# واعیزەکانی سوڵتان



دکتۆر عەلی وەردی



وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: مەودود جەبار

# واعیزەکانی سوڵتان

نوسینی: عەلی وەردی



وەرگێڕانی: مەودود جەبار




**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشانی:** سلێمانی/ شەقامی ئیبراهیم پاشا / فولکەی گۆزەکان / نزیك ناوەندی ڕۆشنبیریی کۆیان

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

ناونیشان: واعیزەکانی سوڵتان.

نووسەر: د. عەلی وەردی.

وەرگێڕانی: مەودود جەبار.

ژانر: ڕۆمان.

پێداچوونەوە: کەیوان هەورامی.

پەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

ساڵی چاپ: 2019 میلادی.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (1843) ساڵی (2017) پێی دراوە، 

## پێشەکی نووسەر

ئەم تـــوێژینەوە بـــێ ڕتووشــــە دەخەمە بەردەســـتی خـــوێنەرانی عەرەبزمـان[1]، کە لەمەڕ سروشـتی مرۆڤەوە بە شـێوەیەکی ڕوون و ڕەوان، دوور لە دووڕووی نووسراوە. هەروەها، ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە، کە ماوەیەکی باشی ویستووە، بە تایبەت هەندێک بەشی کە ویستمان لە ڕادیــۆی بەغــدا پەخشـــی بکەیــن، بەڵام شەقوەشـــێنەکانی ئەوێ ڕێگرییـان لـێ کـردین، لەبەر هۆکارێـک کە کەس نایزانێـت، بـێجگە لە خودا و ئەوانەی زۆر بەخەستوخۆڵی لە زانستدا ڕۆچوون.

پەخشـــــی ڕادیـــۆ و تەلەفزیۆنەکـــانیش، وەک هەمـــوو دەزگـــا ڕۆشنبیرییەکانی دیکە لەم ناوچەیەدا، بە پێی شێوازی بیرکردنەوەی واعیزەکان دەبرێت بەڕێوە، هەر بەتەواوی ڕەنگی هەڵسوکەوتی ئەوان (واعیزەکان)ی لێ نیشتووە.

لەم شـــارەدا بە دەســـت گرۆهێـــک لە ڕۆشـــنبیری ئەفلاتـــوونییەوە گیـرۆدەین، کە بە شـــەو و ڕۆژ، هەر شـینوڕۆیانە بـۆ مـرۆڤ، ئەمە لەبەر چـــی؟ وەڵا مـــرۆ لە هێـــڵ لایـــداوە، هـــێڵەکەیش ئەو نمـــوونە میســـالییەیە (مثـــل العلیـــا) کە خۆیـــان دایاننـــاوە، بەبـێ ئەوەی یەک چـــرکەیش ڕامێـــنن بـــزانن ئەم نمـــوونەیە چەنـــدە لەگەڵ سروشـــتی بنیادەمدا پێک دێتەوە.

ئەم کۆمەڵە ڕۆشنبیرە دەمیان ڕاهاتووە لەسەر وتنەوەی: "هەموو ئەم لەبەر یەکهەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتییە خەتای خراپیی ڕەوشتمانە". وا دەزانن ڕاستکردنەوەی کۆمەڵگە بەم قسانەیە، تەنها بە چاککردنەوەی

[1] ئێمەیش وەرمانگێڕا بۆ خوێنەرانی کوردزمان.

ڕەوشتمان و خاوێنکردنەوەی دەروونمان لە لەچەریی[٢] و خۆپەرستی و هەوەسبازی، دەبینەوە بە کوڕە دڵخۆشەکەی جاران، وەجاخی باوباپیرانیشمان ڕۆشن دەکەینەوە.

ئەوان وا لە دەروونی مرۆ تێگەیشتوون، کە هەروەک پۆشاکێک بێت، دوای ئەوەی بە ئاو و سابوون شووشتمان، خێرا خاوێن دەبێتەوە. هەر بۆیە دەیانبینیت ڕۆژانە، هوتاف دەکێشن پڕ بە دەم و زمانیان هاوار دەکەن: "گەلۆ! ئەخلاقتان خاوێن بکەنەوە، دڵەکانتان لە ژەنگ سپی بکەنەوە!" خۆ ئەگەر هەستیان کرد وا کەسێک بە قسەکانیان کاریگەر نابێت، یەکسەر دەست دەکەن بە قسەی هەڵیتوپەڵیت و سوێر، دوایش دەست دەکەن بە دوعای شەڕ و لەناوچوون لەوانەی کە قسە کاریان لێ ناکات.

من بڕوام وایە، ئەمە هیچوپووچترین ڕێی چاکسازیی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر ئێمە سەدان ساڵیش وەک ئەوە بکەین کە پێشینانی ئێمە کردوویانە، لە نەڕاندن و هاتوهاوار بەسەر ئەو مەردوومەدا، سا بەڵکوو سروشتی خۆیان بگۆڕن، ئەوا دەستمان لە بنی هەمبانەکەوە دەردەچێت و پووش لە دەم دەمێنینەوە[٣]. تەنانەت لەوانەیە بەم کارەمان، خراپەمان بەرانبەر کۆمەڵگەکەمان کردبێت. ئێمە بەم کارەمان خۆمانمان وا تێگەیاندووە کە خەریکین ڕێگای چاکسازی تەی دەکەین، لە کاتێکدا لە جێی خۆماندا وەستاوین، یان لەوانەیە بەرەودواوەیش بگەڕێینەوە.

سروشتی مرۆ، تەنها بە ئامۆژگاری و دەرسدادان، چاک نابێت، بەڵکوو وەک هەموو شتەکانی گێتی، بە پێی پێڕەو و ڕێسایەک ئەویش کار دەکات. بەر لەوەی جوان لە شتێک بکۆڵینەوە، هەرگیز ناتوانین

---

[٢] لەچەریی: حەسوودی.
[٣] پووشلەدەم: هیچ بۆنەماو.

سەرکەوتوانە کاری لەسەر بکەین و ئاراستە و ئامادەی بکەین، بۆیە لەمەڕ سروشتیی مرۆ پێویستە زۆر بخوێنین و ڕامێنین، ئەوسا بانگی چاکسازی هەڵدەین.

"فرانسیس بیکۆن" دەڵێت: "بۆ ئەوەی دەسەڵاتت بەسەر سروشتدا بشکێت، پێویستە سەرەتا لێی بکۆڵیتەوە."[4] هەر بۆیە مرۆیش بەشێکی دانەبڕاوە لەو سروشتەی کە تێیدا دەژی و هەمان یاسا دەیگرێتەوە. پێشینانی ئێمە وایانزانیوە کە مرۆ هەم هۆشیارە و هەم ئازادە لە هەڵبژاردندا. لە زیهنی ئەواندا مرۆ خەریکە ئەو ڕێگایە تەی دەکات، کە خۆی لە سایەی لۆژیک و عەقڵی پوختدا دۆزیویەتییەوە. لەبەر ئەمە لە ئامۆژگاریکردن ماندوو نابن، چونکە وا دەزانن بەم میکانیزمە، دەتوانرێت خووە خراپەکان بگۆڕن بە ڕەوشتی بەرز و فەزیلەت.

چەندین ساڵ و سەدەیە ئەمانە هەر خەریکی کاری وەعزن، خەڵکیش سەرقاڵی کاروباری خۆیانن، سەرسام نین بە وەعز و نەسیحەت، مەگەر ئەو دەمەی دەکەون بەسەر بابەتەکەدا، ئیدی ئەوکاتە دەست دەکەن بە فرمێسکهۆنینەوە. دواتریش کە لە کۆڕی وەعزەکان چوونە دەرەوە، وەک ئەوەی نە بایان دیتبێت نە بۆران.

ڕۆشنبیرە هاوچەرخەکانیش هەر هەمان قەوانی باووباپیران لێ دەدەنەوە. هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەوانەی کە ڕۆشنبیریی نوێیان وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوانەی کە بە کلاسیک ناسراون. هەموو تێکرا دەیانەوێت سروشتی بنیادەم لە ڕێی "قسە"بۆکردنەوە (الوعض - ئامۆژگاری)، بگۆڕن. زۆرێکیان دەبینیت، لە ڕێی وەعزەکانیانەوە داوای گۆڕانکاری شتانێک لە مرۆی بەستەزمان دەکەن، کە ناگۆڕدرێن، بەم کارەیشیان داوای ئەستەم (مستحیل) دەکەن. ئەمەش

---

[4] فرانسیس بیکۆن ١٥٦١- ١٦٢٦ فەیلەسووف و نووسەری ئینگلیزی بەناوبانگ.

وای لە خەڵکی کردووە، کە تەنها دەنگی واعیزەکان دەبیستن، بەبێ گوێلێگرتن (وەرگێڕ: جاری وا هەیە، قسەکانی بەرانبەر دەبیستیت، بەڵام گوێت نەگرتووە، تا بزانیت چی دەڵێت.)

لەم کۆتاییانەدا، خوویەکی خراپ لە نێوان نەوەی نوێدا بڵاو بووەتەوە، ئەویش ئەوەیە: "ئەم نەوە نوێیە پێکەنینیان بە قسەی هەرچی واعیزە دێت، ئەمان لە شام دەخوێنن ئەوان لە شیراز."

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، ئەم واعیزانە خۆیشیان پێڕەوی لە قسەکانی خۆیان ناکەن. بە خەڵکی دەڵێن: خۆتان لە "خۆبەشتزانین"، "هەوەسبازیی" و "ڕژدی" خاوێن بکەنەوە، کەچی لەولاوە هێندێکیان دەبینیت لە خەڵکی زیاتر هەڵپەهەڵپیانە.

لەوانەیە هەڵەمان نەکردبێت ئەگەر گوتبێتمان: "چاوچنۆکی، بەخیلی و ئارەزووپەرستی" سیفەتگەلێکی بنچینەیی ناو ڕەوانی مرۆڤن، هەڵاتن لێیان ئەستەمە. هیچ تاکێک نابینیتەوە مەگەر بڕێک لەم سیفەتانەی تێدایە. هەموو کەسێک بە ڕێژەیەک چاوچنۆک، بەخیل و هەوەسبازە، بەڵام کەم و زۆری کەوتووە. ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە، جیاوازی لە پلەی چاوچنۆکییەکەدا هەیە، نەک لە جۆردا (جیاوازییەکە چەندایەتییە، نەک چۆنایەتی، چونکە چاوچنۆکی هەر چاوچنۆکییە کە حەز دەکەیت هیچ نەدەیت بە کەس، هەمووشت هی خۆت بێت). هیچ کەسێک زەمی ئەم تایبەتمەندییە سروشتیانەی مرۆ ناکات، بێجگە لەوانەی کە خودا لە نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون، ئیدی لە شەهوەت کەمکورتییان نییە، هێندەشیان لە ماڵی دنیا پێدراوە، کە بوونەتە جێی "لەچەریی پێبردن"[٥]. ئەوان چۆن حەز ناکەن لەچەریی کەم ببێتەوە؟ وەک بڵێیت ناخودئاگایانە بەم کارەیان دەیانەوێت خۆیان و شوێن و سامانەکەیان بپارێزن لە بەربەرەکانێ و کێبڕکێ،

---

[٥] لەچەریی: حەسوودی.

بە خەڵکیش بڵێن: هۆ گەلۆ! "حەسوودیی" ئاگرە و دوایی دەتانسووتێنێت.

هەموو کەسێک خۆی خۆش دەوێت، وەک دەڵێن: "هەرکەس حەز دەکات، خۆی لە هەموو کەس بەڕێزتر بێت، چاویش حەز ناکات لە خۆی بیناتر هەبێت". ئەگەر بە مرۆمان گوت: لەچەریی و خۆپەرستی لە خۆتان داڕنن! مانای وایە پێمان وتوون، لە سروشتی خۆتان لابدەن و ببنە فریشتە.

ئەوەی کە لێرەدا شایەنی باسکردنە، نموونەی ئەو کەسە ئەزهەرییەیە، کە هاوڕێ لەگەڵ یەکەم شاند، لەسەر داخوازیی "محمد علی" سەردانی فەرەنسایان کرد. ئەم برادەرە لە یادەوەرییەکانیدا، کە لەمەڕ گەشتەکەیان نووسیبووی: تووشی شۆک بووە ئەو دەمەی خانمانی بێ حیجاب و بێ سەرپۆشی بینیوە، کە چۆن لەگەڵ پیاوان تێکەڵوپێکەڵ دەبن. ئەو، ئەم کارە بە نەنگی و شوورەیی دەزانێت، گوزارشتی لێ دەکات بە خراپەکاری و فاحیشە. بەڵام پاش کەمێک هەست و سۆز دەیجووڵێنێت و دەست دەکات بە وەسفی فەرەنسییەکان، کە خەریکی "نێربازی" و "هەتیوبازی" و ئەم شتانە نین. ئەمەیش دەقی وتەکەیەتی: "نەبوونی ئارەزوویان بەلای "منداڵبازی و نێربازی"دا، ئەسڵەن ئەوان ئەم کارەیان لەیادچووە. یەکێک لە قەشەنگی زمان و شیعریان ئەوەیە، کە ناکرێت کەسێک عاشقی هاورەگەزی خۆی بووبێت، لە زمانی فەرەنسییدا ئەم ڕستەیە شوورەییە و بە کارێکی ناشیرین دەبینرێت ئەگەر ببیستن وا "پیاوێک عاشقی غولامێک[6] بووە."[7]

---

[6] خولام: مێردمنداڵ.

[7] تەماشای گۆڤاری "الهلال" ٦١ بکە، بەشی ١١، لاپەڕەی ٦٨.

ئەم ئەزهەرییە پەسنی فەرەنسییەکان دەکات بەوەی دڵیان ناچێتە سەر منداڵ و عاشقی نابن، لەولاشەوە بە سەروچاوی ژنەکاندا هاتووەتە خوارەوە لەسەر بێ جلوبەرگیان و تێکەڵوپێکەڵ بوونیان لەگەڵ پیاواندا. ئەو نەیزانیوە کە ئەم دوو کارە تەواوکەری یەکترین، هیچکامیان بەبێ ئەویتریان نابێت.

ڕێورەسمی واعیزەکان بریتییە لە کردنە کونی ژنان و بە باشزانینی حیجاب بۆیان. هەر لێرەوەیە لادانی سێکسی سەر هەڵ دەدات، ئیدی چی لە پیاودا، چیش لە ژندا. سروشتی پیاو وایە سەری بۆ ژن دەخورێت، سەری ژنیش هەر بۆ پیاو دەخورێت، بەڵام ئەگەر بەربەستمان دروست کرد لە بەردەم گەیشتن بە ئامانجەکان بە شێوەیەکی ڕێک و ڕەوان، ئەو دەمە ئیدی مرۆ بۆ ڕێگای چەوت و هەڵە پەنا دێنێت. بەدواداچوونە مەیدانییەکان ئەوەیان دەرخستووە، تا کۆمەڵگا توندتر مامەڵە لەگەڵ حیجابدا بکات، دیاردەی "نێربازی" و "پانپانۆکێ"[8]یش پەرەی زیاتر دەسەنێت. واعیزەکانی ئێمە وا گومان دەبەن تەنها لە ڕێگەی قسە و پەند و نەسیحەتەوە دەتوانن ڕێ لەم لادانە ئەخلاقیانە بگرن، ئەوەیان لە یاد چووە کە هۆکاری سەرەکی تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی لەو دەمەوە دەست پێ دەکات کە پیاو و ژن لە یەکتری دوور بخرێنەوە و دیوار لە نێوانیاندا دروست بکرێت[9]. بۆیە هەر لە دێر زەمانەوە وتراوە: "ئەگەر ویستت نەتوانیت، ئەوا خۆت بدە لە قەرەی کارێکی ئەستەم."

[8] پانپانۆکێ لە عەرەبیدا پێی دەڵێن "سحاق"، لە ئینگلیزی مۆدێرنیشدا بریتییە لە "Lesbianisim".

[9] لەوانەیە واعیزەکانمان گرفتی بڵاوبوونەوەی لادانی سێکسییان پێ هەرس بکرێت، بەڵام دیاردەی سفورییان پێ نەکرێت. لەوانەیە زیادەڕەویمان نەکردبێت ئەگەر وتبێتمان: "لادانی سێکسی لە نێوان

من بۆ خۆم دان بەو شۆکەدا دەنێم کە تووشم بوو، ئەو دەمەی سەردانی وڵاتانی ڕۆژئاوام کرد. سەرنجی ئەوەم دا، چەندە بە تەنگ پاراستنی سروشتی مرۆڤەوەن. ڕێگە بە بنیادەم دەدەن لە سنوورێکی ئازادیی دیاریکراودا گوزارشت لە کەسایەتی خۆی بکات. بە زۆر داینانێن پەند و وەعزی بدەنێ، ڕێگەیشی لێ ناگرن، کە لە سنوورێکی دانپێدانراودا هەوەس و خۆپەرستییەکەیشی بەرجەستە و تێر بکات.

لەوێ دەبینیت منداڵێک دەزانێت و بڕوایشی هەیە، کە مافی یاریکردن و پێشبڕکێ و مونافەسە و حەزکردن لە شتی هەیە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی ئەو گرووپ و کۆمەڵگەیەی کە ئەمیش دانەیەکە لێیان. بۆیە ئەو دەمەی بووە جاحێڵ و پێگەیشت، کەسایەتییەکی سروشتی و دوور لە ڕووپارمایی و دووڕازیی[10] لێ دروست دەبێت.

بەراوردی ئەم دیاردەیەی ئەوێم بە ساتی منداڵیی خۆمان دەکرد، کاتێک مامۆستاکانمان لە "دەرسخانەکان"[11]دا، ئەو ساتانەی کە ئیدی ئامۆژگاریکردن دەگەیشتە چڵەپۆپەی خۆی، بە قامچییەکەیەوە، ڕووی تێ دەکردین و دەیوت: "بەڕەوشت و هێمن و بەویقار بن، بێدەنگی دەرسخانەکەیش لە ئەستۆتاندایە". ئێمەیش متقمان لە خۆمان دەبڕی، خۆمان بە شەریفی مەککە[12] نیشان دەدا، ویقارێکی درۆزنانەیشمان

---

واعیزەکان خۆیاندا زیاترە وەك لەوەی لەناو خەڵکیدا هەیە". ئەمەیش سەرەنجامی هەر کارێکی پێچەوانەی سرشتی مرۆیە. نووسەر.

[10] دووڕازیی: دووڕوویی.

[11] کتاتیب: دەرسخانە، حوجرەی کۆنی جاران، وشەیەکی کۆنە، جێگرەوە هاوچەرخەکەی بریتییە لە خوێندنگە.

[12] "شەریفی مەککە و شامی شەریف"، دوو دەستەواژەی مەجازیین (خوازراون)، یەکەمیان بۆ کەسێکی زۆر هێمن و بە شەخسیەت، دووهەمیشیان بۆ شوێنێکی زۆر ئاسایش و دڵڕووبا، کە مرۆڤ لەوێ ئازاد و ئەرخەیانە.

لە خۆماندا بەرجەستە دەکرد. هەر هێندەی بەس بوو لە دەرسخانە خەلاسیمان بێت، ئیدیی هەرچی بەرەڵلایی ئەو سەر زەمینەیە، تێکەڵ بە جرت و چەقەنەمان دەکرد و شاییمان دەگێڕا.

ئەو دەمەیشی زانکۆ ڕۆژئاواییەکانم دیت، خەریک بوو باوەڕ نەکەم، کە چەندە ئاگاداریی لە ئارەزووەکانیان دەکەن، هیچ شەرم و عەیبەیەک لە گۆڕێ نییە، جێگای تایبەت سازکراوە بۆ دانس و سەمای قوتابییەکان. ئەمە لە کاتێکدا بۆ یەکترناسین و تەعاروفی خوێندکارەکانیش شوێنێکی نایاب بوو. کەشوهەوایەکی مۆسیقی چێژبەخشیان بۆ ساز دەکرێت کە ببێتە مایەی کامەرانیی دڵیان بە شێوەیەکی پاک و خاوێن[١٣]. بۆیە ئەم عاجبایەتییەم لای یەکێک لە مامۆستاکانم ئاشکرا کرد، ئەویش وەلامی بەم چەشنە دامەوە: "ئێمە ئەگەر بێتوو ڕێگری خوێندکارەکانمان لەم تێکەڵییە ئاشکرایە بکەین، ئەوا ناچار دەبن، پەنا ببنە بەر تێکەڵیی پەنهان لە کەشوهەوایەکی خراپی فریودەرانەدا. ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە، سروشتی مرۆ لە ناواخنی خۆیدا هێزێکی حەشارداوە کە ڕێگریی کاری خراپەی لێ دەکات لە کەشوهەوای ئاشکرا و خاوێندا، بەم کارەیشمان مرۆڤمان پاراستووە لە خراپە و ئیغراییەکانی شوێنە تاریکەکان". مامۆستا خەتمی کەلامەکەیشی بریتیی بوو لە "منداڵەکانت لەسەر ژیانی ناو

---

[١٣] مەبەستم لە چێژی پاکوخاوێن ئەوەیە کە لە لای خۆیان وایان دەبینی، چونکە ئەخلاق شتێکی ڕێژەییە، لەوانەیە ئەوەی ئەوان بە پاکوخاوێنی ناو دەبەن، لای ئێمە بریتی بێت لە تاوان و بەرەڵایی. لەوانەیە ڕۆژێك دابێت پێوەرەکانی ڕەوشت لای ئێمەیش بگۆڕێت و وەك ئێستا نەمێنێت. نکوڵی لەوە ناکەم، لە سەرەتا، کە ڕۆیشتم بۆ ئەوێ، تووشی سەرەگێژە بووم کە بینیم، وا خوێندکارەکان تێکەڵ بە یەك بوون، وام دەبینی کە ئەمە بریتییە لە بەرەڵایی و تاوان، چونکە ئەودەم بە باشیی لەژێر کاریگەریی وەعز و واعیزاندا خۆم بینیبوویەوە. نووسەر.

ڕووناكى ڕابهێنە، ئەوكات لە دەروونیدا، خۆشەویستى بۆ تاریكى نامێنێت."

جارێكیان، هەروا كە تازە چووبووومە ئەمریكا، ڕۆژێكیان سڵاوم لە یەكێك لە خوێندكارە كچەكانى پۆلەكەى خۆمان كرد، ئەویش بە ڕوویەكى خۆش و ئیشارەتێكى خاوێن لە چاوەكانیدا، وەڵامى دامەوە. ڕووخوشى و ئیشارەتى تاكێكى ئەمریكى، هیچ مانایەكى نییە، جگە لە جوانیى ڕەفتار و وردە موجامەلە. بەڵام من ڕاڤەى ئەم ئیشارەتەم بە شێوەیەكى پیسى ڕۆژهەڵاتیانە كرد. بە درێژایى ڕۆژ لەبەر ئاوێنە ڕاوەستابووم هەر پێنجم لێكدانى شەش دەكرد.

ئەوەى كە منى لەسەر گەورەبووم لە ژینگەكەى خۆمدا، ئیدى لە بارەى هەموو جۆرەكانى دووڕوویییەوە، لە بارەى ویقارى دەستكردەوە، واى لێ كردم ئەو ئیشارەتە بە تیرێك لە تیرە ژەهراوییەكانى شەیتان لێك بدەمەوە. بۆیە بۆ شەیتانیش زۆر ئاسانە بتوانێت كەسێكى تەزویر و دووڕوو لە خشتە بەرێت.

ئەم داخراوییە بەتینە، كە بریتییە لە تایبەتمەندى شارستانییەتى ڕۆژئاواى خۆمان، لەوانەیە میراتى سەدەى زێڕینى پێشینانمان بێت، ئەو دەمەى ژنان، كڕین و فرۆشتنیان پێوە دەكرا، سەرۆك و دەوڵەمەندەكان پڕ بە دڵى خۆیانیان دەكڕى، كۆشك و تەلارەكانیان لێ پڕ دەكردن.[14]

ئەم خاوەن كەنیزەكانە، زۆر بە تەنگ داوێنپاكى كەنیزەكەكانەوە بوون. هەڵدەستان بە دروستكردنى تەلبەندى بڵند بڵند بە دەوریاندا، بە وردى چاودێرییان لێ دەكردن، سا نەبادا فەقیرێك، لاتێك، لەوێوە

[14] دەڵێن: موتەوەكیل، ڕەزاى خواى لێبێت، لە كۆشكەكەى خۆیدا ٤ هەزار كەنیزەكى هەبووە، لە هەر چوار هەزارەكەیشیان پەڕیوە. بنواڕە (Hitti ، History of the arabs، ٣٤٢ p).

تێپەڕ بێت و تیلەچاوێکی تێ بگرن و تیر لە کەوان بترازێت. واعیز و فەقیهەکانی ئێستا، بەرگری لە خاوەن کەنیزەکەکان دەکەن، لە ڕێگەی چاودێریکردن و لەقاڵبدانی ژنانەوە. واعیزەکان، جاران و ئێستایشی بە دەمەوە بێت، هەر بە نان و ئاوی خاوەن کەنیزەکەکان - پیاوە دەوڵەمەندەکان- ژیاون و دەژین.

واعیزەکان بابەتێکیان لەمەڕ "خۆداپۆشین" بڵاو کردووەتەوە، تێیدا بە دەستاوێژ[15]ی عەقڵی و نەقڵی هەوڵی سەلماندنی چەمکەکە دەدەن. لەوانەیە بەم کارەیان، نەستییانە[16] بیانەوێت ڕەشوڕووت بترسێنن، سا نەبادا بۆیان دەرکەوێت چی لە کۆشک و تەلاران دەگوزەرێت، ئەم دۆتە[17] سپی و ناسکانە لەم حەسار و تەلارانەدا، چما کاریان چی بێت؟

واعیز کاتێک دەڵێت: "تەماشای ژنان مەکەن"، لەوانەیە مەبەستی ئەوەبێت" تەماشای کەنیزەکی بێجگە لە خۆتان مەکەن". ئەو دەمەیش کە دەڵێت: "وریای حەسوودی بن"، هەر لەوانەیە بیەوێت پێمان بڵێت: "چاوت مەبڕە کەسێک، کە بە ماڵی حەڵاڵی خۆی کەنیزەکی کڕیوە". بنیادەم لەوەدا سەر سپی دەکات، سزای خوا دێننە خوارەوە بەسەر هەژارێکی بێدەرەتاندا، کاتێک بە چاوێکی جۆرێک دەنواڕێتە کەنیزەکێک، لە حاڵێکدا، خۆیان پیرۆزبایی لە "زەنگین کەس"ێک دەکەن، کە چووە و بە پارە، کەنیزەکی لە بازاڕ هێناوەتەوە. وەک بڵێیت حەڵاڵ و حەرام لەسەر هەبوونی پارە و نەبوونی ڕاوەستابێت.[18]

---

[15] دەستاوێژ: بەڵگە.

[16] نەستییانە: لاشعوریانە.

[17] دۆت: کیژ، کچ.

[18] ئەوەی جێگەی واقوڕمانە ئەوەیە، هێندێك لە فەقیهەکان، جیاوازی دەکەن لە نێوان، نێربازی لەگەڵ کەسی بەندە و کەسی سەربەستدا.

دەڵێن جارێکیان خەلیفە "سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک" بە شوێنێکدا تێپەڕ دەبێت، لە دوورەوە دەنگێکی زۆر خۆش و نەرمی کوڕێکی جاحێل دەبیستێت، خەلیفە ئاگری تووڕەیی تاو دەستێنێت و دەڵێت ئەو دەنگە دەنگێکی لەخشتەبەر و خراپە بۆ ژنان، گوایە خراپە بۆ عیففەت و داوێنپاکی کچانمان. بۆیە خەلیفە بڕیار دەردەکات کە ئەو داماوە قۆڕ[19] بکەن.[20]

ئەم نەزیلەیەی[21] باسمان کرد، دڵی واعیزەکان زۆر خۆش دەکات، لەبەر ئەوەی لە کارەکەی خەلیفەدا، غیرەت و جوامێریی دەبینن. لەوانەیشە بیانەوێت ئەم حکومەتە نازادارەیشمان لەسەر سوننەتی جەنابی خەلیفە ببەن بەڕێوە، هەموو گۆرانیبێژان قۆڕ بکەن.[22]

واعیزەکان گوێیان لەوە نییە، ئەگەر گۆرانیبێژێک لە دەرباری خەلیفەدا جەرگی کەنیزەکەکان ببڕێت بە دەنگە نیانەکەی، بەڵام ئەگەر دیتیان وا

---

ئەگەر لەگەڵ کەسێکی سەربەستدا ئەنجام درا، ئەوا سزاکەی بریتییە لە سەنگەسار تا مردن، بەڵام ئەگەر لەگەڵ بەردەیەکدا ئەنجام درا، سزاکەی ئەوەیە، قازی دوو تف لە نێوچاوانی دەکات و دەڵێت: "تف، هەی نانەجیب". مانای وایە ئەگەر فەقیر ئەم کارەی کرد، ئەوە دەیکوژن، بەڵام ئەگەر دەوڵەمەندێك خەریکی ئەم کارە پیسە بوو، دەچوو لە بازاڕی بەردفرۆشان دەیکڕین و دەیهێنایەوە، تەنها بە تفێك خەلاسیی دێت. (بنواڕە: منز، الحجارە الاسلامیە فی القرن الرابع الهجری، ج ٢، ص ١١٨). نووسەر.

[19] قۆڕکردن ئەوەیە هێلکەگونەکانی دەردێنن و ئیتر ئامێرەکەی ڕەق نابێت و سپێرمیش دروست ناکات.

[20] زیدان، التمدن الاسلامی/ ج ٥، لاپەڕە ٣٦.

[21] نەزیلە: کورتەچیرۆك.

[22] پشتبەست بەم بڕیارە، لەوانەیە دەوڵەت فەرمان بە قۆڕکردنی فەرید ئەترەش و محمد عەبدولوەهاب بکات. (دوو گۆرانیبێژی سەردەمی نووسینی ئەم کتێبە بوون).

لاتێکی ڕەجاڵ، خەریکە بۆ بەختی ڕەشی خۆی شتێک دەچرێت، زەوی و ئاسمانی لێ دەکەنە چەرمە چۆلەکە. هۆکاری ئەم لایەنگیرییە لە وەعزی واعیزاندا، ئەوەندەی من بیرم لێ کردووەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە دێرزەمان و ئێستاشدا، ئەم واعیزانە هەر لەسەر پاشماوەخۆری و سەر سفرەی دەوڵەمەندان و ستەمکاران ژیاون و دەژین. گوزەرانیان بەند بووە لەسەر ڕەزامەندیی وەلی ئەمرەکانیان. لەبەر ئەم هۆیە، چاویان لە ئاستی هەموو خراپە و سەرەڕۆیی و زیادەڕەوییەکانیان نوقاندووە، دواتریش لە خودا لاڵاونەتەوە سا بەڵکوو تەمەنیان درێژ بێت.

لەوانەیە بۆ ئەم ستەمکارانە، واعیزەکان باشترین دەسکەلابن، تا ئەو خەڵکە ڕەشوڕووتەیان بۆ کەوی[23] بکەن، تا هەر لەبەر یەکتری و ئامۆژگاری ئەم بۆ ئەو، سەریان نەپەرژێتە ئەوەی لە لایەن ستەمکارانەوە چیان لێکراوە. واعیز کاتێک وەعزی خەڵکی دەکات بە شوێنکەوتنی مەسەلی عولیای خۆی (نموونە یۆتۆپیاکەی خۆی، کە هەمووکەسێک نموونەیەکی خەیاڵیی لە زیهنیدا هەیە و دەیەوێت خۆی بکات بەو نموونەیە)، داوای ئەوەیان لێ دەکات، دەروونیان لە خۆپەرستی و لەچەریی[24] خاوێن بکەنەوە، هەر وەک پێشتریش باسمان کرد، ئەوە داواکارییەکی ئەستەمە. بێجگە لە کۆمەڵێکی کەم لە خەڵکی کەس ناتوانێت ئا بەو چەشنە بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ ببێت. ئەوەیشی دەمێنێتەوە، کە بریتییە لە زۆرینەی خەڵکی -ڕەشەخەڵک-، لە حیرەت و سەرسامیدا دەمێننەوە، خۆشیان نازانن چی بکەن بە دەست ئەم داخوازییە قورسانەوە.

---

[23] کەویکردن: ڕامکرد، مسەخەرکردن.

[24] لەچەریی: حەسوودی.

کاسبکارێک لەو بازاڕەدا، هەست دەکات کە پێویستە خۆی خۆش بوێت و خۆپەرست بێت، تا بتوانێت ژیان بگوزەرێنێت، ئەمە لە کاتێکدا واعیزەکان بەمدەست و ئەودەست دووری دەخەنەوە، دەنەڕێنن بە سەریدا و دەڵێن: "خۆویستی، تاوانێکی قێزەونە". ئیدی بەم کارە، بێئومێدی باڵ دەکێشێت بە سەریدا، هەست دەکات کە ئیدی ناتوانێت چاکسازی لە دەروونی خۆیدا بکات. نەفسی خۆی بە پیس و ئاوێتەبوو دەزانێت. ترسی تۆڵەسەندنەوەی خودایش لەولاوە بوەستێت. ئەمە ئەو گرفتەیە کە لە زانستی دەروونناسیدا پێی دەڵێن: "هەست بە تاوان." (Guilt Complex) ئیدی لەم ساتەدا، واعیز هەلی دەست دەکەوێت و ڕوو لە مەردوومەکە دەکات و دەڵێت: "ئێوە بەم کارانەتان خۆتان شایەنی سزای ئاسمان کردووە، شایەنی ئەوەن چۆن سون و کولله بەسەر مەزرادا دەدەن، ئاوەها بەڵاتان بەسەردا بباریێت". واعیز بەم کارەی، هەموو بەرپرسیاریێتییەکی زوڵم و ستەم لە ئەستۆی زاڵمان دادەڕنێت و دەیدات بە کۆڵی ستەملێکراواندا. ئەو فەقیرانەیش دەست دەکەن بە ئەستەغفیروڵڵا و داوای لێخۆشبوون. بەم شێوەیەش ستەمکاران پاڵی لێ دەدەنەوە، چونکە هەرچی بەرپرسیاریێتییە لەسەریان لابراوە، هەمووی دراوە بە کۆڵی ئەو هەژارە بێدەرەتانە داماوەدا، کە بولێلی[٢٥] بەیان تا شەو، ڕاکەڕاکێتی بە دوای پارووپەک ناندا. سەرباری ئەمانەیش، واعیزەکان هەڕەشەی ئاگری پڕتینی جەهەندەمی لێ دەکەن.

من خەریکە دەگەمە ئەو بڕوایەی، کە لۆژیکی واعیزی ئەفلاتوونی، بریتییە لە لۆژیکی ستەمکار و خۆشگوزەرانەکان. ئەوان خەڵکی بەم لۆژیکەوە مەژغوڵ دەکەن، دەڵێن: "ئێوە ستەمتان لە خۆتان کردووە، بە ستەمەکەشتان سزای پەروەرێنتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردووە". بەم

---

[٢٥] بولێڵ: لێڵی.

لۆجیکەیش، دەوڵەتمەنـد و ملهوڕەکـان هەر خەریکـی عەیشونۆشـی خۆیان دەبن و فەقیری داماویش دەست بە تەسبیح، هەر خەریکی "یا غەفار"ـە و تۆبەکردنە. بەمەیش ڕووی ئەو پەندە سپی دەکەنەوە کە دەڵێت: "تا خاوەنماڵ دزی گرت، دز خاوەنماڵی گرت."

جارێکیـان کۆمەڵێـک واعیـزم بینـی، خەریکـی پیاهەڵـدان بـوون بە شانوباڵی یەکێک لە ستەمکارەکاندا، لەبەر ئەوەی بە توندی لەگەڵ دز و چەتەکاندا مامەڵەی کردبوو. لە مێشکی ئەواندا بەم کارەی شکۆی پێشـینانی بـۆ گەڕانـدوینەتەوە و شـایەنی ڕەزامەنـدی خـودا و پێغەمبەرەکەیەتی، بەڵام ئەم واعیزانە، ئەوەیـان بیرچـووەتەوە کە دزی گەورە ئەم ئیماندارە ستەمکارەیە. ماڵی میللەت تەخشـان و پەخشـان دەکـات بەمـدیو و بەودیـودا، سـەرفی دەکـات لە خۆشـی خـۆی و منـداڵەکانی و داروودەسـتەکەیدا. بە دڵنیاییشـەوە، خـودا لەمەدا پشـتیوانیەتی. بەڵام ئەگەر بێدەرەتانێکی شـڕەخۆر، دینارێـک بدزێت، ئەوا خودا و مەلائیکەتەکانی نەفرینی لێ دەکەن و واعیزەکانیش بەر دەبنە نێزەیەوە.

گرفتـی ئەم واعیـزانەی لای خۆمـان ئەوەیە، لایەنـی "دەسـەڵاتداران" دەگرن، دژی "ڕەشـەخەڵک" دەوەستنەوە. بۆیە دەیانبینیت کە باس لە فەلەتکردنـی سروشـتی مـرۆڤ دەکەن، ئەو دەمەی کە دەسـەڵاتدارێک پەنێکـی لە دەسـت دەقەومێـت، یـان ئەو دەمەی حـاکمی مەمـلەکەت سـتەمی لە ڕەشـەخەڵک کـرد، خسـتنیە نـاو گێژاوێکـی بـێ ئامـانەوە، واعیزەکـان دەڵـێن: "ئەوە ئیجتیهـادی کـردووە و نەیپێکـاوە. کەسـیش بێهەڵە نەژیاوە لەسەر ئەم زەوییە. ئەوە هەر خودایە بێهەڵە و پەڵەیە. بەڵام ئەگەر دەستکورتێکی بێکەسوکار و عەشرەت، قاچی بخلیسکێت بە ڕووی تاوانـدا، یەک قەتـرە ئـابڕووی بـۆ نـاهێڵن، بە هۆکـاری ئەم هەموو بەڵا داباریوەی دەزانن کە بەرۆکی مرۆی گرتووە لەم چەرخ و

خولەدا.

من دەمەویت لەم پەرتووکەمدا، سەرنجتان ڕاکیشم بۆ ئەم ڕیتمە پیسە لە بیرکردنەوە. ئەویش بیرکردنەوەیە لە باوەشی ئەو ستەمکارە بێفەرانەدا، لەوەڕین لەسەر پاشماوەی سفرە و خوانیان. ئیمرۆ ئەو ڕۆژەیە کە دەبێت ڕێگایەکی دیکە بۆ بیرکردنەوە بدۆزینەوە، ئەویش بیرکردنەوەی بەقاڵ و حەماڵەکانە (میوەفرۆش و کۆڵبەرەکان)، بیرکردنەوەی بێدەرەتان و ڕەجاڵەکان.

زۆرینەی بیریارەکانمان، ئەمرۆ، هەروەک پێشتریش گوتمان، چەپڵە و فیکە بۆ ستەمکاران لێ دەدەن و بەرانبەر بە هەژارانیش گرژومۆنن. ئێستا ئیدی کاتی ئەوەیە سروشتی مرۆ بخوێنینەوە، وەک ئەوەی لە واقیعدا هەیە، نەک دانیشین و وەک مەلائیکە و پەری تەماشای بکەین.

سروشتی مرۆ هەر ئەو سروشتەیە، ناگۆڕێت، ئیدی پەیوەندی بەوەوە نییە، لە بڵندایی کۆشک و تەلاردا دەژیت، یان لە کەلاوەیەکی بێ داروپەردوو. هەموو کەسێک بە دووی خۆی کەوتووە و خەریکە پلە و ناوبانگی خۆی برەو پێ دەدات. ئەوە جوامێری نییە، هەموو خووە خراپەکان لە خۆپەرەستی و ڕژی و چاوچنۆکی بدەینە پاڵ کۆڵبەر و تەماتە و خەیارفرۆش، یان ئاسنگەر و دارتاش، بەڵام ئەو هەموو پلان و پیلانانە نەبینین، کە لەناو کۆشکەکاندا دادەڕێژرێت بۆ قڕکردنی برا بە دەست براوە، دەرمانخواردکردنی خوردەمێک[٢٦] لە بەینی یەکتریدا، ئەوە حەسوودیی نێوان خۆیان با بوەستێت -مەبەستمان ئاغا و ئاغاواتەکانی ناو کۆشک و تەلارانە کە چەندە دڵ بە دەغەزن لەناو یەکتردا-.

[٢٦] خورپەم: خەڵکێکی زۆر.

ئەوەی مایەی خەفەتە ئەوەیە، هەژار توانای بەرگری‌لەخۆکردنی نییە، ئەویش هەروەک ئەو خەڵکە، خۆی خۆش دەوێت و خۆپەرستە، بەڵام ناچارە بەرگەی تۆمەتەکانی واعیز دەگرێت، چی بکات؟ ناچارە. ئەم دەوڵەمەند و هەوەسبازانە، وەک خەڵکی فەقیر و ڕووتەڵ، ئەوانیش لە ناو یەکدا بەخیل و دڵ لەیەک بە دەغەزن[27]، بەڵام ئەمان ناوێکی دیکەیان لێناوە، عەنعەنە و تەنتەنەیان کردووە بە کارە زشتەکانی خۆیانەوە و لەژێر چەتری "بەرژەوەندی گشتیدا"، هەموو کارە شەڕەتەکانی خۆیانیان ڕووکەش کردووە، دوایش واعیزەکان لە پشتیانەوە سەر دەلەقێنن بۆ قسەکانیان.

لە سەرەتای تەمەنمدا، هەلێکی زێڕینم دەست کەوت، ئەو دەمەی لە بازار، بە عارەقەی نێوچەوانم، خەریکی پەیداکردنی دوو پاروو نان بووم. زۆرم ناڵاند بە دەست زەلیلی و بێبەشکردن و سووکایەتیپێکردنەوە. هەر ئەو دەمە تێگەیشتم، کوڕانی بازاڕ و مەزادخانە، چەندە لە ئازار و چەرمەسەریدان بە دەست ستەمکار و ملهوڕانەوە. دووڕازیی[28] واعیزەکانیشم هەست پێ کرد، کە چۆن لە بەرانبەر ئێمەدا دەم پڕ بە ئایەتی ترسێنەرن (ئایەتی سزاوار و خەشمی خودا)، لە بەرانبەر ستەمکاران و ملهوڕانیشەوە، ڕێزی تایبەت ئەدا دەکەن و دەم پڕ لە پێکەنین و بزەن.

ئەگەر دەوڵەتمەندێک[29] هێرشی کردە سەر ڕەجاڵێکی پێپەتی، ئەوا بێ سێ و دوو، واعیزەکان لۆمەی ڕەجاڵەکە دەکەن و هەموو خەتاکەی لە مل دەهاوێن. خۆ خوا نەکردە، ئەگەر جارێک لە جاران، یەکێ لەم هەژار و برسییانە، هێرش بکاتە سەر موفتەخۆرێکی ملهوڕ، ئەوە ئیتر

---

[27] دڵ بەدەغەز: دڵ نەخۆش.

[28] دووڕازیی: دووڕوویی.

[29] دەوڵەتمەند: دەوڵەمەند.

قیامەتی کوبرا هەستاوە، دەروبان[30] دەبێتە باسوخواس، کۆی بابەتی وەعزەکەیان دەبێتە حەکایەتی ئەم داماوە.

چەندین نەوەیە، ئەم ملهوڕانە زەمامی ئموری ئەم دەڤەرەیان بە دەستەوەیە. بۆیە خەڵکەکەی لە ترسی گیانی خۆیان، ڕێزی ستەمکار دەگرن، ستەملێکراویش سووک دەکەن. هەرچی بیریارەکانیشمانە، هەر باس لایان باسی وێنە نموونەییەکەیە (المثل العليا)، کە بووتەوە تۆوی دووڕوویی لەناو کۆمەڵگەدا.

دەردی بێدەرمان لەم مەملەکەتەدا ئەوەیە، فەقیر و بێکەس بێت.٠

بێگومان چەورە و خۆشگوزەرانەکان سۆمایان بەم کتێبە هەڵنایەت، چونکە وێنەیەکی دیکەیان لە سروشتی مرۆ دەداتێ، کە ئەمان پێی ڕانەهاتوون. ملهوڕی "خۆشڕابوێر"، ڕاهاتووە لەسەر ئەوەی خەڵکی بە دەوری سەر و سمێڵیدا خولەخولیان بێت. وا تێگەیشتووە، مرۆ لە بنچینەوە سروشتێکی خاوێنی وەک کلووە بەفری هەیە، دڵی کەفوکوڵیەتی بۆ خزمەتکردنی حەق و حەقیقەت. ئەمەیش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، بە توولی تەمەنی خراپە، بێتەربێتی لە خزمەتکارەکانی نەبینیوە، مەگەر بە دەگمەن شتێکی زشتی بەرچاو کەوتبێت. هەمیشە دەستلەسەرسنگ لە خزمەتیدا بوون. بەڵام کوڕە ڕەنجبەرێکی وەک من و هاوشێوەکانی من، لە ژیانیاندا هێندە ئەزموونی تاڵ و ترشیان بینیوە، لەمەڕ سروشتی مرۆڤەوە (هیی ئەو دەمەی کە مرۆڤ ڕێک خۆیەتی، بەبێ پەردە و بۆیاخ و دووڕوویی)، کە بە جوانی بۆیان ڕوون بووەتەوە کە پێکهاتەی دەروونی مرۆ چییە و لە چی پێکهاتووە.

عەلی وەردی.

---

[30] دەروبان: سەر و خوار، ئەرز و ئاسمان.

# بەشی یەکەم

## وەعز و ململانێی دەروونی

وەعـزدان و ئامۆژگـاریکردن، زیـانی ئاشـکرا لە کەسـایەتی مـرۆڤ دەدات، ئەگەر هـاتوو ئەم وەعـزانە، داخـوازی شـتی پـێچەوانەی دابـونەریتی کـۆمەڵایەتی، لە مـرۆڤ بـکەن. ئەگەر کەسـێک چـوو بـۆ مزگەوت، یان قوتابخانە، لەوێ گوێی بۆ وەعزێکی ئەفلاتوونی گرت، کە باسی تەرکی دنیا و ماڵی دنیا دەکات، دەستبەجێ لە دەروونیدا، ململانـێ و خووتەخـووتە دەسـت پـێ دەکـات. ئەم لە قـووڵایی نـاو دەروونییەوە دنیای خۆشدەوێت، حەز دەکات بەهەموو هێزی بـاوەش بە دنیـادا بکـات و پـڕ بە دڵـی خـۆی شـتی دەسـتکەوێت. ئەمەیـش سروشتی مرۆڤە بە شێوەیەکی گشتی.

دونیـا و ئەوەی تێیـدایە لە خۆشـی و تەمـاح و سـەرگەرمی، ژمـارەی ڕکاتەکانی نوێژ لە بنیـادەم تێک دەدەن و چاوی ئەبڵەق دەکەن! هیچ کەسـێک هەڵاویـر نییە لەمەدا، مەگەر کەسـی نـامۆ، نامۆ(شـاز)یش لە ڕێسا بەدەرە، وەک ئەوەی لە لۆژیکدا دەگوترێت.

بنیـادەم کاتێـک گـوێی لە واعیـزە، نەسـیحەتی ئەوەی دەکـات واز لەم لاکەی دنیا بهێنێت، ئیدی دۆش دادەمێنێت. بەشێکی دەروونـی داوای گوێڕایەڵی واعیزی لێ دەکات و نەفسیشی پاڵی پێوە دەنێت بـۆ چێژی دنیـا، ئەوەی کە دەرچـوون لێـی ئەسـتەمە. ئیتـر دامـاوە دەکەوێـتە

دووڕیانێک، نە ئەوەیە تەرکی دنیا بکات، نە ئەوەیشە تەرکی ئەو بەهەشتەی کە بڕیار دراوە بۆ پارێزکاران.

لەوانەیە باروودۆخەکەی "عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس"، هەر شتێک بووبێت لەم جۆرە، کاتێک ئیبن زیاد بەڵێنی میرنشینی "ڕەی" دەداتێ، ئەگەر بچێت بۆ شەڕ لەگەڵ حوسەینی کوڕی عەلیدا. لەو نێوەندەدا خۆیشی نەیدەزانی چی بکات! ئایا واز لە جەنگی حوسەین بێنێت و ئەمارەتەکەی لەکیس بچێت، یان بچێت لە دژی بجەنگێت و ئازاری ویژدان و "عاقیبەت شەڕی"ی بۆ خۆی بە دەست بهێنێت. دەگێڕنەوە کە لەسەر دۆشەکەکەی تەپاوتلی دەکرد، وەها دۆشی دامابوو، هەر لە پەسا[31] ئەم هەڵبەستەی دەگوتەوە:

**فوالله ما أدري وإني لحائر**

**أفكر في أمري على خطرين**

**أأترك ملك الري والري منيتي**

**أم أرجع مأثوما بقتل حسين**

بە خودا خۆشم نازانم

سەرم لێ شێواوە کەوتوومەتە نێوان دوو خەتەرەوە

واز لە موڵکی ڕەی بێنم

کە هیوایەتمە یان بە تاوانباری لە جەنگی حوسەین بگەڕێمەوە

ئەمە چیرۆکێکە و دەگێڕدرێتەوە، ئێمە نازانین تا چەندە هەواڵێکی دروستە. بەڵام هەرچۆنێک بێت چیرۆکێکی دەروونییە. زۆربەمان ڕۆژێک لە ڕۆژان تووشی دۆشدامانێکی لەم چەشنە بووین، یان دەبین، ئەو دەمەی کە نازانیت کام لایەن هەڵبژێریت. ئەم جۆرە

---

[31] لەپەسا: یەك لەدوای یەك، بە بەردەوامی.

قەیرانە سەختانە، زیاتر لە کاتە سەختەکاندا تووشی بنیادەم دەبێت، کاتێک دوو جەمسەری دژ بە یەک لە بوارەکەدا کار دەکەن. یەکەم جەمسەری نموونەی بەرز (مەسەلی عولیا) و جەمسەری دووەم: پاڵنەرەکانی تەماح و لەخشتەبردن و خۆپەرستی. لەوانەیە ئەو دەمەی حوسەینی تێدا کوژرا، جوانترین نموونەی بەرجەستەکراوی ئەو دووڕیانە بێت کە دێتە پێش بۆ مرۆ.

مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە زۆرێک لەوانەی دەرچوون بۆ جەنگ دژی حوسەین، تووشی ئەم ململانێ دەروونییە بووبوون، لە مەیدانی جەنگدا، قاچێکیان بۆ پێشەوە و ئەوی دیبان بۆ دواوە هەنگاوی دەنا. ئەم ململانێ دەروونییە، پێشتر لە سەردەمی فتوحاتەکاندا لە گۆڕێدا نەبوو. ئەوەی دەجەنگا، دڵنیا بوو کە لە دژی دووژمنی خودا دەجەنگێت، ئیهـ ئەگەر لەو سەروبەندەیشدا، دەستکەوتێک شتێکیشی دەستکەوتایە، بە دڵێکی ئەرخەیانەوە نۆشی گیانی دەکرد و هیچ ئازارێکیش، تووشی دەروونی نەدەبوو. بەڵام ئەم شتە، لە بابەتەکەی حوسەیندا ڕاست نەبوو، وەک ئەوەی فەرەزدەق باسی دەکات: "دڵەکانی حوسەین، دڵیان لای ئەم بوو، شمشێرەکانیشیان لە سەری". ئەمەیە ئەو ململانێ دەروونییە سەختەی کە باسی دەکەین.

دەڵێن کابرایەک لە مەیدانی جەنگەکەدا هەڵ دەلەرزی، لە کاتێکدا پێشتر بە جوامێری و ئازایەتی ناسرا بوو. لێیان پرسی ئەوە خێرە؟ چیت لێ قەوماوە؟، وەڵامی دایەوە: "ئەوە لە ترسدا نییە وا پەشۆکاوم، هیی ئەوەیە خۆشم نازانم دەبێت چی بکەم، دۆش داماوم". لە دواییشدا خۆی گەیاندە سوپاکەی حوسەین و بووە پشتیوانی[٣٢].

[٣٢] بڕوانە: عباس العقاد، أبو شهداو، لاپەڕە ١٧٦.

هەریەک لە ئێمە، ڕۆژێک لە ڕۆژان، تووشی ئەم جۆرە گرفتە دەروونییە ترسناکە بووینەتەوە. بەڵام بە دەگمەن کەسێکمان تێدا هەڵدەکەوێت، خۆی بخات بەو دیوەدا، کە وادەزانێت حەق لەوێیە، خۆی بگەیەنێتە لەشکرەکە وەک ئەم کابرایە. دنیا شوێنێکی هەڵخەڵەتێنەرە، هەروەک پێشتریش وتمان، بۆیە کەمترین کەسمان دەتوانێت خۆی بگرێت لە بەردەمیدا.

هەندێک لە لێکۆڵەرە دەروونییەکان، هەوڵیان داوە چارەسەری ئەو ململانێ دەروونییانە بکەن، بە هەموو شێوەکانیەوە. بۆیشیان ڕوون بووەتەوە، کە زۆرێنەی خەڵکی دەردەدارن بە دەست ئەم گرفتانەوە، ئیدی کەم و زیادی هەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر. تێبینی ئەوەیشیان کردووە کە لە هەندێک کەسدا پەرە دەستێنێت و دەبێتە لادانان و کێشەی دەروونی.

فرۆید توانیویەتی زۆرێک لەم دیاردەی هیستریا و گرژبوونی دەمار و شڵەژانی کەسایەتییانە، بگەڕێنیتەوە بۆ ئەو بەریەککەوتنە ناوەکیانەی ناو دەروونی مرۆڤ، لە نێوان بنەما سەرەکییە سروشتییەکان و ئەوەی کە نەفسی مرۆڤ داوای دەکات لە ئارەزووە سێکسییەکان. ئەو نەخۆشانەی کە فرۆید چارەسەری بۆ وەردەگرتن، زۆربەیان لە ڕەگەزی مێ بوون. فرۆید هۆکاری ئەمەی دەگەڕاندەوە بۆ ئەو دووڕیانەی کە لەو سەردەمەدا لە بەردەم ڕەگەزی مێینەدا هەبوو. ئەوەی کە لە هەمان کاتدا بڕوای وابوو کە هەوەسی سێکسی، تاوانێکی گەورەیە و لەملاشەوە پاڵنەری بەهێزی نەستی پاڵی پێوە دەنان بۆ پڕکردنەوەی ئەم ئارەزووە بەهێزە.

کۆمەڵگە مۆدێرنەکان، وا خەریکن هێندێک لەم هۆکارانە لەبەین دەبەن، لەو ساتەوەی دەرگایان بەسەر ئازادیی مێینەدا کردووەتەوە، لە ڕووی ڕۆشنبیری و ئابوورییەوە ئاستییان بەرزبووەتەوە،

دەرگایشیان ئاوەڵا كردووە لە بەردەم تێكەڵاوبوونی نێر و مێدا، تا یاری و دانس و سەما پێكەوە بكەن و گرێكوێرەكانیان بكرێنەوە.[٣٣]

ئەم ململانێ ناوەكییە دەگاتە چڵەپۆپە، ئەو دەمەی كە نەریتی كۆمەڵایەتی دەبێتە پێوەر بۆ پێگە و سامان، ئیدی مرۆڤ دۆش دادەمێنێت: كاتێك پێوەرە كۆمەڵایەتییەكان لە لایەكەوە، پاڵی پێوە دەنێن بۆ كۆكۆدنەوەی ماڵ و بەدەستهێنانی پێگە و ڕێگە، لەولایشەوە واعیزەكان جەخت دەكەنەوە كە كۆكردنەوەی ماڵ كارێكی خراپە، خۆشویستنی پلەوپایەیش تاوانێكی قێزەونە.

یەكێكی تر لە سروشتی مرۆڤ: زۆر خێرا كاریگەر دەبێت بەو شتانەی كە دابونەریتی كۆمەڵایەتی پەسەندی دەكەن لە بەها و شتە ئیعتیبارەكان. مرۆڤ خێرا حەز دەكات ئەو شتانەی دەست بكەوێت كە لە بەرچاوی ئەوانی تر بەرز و بڵندی دەكاتەوە. ئەگەر خەڵكی سیفەتێكیان پەسن[٣٤] كرد، ئەوا تاكەكانیش زۆر بە هەڵەداوان هەوڵی پەیداكردنی ئەو تایبەتمەندییە دەدەن و پێشبركێیشی لەسەر دەكەن. بێفەڕترین[٣٥] كۆمەڵگە ئەو كۆمەڵگەیەیە، كە خۆی ڕێوڕەسمێك لە ژیان پەسەند دەكات و واعیزەكانیش بانگەشە بۆ میتۆدێكی دیكە لە ژیان بكەن. (كۆی گشتی كۆمەڵگەمان مەبەستە، ئەوەی كە بەبێ وتن، هەمووی دەزانن كێ ڕێزی هەیە و لەبەر چیش لە ناو خەڵكدا فلان ڕێزی زیاتری لێ دەگیرێت!). لەم كۆمەڵگە دوو دەموچاوەدا، ململانێی

---

[٣٣] گومان لەوەدا نییە، ئەم كۆمەڵگە مۆدێرنانە، لە ئەنجامی ئەم چارەسەرەدا لەمەڕ گرفتی ڕەگەزی مێ، دووچاری هێندێك تازەگرفت بووەتەوە، بەڵام لەو لایشەوە گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی، هەر دەردێك، ئیدی چی ناو دەنێیت، لە دەردی ململانێی دەروونی و دروستكردنی تاكی دوور و كەبتكراو باشترە. وەرگێڕ.

[٣٤] پەسنكردن: بەدڵبوون، دڵلێبوون.

[٣٥] بێفەڕ: بێخێر، خراپ.

دەروونی لە لای هەندێک سەر هەڵ دەدات. لە ئەنجامی بەرگەنەگرتنی بارودۆخەکە، هێندێکیان بڕیاری گۆشەگیری و ڕەبەنی[36] دەدەن. ئەمانە ناتوانن ڕێکخستنێک لە نێوان ئەم دوو پاڵنەرە ناوەکییەدا بەرقەرار بکەن. بۆیە دەیانبینیت سێ-بەردەیان خستووەتە مشتی دنیاوە، چوونەتە ناو پەرستگاکان، یان بورجە عاجییەکانیانەوە و خەریکی گەیشتنن بە نموونە بەرزەکەیان (المثل العلیا). ئەو کەسانەیش کە توانای گۆشەگیرییان نییە، خەریکی ڕێکخستنن لە نێوان ئەوەی کۆمەڵگە دەیڵێت و ئەوەیش کە واعیزەکان بانگی بۆ دەدەن، ناویان لە شتەکەی خۆیان ناوە: دووفلیقانەییبوونی کەسایەتی (إزدواجیە الشخصیە)[37]. ئیدی ئەوکاتە خەڵکەکە دەبینین دابەشبوون بۆ دوو کەسایەتی جیاواز، کەسایەتییەکیان ئەوە دەکات کە واعیزەکان داوای دەکەن، ئەویتریشیان ڕاکەڕاکێتی بە دوای ئەوەی خەڵک و کۆمەڵگە چۆن ڕێزی لێ بگرن لە پەیداکردنی ماڵ و مەنسەب.

شایەنی باسە، مرۆ دوو عەقڵیشی هەیە، عەقڵێکی ئاشکرا و عەقڵێکی پەنهان. ئەو دەمەی ئێمە خەریکی وەعزکردنی کەسێکین، ئەو تەنها بە عەقڵە ئاشکراکەی گوێمان لێ دەگرێت، پەنهانەکەی هەر سەرقاڵی ئەوەیە کە خەڵکی چی دەڵێن و چییان بە لاوە جوان و پەسەندە، سا ئەم بۆ خۆی وەچنگ بخات. کەمێک لەمەوبەریش ئاماژەمان پێ دا، بنیادەم بە چوار پەل کۆششی ئەوەیەتی لەناو خەڵکیدا خاوەن ڕێز بێت، پەنجەی شایەتوومانی بۆ ڕاکێشن (ئەها چەندە بە جاە و جەلالە، چەندە دەست و دڵکراوەیە). خەڵکی لەسەر زۆر شت تەبا نین، بەڵام دوا دنکیان[38] لەسەر خۆشەویستی ناوبانگ و پێگەی کۆمەڵایەتی کۆکن. ئەوە پاڵنەرێکی پەنهانی نێو دەروونی هەر یەکێکە، بیجگە لە

---

[36] ڕەبەن: هاومانا عەرەبییەکەی بریتییە لە "رهبان."

[37] بنوارە: personality، Murphy .

[38] دوا دنك: دوا دانە: هەموویان بە تێکڕا.

تـاک و تەرایەک، کەسـی لـێ قووتـار نابێـت. ئەگەر کەسـێکیش پێـی گوتیت: کە ئەو حەزی لە پێگەی کۆمەلایەتی نییە، ئەو درۆزنە، فێڵت لێ دەکات، دەیەوێ گێژوویژت بکات.

مـرۆ ئەو دەمەی دەبینێـت، گەل و شـارەکەی ماڵومولکیـان خـۆش دەوێـت، خاوەنەکەیشـیان لە لا ڕێـزدارە، ئیـدی دەسـت دەکـات بە ماڵکۆکردنەوە، گوێی لێ نییە لە چی ڕێگایەکەوە، دەی دزێت، دەسـتی بەسـەردا دەگرێت، ڕەشـوە وەردەگرێـت، هەمـوو شـتێک دەکـات بـۆ ئەوەی بگـات بە مـاڵ و سـامان، چـونکە بە جـووتە چاوەکـانی خـۆی دەبینێت کە بە مـاڵ و سـامان چەنـدە گرانقەدر دەبێت لەنـاو خەڵکیدا. بۆیە هەموو هۆکارێک دەگرێتە بەر بۆ گەیشـتن بە ڕێز و حورمەتی خەڵکی. خۆ ئەگەر لەو ساتەدا، واعیزەکان بێن و باسـی لەخواترسـانی بۆ بکەن، ئەوە ناچێتە قوولایی ناو دەروونییەوە، لەبەر ئەوەی عەقڵی ڕووکەشـــی، بەم جـــۆرە ئامۆژگارییـــانە، هەر لە شـــیرەخۆرییەوە ئاخنراوە. لەوانەیە ئەمیش بێت و قسەکان ئەزبەر بکات و بیڵێتەوە بە کەسـانی دیکە، بەلام بـۆ خـۆی هێندەی بـاڵە مێشـوولەیەک جێکەوتـی نابێـت تـا ئەو سـاتەی لە کۆمەڵگەکەیـدا پـێچەوانەکەی بە چاوەکـانی خۆی ببینێت. بەم مانایەش بێت، ئیدی ئەم تاکە دەبێتە تـاکێکی خـاوەن دوو کەسایەتی، ئەم جۆرەیش لە دوانەیی لە کەسـایەتیدا، لە هەنـدێک حاڵدا لە دووڕوویـی جیـاوازە، مونـافیق (دووڕوو) لە قسـەیدا، یـان لە کاریــدا دوودیــوە، پاشـــان خۆیشـــی دەزانێــت کە دوودیــوی هەیە، دواتریش بەو دووڕووییەی کارێک دەکات، ئیدی یان خۆی لە کەسێک نزیک دەکاتەوە، یان دەیەوێت شتێک بەدەست بهێنێت. بەلام دووفـاقی لە کەسایەتیدا (ازدواج الشخصیە)، خـۆی بە خـۆی نازانێت کە وایە و نایشیەوێت بزانێت. لە ڕاستیدا ئەو دوو دەموچاوی هەیە، بە یەکێکیـان دڵی واعیزەکان ڕازی دەکات، بەوی دیکەیش دڵی خەڵکی دەهێنێت بە

لای خۆیدا. خۆ ئەگەر بێت و کەسێک پێی بڵێت تۆ وایت، ئەوا نکوڵی دەکات، لەوانەیشە دەست بکات بە نەڕەنەڕ و هاوار. گرفتەکە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت، کە هەموو دەیانەوێت لەو ململانێ دەروونییە هەڵبێن، نایانەوێت دانی پێدا بنێن، تا نەبادا هەست بە دووفاقی و دوو ئاراستەیی لەناو دەروونیدا بکات.

من لە پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، تێبینی ئەوەم کردووە، کە عەرەب لە هەموو قەومێکی دیکە پتر دووفاقن. لەوانەیشە هۆکاری ماکی[39] ئەمەیش بریتی بێت لەوەی کەوتوونەتە بەردەم دوو شەپۆلی پێچەوانەوە، ئەوانەیش بریتین لە "کۆچەری" و "ئیسلام". ئەوان لە سەرەتای ژیانیاندا لە بیاباندا دەژیان، دواتریش ئیسلام هات کە پێکهاتووە لە چەندین ڕێنمایی، کە پێچەوانەیە لەگەڵ دابونەریتی کۆنی دەشت و سەحرادا[40]. نەریتی خێلەکی و دەشت، جەخت لەسەر خۆبەگەورەزانین و حەز لە پلەوپایە و خۆهەڵکێشان بە بنەچە و عەشیرەتەوە دەکات، بەڵام ئیسلام ئاینی خاکیبوون و پارێزکاریی و دادپەروەریی و ئەم شتانەیە.

لەوانەیە زیادەڕەوییم نەکردبێت ئەگەر گوتبێتم: عەرەبێک لە عەقڵی پەنهانیدا دەشتەکییە و لە عەقڵی ڕووپۆشیشیدا موسوڵمانە. لە کردەوەکانیدا پەسنی هێز و خۆهەڵنان و گەورەیی دەکات، لە کردەوەکانیشیدا وەعزی خەڵکی دەکات بە یەکسانی لە نێوان خەڵکی و تەقوای پەروەرێن. لەم قسەیەمدا گشتاندن بۆ کۆی عەرەب ناکەم. من دەڵێم دووفاقی کەسایەتیی لەو ناوچە عەرەبنشینانەدا زیاترە کە کۆچەریین و پیاوانی ئاینی زۆریشیان هەیە. لەم نێوەندەشدا

[39] ماك: بنچینە، شت یان شوێنی سەرەکی.

[40] بڕوانە: احمد امین، فجر الاسلام، الباب الثانی، الفصل الاول.

عێراقییەکان لە هەموو ناوچەکانی تر زیاتر ئەم سیفەتەیان تێدا زەق بووەتەوە. ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: عێراق هەر لە دێرزەمانەوە و ئێستایش، شەپۆلگەلێکی چادرنشینی بەهێزی بە خۆیەوە بینیوە، زیاتر لە هەر ناوچەیەکی دیکەی عەرەبی. عێراق ناوچەیەکی تەخت و خاکێکی بەفەڕی هەیە[41]، ئەمە وای کردووە کۆچەری زۆر ڕووی تێ بکەن. هەر بۆیە کۆمەڵگەی عێراقی لەژێر کاریگەریی کۆچەری و چادرنشینەکاندایە زیاتر لە هەر ناوچەیەکی دیکە -بێگومان بە هەڵاوێرد[42]کردنی کۆمەڵگەی نەجد.-

هۆکاری دووەم: عێراق، هەر لە سەدری ئیسلامەوە، جێگا و سەرچاوەیەکی دیاری فیرقە و مەزهەبە ئاینییەکان بوو. تێیدا مەنتیقزانەکان، ئەربابی زانست و فەلسەفە گەشەیان کردووە، لە پەنا ئەمانەیشەوە دەنگی واعیزەکانیش زوڵاڵ بووە. ئیتر عاجباتیت لێ نەیەت، ئەگەر دەغەزی[43] دووفلیقانەیی لە کەسایەتی تاکی عێراقیدا وەک ڕۆژی نیوەڕۆ ببینرێت لە زۆربەی دانیشتوانەکەیدا.[44]

ئەو قسەیە ڕاستە کە دەڵێت: "دووفلیقانەیی لە کەسایەتیدا کەم دەبێتەوە بە دوورکەوتنەوە لە بیابان و ڕووکردنە شار و باژێران". هەر بۆیە لەم ڕێگەیەوە دەتوانین پلەبەندی وڵاتە عەرەبییەکان بە

[41] بەفەڕ: بەپیت.
[42] هەڵاوێرد: بێجگە لە، ئیستیسنای عەرەبی.
[43] دەعەز: دەرد: نەخۆشی.
[44] بڕوانە: علی الوردی، شخصیه الفرد العراقی، لاپەڕە ٣٩ و دواتر.

دوور و نزیکییان لە بابانەوە بکەین، ئەوەی کە چەقی کۆچەریی و دەوارنشینەکانە[٤٥].

بیریارەکانی عەرەب، وەعزی زۆریان بەحەوادا[٤٦] هەڵداوە، نەیانتوانیوە بە وەعزەکانیان، یەک تۆزیش لە واقیعی ئەو خەڵکە نزیک ببنەوە کە تێیدا دەژین. هەر بۆیە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان واقیع و ئەوەی کە لە وێنە نموونەییەکەدا بیری لێ دەکەنەوە. زۆرجاران واعیزێک لەناو کۆمەڵێک پیاوی عەشایەردا، خەریکی وەعزی خەڵکە لەسەر تەقوای خوا و دادپەروەری نێوان خەڵک و خاکیبون، کەچی پاش کاتژمێرێک، خەریکی سیخورمە کردنە[٤٧] بە یەکێکەوە و هەڵی دەنێت تا بڕوات خوشکەکەی بکوژێت لەبەر ئەوەی باسی بە خراپە ڕۆیشتووە، یان ئەوەتا پیتک[٤٨] دەنێت بە کەسێکی ترەوە و پێی دەڵێت: "خەسێنراوی بێغیرەت"، ئەمە لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی زللەیەکی بە دە زللە وەڵام نەداوەتەوە. پیاوێک دەناسم، ئایندار و شەونوێژچی، هەموو دەم خەریکی تەسبیحات و خوێندنەوەی کتێبی فەرموودە و گوێگرتنە لە وەعزی واعیزان، کەچی لەولاشەوە عەشایەرێکی عەیارە بیستوچوارە لە بەها کۆمەڵایەتییەکاندا. ڕۆژێکیان بە یەکدی گەیشتین و باسی ئەو بەرگرییانەی بۆ کردم، کە لە جەحێڵانی عەشرەتەکەی خۆی کردووە، بە شێوەیەک، کە خۆی پێوە هەڵدەنا و شانازیی بەو بەرگریکردناوە دەکرد. دەیگوت فڵانەڕۆژ چۆن لە دەستی پۆلیس

---

[٤٥] خوێنەر لە کتێبەکەی دواترماندا (العراق و قیم البداوه)، زانیاری فراوانتر لەسەر سروشتی عەرەب بەگشتی و خەڵکی عێراق بەتایبەتی دەخوێنێتەوە.

[٤٦] حەوا: ئاسمان.

[٤٧] سیخورمەپێوەرکردن: تێژەنینی لای کەمەر، ئەها یەکێک دەیەوێت یەکێکی دیکە هەستێنێتەوە بۆ کارێك، هەر لەپەستا تێی دەژەنێت سا بەڵکوو هەستێتە سەر پێ.

[٤٨] پیتك‌پێوەنان: ناوناتۆرەلێنان.

ئازادی کردوون بە بەرتیل. هەروەها چۆن دزینەکانیان لای ئەم قاییم کردووە و خاوەنماڵەکانیش چۆن دێن مەمنوونی قۆندەرەکانی دەبن، دەلالێنەوە لە بەردەمیدا، سا بەڵکە لەڕێی یەزدان ماڵەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەمیش چۆن لە بەردەمیاندا فیز دەکات و فوو دەکاتە خۆی ، باسی مەزنی و ناوبانگی باب و باپیریان بۆ دەکات.

لە یەکێک لە کۆبوونەوە عەشایەرییەکاندا، کابرایەکی عەشایەرم دیت، هەر خەریکی وتنەوەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بوو، کە باسی ڕەحمکردن بە خەڵک، یەکسانی و دادپەروەریی دەکەن، دەنگی بەرز کردبووەوە، هاوار لەسەر هاوار. دواتر هەواڵم زانی، ئەم کاکەیە، هێندە تووڕە و کەم جیقڵدانە لەو دەمەی کە تووڕە دەبێت، مەناعەتی نییە ئەو خوێنە برژێنێت کە پێغەمبەر لە فەرموودەکانیدا نەهی لێ کردووە. ئەم جۆرە کەسانە، نموونەی هەرە ئاشکرای دووفلیقانەیین لە کەسایەتیدا. عەقڵی ئاشکرای لەگەڵ وەعز و خۆشەویستی ڕەسوولی خودا و دووبارەکردنەوەی فەرمایشتەکانیدایە، بەڵام عەقڵە ناوەکییەکەی، دەشتەکییەکە، کە لە بارەی ئیسلامەوە هیچ نازانێت بێجگە لە "شایەتوومان" و "سجود و رکوع". بێگومان بەم دووفلیقانەییە لە کەسایەتییدا، خۆی لە ململانێ دەروونییەکان ڕزگار کردووە.

ئەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە، کە بووەتە هۆی سەرهەڵدانی دووفاقەیی لە کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا، مێژوویەکی دێرینی هەیە و بە چەند قۆناغدا تێپەریوە. ئەو تۆو و کێڵگەیەی کە ئەم گۆڕانە کۆمەلایەتییەی تێدا شین بوو، هەروەک پێشتریش باسمان کرد، بریتییە لەو پارادۆکس و بەریەککەوتنانەی نێوان بەها ئیسلامییەکان و بەها خێڵەکییەکان. بەهاکانی ئیسلام و خێڵەکی لە بنەڕەتدا پێچەوانەن، بەڵام ئەم پارادۆکسانە لە سەردەمی پەیامبەر و ئەبوبەکر و عومەردا

دەنگۆیـان نەبـوو، ئەمەش لەبەر بەردەوامـی جەنـگ و تێکۆشـان دژی بێگـانە و عەجەمـان، ئامانجەکەیـانی یەک خسـتبوو، هەمـوو سـەرقاڵی دامەزراندنی دەوڵەت و فتوحات و غەزا بوون.

سروشتی خێڵەکان سروشتێکی شەڕەنگێزانەیە، چادرنشینێک، هیچ لە دنیـا نازانێـت بـێجگە لە "هێزوبـازوو"، "جەربەزەیـی" و "بەرانـبەر شکاندن"، بێگومان ئەمەش پەلکێشی دەکات بۆ خۆشویستنی کورسی، پلەوپایە، ئاغایەتیی و بوونە قەڕاڵ[٤٩]. ئەوە وەک ڕۆژی ڕۆشن دیارە کە دەشتەکی سەری بۆ ئاشووب و جەنگ دەخوری هەمیشە، لەچەرە، ئەگەر لە بێگانە دوژمن پەیدا نەکا، بەردەبێتە کوڕە مام[٥٠] و پلک[٥١] و خـاڵ. ئەوەتـا قوتـامی، شـاعیری بەناوبـانگی جـاهیلی، هـۆنراوەیەکی بەناوبانگی هەیە، تێیدا ئێژێت:

وَمَن تكُنِ الحضارةُ أعجَبَتهُ

فأيْ أناسِ باديةِ تَرانا

وَمَن رَبَطَ الجحاشَ فإنَّ فينا

قناً سُلباً وأفراساً حِسانا

وكُنَّ اذا أغرنَ على جَنابٍ

وأعوَزهُنَّ كوزٌ حيث كانا

أغرنَ من الضَّبابِ على حَلالِ

وضبة إنَّهُ مَن حانَ حانا

وأحياناً على بَكرٍ أخينا

إذا ما لم نَجِد إلا أخانا

---

[٤٩] قەڕاڵ: پاشا.
[٥٠] ئاپ: مام، ئاپۆ: مامۆ، مامە.
[٥١] پلك: پوور.

((بە کورتی و پوختی باسی ئەوە دەکات کە هەر کەس شارنشینی بەلاوە جێگەی سەرنجە، با کەمێك بێت و تەماشای ئێمەی دەوارنشین بکات، بزانێت چیمان هەیە لە ئەسپ و شمشێری تیژ. با ئەوکاتە بێت کە دەدەین بەسەر هۆزێکی دیکەدا و پێخۆری نێوارەیان بۆ ناهێڵینەوە، هەمووی وەك غەنیمەت دەبەین، خۆ ئەگەر ماوەیەك تێپەڕی و شەڕمان نەکردبوو، ئەوا بەر دەبینە برای خۆمان، چونکە ئێمە بەبێ ئاژاوە ناتوانین دابنیشین)).

لەمەوە ئەوە تێدەگەین کە خەڵکی کۆچەر و بیباننشین، جەنگ و کوشتار بووەتە بە شێکی دانەبڕاو لە لاشعوریاندا، خەلاسییان لێی ئەستەمە، بە شرۆڤەی پرۆفیسۆر "فیلیپ": "بابەتی کوشتوبڕ لای بیابانشین، بووەتە شتێکی عەقڵیی زگماک، یانی سەحرانشین، هەمیشە لە بەردەم هێرشی لە برساندا مردنە، بۆیە جەنگ و قاقڕکردن وەک پشتێنەیەکی سەلامەتییە، تا دانیشتوان زیاد نەکەن. بەم هۆیەوەیە تۆڵە و خوێنڕێژی بەهێزترین سیستەمی ئاینی و کۆمەڵایەتییە لە لایان"[٥٢]. زۆر ئاشکرایە، ئەم سروشتە دەشتەکییە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ناتەبایە. ئیسلام داوای دلۆڤانی، نەرمونیانی، پارێزگاری و یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا دەکات. سروشتی بیابانشینیش ناتوانێت ببێتە مسوڵمانێکی ڕاستەقینە، مەگەر تەنها لە چەند ڕوویەکەوە، ئەو لایەنانەیش ئەو کاتانەیە کە دەکەونە جەنگ و شەڕەوە لەگەڵ نەیارەکانیاندا. ئیسلام لە چاخی پەیامبەر و ئەبوبەکر و عومەردا سەرقاڵی جەنگی فارس و ڕۆم بوون، ئیدی سەحرانشینێک، بەم جەنگ و شەڕانە توانیبووی هەردوو ئاراستە

[٥٢] Hitti, history of the ababs, p.٨٩.

پێچەوانەکە لە گەیشتن بە ئامانجێکدا کۆ بکاتەوە، ئەویش سەرکەوتن و جەنگانە لەگەڵ دوژمنی خۆی و خودادا.

موحەمەد (دخ)، یەکەمین کەسێک بوو لە مێژوودا توانی هۆزە ڕقئەستوورەکان لە دەوری یەکدی کۆ بکاتەوە، ئاڕاستەیشیان بکات بەرەو جەنگی فارس و ڕۆم. ئەمە لە کاتێکدا بوو، بەر لە موحەمەد(دخ)، هۆزەکان بەربووبوونە نێزەی یەکتر، کەچی ئێستا هەموو دوژمنێکی هاوبەشیان بۆ پەیدا بووە و لە دژی دەجەنگن. ئەم حەزی جەنگەیان کە هەر لە دێرین زەمانەوە تێدا بوو، هەر تێدا مایەوە و سوودێکی مەزنیان لێ وەرگرت لە بەرانبەر دوژمنێکی هاوبەشەوە و توانیان ئیمپراتۆرییەک لە هەرە ئیمپراتۆرییەکانی مێژوو دامەزرێنن.

بەڵام ئەو دەمەی فتوحات وەستا، هەر وەک جارانی دەوارنشینی بەربوونەوە یەکتر.

لە بێبەخت و ئیقباڵی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان، فتوحات لە سەردەمی ئەودا وەستا، خۆ ئەگەر نەوەستایە، ئەگەری زۆر زۆر بوو ئەو ڕاپەرینە سەرتاسەرییە ڕووی نەدایە کە هەموو کۆمەڵکەی ئیسلامی لەرزاند[53]. لەو کۆڕبەندەی کە هەموو کۆبووبوونەوە لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفان، بۆ چاککردنی بارودۆخەکە و کوژاندنەوەی ئاوری فیتنە بەر لە تەشەنەسەندنی، عەبدوڵڵای کوڕی عامیر، کە یەکێک بوو لە والییەکانی هەستایەوە و گوتی: "ڕاوێژی من بۆ جەنابت، ئەی خەلیفەی مسوڵمانان، ئەوەیە: فەرمانیان پێ بکەیت بە

---

[53] لەمەڕ ئەم ڕاپەرینە مەزنە کۆمەڵایەتییە دەدوێین لە کتێبی داهاتووماندا بە ناوی (منشأ الحركات الاسلامیە فی الاسلام).

جیهاد تا مەشغوڵ بن، چەشەیشیان[٥٤] بکەیت بە دەسکەوتی جەنگ، تا ملکەچت بن، ئەو دەمە کەسیان نایان پەرژێتە[٥٥] سەرت، تەنها لە بیری خۆیانــدا دەبـن".[٥٦] لەوانەیە ئەم ڕاوێــژەی ئیـبن عــامیر پێشکەشـــی خەلیفەی کردووە، تاکە ڕاوێژی کردارەکی بێت کە بتوانێت ئەم فیتنەیە دامرکێنێتەوە. بۆیە حەجاج توانی سوود لەم ڕاوێژە وەرگرێت، ئەو دەمەی قەڵەمڕەوی عێراقی لە بندەست بوو. لە وتارە بەناوبانگەکەیدا لە دەستپێکی ویلایەتەکەیەوە گوتی: "سوێندتان بۆ دەخۆم. بەڵێنێک نادەم نەیبەمە سەر، هیچ شتێک بنیات نانێم، تا شتێک نەڕووخێنم، جا وریای ئەم گرووپ گرووپێنەیە بن، قسە و قسەڵۆک زۆر دەبیستم کە گوایە خەریکی چی کەتنێکن لە ژێرەوە... سا بە خودای ئاسمانەکان یان ئەوەتا وەکو بەشەر ڕێک و ڕاساڵ دەبن، یان وەها بە برینەکانی لەشتانەوە مەشـغوڵتان دەکەم، مەرگـی خۆتـان بە خەڵات بـزانن، جـا کـوڕم دەوێت و لە مـاوەی ٣ ڕۆژدا نـاوی لە سـوپاکەی موهەللەبـدا تۆمـار نەکردبێـت، ئەوسـا مـن و ئێـوە، ئەگەر خـوێنم نەڕژاند و مـاڵم نەکردە غەنیمەت، مـن هیـچم لە دنیـا نەزانیبێت"[٥٧]. خەڵکی عێراق ئەم وتـارە جەحەنـدەمییەیان بە گـاڵتە وەر نەگـرت، دەتبینـین بە خێرایـی چوون و خۆبەخشانە پەیوەندییان دەکرد بە سوپاکەی "موهەللەبی و کوڕی ئەبـو سـەفرە"وە. مەهەللەبیش فتوحـاتێکی فراوانـی پـێ کـردن لەودیو ڕووبارەوە (ماوراو النهر). دواتر خەڵکی عێراق ئیسـراحەتیان کرد، پاش ئەوەی لە ناوچە ئازادکراوەکانەوە سەربازی دیکەیـان پێوە لکا.

---

[٥٤] چەشـەکردن: شتێك دەدەیت بە کەسێك تـا نـمەك بیگرێـت و نـەتوانێـت بەرامبـەرت نـامەردی بکـات.

[٥٥] نـەپەرژان یـان نـەپەرژینـە سەر شتێك، واتـە مەجالـی ئـەو شتـەت نـەبێت.

[٥٦] عبـاس العقـاد، عبقریـە الإمـام لاپەڕە ٧٢- ٧٣

[٥٧] الجـاحـج، البیـان والتبین، ج٢ ص٢٤٧ – ٢٤٨

لەوانەیە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان نەیتوانیبێت ئەو سیاسەتەکەی ئیبن عامیر پێی گوت، جێبەجێی بکات. وایش هەست دەکەم هۆکارەکەی ئەخلاقی نەرم و سروشتی دوور لە شەڕی عوسمانی کوڕی عەفان خۆی بوو، وای لێ کرد بە گوێی نەکات. "ئەوەیشی کە زیاتر قورەکەی خەستتر کردبوویەوە ئەوە بوو، کە عوسمانی کوڕی عەفان لەناو عێل و عەشرەتەکەیدا خۆشەویست بوو، بە جۆرێکیان خۆش دەویست کە هەستی پێ دەکرا. ئەو خزم و خوێشانەیشی، لەوانە بوون کە پاش فەتحی مەککە هاتبوونە نێو ئیسلامەوە، وەک بڵێیت بە تەواوەتی ئیمان نەچووبوویە ناو کون بە کونی دەروونیانەوە، بۆیە زۆرێک لە شوێنە سەرەکییەکانی دەوڵەتیان قۆرخ کردبوو"[58]. بەهۆی ئەمەیشەوە تەڕ و وشک پێکڕا سووتێنران.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وەسفێکی حەکیمانەی هەیە بۆ خزمانی عوسمانی کوڕی عەفان و شۆڕشگێڕەکان. مانای ئەوەی عەلی گوتوویەتی ئەمەیە: ئەوان بۆ خۆیانیان قۆرخ کرد، قۆرخکردنێکی خراپ، ئەمانیش ڕاپەڕین و توورەبوون، بە شێوەیەکی خراپ. ئەمەیش مانای وایە ئەم شۆڕشە دوو پاڵنەری هەبووە: یەکەم، بەشێک لە قۆرخکاری لە لایەن والییەکانەوە، دووەمیش زیادەڕۆیی و خۆبەشیاوزانینی ڕەعیەت و خەڵکەکەیش لەولاوە. ئەوەی ڕاستی بێت، هەموو شۆڕشێکیش بەهۆی ئەم دوو هۆکارەوە سەرچاوە دەگرێت. لایەک دەستدرێژی دەکات و لایەکەی تریش دەست دەکات بە تۆڵەسەندنەوەیەکی زۆر پیس.

کەسی یاخیبوو هەمیشە پێویستی بە دوو پاڵنەر هەیە: یەکێکیان عەقڵی و ئەوی دیکەیشیان عاتیفی. لە شۆڕشەکەی عوسمانی کوڕی

[58] Gilmanm، the Saracems، p.٣٦٦.

عەفاندا، پاڵنەری عەقڵی بریتیی بوو لەو چەمکانەی کە هاوەڵان و خوێنەرانی قورئان و لەخواترسان، باسیان دەکردن لە عەدالەت و زوهد و یەکسانی. هەرچی پاڵنەری عاتیفی و سۆزداریش هەبوو، بریتی بوو لە: سروشتی شەڕەنگێزی، ئەوەی لە خوێنی چادرنشینیاندا خۆی مەڵاس داوە، ئەوەی کە ئەگەر دووژمنێکیان دەست نەکەوێت، براکەی خۆیان دەکەنە دوژمن تا بێکار و عەلـلاف نەبن، وەک لە شیعرەکەی قوتامیشدا باسی دەکات.

یاخیبوان لۆمەی عوسمانی کوڕی عەفانیان لەسەر هەندێک شت دەکرد، کە عومەر لە سەردەمی خۆیدا ئەنجامی دەدان. دەگێڕنەوە جارێکیان سەرکەوتە سەر مینبەر و گوتی: "... ئینجا سوێندم بە پەروەرێنتان، ئێوە پیتکم[59] لەسەر شتانێک پێوە دەنێن، کە ڕازی بوون عومەر بیانکات، بەڵام ئەو بە پێیەکانی لەقەشێلی[60] دەکردن، بە دەستەکانی میرازی[61] دەگرتن، بە زووبانی دەیشکاندن، ئێوەیش لە حەیبەتان[62] ملتان بۆ خووس دەکرد و نەتان دەوێرا فزە بکەن. بەڵام من نەرمونیانم لەگەڵتان، شانم بۆ ڕاخستوون، دەست و زمانیشمم لێ گرتوونەتەوە، بۆیە ئاوا زاتتان هەیە لە بەردەممدا دەم بکەنەوە."[63]....

ئەم قسەیەی عوسمانی کوڕی عەفان لە دیوێکەوە ڕاستە، چونکە عوسمانی کوڕی عەفان لە ڕەفتاری و کەسێتییدا جیاوازییەکی وای نەبووە لەگەڵ عومەردا، هەر بەڕاستی باسی دەکەن کە ئیماندارێکی سالح بووە، بەڵام لایەنگری خزمانی زۆر بە ئاشکرای کردووە. خەڵکیش حەز ناکەن گەورە و پێشەنگەکەیان بە لای هیچ مرۆڤێکدا

---

[59] پیتك: تانەلێدان.
[60] لەقەشێل: نانەژێرپێ.
[61] میرازگرتن: دارکاریکردن.
[62] لەحەیبەت: لەترس.
[63] بنوارە تەها حوسەین: الفتنە الکبری، بەرگی دوو، لاپەڕە ٢٠٤ – ٢٠٥

دای بتاشن، ئیدی ئەو کەسە هەر کەسێک بێت. سەرگەورەی دووربین ئەوەیە، خۆی لە بچووکترین دڵتەنگی و گومان بپارێزێت.

عومەر لەگەڵ خۆی و کوڕەکەی خۆیدا توند بوو بەر لەوەی لەگەڵ خەڵکیدا توند و سەختگیر بێت، بۆ خۆی ئەم کارە لەناو خەڵکیدا جێکەوتێکی تایبەتی هەبوو. بنیادەم کاتێک دەبینێت ئاغاکەی لەگەڵ کوڕوکاڵی خۆیدا توندە، بێگومان ئەمانیش بەرگەی توندی ئاغایان دەگرن، هەموو کاروبارێکی ئاغایش بە شێوەیەکی جوان ڕاڤە و شرۆڤە دەکەن. بەڵام ئاغایەک بێت بە دڵودایەنی کەسوکاری خۆی و لە کاروباردا بیانخاتە پێش خەڵکی بێگانەوە، ئەو ئاغایە هەرچەندیش دەروونخاوێن و نییەتپاک بێت، خەڵکی زمانی خێری بۆ ناچەرخێنن. خەڵکی لەسەر کارە ڕووکەشەکان بڕیار لەسەر چاک و خراپی گەورەکانیان دەدەن. هەرکارێکیش ئەم سەرگەورەیە هەستێت بە کردنی لە سوود و بەرژەوەندی خۆی و خزمانی، زۆر بە خێرایی بە دەرگا و پەنجەرەی ماڵاندا دەچێتە ژوورەوە و هەموو عالەمەکە دەیزانن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش موبالەغە و درۆی زیاتری پێوە دەلکێنرێت. عوسمانی کوڕی عەفان پاساوێکی شەرعی هەبوو لە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە دەیانگوت، بۆچی ئەبا بەکر و عومەر بە لای خزمانی خۆیاندا نەدەرۆیشتن، کەچی تۆ دەڕۆیت؟ ئەویش دەیگوت: ئەوان لەبەر خاتری خودا نەیان دەکرد، من لەبەر خاتری خودا خەمی کەسوکارم دەخۆم.

دەگێڕنەوە کە عوسمانی کوڕی عەفان لە زەماوەندی کوڕەکەیدا، دووسەد هەزار درهەمی داوە بە بووکەکەی. کلیلداری بەیتولماڵیش هات بە گریانەوە (زەیدی کوڕی ئەرقەم) ڕەخنەی لە کارەکەی گرت و تکای کرد دەستلەکارترازانی بۆ واژۆ بکات. عوسمانی کوڕی عەفان بە واقی وڕماوەوە تەماشای کرد و گوتی: "ئەوە بۆ ئەوە شین دەکەی

کوڕی ئەرقەم، ئایا خزمایەتیت پچڕاندووە؟"، وەڵامی دایەوە گوتی: (نەخێر ئەی گەورەی مسوڵمانان، بەڵکوو بۆ ئەوە دەگریم، وامزانی ئەمەت لە جیاتی ئەو ماڵەدا بردووەتەوە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(د.خ) بەخشیبووت. سوێندم بە پەروەرێن، ئەگەر سەد درهەمیشت بدایەتێ، هێشتایش هەر زۆر بوو). عوسمانی کوڕی عەفان لەم قسەیەی ڕقی هەستا و پێی گوت: "کلیلەکان دانێ با بیدەم بە کەسێکی دیکە ئەی کوڕی ئەرقەم."

ئەم سیاسەتی "خاترگرتن و خزمایەتییە" کە عوسمانی کوڕی عەفان لێی دەوەشایەوە، خەڵکی لە خۆی پڕکردبوو. بۆشاییەکی لە نێوان خۆی و ڕەعیەتەکەیدا دروست کردبوو. خەڵکی وایان لێهاتبوو، هەر کارێکی دەکرد، ئەمان بە شێوەیەکی خراپ لێکدانەوەیان بۆ دەکرد. عوسمانی کوڕی عەفان لە زۆرێک لە کارەکانیدا، خێر و بەرژەوەندی خەڵکەکەی لە بەرچاو دەگرت، بۆ نموونە: "فراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەری خودا"، " کۆکردنەوەی قورئان"، "بەخششی زیادە بە خەڵک"، "ناردنی شاند بۆ شارەکان" و هیی تریش، بەڵام خەڵکەکە دەیان گوت خەریکی کاری زیانبەخشە و لەسەر کارەکانی توانجیان لێ دەدا. تەنانەت لە کاتی بەرینکردنی مزگەوتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت)، دەیانگوت: "بنوارە خەریکی فراوانکردنی مزگەوتە، وازی لە سوننەتی پێغەمبەر هێناوە و خەریکی بیدعەیە."

ئەوەی کە لەم بابەتەدا نامۆیە، قسەکەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە، ئەو پیاوەی بە دووربینی ناسرابوو، هات و بە عوسمانی کوڕی عەفانی گوت: "... ئەگەر تۆ خۆتت بۆ خەڵکی تۆمەتبار کردووە، ئەوا خەڵکیش بۆتۆ خۆیان تۆمەتبار کردووە، ئەگەر ئەوان دەیانەوێت لە چنگت دەری بهێننەوە، ئەوە پێشتر تۆ لە چنگی ئەوانت دەرهێنا بوو... ئەم کارە هیچ عەیبێکی تێدا نییە". ئەم قسەیەی

عەباس، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەو گرفتە کۆمەڵایەتییەی کە عوسمانی کوڕی عەففان پێوەی دەیناڵاند. ئەوە کەلێنێکی دەروونییە، ڕۆژ بە ڕۆژیش لە تەشەنەدایە، هەر کارێک عوسمانی کوڕی عەفان پێی هەستێت، خەڵک ڕاڤەی هەڵەی بۆ دەکەن، خەڵکیش هەرشتێک بە عوسمانی کوڕی عەففان بڵێن، ئەم بە هەڵە لێکدانەوەی بۆ دەکات. ئیدی لێرەوە یەکەم دەرکەوتەکانی ململانێ لە نێوان گەل و دەسەڵاتداراندا خۆی نیشان دا.

بەڵام لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا شتەکە بە جۆرێکی دیکەبوو. هەرچەند عومەر هەڵەیشی هەبوو، پەرگیریشی تێدا دەبینرا، بەڵام هەر خەڵکەکە سوپاسگوزار بوون، ڕێزیشیان لێ دەگرت بە هەر جۆرێک بوایە. لە نێوان عومەر و ڕەعیەتەکەیدا، هەماهەنگییەکی دەروونی زۆر قووڵ هەبوو. نهێنی ئەمەیش ئەوەبوو، عومەر زۆر عادل بوو، لە هەمان کاتیشدا زاهید. دەڵێت ڕۆژێکیان بیستی، یەکێک لە کوڕەکانی مەیی نۆشیوە، فەرمانی دەرکرد بە فەلاقەکردنی و کوڕە مرد، هەواڵەکە لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، تا خەڵکی هێندەیان زیادەڕۆیی و موبالەغە تێدا کرد، عومەریان خستە ژووروودی گومان و شوبهەوە، خۆ ئەگەر کەسێک گازەندەی لە عومەر کردبا، خەڵکەکە دەیان نەڕاند بە سەریدا: "دەمت داخە.... ئەگەر عومەر وەک ئەوە بوایە کە تۆ دەیڵێیت، ئەوا لە کوڕەکەی خۆی خۆش دەبوو، جەرگی خۆی نەدەسووتاند". بەم کارەیش حاکم و ڕەعیەت بووبوونە یەک جەستەی بێ کەلەبەر. کۆمەڵگەیەکی بتەویان پێک هێنابوو.

ئەگەر کەلێن کەوتە نێوان حاکم و ڕەعیەتەوە، ئەوا تەنها بە شتێکەوە داناسەکنێ، بەڵکوو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر پەرە دەستێنێت، هەر یەک لە لای خۆیەوە ناوناتورە لەوی دیکە دەنێت و بانگ و سەڵای شەڕ و دوژمنایەتی بەرز دەکەنەوە. ئەو کەلێنەی کە دەکەوێتە ئەو

نێوەندەوە، هێندە کەلێنێکی مەجازی و ئیعتیبارییە، هێندە کەلێنێکی ڕاستەقینە نییە. ئەمەمان بە دووچاوی خۆمان لە حکومەتی ئێستای عێراقدا بینی. ئەم حکومەتە هەرچییەک بکات، خەڵکەکە بە هەڵە لێکدانەوەی بۆ دەکەن، ئەمەیش لەبەر ئەوەیە، خەڵکەکە خۆشە بوون لەسەر بینینی سەرکردەکانیان کە هەر بە لای خزم و کەسی خۆیاندا دای دەتاشن. هەر کەلێنێکی دەروونی لە نێوان دەسەڵات و گەلدا دروست ببێت، دوور یان نزیک پەل دەهاوێت بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش و ڕاپەڕین. ئەم جۆرە کەلێنەیش لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا دروست بووبوو، عوسمان هەرچەندی هەوڵ و کۆشش دا، لە خەڵکەکەی نزیک بێتەوە، بارودۆخەکە هێور بکاتەوە، خزم و کەسەکەی دەبوونە بەربەست و ڕێسەکەیان لێ دەکردەوە بە خوری.

کوشتی عوسمانی کوڕی عەفان بووە پاڵنەر و بەڵگەیەک بە دەست خزمەکانیەوە، تا شۆڕشەکە تەفرە بدەن بەر لەوەی بگاتە ئامانجەکانی خۆی. ئەمەوییەکان، کراسەکەی عوسمانیان لەسەر مینبەرەکان بەرز دەکردەوە و وەک دروشمی بزوتنەوە پەکخەرەکەیان. ئەم کراسەی عوسمانی کوڕی عەفان لە مێژوودا ناوی دەرکرد، گەیشتووەتە ئاستێک کە نموونەی پێ دەهێنرێتەوە لەو شوێنانەی کە کەسێک بە قسەیەکی جوان دەیەوێت بگاتە ئامانجێکی خراپ (کلمە الحق فی سبیل الباطل). کۆمەڵێک شۆرش لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا ڕوویان دا. بەڵام ئەمەوییەکان هەر بەردەوام بوون لەسەر ئەو شتانەی کە لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا خەریکی بوون لە قۆرخکاریی دەسەڵات و فیزکردن بەسەر خەڵکیدا. ئەمەوییەکان پێڕەوییان لە یاساکانی بیابان دەکرد لە دەسەڵاتداریدا. هەر بۆیە فەقیهـ و زاهیدەکان، بە ڕێنماییە سەرەتاییەکانی ئیسلامەوە خەڵکیان لە دژ هان دەدان و دەیان ویست لە شان و شەوکەتیان بدەن.

ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی بۆ شۆڕشە یەک لە دوای یەکەکان بکەین، ئەوا ڕێک گوزارشتە لەو ململانێ دەروونییەی ناو خەڵک کە بەرانبەر دەسەڵاتدارەکانیان هەیان بوو. خەڵکی ئەو دەم و ساتە بە توندی گرفتاری ململانێی دەروونی بووبوون. لە کونی ناو دەروونیاندا هێشتا هەر چادرنشین بوون، لەملاشەوە داوایان لە سەرگەورەکانیان دەکرد، دوای پەیامەکانی ئیسلام بکەون. بە مانایەکی دیکە ئەگەر بیڵێم: دڵیان هەر دەشتەکی و زووبانیان ئیسلامیی بوو. لە سوڵتانەکانیان داوا دەکرد، پێڕەوی یەکسانی و دادپەروەری بن، کەچی خۆیان لە واقیعدا وەک هەموو کوڕانی هۆزەکانی دیکە، خەریکی وەسفوسەنای هۆز و تیرەکەی خۆیان بوون، بە شانوباڵی باپیرانیاندا هەڵیان دەدا. دەهات ڕەخنەی لە ئاغاکەی دەگرت بە بەڵگەی ئاینی و لەولایشەوە بە شمێری خێڵەکی لە دژی ڕاست دەبوویەوە. بە کردار خێڵەکییەکی خۆبەشتزان و بەگوفتار زاهیدێکی لەخواترس دەردەکەوتن.

ئەمانە ناتوانن شوێن ڕێنماییەکانی ئیسلام بکەون، شوێنکەوتنێکی ڕاستەقینە، چونکە پێچەوانە دێتەوە لەگەڵ ئەوەی لەسەری بەکردەیی پەروەردە کراوە، لە کاتێکدا دەیشیەوێت دەسەڵاتدارەکان، موسوڵمانی عەیارە ٢٤ بن. بۆیە دەسەڵاتدارانیش پەستن بەم دووفاقییە کە لە ڕەفتار و کرداری ڕەعیەتەکەیاندا دەیبینن. دەسەڵاتداران ڕێک لەسەر ئەو ڕێتمە دەڕۆن کە لە سەری ڕاهاتوون لە ژیانی واقیعیدا، ئەوان ئەو قسەیەی پێغەمبەریان بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە دەڵێت: "خۆتان چۆن بن، هەر لەوەیش دەبێتە ئاغاتان". ئەمانە گوێ نادەن بە وتیوتی خەڵک، لەسەر ئەو شێوەیە دەڕۆن کە ژیانی واقیعی خەڵک داخوازییەتی. هێشتا ئەمان لۆمەی ڕەشەخەڵکیش دەکەن، کە بۆچی ئەوەی بە زمان دەیڵێن لە کردەوەی ڕۆژانەتاندا جێبەجێی ناکەن.

لە واقیعیشـــدا، زۆریـــنەی شۆڕشـــەکان بەهـــۆی ئەم سروشـــتە دووفـــاقییەوە بـــووە. هـــیچ گومانێـــک لەوەدا نیـــیە، مـــرۆڤ داوای دادپەروەری دەکـات و خۆیشـی جێبەجێی ناکـات. پێویسـتە لەسـەر فەرمـانڕەوای دادوەر، وەڵامی داواکارییەکانی خەڵکی بـداتەوە، حەقی بەسەر کرداری خەڵکەوە نەبێت و لەسەری لۆمەیان نەکات. بەمەیش کۆمەڵگە هەردەم لە بەرەوپێشچوون و گەشە و نەشەدا دەبێت. عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە سـەردەمی خۆیـدا، ئـاوا باسـی خەڵکەکەی دەکـات: (بـزانن ئێـوە لە پـاش هیجـرەت، بـوونەوە دەشـتەکی -مەبەسـت لە دەشتەکی لێرەدا تانەیە- پاش ئازادکردنی ناوچەکان بوونە تاقم تـاقم، هیچ فریکتان بە ئیسلامەوە نییە، مەگەر تەنهـا بە نـاو، هـیچ هۆشـێکتان بە لای ئیمـانەوە نیـیە، مەگەر تەنهـا بە شـکڵ. ئێـوە دەڵـێن: (العـار ولا النار)، وەک ئەوەی بتانەوێت ئیسلام سەرەوخوار بکەنەوە).

عەلـی کـوڕی ئەبـی تالیـب بەو شـێوەیەی کە لەنـاو خەڵکیـدا بـاوە، دەسەڵاتدارێتی و حـاکمێتی نەدەکرد، ئەو کەسێکی ڕەخنەگر و یاخی بـوو هەتـا ئەو دەمەی گیـانی سـپارد. ئەمە لە بەشـی ئاینـدەدا بـاس دەکەین. ئەو بە قەلب و قاڵب یـاخی بـوو، شۆڕشـگێڕ بـوو، کەسـێکی دووفلیقانە نەبوو، هەر بۆیە دەبینرا، ڕەخنەی لەسەر دووفلیقانەیی لە کۆمەڵگەکەی دەگرت، بە تایبەتی کاتێک بە زمان پەسنیان دەکرد و بە کـردەوە لە دژی پیلانیـان دادەڕشـت. ئەمەیـش یەکێـک بـوو لە هەرە گەورەترین هۆکارەکانی داڕووخـانی هەمـوو شۆڕشـەکانی سـەرەتای ئیسلام، دڵی خەڵکی لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا بووە، شمشێرەکانیشیان لە دژیان.

دەڵێن: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، پرسیاری لە یەکێک لە زاناکان کرد دەربارەی گوزەرانی ویلایەتەکان و سروشـتی خەڵکەکەی، ئیدی زانـاکەیش وەڵامـی دایەوە، گـوتی: "خەڵکـی مەدینـە، لە هەمـوو کەس

زیاتر سوورن لەسەر خراپەکاری لە دەروونیاندا، بەڵام دەستیان تێی ناچێت بیکەن. خەڵکی میسر زۆر بەینیان لەگەڵ خراپەکاریدا خۆشە، بەڵام زۆر زوویش پەژێوان دەبنەوە. مەردوومی شامیش گوێڕایەڵترینی خەڵکین بۆ ئەمیرەکانیان و زۆر توندوتیژیشن لە بەرانبەر دوژمنانەوە". ئاشکرایە ئەم خشتەبەندییەی وڵاتانی مسوڵمان، خشتەبەندیی کابرایەکی ماستاوچییە، کە دەیەوێت لە ئەمیر نزیک ببێتەوە، کە وا گوزارشت لە هەموو ناوچەکان دەکات، کە حەزیان لە خراپە و ئاشووبە، بێجگە لە خەڵکی شام. مەردوومی شام لە چاوی ئەم زانا شارەزایەوە، تاکە باشترینی ناو هەموویانن. لە چاوی منیشەوە، ئەوان تاکن لە خۆڕزگارکردن لە گرێی دەروونی و دووفاقی کەسێتی.

عەبدولمەلیکی کوری مەروان، چووە سەر مینبەری مەدینە و بە هەڕەشەوە گوتی: ((باش باش بزانن، من کاروباری ئەم میللەتە نابەم بەڕێوە، مەگەر بە شمشێر نەبێت، هەتا بیروبڕواتان ڕێک و دروست دەبێتەوە. ئێوە کردەوەی کۆچەرییەکان (المهاجرین)تان لەبەرچاوە کە سەرەتا کۆچیان کرد بۆ مەدینە، کەچی هیچ وەکو ئەوان ڕەفتار ناکەن. ئێوە، ئێمە بە تەقوای خوا ئامۆژگاری دەکەن، کەچی خودی خۆتانتان بیرچووەتەوە. سوێندم بە پەروەرێنتان، هەر کەس لە ئێوە بێت و پێم بڵێت لە خوا بترسە، ئا بەم شمشێرە لە گەردنی زەردی دەدەم.[64]

حەجاجیش هەر هەمان شتی بە خەڵکی کوفە گوت، ئەو دەمەی عەبدولمەلیک کردی بە والی لەوێ. ئەو پێناسەی خەڵکە عێراقی بە "خەڵکێکی ملنەدەر، دووڕوو و بەد ئەخلاق" کرد. ئەم وەسفەی حەجاج بووە بنێشتەخۆشەی سەر زاران، تا ئێستایشی پێوە بێت. هەر

[64]- بنوارە: جرجی زیدان، التمدن الاسلامی. بەشی ٤، لاپەڕە ٨٣.

کات باسی خەڵکی عێراق بکرێت، لەگەڵیشدا باسی ملنەدەری و دووڕوویی دەکرێت (العراق بلد النفاق والشقاق). جاحز هەوڵی داوە ئەم تۆمەتە بە جۆرێک لە جۆرەکان بە ئاڕاستەیەکی ئەهوەنتردا بەرێت و کەمێک تەئویلی بابەتەکە بکات بە بەراوردکردنی خەڵکی عێراق بە خەڵکی شام. بۆیە دەڵێت: "هۆکاری گوێڕایەڵینەکردنی خەڵکی عێراق بۆ فەرمانڕەواکانیان و ملکەچی خەڵکی شام ئەوەیە کە: خەڵکی عێراق خاوەنی بیرێکی تیژن، لەگەڵ زیرەکی و بیرتیژیدا هەمیشە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون هەیە، لەگەڵ بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەدا هەمیشە پیس و پاککردنی خەڵکی هەیە، لەم پیس و پاکەیشدا فەرمانڕەوای باش لە ناباش جیا دەکرێتەوە و عەیبوعاری فەرمانڕەوایان دەردەخرێت. بەڵام خەڵکی شام کەللەپووت و دەمەلاسکەچین. تا ئێستایشی بە دەمەوە بێت، خەڵکی عێراق هەر ناسراون بە بێگوێییان بەرانبەر فەرمانڕەواکانیان و ملنەدانیان لە بەرانبەر دەسەلاتەوە."

بەڵام جاحز هیچ بەردێکی نەخستووەتە سەر بەرد بەم کارەی. ئەو دەڵێت: خەڵکی عێراق بەهۆش و بیرن، هیی شام بێهۆش و دەماغ سستن. ئەو بەم کارەی قورەکەی خەستتر کردووەتەوە. ئەگەر ڕەخنەگرێک ڕەخنەی لێبگرێت و بڵێت: بە چی پێوەرێک خەڵکی عێراق ئاوان و هیی شامیش ئاوەها نین؟ لەوانەیە جاحز ئەم پۆلێنەی لە ڕووی جیاوازی سروشتی خەڵکی هەردوو ناوچەکەوە کردبێت، بەڵام زانستی کۆمەڵناسیی سەردەم، ئەمە بە درۆ دەخاتەوە. سروشتی مرۆ لە هەموو شوێنێک و هەموو کاتێکدا هەر یەکێکە، ئەگەر جیاوازییەک هەبێت، ئەوا لە ڕووی سروشت و خۆڕسکی مرۆڤەوە نییە، بەڵکە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی. ئەوەی لێکۆڵینەوەی بۆ ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییە کردبێت کە لە عێراقدا سەرچاوەی گرتووە،

لەگەڵ ئەوەی کە لە شامدا هەبووە، بێگومان جیاوازییەکی فراوان دەبینێت. ڕاستە کە هەردووکیان لە خێڵەکییەوە گەشەیان کردووە، بەڵام ئەو چینە دەسەڵاتدارەی کە فەرمانڕەوای خەڵکی عێراقیان دەکرد، جیاوازبوون لەوانەی فەرمانڕەوایی شامیان کردووە. ئەوانەی ڕوویان کردە شام و بوونە دسەڵاتدار و گەورە، ئەوانەبوون کە کاتی خۆیشی گەورە و سەرداری قورەیش بوون. بەڵام ئەوانەی عێراق، جۆرێکی دیکە بوون. زۆرینەیان لە کۆچەریی و پشتیوانەکان بوون، ئەوانەی کە لە ڕێگەی ئیسلام و جیهادەوە پلەیان بەرزبووبووەوە و بووبوونە گەورە و سەردار[٦٥].

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە بەها کۆمەڵایەتییەکانی هەریەک لەم دوو ناوچەیە جیاوازن. لە عێراق، وەعزی ئاینی ڕۆڵی هەبوو، بەڵام لە شام بەها خێڵەکییەکان لە ڕەواج و برەودا بوون. بۆیە ئەو ململانێ دەروونییەی تووشی خەڵکی عێراق دەبوو، لە شام نەدەبینرا. بەنی ئومەییە، لە شام، هەر لەسەر ڕێوڕەسمی خێڵ دەرویشتن بە ڕێگادا، هیچێک لە ئیسلامەوە فێر نەبووبوون، مەگەر شتە ڕوواڵەتیی و تقووسەکان، ئەو خەڵکە خێڵەکییەیش کە شوێنیان کەوتبوون، هیچ تووشی ململانێی دەروونی نەدەبوونەوە، دڵ-ئەرخەیان و بێگرفت شەو لێی دەنوستن. چونکە دابونەریتی کۆنیان، لەم دەوڵەتە تازەیەشدا هەر شکۆدار و گرنگ تەماشا دەکرا. بەڵام لە عێراق، بە پێچەوانەی ئەمەوەبوو. جیاوازییەکی فراوان و بەرچاو لە نێوان بەهاکانی خێڵ و ئیسلامدا دەبینرا. بەها ئیسلامییەکان لە عێراق ڕوون و کاریگەر بوون، چونکە بانگخوازەکانی لەوانەبوون کە لەگەڵ پێغەمبەردا بەرگەی ئەو هەموو ناڕەحەتی و زەحمەتەی سەرەتای

---

[٦٥]- دەڵێن ژمارەی ئەو هاوەڵانەی چوونەتە کوفە، ١٤٨ هاوەڵ بوون. لە شوێنکەوتوانیش ٨٥٠ دانەیان چوونەتە ئەوێ. تەبەقاتی ئیبنو سەعد بەشی شەشەم.

ئیسلامیان گرتبوو، دواتریش شانبەشانی پەیامبەر جیهاد و تێکۆشانیان کردووە. ئەو هاوەڵانەی لە عێراق نیشتەجێ بوون، بەراورد بەوانەی لە شام بوون، ئەگەر هێڵێکی بەیانی هەبوایە ڕێژەکانیانمان دیاریکردایە، ئەوا جیاوازییەکی فراوان بەدی دەکرا.

دکتۆر ئەحمەد ئەمین دەڵێت: ((لە ڕاستیدا ئەو ململانێیەی لە نێوان "نەفسییەتی ئیسلامی" و "نەفسییەتی جاهیلی"دا ڕووی داوە، کە بەها جاهیلییەکان ڕەگوڕیشەیەکی زۆر قووڵتریان لە دەروونی خەڵکەکەدا هەبووە. ئیسلام هەرگیز هەموو عەرەبی لەسەر یەک سیفەت دانەمەزراندووە، بەڵکوو ئەوانەی کە دامەزرابوون بە جوانی لەسەری، تەنها کۆچەر و پشتیوانەکان بوون، ئەوانەی کە بەها ئاینییەکان چووبوویە کونبەکونی ناو دەروونیانەوە، خۆیانیان بۆ یەکلا کردبوویەوە و خەریکی جێبەجێکردنیان بوون لەسەر خۆیان. بەڵام ئەوانەی کە لەسەر کوفر و ملەجەڕێی خۆیان بەردەوام بوون تا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و هاوەڵانیان بینی لە ڕۆژی فەتح، کە چۆن سەرکەوتن، ئەمانە تەنها ئیسلام بوون و ئیمانێکی ئەوتۆی پتەویان لەدڵدا جێگیر نەبوو[٦٦].))

لە ڕاستیدا ئەو نارەحەتی و تەنگ و چەڵەمەیەی یەخەی یەکەم گرووپ لە ئیماندارانی گرت، دەتوانین بڵێین شێوەیەک لە شێوەکان "لەبێژنگدان" بوو. لە دەمی سەرەتادا، ئەوەی ئیمان نەچووبوایە ناو شادەمارەکانیەوە، بەرگەی بارودۆخەکەی نەدەگرت. بەڵام لە پاش سەرکەوتن و نفوزی ئیسلام بەسەر ناوچەکاندا، ئیدی وردە وردە ئەوانەی دەهاتن تێکەڵ بوون، تیایان بوو ئیمانی هێنابوو، تیایشیدابوو، بۆ غەنیمەت و فرسەت سەری کردبوو بەناو تەندوورەکەدا. لە بەختی باشی عێراق، یان لە بەختی ڕەشی، ئەوانەی کە بۆی هاتن و تێیدا

---

[٦٦]- بنوارە: ئەحمەد ئەمین، فجر الاسلام، ص ٨٢.

نیشتەجێ بوون، ئەوانە بوون کە لە سەرەتادا ئیمانیان هێنابوو، ئینجا لەسەریشــی جەنگــابوون. لەبەر ئەمە وەعــز و ململانــێ ئاینییەکــان بەبرەوتر بوون لێرە. هەر بۆیە خەڵکی عێراق کەوتبوونە نێوان دوو ئاراستەی جیاواز لە دابونەریتی خێڵەکی کۆن و ڕێنماییەکانی ئیسلام.

ئەو کاتەیشی جەنگ لە نێوان عێراق و شامدا هەستا، مەبەستمان لە جەنگی صــەفینە. ئەم دیــاردەیە وەک مــانگی چــواردە بەدی دەکـرا لە خەڵکی عێراقدا. لەوکــاتەی کە خەڵکــی شــام، بەتەواوی گــوێلەمشـتی ئەمیرەکانیان بوون، خەڵکی عێراق مقۆمقۆیان بـوو، خرۆشـی شـۆڕش لەشی داهێزراندبوون. پرسیار لە موعاویەی کوڕی ئەبوسووفیان کرا، هۆکاری سەرکەوتنت لە جەنگی صەفیندا چیبوو؟ ئەویش بەم شێوەیە پوختەی مانای پێ گەیاند:

یەکەم: عەلی کوڕی ئەبوتالیب نهێنیی خۆی ئاشکرا دەکرد، بەڵام مـن سرڕاگیم بووم.

دووەم: جەنگــاوەرانێکی بــێفەڕ و پــڕ لە تەنــگەژەی هەبــوو، بەڵام ئەوانەی من کەمترین تەنگەژەیان هەبوو، لە کاتێکدا بەبێ فەرمانی من دەستیان بە ئاوی سارد و گەرمدا نەدەکرد.

سێیەم: لەلای قورەیش، من لەو خۆشەویستترم[٦٧].

من وا دەزانم، ئەم سێ هۆکارەی کە موعاویەی کـوڕی ئەبوسـووفیان باسی کردن لەسەر عەلی کوڕی ئەبو تالیب، هەرسێکیان لە یەک خاڵدا خۆی نیشان دەدات، ئەویش ئەوەیە کە لەسـەرەوە باسـمان کرد. ئەو چینەی کە زەمـامی دەورانیـان بە دەسـتەوە بوو لە شـام، ئەوانەبوون کە لە سـەردەمی جاهیلیـدا ئەشـراف و گەورە و بەدەسـەڵات بـوون.

[٦٧]- بنواڕە: جاحز، سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ص ٩٤.

ئەمە لە کاتێکـــــدا مەردوومـــــی عێـــــراق پێـــــک دەهـــــات لە قورڕائــ(قورئانزانەکان) و هــاوەڵانی پێشـینی وەک عەممـاری کـوڕی یاسـر و هەنـدێکی دیکە. عەلی نەیـدەتوانی نهێنیـی خـۆی قـایم بکـات، وەک معاوییە، چونکە خەڵکی عێراق لە هەمـوو شـتێکدا پرسـیاریان لـێ دەکرد و موناقەشەیان لەسـەر هەمـوو هەڵسوکەوتێک لەگەڵدا دەکرد. هەر بۆیە لە داروبەردا (لە سەغیرە و کەبیرەدا) لەگەڵی ناتەبا بوون. بەڵام شوێنکەوتوانی معاویە، وەک چۆن لە جەنگی ڕۆژانـی جاهیلیدا دوای گەورە و سـەردارەکانیان دەکەوتـن، ئـاوا لێـرەیش بە شـوێن سالارەکانی خۆیانەوە بوون بەرەو مەیدانی جەنگ.

ئەوەی لێرەدا شـایەنی باسـکردنە، ئەوەیە: عەلـی کـوڕی ئەبوتالیب لە بەخشیندا ڕێک دەتگوت پێغەمبەرە (د.خ)، هیچ جیاوازییەک نەبوو لە نێوان ڕەش و سـوورێکدا لەلای، هەمـووی بەقەد یەکـی دەدانـێ، بەڵام معـاویەی کـوڕی ئەبوسـووفیان، تەماشـای کـابرای دەکـرد، بزانێت لە ڕووی نفوزی کۆمەڵایەتی و شانوشـەوکەتەوە چەنـد دەژی، هێنـدەی دەدایە. ئەمەش یەکێکی دیکەبوو لە هۆکارەکـانی سـەرکەوتنی، بەسـەر عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا. دەڵێن: خـوزەیمەی کـوڕی سـابیتی ئەنسـاری، کە لە مسوڵمانەکانی سەرەتای سەرەتا بوو، لە جەنگی صەفیندا لەگەڵ عەلـی هـاتبوو، بەڵام نەدەجەنگـا، بەوردی تاقیبـاتی عەمـاری کـوڕی یاسری دەکرد، کاتێک دیتـی عەمـار کـوژرا، گـوتی: "ئەرەوەڵا گـومڕایی بەدیـارکەوت"، ئیـدی ئەمـیش دەسـتی بە جەنـگ کـرد هەتـا کـوژرا. ئەم هاوەڵە ئەنسـارییە، دڵـی بە شـەڕکردنەوە نییە هەتـا دڵنیـا دەبێتەوە کە لەبەری حەق و ڕاستییە بە بڕوای خۆی. دوای یاسری کوڕی عەممار کەوتبـوو، لەبەر ئەوەی پێغەمـبەری خـوا (د.خ)، فەرمووبـووی: "دایکـت شینت بۆ بکات ئەی کوڕی سومییە، گرووپێکی تاوانبار تۆ دەکوژن". ئیتـر زانـــی کە ئەو خەڵــکەی شـــام کە عەماریـــان کوشـــت، تـــاقمە

تاوانبارەکە بوون.

دەیشگێڕنەوە ئەو دەمەی خەڵکی شام زانیان ئەوا عەممار کوژراوە. هاتنەوە بە خۆیاندا و لەو شوێنکەوتنە کوێرانەیە کەمێک پاشەکشەیان کرد، مقۆمقۆ کەوتە نێوانیانەوە. بۆیە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان بە خەڵکەکەی گوت: "ئەوە ئێمەنین کە کوشتوومانە، بەڵکوو ئەوانە کوشتوویانە کە هێناویانە". ئیتر خەڵکەکە بێدەنگ بوونەوە و گەڕانەوە سەر سروشتە ئاساییەکەی خۆیان.

باسکراوە کە کەسێکی خەڵکی عێراق، هێندێک گومانی کردبوو، دەیگوت: خەڵکی شامیش وەکو ئێمە نوێژ دەکەن، قورئان دەخوێنن، دان دەنێن بە پێغەمبەرایەتی (موحەمەددا دروودی خوای لەسەر بێت)، بۆیە ڕۆشتە لای عەممار کەمێک بەر لە کوژرانی و لێی پرسی. عەماریش وەلامی دایەوە: "ئەم سوپایەی معاویە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ سوپاکەی باوکیدا نییە ئەو کاتەی هاتن جەنگیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا کرد، من ئێستا لەسەر هەمان بنەما و باوەڕ لە دژی ئەم سوپایەیش دەجەنگم". ئیتر کابرا عێراقییەکە دڵی ئاوی خواردەوە و گەڕایەوە ڕیزەکەی. ئەم ڕووداوانە، بە کۆی گشتی، ئاماژەی ئەوەمان دەدەنێ کە خەڵکی عێراق تووشی ململانێی دەروونی بووبوون، کۆی گشتی هەموو خەڵکیش، هەر شوێنە و بە ڕێژەیەک، بەڵام وەک دەردەکەوێت خەڵکی عێراق پشکی شێریان هەبووە لەم مەینەتەدا.

ئەو ناوچانەی کە عەرەب لە سەردەمی ئیسلامدا بنیاتیان نا، هەر وەک پرۆفیسۆر "Gibb" ئاماژەی پێ دەدات، خەڵکەکەیان پێک هاتبوون لە دوو جۆر کەس، یەکێکیان خەریکی ئازادکردنی ناوچەکان بوو بە هەڵگرتنی شمشێر، ئەوی دیکەیش هەڵگری قورئان بوون. زۆرینەی تاکەکانی عەرەب لەو دەمەدا هەردوو کەسایەتییەکەیان لە خۆیاندا

کۆبووەوە، لە لایەکەوە خەریکی ئازادکردنی ناوچەکان و جەنگ بوو، لە لایەکی دیکەیشەوە قورئانخوێنێکی خاوەن تەقوا بوون. ئەم دیاردەیەیش دەکرێت بۆ ماوەیەک بەردەوام بێت، بەڵام درەنگ و زوو هەر دەتەقێتەوە. تایبەتمەندییەکانی جەنگ لە هەندێک کاتدا، داخوازی ئەوەیە مرۆڤ کەمێک لە دینداری و تەقوا خۆی دوور بخاتەوە، ئەگینا ئیشی لەبەر ناڕوات. ئەمانە گرفتگەلێکی گەورەی دەروونی و کۆمەڵایەتین، مسوڵمانەکانیش زۆریان بە دەست ئەم دەردەوە کێشاوە، ئیدی خەڵکی عێراق لەم نێوەندەدا پشکیان لە پشکی هەموولا زیاتر بوو، تا وای لێهات، ئەم نەخۆشییە بووە میوانی هەمیشەیی.

لە کۆتاییشدا حەجاج هات بۆیان، لە ناویاندا بۆ مێژوو قیڕاندی: "هۆ خەڵکی عێراق، هۆ خەڵکی لاسار و نیفاق". ئەم ناولێنان و هاوارەی حەجاج بووە نێو و شۆرەتی خەڵکی عێراق و نەوە لە دوای نەوە باس دەکرێت و دەگوترێتەوە.

شایەنی باسە، ئەو دەستەواژەی "نیفاق"ـەی کە حەللاج دەیگوت، ئەو دەستەواژە باوە نییە کە ئێمە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین. بەڵکوو بریتییە لە ململانێیەکی دەروونی، کە خەریکە مرۆڤ بکات بە کەسێکی دووفاق (الشخصیە المزدوجە). خەڵکی عێراق بە خۆیانیان نەدەزانی کە خەریکن پارادۆکسێک پەیڕەو دەکەن لە دەروونیاندا کاتێک کە شتێکیان دەگوت و بە کردەوە جێبەجێیان نەدەکرد. نەریتە خێڵەکییەکەیان داخوازی ئەوەبوو کە بە لاشعوری، کەسانێکی خۆبەگەورەزان و ڕەگەزپەرست بن. ئەوان کاتێک ناوچەکانیان بە ناوی ئیسلامەوە ئازاد دەکرد، لە ڕاستیدا بریتی بوون لە کۆمەڵێک دەشتەکی کە بۆ خۆهەڵنان و بەدەستخستنی غەنیمەت دەجەنگان. بەڵام تووشی بەلا دەهاتن لەم ئازادکردنانەدا کاتێک لە دیدگای خەڵکە بەتەقوا و ئایندارەکەوە ئەمە وەک فەتحێکی ئاینی تەماشا دەکرا و

دەبوایە ئەنجامەکەی بریتی بوایە لە دلۆڤانی و سۆز و یەکسانی، کەچی ئەوە دەرنەچوو کە ئەمان پێشبینیان دەکرد و ڕەحمەتێک لە ئارادا نەبوو.

بەسەر ناوچەکانی دیکەدا سەرکەوتن، ئەم سەرکەوتنانەیش تووشی لەخۆباییبوون و گەڕانەوەی کردن بۆ سیفەتەکانی جارانیان وەک: بەخۆدانازین و مونافەسە هەروەک خەڵکی ئەوسای بیابان. بەڵام ئەمەیان بە باشی بەسەرەوە نەدەچوو، کەسانی خاوەن تەقوا و ئیماندار، لە لایەکەوە بە قورئانێکەوە دوایان کەوتبوون، لە لایەکی دیکەیشەوە دابوونیانە بەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر. گرفتی هەرە گەورە ئەوەیە، بنیادەم ناتوانێت بە ویست و بژاردەی خۆی، خۆی لەو نەریتە بنجداکوتاوانەی ناو دەروونی ڕزگار بکات. ئەم داب و نەریتانە چوونەتە کونی ژوورەوەی ناو دەروونییەوە، بێجگە کەمینەیەکی هەر زۆر کەم، کەس لە دەستیان خەلاسی نایەت. هەر بۆیە، نەستی بنیادەم لابەلا و بەبێ خشپە، دەستەمۆی ئەم نەریتانە دەبێت و بە هیچ کلۆجێک لێیان قوتار نابێت، ئیتر هیچ بوارێک بۆ لۆجیک و عەقڵ و ئەم جۆرە شتانە نامێنێتەوە.

ئەو دەمەی کە مرۆڤ گوێ لە قسەکانی واعیز دەگرێت و دەبینێت زۆر پێچەوانەی نەریتە باوەکانە، ئیتر لەم چرکەیەوە تووشی ململانێی دەروونی دەبێت. هەر لەبەر ئەوەیە کە سەردەمەکە پڕپڕبوو لە شۆڕش و فیتنە و بەربەرەکانێی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتیی. ئیدی ئەمەوییەکان خەڵکیان بە فتوحاتەوە سەرگەرم کردبوو. ئەم فتوحاتانەیش هەر کە سارد دەبوویەوە، ئەوا لە لایەکەوە شۆڕش هەڵدەئایسا و دیسانەوە مەشغوڵی دەستی پێ دەکردەوە، ئەم شۆڕشەیش هەمیشە گیان و خوێنی چەندین داماو و هەژارەی لەگەڵ خۆی دەبرد.

مێــژوو ئامــاژە بــۆ ئــارامی و هێمنییەکــی کەم تــا زۆر دەکــات، لە ســـــەردەمی عەباســـــییەکاندا. لە ڕواڵەتیشـــــدا وا دەردەکەوێـــت ئەو سـەردەمە سـەردەمی دووفـاقیی بـووە لە دەروونەکانـدا. هێدی هێدی خەڵـکەکە خۆیـان لە ململانێـی دەروونـی ڕزگـار کـردووە، ڕوویـان کـردووەتە دوانەیـی لە دەروونیانـدا، تـا کەمێـک لەو مانـدووبوونەی ڕابردوویـان بـڕەوێننەوە. لە بەشـی داهاتوویشـدا بـاس لە چـۆنییەتی دامرکـانەوەی دووفـاقی لە دەروونـی مرۆڤـی مسـوڵمان بە گشـتی و تاکی عێراقی بە تایبەتی دەکەین.

# بەشی دووەم

# وەعز و دووفاقی لە کەسایەتیدا

لە بەشی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە زۆرینەی مسوڵمانان، بە تایبەتیش عێراقییەکان، تووشی دەعەزی ململانێی دەروونی بووبوون لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا. بە جۆرێک، ژیانی ڕۆژانەیان لەژێر کاریگەری بەها خێڵەکییەکاندا و ژیانی "فیکریی"شیان لەژێر کاریگەری بەها ئیسلامییەکاندا بوو. هەر بۆیە لە ناوەوی نێو دەروونیاندا هەستیان بە پارادۆکس لە نێوان کردار و ڕەفتارەکانی خۆیاندا دەکرد. هەر بۆیە ئەو شۆڕشە یەک لە دوای یەکانە، گوزارشتێکی بەرجەستەی ئەو بەیەکداچوونە دەروونییانەی خەڵکی بوو.

ئەوەی سەرنجراکێشە: ئەمەوییەکان لەسەر سروشتێکی خێڵەکی تەواو ڕوون بوو، تەنانەت وەک گیزەی مێشوولە تەماشای قسەی فەقیە و پیاوە ئاینییەکانیان دەکرد. هەموو هەوڵ و تەقەلایەکیان بۆ مانەوەیان بوو لەسەر تەخت و تاجی سوڵتانی، ئیدی ئەگەر بە شیر و

تیر، یان بە هەرشتێکی دیکە بێت. سەردەمی ئەمەوییەکان دووررییەکی زۆر لە نێوان دین و دەسەڵاتدا دروست بووبوو. دەوڵەت لەملاوە لە لایەن هۆزە شمشێربەدەستەکانەوە دەپارێزرا و لەولایشەوە ئاین و فیقە و حەدیسیش لەناو خەڵکە ڕەجاڵ و جووتیار و وەرزێر و خاوەن پیشەکاندا بڵاو دەکرایەوە[68]. بەم شێوەیەیش ئاین و دەوڵەتداری بە دوو ئاراستەی جیاوازدا دەڕۆیشتن. ئەم پارادۆکسەیش لە باروودۆخەکەدا خەڵکەکەی بەرەو ململانێیەکی دەروونی ئاراستە دەکرد، وەکوو پێشتر ئاماژەمان پێ دا. لە لایەکی دیکەیشەوە دەیبردن بەرەو نادڵنیاییەکی کۆمەڵایەتی. بۆیە هیچ باروودۆخێک تا سەر بەم ئاقارەدا ناڕوات، بێ شک دەبێت بە لایەکدا بکەوێت، ئیدی درەنگ و زووی کەوتووە.

بۆیە لە سەردەمی عەباسییەکاندا کارەکە هاتە ڕاستە و کەوت بە بارێکدا، جا چ بارێک؟

عەباسییەکان کە هاتنە سەر دەور، بانگەشەی زیندووکردنەوەی ئەو سوننەتانەیان دەکرد کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا مرێنرابوون. هەروەها ڕاستکردنەوەی ئەو مەشخەڵانەی ئایین کە گۆجێنرابوون (لار کرابوونەوە لە مانا ڕاستەقینەکەی خۆیان)[69]. بە مانایەکی دیکە، ئەمان دەیانەویست ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە کە لە نێوان دین و دەوڵەتدا دروست بووبوو لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا. کە ئەمەیش نزیک بوو لە موستەحیلەوە (ئەستەم). کۆکردنەوەی ئاین و دەوڵەت کارێکی ئەستەمە، ئەم دوانە ناتوانن بە جوانی پێکەوە کارلێک بکەن و ئەنجامی کارلێکەکەیان ئەنجامێکی دڵخواز و پەسەند بێت، چونکە

---

[68]- جۆرجی زەیدان، التمدن الاسلامی، ج ٤، ص ١٩٢ – ١٩٤.

[69]- سەرچاوەی پێشوو، ج ٤ ص ١٩٦.

دەوڵەت لەسەر بنەمای شەق و دەسەلات دادەمەزرێت، لە کاتێکدا ئاین لەسەر بنەمای سۆز و دلۆڤانی و یەکسانی دادەمەزرێت.

دەگونجێت هەندێک جار ئەم دوو چەمکە پێکەوە هەڵبکەن، بەلام هەروا کورتخایەن و زوو گوزەرە. ئاین و دەوڵەت لە ئامێزێکدا، وێنەی ئاو و ئاگرە پێکەوە. عەباسییەکان ئەم کارەیان ئەنجام دا، بەلام تەنها بە ڕواڵەت. هەستان فەقیە و فەرموودەزانەکانیان لە خۆیان نزیک کردەوە، بەخششیان دانی و ڕێزی فراوانیان لێ گرتن، لە وەعزەکانیاندا دادەنیشتن و ملکەچی خۆیانیان نیشان دەدان. ئەمان لەمە زیاتریان لەدەست نەدەهات، بەلام بۆ خۆیان لە ژیانی ڕۆژانە و کەسێتی خۆیاندا، هەر وەک باقی پادشا و قەڕاڵەکانی دیکە، خاوەن تەلاری دلڕفێن بوون و لە گەوجاندنی خەڵکی بەهرەیان دەبرد.

پرۆفیسۆر "فیلیپ" لە بارەی دەوڵەتی عەبباسییەوە دەڵێت: "لە ڕاستیدا ئەو ڕیفۆرمە ئاینییەی لە سەردەمی عەباسییەکاندا ڕووی دا، هێندە ڕیفۆرمێکی ڕواڵەتیی بوو، ئەوەندە ڕیشەیی و ڕاستەقینە نەبوو. خەلیفەکانی بەغداد، بە پێچەوانەی خەلیفە ئەمەوییەکانەوە، دەستیان دابوویە نواندن و خۆکردن بە مەڕی پێغەمبەر[٧٠]، کەچی لە ژێرەوە هەر وەک پێشینە ئەمەوییەکانی خۆیان، خەریکی عەیشونۆش بوون". وەک دەگێڕنەوە، ڕەشید دوو هەزار کەنیزەکی هەبووە، سێ سەد دانەیانی تایبەت کردووە بەس بە گۆرانی و موزیک و سەما. دەڵێن ڕۆژێکیان لە دیوەخانەکەیدا دوو ملیۆن درهەمی بە شاباش داوە بە ئامادەبوان[٧١]. ڕۆژێکی دیکەیشیان گۆرانیبێژی حەفلەکەی کردووە بە والی میسر. لەوانەیە میسرییەکانیش گۆرانی باشیان گوتبێت لە کاتی

[٧٠]- ئەم دەستەواژەیە لە کوردیدا بۆ کەسێك بەکار دێت خۆی زۆر نەرمونیان و لەخواترس نیشان بدات.

[٧١]- جۆرجی زەیدان، التمدن الاسلامی، ج٥، ص ١١٨ – ١٢٦.

گەیشـتنی ئەم والیـیە خۆشـدووەدا[72]. هەروەهـا ڕەشـید کەنیزەکێکـی کڕیـوە بە ۱۰۰ هەزار دینـار. پاشـان دانەیەکـی دیـکەی کـڕی بە ۳٦ هەزار دینـار، تەنهـا یەک شـەویش لای مـاوەیە و هەدیەی کـرد بە یەکێک لە هاوەڵەکانی، ئیتر خـودایش نەبێ کەس تێناگات کە هۆکـار چی بووبێت وا لای خۆی گل نەداوەتەوە.

هـاروونە ڕەشـید، هەمـوو ئەم پـارەیەی لە بەیتولمـاڵ دەردەهێنـا، خۆ مەنسووری باپیری، ئەو دەمەی هاتە سەر تەخت، شتێکی وای نەبوو شایەنی باس بێت، هەمووی لەسەر ڕەنج و ئارەقەی نێوچەوانی فەقیر و ڕەنجبەران پەیدا دەکرد. دوای ئەمەیش یەک دەنکە بە بـای خەیاڵیدا نەدەهـات و دەچـووە کۆڕی وەعـز و ئامۆژگـاری و دەسـتی دەکـردە گریـان. تـا ئەوکاتەی واعیـز، ڕەشـیدی بترسـاندایە بە سـزای خـودا و تووڕەبـوونی پەروەردگـار، ئەوا ئەو واعیـزە، چـاک و لەبەردڵان بـوو، بەڵام ئەگەر بێتوو باسـی سزا و ناڕەزایی خەڵکی بکردایە و خەلیفەی ئاگادار بکردایەتەوە بەو شتانە، ئەوا ئیدی هێڵی سـووری تێپەڕاندووە و خەتەرە... زندیقە.

غەزەبی خودا لای ڕەشید لە غەزەبی خەڵکی ئاسانترە، هەرچۆن بێت خودا گەورە و غەفوور و ڕەحیمە.

ئەبوزەڕ، هـاوەڵی ناسـراو، بە لای مەعـاویەدا تێپەڕی کاتێک خەریکی بنیاتنانی ماڵە سەوزەکەی بوون، ئەبوزەڕ لە جێگای ئەوەی پیرۆزبایی لێ بکات و هیوای تەمەنێکی درێژی بۆ بخوازێت، قیراندی بە ملیدا و گوتی: "ئەمەت لە کوێ بـوو؟ ئەگەر ئەمەت لە بەیتولمـاڵی مسـوڵمانان هێنـاوە، ئەوە خیانەتـت کـردووە، خـۆ ئەگەریـش مـاڵی خـۆتە، ئەوە دیسـانەوە هەر ئیسـراف و زیادەکـارییە"[73]. ئەبـوزەڕ، معـاویەی بینـی

---

[72]- خۆشدوو: قسەخۆش.

[73]- تەها حوسەین، الفتنە الکبری، ج ۲، لاپەڕە ۲۰٤ – ۲۰٥.

ماڵێکی بۆ خۆی ساز دەکرد، وای پێ وت، چیجای ئەگەر ڕەشیدی ببینیایە، کە کارەکانی ڕەشید بوونەتە قسەی سەرزاران، لە لادێ و شاران، لەوانەیە تێی بسرەواندایە. دەگێڕنەوە: جارێکیان عومەری کوڕی خەتاب، دەچێت بۆ سەردانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت)، دەبینێت لەسەر حەسیرێک ڕاکشاوە و نەخشی حەسیرەکە لەسەر لا ڕوومەتی دەرچووە. کوڕی خەتاب دایە پرمەی گریان له سۆزی بۆ پێغەمبەر، گوتی: "هەی پەیامبەری خودا، دۆشەکێکی نەرمتان نییە لەسەری ڕاکشێیت، یان لەژێر سەرتی بهاوێی؟ جەنابی پەیامبەر وەڵامی دایەوە و گوتی: تۆ منت بە چی زانیوە؟ من پێغەمبەرم، نەک کیسرا و قەیسەر."[74]

هەروەها پێغەمبەر فەرموویەتی: "کە کیسرا لەناوچوو، ئیدی کیسرایەتی نامێنێت، کە قەیسەر لەبەین چوو، قەیسەرایەتی دووایی دێت، من لە لایەن خوداوە خێرێکی تازەم بۆ هێناون، ئەویش پێغەمبەرایەتی و ڕەحمەتە"[75]. من نازانم ئەگەر پێغەمبەر هەندێک لەو خەلیفانەی ببینیایە چی دەگوت کە لە ئیسراف و خۆشڕابواردندا، قەیسەر و کیسرایان نابووە بندەستیانەوە. پەیامبەر (د.خ) وا گومانی دەبرد، کە ئەگەر کیسرا ڕووخا، ئیدی تەواو، نایەتەوە. هەموو هەوڵ و کۆششێکی لەپێناو ئەم شتەدا کرد، بەرگەی زەحمەتگەلێکی گرت، کە تووشی پێغەمبەران و چاکسازانی پێش ئەو نەبووبوویەوە. هەموو ئەو شتانەی کردی بۆ ئەوەی کرد تا بدات لە سەری کیسرایەتی و ببڕای ببڕ گۆڕی گوم بکات و لە جێگایدا سیستەمێک تەژی لە یەکسانی و سۆز، بنیات بنێت.

---

[74]- بنوارە: خالد محمد خالد، الدین فی خدمە الشعب ص ٢٦.
[75]- سەرچاوەی پێشوو، ص ١١.

دواتر چەرخی بەخت خولی خوارد و لە سەردەمی خەلیفەکانی ئەم پێغەمبەرەدا، شکۆ و شان بۆ کیسرا و کیسرایەتی گەڕێنرایەوە. بگرە لەوانەیە بەهۆی زیرەکی و نابیغەییەکەیانەوە شتێکیان بۆ زیاد کردبێت کە بە بیری کیسرایشدا نەهاتبێت[٧٦]. ئیبن عەلقە دەڵێت: "چوومە سەردانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب، ماستێکی ترش و کوتکە نانێکی وشکەهەڵاتووی لە بەردەست بوو، گوتم ئەی گەورەی ئیمانداران، ئا لەوە دەخۆیت؟ وەڵامی دامەوە: ئەی کوڕی جنوب، پێغەمبەری خودا لەمە وشکتری دەخوارد و لەمەیش زبرتری دەپۆشی (ئیشارەتی کرد بۆ کراسەکەی بەری)، دەترسم ئەگەر وەک ئەوە نەکەم کە ئەو دەیکرد، پێی نەگەمەوە"[٧٧]. یەکێک لە لێکۆڵەرە ڕۆژئاواییەکان پێی گوتم: بۆچی ئاینەکەی ئێوە ڕێگەی جەنگی پێداون و جیهادیشی لەسەر فەرز کردوون؟ هۆکار چییە ئێوە بە شمشێر هەموو جیهان ئازاد دەکەن و خوێنڕێژی بەرپا دەکەن؟ ڕاستەوخۆ دوای ئەوەیش نەیهێشت هیچ بڵێم، بە دوایدا گوتی: ئێوە بەم کارەتان هیچتان نەکردووە بێجگە لە جێگۆرکێی ئیمپراتۆریەتێک بە ئیمپراتۆریەتێکی دیکە. ئێوە کیسراتان لەناو برد و کیسرایەکی دیکەتان لە جێگایدا ڕواند. ئەمەی گوت، من دۆش دامام و هەر خەریک بووم پێنجم لێکدانی شەش دەکرد.

ئەمە ئەو شتەیە کە درۆی تێدا نییە، خۆ ئەمیری مسوڵمانان کە تەشریفی دەهات، جێگەی ئەمیری کافرانی نەدەگرتەوە، مەگەر لە ڕواڵەتدا، لە نوێژ و ڕۆژ و شتە ڕواڵەتییەکاندا، گریان و فرمێسکڕشتن زیادی دەکرد، هەیانبوو ساڵێک دەجەنگا و ساڵێک دەحەجا[٧٨]. ئەگینا وەزعی ڕەشوڕووت و سەپان، وەرزێر و بەردەی ملپان، هەر لەو

---

[٧٦]-- Hitts، history of the arabs، p.٣٠١ .

[٧٧]- عەباس مەحمود عەقاد عبقريە الامام، ص ٥٢.

[٧٨]- دەحەجا: دەچوو بۆ حەج.

خوارەوە تەماشایان دەکردە ژووررووی خۆیان، باری ئەمان هەر چل مەنان، ئاغا کافر یان مسوڵمان. خەلیفە خودای دەپەرست و بەندەکانی خودای دەچەوساندەوە.

ئەبو یوسف، قازی بەغداد لە سەردەمی هاروونە ڕەشید، لە بارەی باجگرەکانی دەڵێت: "پێم گەیشتووەتەوە کە باجگرەکان زۆر بە توندی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن، لە ماڵ دەریان دێنن و تێیان دەسرەوێنن، ئامێری زەوی کێڵانیان لە جێگای گاجووت پێوە دەبەستنەوە، کارێکیان بەسەر دێنن تواناى نوێژکردن لەدەست بدەن. ئەم کارە لای خودا تاوانە و لە ئیسلامیشدا ڕێگەپێنەدراوە"

هەر ئەبو یوسف دەڵێت: "... پێم ڕاگەیشتووە، والی هێندێک کەسی لە دەورخولدایە، هێندێکیان کەسوکاری خۆیین، هێندێکیشیان بۆ ڕاپەراندنی کار ڕاگیرکراون و ئامرازن. ئەمانە کەسانی باش و خاوێن نین، والی بۆ کارەکانی پشتیان پێ دەبەستێت و بەگەڕیان دەخات، ئەمانە ئەو شتەی لە گەردنیان سپێردراوە ناپارێزن، خۆش خولق و ڕوو نین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، بەڵکو تاکە ئامانجیان دەستکەوتنە، ئیدی چ لە خەراج، یان لە ماڵی میللەت. ئەوەی کە من پێم ڕاگەیەنراوە، ئەمانە بە ستەم و شەق و شەقکاری شتەکان وەردەگرن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کاتێک والی سەردانی دێیەک دەکات، لەوێش دیسانەوە شتیان لێ دەسەنێت کە پێویست نییە بیدەن، یان ناتوانن بیدەن، ئەگەر هەر نەیدەن، ئەوا دوایی یەکێک لە شەقوەشێنەکانی خۆی دەنێرێتە سەریان و بۆ خۆی و بەکەیفی خۆی گەلەمەڕ و ڕانەبزن دەداتە بەر و دەیهێنێتەوە بەر دیوانی سوڵتان..."[٧٩]. گرفتەکە لەوەدایە ئەم پارە و پوولەی کە بەم چەشنە دەگەڕێندرێتەوە

---

[٧٩]- سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٢٨ – ١٢٩.

بۆ خەلیفە، ئەویش دەچێت کەنیزە و دۆتی جوان جوانی پێ دەکڕێت، یان پارەکە تەخشان و پەخشان دەکات بەسەر نزیکەکانی خۆیدا.

دەڵێن گۆرانیبێژێک هەندێک شیعری تەڕوبڕی نەواسیی بۆ "ئەمین" گوت لە بارەی غیلمان و کوڕی جوانەوە، ئەمینیش حاڵ گرتی و هەستایەوە سەر پێ و چوو خۆی دا بە ملی گۆرانیبێژەکەدا سەری ماچ کرد و فەرمانی دەرکرد بە پاداشتکردنی. گۆرانیبێژەکە بە سەرسوورمانەوە گوتی: گەورەم ئەم هەموو بەخششە، بیست هەزار هەزار درهەم"، ئەمین هەر قەشمەریی بەو بیست ملیۆن درهەمەی ئەو سەردەمە دەهات و گوتی: "کورە ئەمە خەراجی هەندێک کوێرە لادێیەکە"[80]. خەلیفە ئەمین، گوێی لەوە نییە ۲۰ ملیۆن درهەم بدات بە گۆرانیبێژێک، چونکە ئەم بیست ملیۆنە هیچ نییە مەگەر خەراجی چەپە دێیەکی یان کوێرە ئاواییەک.

خوێنەر ئەو چەرمەسەرییە بێنێتە بەر چاوی خۆی، کاتێک خەڵکی لادێیەک بە چی ناڕەحەتییەک و نابەدڵییەک ئەم پارەیەیان لێ سەندرابێت، کەچی جەنابی خەلیفە بە یەک چرکە هەمووی دەداتە گۆرانیبێژێک کە گۆرانی دەڵێت بۆ خەلیفەی مسوڵمان لەمەڕ شەهوەت بەرانبەر غیلمانەکانەوە.

ئەگەر خوێنەر دەیەوێت بزانێت، گوزەرانی خەڵکی فەقیر لەو دەم و ساتەدا چۆن بووە، ئەوە با ئەم چیرۆکە بخوێنێتەوە کە "ئەبو فەرەجی ئەسفەهانی" بۆمانی دەگێڕێتەوە لە "موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی حەسەن"ـییەوە: ((... جارێکیان بە ڕێگەی کوفەدا تێپەردەبوو، هەروا دوور و نزیک، پیرەژنێکی بینی وا خەریکە دوای بارە وڵاخ کەوتووە کە خورمایان لێ بار کراوە، ئەمیش ئەو دنکە دنکەی لە بارەکە بەر دەبێتەوە هەڵدەگرێتەوە و لە تۆشەبەرەیەکی شڕی دەهاوێت. دەڵێت:

[80]- بروانە ابن عبدربە، العقد الفرید، ج ۳، ص ۱۹۵.

لێم پرسی ئەوە چی دەکەیت؟ وتی تۆ چارەیەکی باشترم بۆ پەیداکە، مێردم نەماوە سایەی لە سەرم بێت، ئیدی چەند کیژۆڵەیشم هەن، هیچیان لە دەست نایەت. ئیتر بۆ خۆی بەم ڕێگایەدا دێم و هەرچێکم دەستگیر بێت، دەیکەینە قوتی خۆمان و ژیانی پێ ڕایی دەکەین. گریا... زۆریش گریا و گوتی: بەو خوایە، تۆ و هاوشێوەکانی تۆ، سبەی پەلکێشی دەرەوم دەکەن تا خوێنم نەرژێت کوڵم لی نادەن...[٨١])).

بۆیە داوا لە خوێنەر دەکەم، کەمێک بەراوردی ژینی ئەم جۆرە کەسانە و عەیش و نۆشی خەلیفە و شەهوەتە پیسەکەی بکات، بزانێت کە ئەم ڕەجالانە لە سەردەمی ئەودا ژیاون.

بێگومان ڕۆژ دوای ڕۆژ، ژمارەی واعیزەکان لە گەشەدا بوون لەژێر سایەی دەوڵەتی عەباسیدا. ئیدی هەر وەزیر و گزیرێک تۆ دەتبینی، هەندێک لە ماڵ و سامانەکەی وەقفی مزگەوت و تەکیە و فەقێ و سوختەکان[٨٢] دەکرد. ئەوانەی کە دەهاتنە مزگەوتەکان، تا دەرس بخوێنن، یان بەندایەتی و پەرستش ئەنجام بدەن. پێوەری واعیزی سەرسووڕهێن و شاز ئەوەبوو کە لە هەمووی ڕەوانتر و گەیەنەرتر بێت، واتە هەم فەصیح و هەمیش بەلیغ بێت. لەولایشەوە بەقەد توانا و شارەزاییەکەیشی وەریان دەگرت لە لایەن خەلیفەوە. ئەگەر واعیزێک ناوی دەرکردبا بە بەلیغ و فەسیح، ئەوا خەلیفە و کوڕوکاڵی، دەربار و هەرچی حەشەم و خەدەمی هەبوون، هەموویان دەچوونە ئەوێ و لەوێ لە بەردەمی واعیزی خۆشدوودا ڕێز و ئیحترامیان

---

[٨١]- ابو فرج الاصفهانی، مقاتل الطالبین ص ٣٤١.

[٨٢]- سوختە قۆناغێك بەر لە فەقێیە، بۆ نموونە: مەلا دەرس بە فەقێ دەڵێتەوە، فەقێیش دەرس بە سوختە دەڵێتەوە، لەبەر هەندەیش پێی دەڵێن سوختە، گوایە لە حوجرە هەرچی کارێکە بە سوختەکان ئەنجام دەدرێت.

پێشکەش دەکرد وەک ئەوەی بە واعیزەکانی دیکەیش بڵێن، ئێوەیش چاو لەم بلیمەتە بکەن.

گەڕۆکی ئەندەلووسی، ئیبن جوبەیر، ئەو دەمەی لە سەدەی شەشەم سەردانی بەغداد دەکات، دەچێتە کۆڕ و مەجلیسی وەعزەوە، شتی سەیر و سەمەرە لای ئەوە کە بۆمانی بگێڕێتەوە. ئیبن جوبەیر لە سەرەتادا باسی ڕەوشتی بەغدادییەکان دەکات و بە ڕەوشت ناشیرین زەمیان دەکات، بە خراپترین دروستکراوی خودا دایان دەنێت. دواتریش دێت و سەرسامی خۆی لەمەڕ واعیزەکان و شێوەی وەعزیان نیشان دەکات و ئا بەم چەشنە باسیان دەکات: "بێگومان شێوازی خۆیانیان هەیە لە وەعز و ئامۆژگاری، پڕن لە بەرچاوڕوونی و ئاگاداری، ئاڕاستەیان دەکات بۆ ترس لە خودا و پارێزکاریی، بە شێوەیەک ڕەحمەتی خودا و بەزەییان بۆ دێنێتە خوار، دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی ئەوزار، لە بەڵای ئاسمانیش دەپارێزێت ماڵ و شار. کەچی سەرباری ئەمەیش لەبەر خراپی خەڵکەکە، ئەم واعیزانە وەک ئەوە بێت ئاسنی سارد بوکتن یان شیر لە گوانی گیسکە نێر بدۆشن."[83]

هەر ئەم ئیبن جوبەیرە، باسی وەعزی واعیزی بەناوبانگ، جەمالەدین جەوزی دەکات، کە خۆی ئامادەی وەعزەکەی بووە، وەسفی دەکات بە "مرواری هونەر" و دەڵێت: ((ئەو لە وەعزەکانیدا ناسکی بەدی دەکرا، ئایەتی ڕوون و ڕەوان بە گوێی ئامادەبواندا دەدرا، دڵەکان بۆی دەجۆشان، نەفسەکان پێی دەخرۆشان، تا وای لێ دەهات دەنگی پڕمەی گریان مزگەوتی دەتەنی، تۆبەکاران دڵیان لە تاوان دادەکەنی، وەها دەکەوتن بە سەرادا، وێنەی پەروانە بەسەر چرادا. سەریان دەهێنایە پێشەوە سا دەستێکی تێژەنێ، پاش ئەوەیش دوعایەکی بۆ

---

[83]- بروانە: ابن جبیر، رحلە ابن جبیر ص ١٧٣ – ١٧٤.

وەخوێنێ، هەیانبوو لە بەردەمیدا لە هۆش دەچوو، بە چوار دەستە دەبرایە دەرەوە و قوتار دەبوو، ناڵە و نرکەیەکمان بینی، کە خەڵکان دەکات تەوبە و پەشیمان، حاڵەکە دەیخستینەوە یادی ڕۆژی پەسڵان، ئەگەر بنیادەم لە ترسی گیرخواردن لە ناوەڕاستی زەریا، یان ترسی ونکردنی ڕێگا نەبوایە لە سەحرا، بار و بنەی بۆ ئەم جۆرە وەعزە لەو دوورەوە بپێچایەتەوە و بهاتایە تەنها بۆ ئەمە، هێشتاش لە قازانجدا بوو[84])).

لە قسەکەی ئیبن جوبەیرەوە دەردەکەوێت، کە لای بەغدادییەکان، گریان شتێکی زۆر بەچێژ بووە لە کاتی گوێڕادێران بۆ وەعز و نەسیحەت. ئەوان لە کاتی وەعزدا دەگرین، هاوار دەکەن، لەخۆ دەچن لە ترسی پەروەرێن، کەچی دواتر مێشێک میوانیان نەبوو ئەگەر لە بازاڕ تەرازووبازی دەکەن، یان بێگانەیەکی وەک ئیبن جوبەیر هەڵدەخەڵەتێنن.

هەر ئیبن جوبەیر باسی کۆڕێکی دیکەی وەعزمان بۆ دەکات، کە جەنابی خەلیفە و دایکی و هەندێکی دیکە لە مەحرەمانی کۆشک ئامادە بوون. ئەو لە بارەی جێکەوتی وەعزەکە لەسەر خەڵکی دەڵێت: ((ئاوی دەزاندە چاوان، خەڵکی وا لێ دەکرد بدوێن لەمەڕ حەزی پەنهان، خەڵکی هەڵپەیان بوو بچنە هەیوانی، تا لەسەر دەستی دەربڕن پەشیمانی، عەقڵ و هۆشەکان حەیرانن، کۆڕ و وەعزەکانی پڕ لە گریانن، نەفسەکان تێریان لێ نەدەخوارد، عەقڵیش باش سەری لە مەسەلەکە دەرنەدەکرد، وەها دەخرۆشان، کۆنترۆڵی خۆیانیان پێ نەدەکرا و ئارامیان لێ دەبڕا[85])).

[84]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٧٦.
[85]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧٧.

گومانم لەوە نییە كە خەلیفە لەگەڵ خەڵكی گریاوە، باشیش گریاوە، ڕەنگە لەهۆش خۆیشی چووبێت هەر وەك باپیرەی -هاروونە ڕەشید- لەهۆش خۆی دەچوو. لەوانەیە ئەو دەمە خەڵك زۆر لەسەر دڵی گران نەبووبێت كە خەلیفەماڵیان زەوت دەكات، چونكە دەیان بینی وا خەلیفە لە ترسی خودا دەبووریتەوە و مزگەوت بنیات دەنێت و پارە و پوول دەداتە واعیزان.

هەر بەڕاستی خەڵك لەو كاتەوە حەسایەوە، كە ئەمەیان كردە نەریت، پێشتر دەیان نالاند زۆر بە سەختی بە دەست دەردی "ململانێی دەروونییەوە"، هەر وەك پێشتریش باسمان كرد. ئەوان هەر خەریكی شۆڕش لە دوای شۆڕش بوون، بەلام لەو ساتەی ڕێگای دووفاقییان هەڵبژارد، كەمێك لە بار و مەینەتیان كەمبوویەوە، ئیتر لەمەو دوا بوونە خاوەنی دوو دڵ، بە یەكێكیان گوییان لە وەعز ڕادەدێرا و دڵەكەی تریشیان بۆ گۆرانی و مەمكی قووت و پارە. لەوساوە خۆیان نەجات دا لە ململانێی دەروونی و دوودڵی كۆمەلایەتی، وهم لا یحزنون.

* * *

دەگێڕنەوە "نیزامەدین شا"، وەزیری سەلجووقییەكان لە عێراق، پارەیەكی باشی لە مزگەوت و تەكیە و دەرسخانەكاندا سەرف دەكرد، لەسەر ئەم كارەی، لە لایەن گەورەكەیەوە "مەلیك شا"، عیتابی لێ گیرا كە بۆچی وا دەكات؟ ئەمیش وەلامی دایەوە: ((... تۆ سەرقاڵی چێژ و خۆشیت، لەناو شەهوەتا خەریكە نغرۆ دەبیت، لە دەفتەری كردەوەكانتدا، زیاتر خراپە دەنووسرێت وەك لە چاكە، ئەو

سوپایەیشی كە ساز و ئامادەت كردووە بۆ ڕۆژی تەنگانە، هەموو گێژ بوون لەناو بەزم و بادە و دەهۆڵ و زوورنادا، بەڵام من سوپایەكم بۆ ئامادە كردوویت، ناویان "سوپای شەو"ـە. ئەو ساتانەی كە سوپای تۆ خرەخەو بوون، سوپاكەی من بێدارن، بە ڕیز وەستاون و فرمێسك ڕەوانەی قاپیی پەروەردگار دەكەن و دوعاگۆن بۆ تۆ و بۆ سوپاكەت، تۆیش و سوپاكەیشت لە سایەی دوعاكانی ئەمانەوە شەو دەكەن بە ڕۆژ، لە سایەی فرمێسكە ڕەوانەكراوەكانی ئەمانەوە باران و ڕزقی ئاسمانتان بەسەردا دێتە خوارێ)). مەلیكشا ئەم وەڵامە پڕپێسەی بەلاوە پەسەند بوو، بۆیە متەقی نەكرد.

لەم وەڵامەوە ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەبێت، كە بابەتی ئاین بابەتێكی ئاسان و سەهلە، كابرا دەتوانێت هەرچییەك دڵخوازی بوو بیبات و دەستی بەسەردا بگرێت، خودایش لێی خۆش دەبێت ئەگەر بێتوو بەشێك لەم ماڵەی كە قۆرخی كردووە، ببەخشێت بە واعیز و زاهید و ڕەش و ڕەجاڵان، سا بەڵكو بڕۆن و دەستكەن بە دوعا و لە بەردەم خودادا بۆی بپاڕێنەوە و خوداش بیخاتە بەر عەفواتی خۆی. شایەنی باسە، دەكرێت بگوترێت، هەتا ستەمی كۆمەڵایەتی زیاتر گەشەوتەشە بكات، دروستكردنی مزگەوت و خوێندنەوەی وەعزیش پتر پەرە دەستێنێت. ستەمكاری قۆرخكار وادەزانێت كە لێرە مزگەوتێكی بنیات نا، خودایش لە بەهەشت تەلارێكی هەرە بڵند و زەلامی لە بری بۆ تاپۆ دەكات، یان ئەگەر نیعمەت و پوولی ڕژاند بەسەر واعیزاندا، پەروەرێن بۆی قەرەبوو دەكاتەوە بە حۆری و غیلمانی سەرمەدیی. خەمی هیچی نەبێت، ئەوەی لێرە، لەم دنیا فانییە لەكیسی چووە، ئەوە قەرزە و داویتی بە خودا، ئەوەیش قەرز بە خودا بدات، خودا چەندین بەرانبەر پێی دەداتەوە، بەڕاستی ئەو (پەروەرێن) بەسەر هەموو شتێكدا زاڵ و تەوانە.

خەڵکی لەسەر ئەم دووڕیانە بەردەوام بوون، تا ئێستایشی بە دەمەوە بێت هەر بەردەوامن. لەوانە ڕێگەمان پێ بدرێت ئەگەر بڵێین: ئەم دیاردەی دووفاقییە لەناو ئەو کۆمەڵگەیانەدا زۆر خەستترە کە واعیز و ئامۆژگاریکەریان زیاترە. خۆ ئەمانیش لە کردەوەکانیاندا هەروەک باقی خەڵکن، بەڵام بەوە جیا دەکرێنەوە کە زیاتر وەعز و فیقە و هاوار و ترساندن لە قیامەت دەڵێن و دەبیستن. ئەوەی بەدوادادچوون بۆ سیستەمی پەروەردەیی ئەم دەڤەر و بازێرانە بکات، زۆر بە ڕوونی دیاردەی دووفلیقانەیی بەدی دەکات. مامۆستای منداڵەکان، یان شێخی دەرسخانە، ماندوو نابێت لە پەند و نەسیحەتی منداڵەکان، داوای شوێنکەوتنی کیتابی خوا و فەرموودەی پەیامبەرەکەی دەکات، ئیدی ئەمە نە بە سەعاتێک و نە بە دوان و نە بە سیان تێر ناخوات، ئەو داخوازی ئەوەی لە تەلەبەکان هەیە، سەریان لەسەر سیپارەکە بەرز نەکەنەوە، تەماشای چەپ و ڕاستی خۆیان نەکەن، قسە نەکەن، گەمەوگەپ مەکەن، ئەگە بیتوانیایە، هەناسەیشی ئەچنین. ئەم مامۆستایە لە کارەکەیدا عەینی واعیزەکەیە، ئەمیش بە خەڵک دەڵێت و خۆی نایکات. بەم کارەیشی منداڵەکان بەرەو هەڵدێر ڕاگوێز دەکات. منداڵ ئەو سەعاتەی دەرسی وەک بەندینخانە لێ دەگوزەرێت. بۆیە ئەو کاتەی لە چنگە مامۆستا قوتاری دەبێت، چکلوپیکان بەو ناوەدا هەڵدەزنێت و دائەزنێت، ڕەنگە زیانێکیشی لە دەست بقەومێت. بەڵام ئەگەر لە دوورەوە مامۆستاکەی بینی، ئیتر خۆی دەکات بە شەریفی مەککە و ویقارێک لە خۆیدا بەرجەستە دەکات وەک بڵێیت ئەمە هەر کەسەکەی پێشتر نەبێت.

زۆر ئەستەمە دوو کەسایەتیت هەبێت، چونکە ناتوانیت لە دەرەوەی قوتابخانەش هەر ئاوا بە ویقار و بێچزە و فزە بیت، لە هەمان کاتیشدا ناتوانێت بەسەر سروشتی ناو ناخی خۆیدا زاڵ ببێت. بۆیە جارێک

زیـــادەڕۆیی لە بێــدەنگی و جـــاریكیش لە قرمەوقـــاڵەدا دەكـــات. لەم دۆخەیشدا ڕێک وەک كەسایەتی "دكتۆر جیكل و میستەر هاید"ی لێ دێت، كە یەكێكە لە ڕۆمانە ناسراوەكان.

قوتـــابی لە ســــەرەتاوە، وەک باووبـــاپیرانی بە دەســـت ململانێـــی دەروونییەوە ماوەیەک دەتلێتەوە، لە قوتابخانە وێنە و بەهای بەرز و وەعزی جوانی دەدرێت بە گوێدا، بەڵام هەر كە چووە كۆڵان و خۆی لەناو یەک دنیا دابونەریتی كۆمەڵایەتی و بەهای ناو خێڵ و بیاباندا بینییەوە، تووشی گرفت دەبێتەوە.

ئەو هەڵسوكەوتانەی منداڵ لە كۆڵاندا لەگەڵ هاوڕێكانیدا دەیكات، ڕێک بچووككراوەی هەڵسوكەوتی خێڵە سەحرانشینەكانە، كە چۆن ململانێ و جەنـگ و جـوێن بە یەک و لەگەڵ یەكـدا دەكەن. منـداڵان لە كـۆڵان فێری هەموو بەها خێڵەكییەكان دەبن، لە هەمان كاتیشدا لە مەدرەســە و دەرســخانە ڕادێن بە گـوێگرتن لە وەعـزی واعیـزان. بەم كارەشیان ئۆجـــاغی باوباپیرانیـــان ڕۆشـــن دەكەنەوە. كاتێـــک ئەم مێردمنـــداڵە پێدەگات، ئیتر واعیزەكان جێگەی مامۆستاكانی بۆ دەگرنەوە، بۆ هەر كوێیەک بـڕوات، واعیـزی لـێ نابڕێـت، ئەمە لە كاتێكدایە كە ژیـان بە شـێوەک دەڕوات، كە هـیچ تەبـا نیـیە لەگەڵ ئەم ڕیـتمە لە وەعـز و نەسیحەتدا.

واعیزی بووبووە پیشەیەک، كە لە ڕێگەیەوە نـان پەیدا دەكرا، پێگەی كۆمەڵایەتی بەهێز دەكرا، تەنانەت كارەكە وای لێهاتبوو، ئەوەی كە لە پیشەكانی دیكەدا فەشەلی دەهێنا، دەستی دەدایە وەعزخوێنی. لە هەر لایەكەوە بۆی دەڕوانیت كارێكی سادەیە، پێویستی بە هیچ نییە مەگەر چەنـد دەقێكـی پیـرۆز لە قورئـان و فەرمـوودە، پاشـان لەبەركردنـی جلوبەرگێكی كەش و فش بۆ چاوبەسـت و ڕاكێشـانی سـەرنج. خراپ نیـیە ئەگەر واعیـز ڕیشـێكی پـان و پـڕی هەبێـت و تەڕبووشـێكی

گومەزیشی لەسەردا بێت -تا زەلامتریش بێت باشترە-. دوای ئەمەیش ئەگەر بتوانێت هاوار و قیڕە بکات بەسەر خەڵکدا و بتوانێت بیانگریێنێت و خۆیشی بگریەت، وای لێ بێت کاتێک خەڵک لە وەعزەکەی دێنە دەرەوە بڕوایان وابێت خودا لێیان خۆش بووە و لە بەهەشتی فیردەوس، باخ و باڵەخانەی بۆ بنیات ناون. ئیتر دوای ئەوەی بووە واعیزێکی بەو جۆرە، ئەم جارە خۆشگوزەران و دەوڵەمەندەکان دێن و هێند پارە و پوولی بەسەردا دەبارێنن تا وەک خۆیانی لێ دەکەن و ئەویش وەک ئەوان دەبێتە خۆشگوزەرانێکی دڵخۆش.

ئەم نوێژ بە کرێ دەکات، ڕۆژوو بە کرێ دەگرێت، حەجی بەیتوڵلا بە کرێ بەجێ دەگەیەنێت، دەیشیەوێت خەڵکی وەک خۆی ڕۆژ و نوێژ بگرن و بکەن، ئەوی بیرچووەتەوە کە فەقیری و نەبوونی بنیادەم کوێر دەکات لە ئاست بینینی هەر شتێکدا، بێجگە لە هەوڵی پەیداکردنی پاروویەک قووزەڵقوورت، کە بیباتەوە بیکات بە دەمی منداڵەکانییەوە. ڕۆژێکیان بە کرێکارێکم گوت: هەی زندیق ئەوە بۆ ڕۆژووت نەگرتووە، ڕۆژەکە گەرماو چلەی هاوین بوو؟ زۆر بە توندی وەلامی دامەوە و گوتی: گەورەم ڕۆژوو بە تەنها لەسەر خەڵکانی بەرسێبەر فەرز کراوە. لەو ساتەدا هەستم کرد ناحەقیم بەرامبەر ئەو کرێکارە کردووە.

جارێکی تریشیان یەکێک لە واعیزەکانم بینی، خەریک بوو سەرکۆنەی هاروونە ڕەشیدی دەکرد، بە قسەی ئەو: ڕەشید قۆرخکار و موترەف بووە، ماڵی خەڵکی زەوت کردووە و لە شەهوەت و هەوەسبازیدا سەرفی کردووە. منیش پێم گوت: براکەم لەجیاتی ئەمەدا دوعای خێر بۆ ڕەشید بکە، ئەو و هاوشێوە موترەفەکانی ئەو، ئێوەیان گەیاندە ئەم گوزەرانە خۆشەی ئێستا، خۆ ئەگەر ئەوان نەبوونایە ئێستا

ئێوەش یان میوەفرۆش یان کۆڵبەر بوون.

ئەگەر ڕاستیت دەوێت، واعیز و ستەمکاران هەر لە قوماشی یەک تۆپن، یەکێکیان بە کردەوە ستەم لە خەڵکی دەکەن و ئەوی تریشیان بە زمان. ئەگەر واعیزەکان لەم مێژووەی کە ڕابورد خەریکی قسەی حەق و کۆشش لەپێناو مافی هەژاران و بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاراندا وەستابوونایە، ئێستا ڕۆژگارمان ڕۆژگارێکی دیکە بوو، گوزەرانی ئەم ڕووت و ڕەجاڵانەیش کەمێک باشتر دەبوو.

ڕۆژێکیان یەکێک لەم ستەمکارانە، پرسیارێکی زۆر شلۆق و ئیحراجکەرانەی لە فەقیە و پیاوانی ئاینی کرد: "کە ئایا مسوڵمانێکی ستەمکار باشترە یان بێباوەڕێکی دادپەروەر؟" هەموویان قوڕوقەپیان کرد، یەک دانەیان نەبێت کە بەغیرەت و ڕاشکاوانە گوتی: ((کافری دادپەروەر باشترە لە مسوڵمانی ستەمکار)) و لە مەجلیسەکە هەستا و گوێی بە هیچ نەدا. بەڕێز عەباس عەززاوی، حاشییەی لەسەر ئەم فتوا نامۆیە نووسیوە بەم شێوەیەی خوارەوە: ((بە هیچ شێوەیەک پەیڕەوی لەم فەتوایەی سەرەوە ناکرێت، بە تایبەت ئەگەر زانرا کە سوڵتان لەژێر چاودێری میللەتدایە و دەتوانن لەسەر تەخت و تاج بیهێننە خوارەوە ئەگەر هاتوو ساز و چاک نەبوو، ئەوەی کە پێویستە بزاندرێت ئەوەیە نابێت ڕازی بین بە دەوڵەتێکی کافر و پشتگیریکردن لێی، ئەمرۆیش بە شێوەیەکی گشتی، خەڵکی دەیانەوێت کەسێک لە خۆیان فەرمانڕەواییان بکات، ئیدارە و ئیرادەی خەڵک هەڵدەستن بە دانانی کەسێک کە خۆیان دەیانەوێت. هەڕەشەکانی پەروەردگاریش لە بارەی شوێنکەوتنی نامسوڵمانەوە زیاد لە یەک شوێن و دوو شوێندا ئاماژەی پێ دراوە[٨٦])).

---

[٨٦]- عباس العزاوی، تأريخ العراق بين الاحتلالين ج ١، ص ٢٦٢.

کاتێک ئەم پەرەگرافەی سەرەوە دەخوێنمەوە، ڕێک وا دەزانم واعیز خەریکە لەسەر مینبەر وەعز دەخوێنێتەوە و منیش دانیشتووم گوێ دەگرم. بەڕێز عەززاوی دەڵێت: پێویستە پشتگیری و پەیڕەوی لە سوڵتانی مسوڵمان بکرێت هەرچەندەیش زاڵم و ستەمکار بێت. بەڵگەیشی ئەوەیە سوڵتانی مسوڵمان لەژێر هەڕەشەی لابردن و دابەزاندندایە لەسەر کورسییەکەی لە لایەن میللەتەوە، ئەگەر هاتوو ستەمی کرد. ئەمە سەرباری ئەو هەڕەشە خوداییانەی کە لە ئیسلامدا هەیە لەسەر ستەم و ستەمکاری. بەڵام ئوستازی بەڕێز ئەو زنجیرەیە لە سوڵتانەکانی لە بیر چووەتەوە کە ئەو هەموو زوڵم و زۆرەیان کرد، لە ستەمدا نیرۆنی پادشای ڕۆمانییەکانیان پێ نەدەگەیشت، کە ئەو کاتەیش نە تووڕەبوونی میللەت، نە هەڕەشەی خودایی هیچ ڕۆڵێکیان نەبوو. هەتاوەکو سوڵتانی زاڵم دەورووپشتی بە واعیز و فەقیە قەرەباڵغ بێت، پشتیوانی بن لە کارەکانیدا و دوعای تەمەندرێژی بۆ بکەن، لە کوێوە بزانێت کە میللەت لێی تووڕەن یان بێزارن؟ یان ڕەنگە خودا لێی ڕەنجابێت؟ هەڕەشەی خودایی پێش بە ستەمی ستەمکار ناگرێت، چونکە ئەو لە کاتی ستەمەکەیدا پاساوی وا دەدۆزێتەوە بۆ ڕەوایەتیدان بە ستەمەکەی، کە لەوانەیە هەر لە خەڵکیشی بشێوێنێت کە ئەرە نەک ڕاست بکات.

خۆشبەختانە فەقیهەکان واژەیەکیان بۆ ئەم کارە دۆزیوەتەوە بە ناوی "حیلە شەرعی –فێڵی شەرعی"[87]. ئەمەیان کاتێک داهێنا کە، سوڵتان بۆ هەموو کارێکی فەقیهەکانی کۆ دەکردەوە و ڕاوێژی پێ دەکردن، ئێ گومانیشی تێدا نییە کە هەموو کارەکانی سوڵتان حەق و ڕاست نین، دەی ئەی چار چییە؟ وەڵا ئەم شتەیان داهێنا. ئیدی ئەگەر سوڵتانیان ببینیایە کە هەر لەسەر کارێک سوورە، ئەوا هەرچی دەقی ئاینی

[87]- احمد امین، ضحی الاسلام، ج٢ ص١٩٠.

پارادۆكسە لە جبەكەیاندا، دەیان هێنا و دەیان خستە بەردەم سولتانەوە تا ئەوە هەڵبژێریت كە لەگەڵ ئەودا گونجاوە. خۆ ئەگەر شتێكیش بێت ئەوا خودا گەورە و غەفوور و ڕەحیمە، دڵ لەدڵ مەدە.

دەڵێن كە "یەحیای كوڕی عەبدوڵلای عەلەوی"، لەو ناوچەی تەبەڕستانە لە "ڕەشید" یاخی بووبوو، شوێنكەوتەیەكی بەرفراوانی هەبوو، لە شار و لادێوە خەڵک پەیوەندییان پێوە دەكرد، ئیدی ناو و شۆرەتی دەنگی دابووەوە. بۆیە "ڕەشید" هەستا بە ناردنی وەفدێک بە سەردەستەیی "فەزڵی كوڕی یەحیای بەرمەكی"، فەزل داوای ئاشتی و سوڵحی لێ كرد لە جیاتی جەنگ و كوشتار، بۆیە یەحیایش گوتی دەبێت هاروون نامەیەكی ئەمان و پارێزگاریم بە دەسخەتی خۆی بۆ بنووسێت. ڕەشیدیش بەپەلە نامەیەكی ئەمانی بۆ نووسی و خۆی و پیاوماقوڵان و فەقیهەكانیشی كردە شایەت. هاوكات لەگەڵ نامەكەیدا كۆڵێک هەدیە و دیاری بەنرخ و ناوازەی ڕەوانە كرد. ئیتر "عەلەوی"، هاوڕێ لەگەڵ "فەزل"دا هاتنەوە بۆ لای خەلیفە، لەوێ ڕێز و ئیحتیرامێكی زۆریان بۆ دانا، خەلیفە ماڵ و موڵكێكی باشی خستە بەردەستی و فەرمانی بە خەڵكیش كرد بچنە سەردانی. بەڵام پاش ماوەیەک هاروون كەوتە فێڵ و تەڵەدانان بۆی. هەستا هەموو فەقیهەكانی كۆ كردەوە و داوای لێكردن فتوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەكەی یەحیا عەلەوی بۆ بدەن. چیرۆكی كۆڕی فەقیهەكان زۆر گرنگە لە ڕووی كۆمەڵایەتی و دەروونییەوە. تێیدا دەبینین ڕۆڵی فەقیهەكان چەندە گرنگە لە بەرهەڵستی زاڵم و ستەمكاران بە ترساندنیان بە سزای خوایی. فەقیهی بەناوبانگ "موحەمەدی كوڕی حەسەن" كە هاوڕێی ئەبو حەنیفە بوو، ویستی ئەوە بە ڕەشید بڵێت كە بەڵێننامەكە دروستە و ناكرێت هەڵبوەشێنرێتەوە، "ڕەشید"یش مشتومڕی لەگەڵ كرد، بەڵام ئیبن حەسەن هەر مكوڕ بوو لەسەر

ڕەئەکەی خـــۆی، ئەمەش بـــووە هـــۆی ئەوەی ڕەشـــید ڕقـــی لـــێ هەڵگرێت[88]. ڕەشید تەماشـای فەقیهێکی دیکەی کرد، ئەویش "ئەبو بەختەر"ی قازی بوو، لێی پرسی و ئەویش خێرا وەڵامی ئامادە بوو، فتـــوای بـــۆ دا کە بەڵێننـــامەکە لە چەنـــد ڕوویەکەوە نوقســـانە و هەڵوەشـاوەتەوە و ئیـدی بە هەڵوەشـاندنەوەیەکی شـەرعییانە (حـیلە شـەرعی) کارەکەیـان بە دوایـی گەیانـد. ڕەشـیدیش بە دەنگـی بڵنـد و دڵێکی خۆشەوە گوتی: "تۆ شازی قازیت، قازیی گشت قازییەکانی، تۆ باشتر لەم کـارانە دەزانیت و ئەمـانە پسـپۆڕی خۆتن"، ئیدی ڕەشید بەڵێننامەکەی پارەکرد و بەختەرییش یەک وۆقە تفی تێکرد[89].

ئـێمە بەتەواوی لە ڕاسـتی و دروسـتی ئەم چیـرۆکە خەبەردار نـین، بەڵام ئەوەی نەفسییەتی سوڵتانەکان بخوێنێتەوە، وا گومـان دەبـات کە چیرۆکێکی ڕاسـتە، چـونکە ئـاوەزی بنیـادەم وەک ڕووەک وایە، ئەو شتانە لە خاکەوە وەردەگرێت کە بۆ خۆی پێویستن و لەگەڵ مەزاجیدا گونجاون و ئەوانی دیکە ڕەفز دەکاتەوە.

ئەگەر یەکێک هات و ویستی وەعزی سوڵتان بکات، ئەوا لە دوو ڕێگا زیاتری نییە، یان ئەوەیە بە شانوباڵی سوڵتاندا هەڵدەدات و بۆی پان دەکـاتەوە، یـان ئەوەتـا بە قسـەکانی سـەغڵەت و دڵنیگەرانـی دەکـات. کەمترینـی سـوڵتانەکانیش بەوەی دوەمیـان قایـل دەبـن، بە وەعزێـک کاریگەر دەبن کە پێچەوانەی هەوا و مەزاجی خۆیـان بێت. زۆرینەی سـوڵتانە ستەمکارەکان، خۆیان نـازانن کە ستەمکارن. ئەو بەهـانە بۆ هەموو کارە قەباعەتبارەکانی خۆی دەهێنێتەوە. ئەگەر واعیزێـک هـات و گوتی: "خودا دەرحەق بە ستەم، تووڕە دەبێت"، سـوڵتان سـەری بۆ

[88]- بنواڕە سەرچاوەی پێشتر. ج٢، ص ٢٠٤.

[89]- بۆ درێژەی چیرۆکەکە، بڕوانـە: موحـەممەد برانق، البـرامکە فـی ضلال الـخلافە، ص ١٩١ ــ ١٩٨.

دەلەقێنیت کە ڕاست دەکەیت و پێی دەڵێت: "هەر بژیت، بارەکەڵڵا". ئەو نازانێت خۆی لەم قسانەدا ئامانجە، چونکە ئەو ئەرخایەنە لەمەڕ عەدل و عەدالەتی خۆی. لەوانەیشە دیاری و مجەوهەراتێکی باشیش بدات بەو واعیزە فرمێسک لەچاو ڕژێنە.

ئەو قسەیەی کە تۆ بە سوڵتانێک بڵێیت "عادل بە"، ڕێک وەک ئەوە وایە بە شێتێک بڵێیت "عاقڵ بە". شێت وا دەزانێت خۆی تاقانە ژیری ناو هەموو شێتەکانە. خۆ ئەگەر هات و پێت گوت: "پێویستە لەسەر بنیادەم عاقڵ و ژیر بێت"، ئەوا پێت دەڵێت: "دەمخۆش، عەقڵ تاجی زێڕینە بۆ بنیادەم". ئەو نازانێت ئەم قسەیە ئاڕاستەی ئەو کراوە. ئیبن جوبەیر دەڵێت: "ئەوکاتەی "ئیبنول جەوزی" خەریکی وەعز بوو لە خزمەت خەلیفە و دایکیدا، سەرەتا دەستی کرد بە پیاهەڵدان و پەسنی جەنابی خەلیفە و، نزاکردن بۆ خۆی و دایکی. گوزارشتی لە خەلیفە کرد بە "سایەبانی هەرە شەریف و زۆر بەڕەحم سۆز". پاشان دەستی کرد بە وەعزدان. دواتریش دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئایەتەکان تا فرمێسک زایە چاوی ئامادەبووان[٩٠].))

ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە ئەوەیە، کاتێک ئیبنولجەوزی وەعز دەدات، لە سەرەتادا دوعای خێر و تەمەندرێژی بۆ خەلیفە دەکات و لە خودا دەپاڕێتەوە سێبەری فراوان و بەرقەرار بکات. بەڵام کە ڕوو دەکاتە ڕەش و ڕووت و داماوەکان، دەست دەکات بە هەڕەشە و ترساندنیان، وەک ئەوەی میللەت ستەمکار و خەلیفە ستەملێکراو بێت. خەلیفە لە قسەی ماستاوچییەکانی دەربارەوە بەتەواوی دڵنیا دەبێتەوە کە ئەو، سێبەری خودایە لەسەر زەوی. فەرمانکردن کاری ئەوە، گوێڕایەڵیش کاری ڕەعیەت. ئەگەر بێفەرمانییان کرد، ئەوا بێ سێودوو، زندیق و نەفرین لێکراون لە لایەن خودا و بەندەکانی

---

[٩٠]- بنوارە: ابن جبير، المصدر السابق، ص ١٧٧.

خودایشەوە. یەکێک لە شاعیرەکان هات بە شان و باڵی "ڕەشید"دا، گوتی: ((وەک بڵێیت دوا پێغەمبەر تۆ پێغەمبەر بیت)). دانەیەکی دیکەیان بەناوی "مەغزی فاتیمی"ەوە گوتی:

ما شئتَ لا ما شاءتِ الأقدارُ

فاحكُمْ فأنتَ الواحد القهّارُ

ئەوەی تۆ نەتەوێت، قەدەریش نایەوێت

برانە، تۆ خۆت تاقانە و بەدەسەڵاتیت

وەسفی موتەوەکیلیشیان دەکرد کە گوایە "سێبەری درێژکراوەی خوایە، لە نێوان خودا و خەڵکدا."[٩١]

*** *** ***

دەمیری لە کتێبەکەیدا دەگێڕێتەوە، کە ڕەشید یەکێک لە زاهیدە گۆشەگیرەکانی دەعوەتی کۆشک کرد، کە ناوی "سوفیانی سەوری" بوو، تا لە خۆی نزیک بکاتەوە و ڕیزی لێ بگرێت وەک ئەوەی بە پیاوانی دیکەی ئاینیی دەکرد. سووفیانیش یەک نامەی زبری بۆ ڕەوانە کرد، کە دەقەکەی بەم شێوەیە بوو: ((ئینجا... من ئەم پەیامەم بۆت نووسی تا تێت بگەیەنم کە حەبلی نێوانمان پچڕاوە، خۆشەویستیم بۆت نەماوە، تۆ بە نامەکەی کە بۆت ناردم، منت کردە شاهید بەسەر خۆتەوە، کە تۆ هێرشت کردووەتە سەر بەیتولماڵی موسوڵمانان و دابەشت کردووە بەسەر کەسانی ناشایستەدا. بەوەیشەوە ڕانەوەستاوی کە کردووەتە، بەڵکوو بە نووسینەکەت

[٩١]- بڕوانە: جرجی زیدان، سەرچاوەی پێشوو، ج ٤ ص ١٩٥.

منیشت كردووە بە شاهید بەسەر خۆتەوە. بەڵام من، خۆم و ئەو هاوەڵانەیشم كە گوێبیستی نامەكەت بووین، سبەی لە بەردەم خودای دادەوەر و عادلا، شایەتیت لەسەر دەدەین كە: ئەی هاروون تۆ پەلاماری خەزێنەی موسوڵمانانت داوە بەبێ ڕەزامەندی خۆیان. پێم بڵێ ئایا تۆ بە پارەكە دڵی كەسانێكت خۆش كردووە تا بێنە ناو ئاینەوە؟ یان ئەوانەی كە زەكات كۆ دەكەنەوە و دوایی چاودێری خەزێنە دەكەن؟ ئایا پارەكەت داوە بە هەژار یان ئەوانەی جیهاد لە ڕێگای خودادا دەكەن؟ ئایا بەم كارەت هەڵگرانی قورئانت بەسەر كردووەتەوە؟ یان دڵی دوو بێباوك و دوو بێوەژنت پێ خۆش كردووە؟"[92])). بەڵێ هەندێك جاریش واعیزی ئاوا نامۆ، ڕووبەڕووی سوڵتان دەبێتەوە. بەڵام چ سوود؟ یەك دانە بەتەنیا، لەناو هەزار دانەی كە بە دەورووپشتی سوڵتاندا دێن و دەچن و چەورەیی بۆ دەكەن، چی پێدەكرێت؟ وەك ئەوەی شاعیر دەڵێت: "سوودی بنیاتنەرێك چییە، ئەگەر لەو ناوەدا هەزار ڕووخێنەر هەبن؟" زۆرن ئەوانەی ئەم واعیزە بێگوێیە (بێگوێی سوڵتانی كردووە لەوەی نەبووەتە ماستاوچی) تۆمەتبار دەكەن بە زندیق و دواتریش سوڵتان فەرمانی كوشتنی بۆ دەردەكات- ئیتر بە حسابی ئەوان ئەم بێگوێیە، دنیایش و ئاخیرەتیشی لەكیس چووە.-

دەگێڕنەوە كە ڕەشید لە مەككە بوو، خەریكی بەجێهێنانی فەریزەی حەج بوو، بینیان بەكوڵ واخەریكە دوعا بۆ پزیشكە مەسیحییەكەی دەكات (جوبرەئیلی كوڕی یەخشوع). ئەوانەی كە لە دەوروبەری بوون ڕەخنەیان لێگرت و پێیان گوت: "ئەو لە ئەهلی زیممەیە". بەڵام ڕەشید پاساوی بەوە هێنایەوە، كە دوعا بۆ دكتۆرە مەسیحییەكەی جائیزە، چونكە لە سوودی موسوڵمانانە، پاساوەكەیشی ئەمەبوو:

---

[92]- الدمیری، حیاە الحیوان، ج٢ ص ١٨٨.

(لەوانەیە بە بەڵگەی لۆجیکیشی دانابێت)، کە تەندروستی خەلیفەی موسوڵمانان لە ئەستۆی دکتۆرەکەیدایە، هەتا ئەو دەمەی چاکەی موسوڵمانانیش بەند بێت بە چاکیی خەلیفەکەیانەوە، ئەوا چاکیی ئەوان بەستراوە بە تەمەندرێژی و دڵخۆشکردنی دکتۆرەکەوە، بە چاوپۆشی لە هەر دین و مەزهەبێک کە هەیبێت. بەڕاستی، وەک دەڵێن: دەستاوێژێکی[٩٣] لۆجیکی بەهێزە. ئەم جۆرە لە شیتەڵ و هەڵێنجاندنانە، بیری بەڵگەهێناوەی پیاوانی ئاینیمان دەخەنەوە، کاتێک دەیانەوێت بەڵگەوبەڵگەکاریی لەسەر شتێک بکەن[٩٤]. ئەم جۆرە لە ئەنجامگیریی، پشت دەبەستێت بەو قیاسە ئەرستۆتالیسییە سەرسوورهێنە، کە بەڕاستی زۆر سەیر و سەمەرەیە، کە دەتوانرێت هەرشتێک دڵت حەزی لێی بوو بیسەلمێنیت و ئەوەیشی پێت خۆش نەبوو نەریی بکەیت.

ئەم قیاسە ئەرستۆتالیسییە بووەتە ئامرازێکی هەرە بەهێز بەدەست سوڵتان و ستەمکار و واعیزەکانەوە، ئەمە لە کاتێکدا خەڵک بە ڕوونی دەیانبینێت وا خەریکی زوڵم و ستەمن، کەچی ئەوان هەر لە بەزم و بالۆرەی خۆیان ناکەون و لەسەری دەکەنەوە.

ئەگەر یەکێک لەو ملهوڕانە، کەنیزەیەکی کڕی بە سەد هەزار دینار، ئەوا دەتوانێت بەشێوەیەک لە شێوەکان، بە سوودوەرگرتن لەم بنەما لۆجیکییە، ڕەوایەتیی بدات بە کارەکەی، کە کڕینی ئەم کەنیزەکە لە سوودی موسوڵماناندایە، چونکە ئەم کارە دڵی سوڵتانەکەیان خۆش دەکات، دڵخۆشی موسوڵمانانیش بەستراوە بە دڵخۆشی سوڵتانەکەیانەوە، ئاو بێنە و دەست بشۆ. دکتۆر ئەحمەد ئەمین، بەرگریی لە ڕەشید دەکات و دەڵێت: "ڕەشید دەردراوی بارودۆخە

---

[٩٣]- دەستاوێژ: بەڵگە.

[٩٤]- بڕوانە: ابن ابی اصیبعە، طبقات الاطباو ج ١ ص ١٣٠.

کۆمەڵایەتییەکەی سەردەمی خۆیەتی. هیچ کەسێکی ئەم سەردەمە، ئەگەر بگەڕێتەوە ئەو چاخە، ئەوا هەر ئەوە دەکات کە ڕەشید کردوویەتی و هەمان ئەو ڕەفتارانەی دەنواند کە ئەو نواندوویەتی". هەروەها دەڵێت: "با شتەکان بەو شێوەیە وەربگرین کە تێپەڕیون، ناکرێت بە پێوەرە ئەمڕۆییەکان کارەکانی لە بێژنگ بدەین، بەڵکوو دەبێت بنوارینە پێوەرەکانی سەردەمی خۆی[95]، پاشان ئێمە نایشزانین پاساو و بەڵگەکانی ڕەشید چی بوون و لەسەر چی بنەمایەک ئەم کارانەی ئەنجام داوە[96].))

دوور و نزیک قسەکەی "ئەحمەد ئەمین" ڕاستە، ئێمە چاوەڕوانی ئەوە نین کە هاروونە ڕەشید وەک عومەری کوڕی خەتاب زاهید و لەخواترس و عادل بێت، لەبەر ئەوەی ئەو لە سەردەمی خۆشی و خۆشگوزەرانیدا ژیاوە، سەردەمێک کە خۆشگوزەرانی بووبووە پێوەری پیاوەتی، هەتاوەکوو سوڵتان و فەرمانڕەوا کۆشکەکەی بڵندتر بوایە، لای خەڵک بەقەدرتر تەماشا دەکرا. ڕەشیدیش لەم کارەیدا لۆمە ناکرێت، بەڵکوو لەسەر ئەو دووفاقییە لۆمە دەکرێت لە کەسایەتی خۆی و ئەوانەی دەوروبەریی لە واعیز و فەقیهاندا هەیە. ئەو لە خۆی دەبووری کاتێک کەنیزەیەک بە ١٠٠ هەزار دینار دەکڕێتەوە، یان لە پەیمانێک پاشگەز دەبێتەوە کە بە دەسخەتی خۆی نووسراوە و مۆری لێ دراوە. یان خوێنی خەڵکی بێتاوان دەڕژێنێت. بەڵام هەرگیز لێخۆشبوونی بۆ ڕەعیەت و ڕەشوڕووت نییە، ئەگەر هەڵەیەک، دزییەک، کافرێتییەکیان لەدەست دەرچێت. ئەگەر گوێ لە پاڵنەرەکانی ئەوانیش بگریت، ئەوا هەروەک سوڵتان، ئەمانیش دەردراوی دۆخە

[95]- یەکێك نەبووە بەم ئازیزەمان بڵێت، باشە ئەی ئێمە پێوەرەکانی سەردەمی هارونەڕەشید لە کوێوە بزانین. وەرگێر.

[96]- احمد امین، ضحی الاسلام، ج ٣ ص ١٦٢.

کۆمەڵایەتییەکەی خۆیـانن و پـاڵنەری دەروونـی و کـۆمەڵایەتی پـاڵی پێوەناون.

فەقیـر ئەگەر تیلەچـاوێکی گـرتە کیـژۆڵەیەک، دنیـای بەسـەردا کـاول دەکەن، بەڵام دەوڵەمەنـدێک، دەچێـتە بـازاڕ و سـەدان دۆت پـێکەوە دێنێتەوە و بە هەوەسی خۆیان غەمزە و نازی بۆ دەکەن و حەڵاڵیشە. ئەگەر سـتەمکار لە ڕێنماییەکـانی ئـاین دەرچـوو، پێـی دەڵـێن: ئەوە موجتەهیـدە، موجتەهیـدیش ئەگەر پێکـای دووان و نەیشـیپێکا هەر پاداشـتێکی بـۆ هەیە. بەڵام ئەگەر داماوێـک، لە پـاش تێڕامـان و بیرکردنەوە، بیروڕایەکی نوێی بۆ هـات، خێرا پێی دەڵین: زەندیقی خوانەنـاس. خێرایش خـاچی بۆ ئامـادەیە و فەرمـانی لەخاچدانی بـۆ دەردەکرێت.

دەگێـڕنەوە کە بیشـری مورەیسـی، کـابرایەکی مـوعتەزیلی بـووە، وتبـووی قورئـان مەخلـوقە. ڕەشـیدیش کە بیسـتبوویەوە، گوتبـووی: "بیسـتوومە دەڵـێن: بیشـر وتـوویەتی قورئـان مەخلـوقە، سـوێندم بە پەروەرێن، ئەگەر بەرچنگم کەوێت، ساردی دەکەمەوە"[٩٧]. ئیدی "بیشر" بەدرێژایی ژیانی، خۆی حەشاردابوو لەتاوی هاروون. گومانی بەهێزم ئەوەیە ئەگەر هاروون بە شوێنەکەی زانیبا، ئیننا لیللای بۆ دەخوێند[٩٨].

ئەو تـاوانەی کە ئەم دامـاوە تووشـی بووبـوو، بەتەنهـا بریتـی بـوو لەوەی کە "قورئـانیش وەک هەمـوو شـتەکانی دیـکە، دروسـتکراوی دەستی خودایە". یەکەمجار کە چیرۆکەکەم خوێندەوە وامزانی کابرا ویستوویەتی قورئانێک بۆخۆی دروست بکات، کەچی دوای تۆزێک تێگەیشـتم نـا، ئەمـیش هەروەک ڕەشـید بـڕوای بە خـوا و قورئـان و پەیامبەر هەیە، تەنها یەک تاوانی هەیە، ئەویش ئەوەیە دەڵێت قورئان

---

[٩٧]- ساردی دەکەمەوە: کینایەیە لە کوشتن، واتە دەیکوژم.

[٩٨]- احمد امین، ضحی الاسلام ص ١٤٧ و ص ١٩٧.

دروستکراوی خودایە. فەقیرە بەم وتەیەی، هەر سات لە بەردەم هەڕەشەی کوشتندا بوو.

دەگێڕنەوە کە کابرایەکی خەڵکی نەهرەوان، لە سەردەمی "هادی"دا، حەجی بەجێ هێنابوو، کاتێک ئەو خوردەمەی بینیبوو کە چۆن بە دەوری کەعبەدا بەپەلەپەل دەخولێنەوە، گوتبووی: "دەڵێیت مانگای دەوری ئاخوڕن". کاتێک کە هادی ئەم لێکچواندنە نەشمیلانەیەی دیتبوو، دەستبەجێ فەرمانی کوشتنی دەرکردبوو، دواتریش لەخاچیان دا[99]. دەڵێن لەوکاتەدا، هادی فەرمانی دەرکرد کە سەد دانە پەلکی دارخورما ئامادە بکەن، تا هەموو ئەو زندیقانەی کە وەک ئەم بیر دەکەنەوە لە خاچ بدات. دەقی قسەکەی کە گەیشتووەتە دەستمان ئەمەیە: "سوێندم بە پەروەردێنتان، ئەگەر بمێنم، مۆڵەتی چاوپرتاندن نادەم بەم زەندیقانە، دانە بەدانەیان لە دار دەدەم"[100]. بەخت و ئیقباڵی خەڵکەکە لەکاردابوو، هادی بەرلەوەی فەرمانەکەی جێبەجێ بکات، تەمەنی درێژی بە ڕەعیەت بەخشی.

ئەم جۆرە هەڵوێستە توندانەی ڕەشید و هادی برای، دەرهەق بە زەندیقەکان، جێگای دڵخۆشی و پیاهەڵدانی واعیز و فەقیهەکان بووە. بەڵام یەک تۆزقاڵ بەهانە یان پاساوی ئەو ڕەجاڵ و خەڵکە ڕەشوڕووتە بەهەند وەرناگرن. خۆ ئەم زەندیقانەیش هەر لە خۆیانەوە ئەم مەزهەب و بیروبڕوایەیان بۆ نەهاتووە، مەگەر ئەمانیش زادەی کولتوور و کۆمەڵگەی خۆیانن، لە باوباپیرانیانەوە ئەمانیش ئەم شتانەیان پێگەیشتووە. مرۆ هەرگیز ناتوانێت ئەرێ یان نەرێی ئاینێک بکات تەنها بە بیرکردنەوەی پەتی.

---

[99]- سەرچاوەی پێشوو/ ج ٣ ص ١٤٨.

[100]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج ٣ ص ١٤٧.

ســـەمەرە ئەوەیە، هەنــدێک فەقیــە، بڕوایــان وایە، زەنــدیق دەبێــت بکوژرێت، تەوبە و مەوبە حسـاب نییە، بـا هەزار سـاڵ بڵێ نەمزانـی، یان پەشیمانم، دەکوژرێت و تەواو. ئەم فەقیهانە، هەرگیز سزای ئەو ملهوڕانە نادەن، کە بە دەسبڵاوی و خۆشگوزەرانیی خۆیان، خەڵکیـان بەرەو زەندیق بوون بردووە، بەڵکوو تەنها هەقیان بە ئەنجامەکانەوە هەیە[١٠١].

ئیمـانی بنیـادەم تووشــی ئەمـبەر و ئەوبەر دەبێـت، کاتێـک دەبینێـت سوڵتان ماڵی مەردووم لە زگ و ژێرزگی خۆیدا خەرج دەکات. ئەوەتا مـاڵبڕاو بە تاوانبار دەرچوو، چەتە و تـاڵانچیش وەک بەرزەکی بانـان بۆی دەردەچن.

*** *** ***

---

[١٠١]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج ٣، ص ١٩٤.

# بەشی سێیەم

# وەعز و چاكسازیی كۆمەڵایەتی

واعیزەكـــان بڕوایـــان وایە، هەتـــا زیـــاتر دەنـــگ بەرزكەنەوە لە وەعزەكانیاندا و بە بڵندتر ئامۆژگاری خەڵكی بكەن، ئەوا كاریگەری زیاتر دەبێت لەسەر ڕازاندنەوەی ڕەفتاری ئەو خەڵكە. شتەكە لای ئەمان وەك باڵابەرێك وایە، ئەوان لە سەرەوە خەڵكڕاكێشن خەڵكیش بەرز دەبێتەوە. ئەوان بەم كارەیان لاسایی بازرگانێك دەكەنەوە، كە بۆ ئەوەی ماڵەكەی، هەر هیچ نەبێت نرخێكی مامناوەندی بۆ بكات، سەرەتا لە نرخێكی بەرزەوە دەست پێ دەكات و دوای كەم كەم دێتە خوارێ. وەك ئەوەی ئەمان وابزانن، چاكسازی لە ڕەوشت و ئاكاردا، وەك كار و كەسابەت و مامەڵەی مەزاتخانە وەهایە. بیریان چووە كە ڕەوشت شتێك نییە وەك شمەك كرین و فرۆشتنی پێوە بكرێت. سروشتی مرۆیش كۆمەڵێك پێوەر و پێودانگی هەیە كە ناكرێت پایماڵ بكرێن، ئەگەریش كەسێك لەم پێودانگانە فەلەت بكات، وەك ئەوە وایە خەڵكی بانگێشتی ناو تاوان و خراپە بكات.

مـــرۆ تووشـــی بێهیـــوایی دەبێـــت، ئەگەر بینـــی پێـــوەرە ســـتانداردە ئەخلاقییەكـــان زۆر لەمەوە دوورن، ئیـــدی كـــاری لەبەر نـــاڕوات و پشتگوێی دەخات، یان لەوانەیە هەر گاڵتەیشی پێ بكات. بۆیە گرنگە واعیـــز، شـــتە ئەخلاقییەكـــان لە ئاســـتێكی مامناوەندیـــدا بە خەڵكـــی

ڕابگەیەنێت، تا خەڵکیش هان بدرێن بۆیی و شانی لەژێر بهاوێن و پێشبرکێی لەسەر بکەن.

دروشمی واعیز بریتییە لە: "پێشەنگی بەرز (القدوه العالیه) و بزۆک، لە پێشەنگی نزم (القدوه الواطئه) و سست باشترە"، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەم قسەیەی سەلماندووە، کە "پێشەنگی هێواش" باشترە و زیاتر دەمێنێتەوە، چونکە ئەمە هانی مرۆ دەدات نەرمەنەرمە کاری خۆی بکات بە گەشبینی. بەڵام پێشەنگی بزۆک و چالاک، کەمینەیەک نەبێت کەس ناتوانێت پێی بگات، تەنانەت لای هەندێک هەر دەبێتە جێگەی مەسخەرە و گاڵتەپێکردن، هەر فشەیان پێی دێت.

بوونە پێشەنگێکی بلند، وەک چیرۆکی ئەو ڕێوییە وایە کە پاش چەندین جار هەوڵ و تەقەلا، دەستی بە بۆڵەترێیەکە نەدەگەیشت، ئیدی بێهیوای داغانی کرد و وتی من ئەم ترێیە چۆن دەخۆم، ترشە، کێ ترێی ترش دەخوات. فەیلەسووفانی هاوچەرخ لە بواری پەروەردەدا، خوێندکارەکانیان هان دەدەن بۆ سەما و گاڵتەوگەپ و پێکەنین، هانیان دەدەن بۆ دڵداری لە ڕۆژی نیوەڕۆدا. ئەگەریش بە چاوی دڵ تەماشاکەیت، دەیانەوێت ئەم پەیامەمان پێ بگەیەنن: "لە ڕووناکیدا سەما بکەن، نەک لە تاریکیدا". بەم کارەیشیان داوای شتێکی ئاسانیان کردووە. کەچی واعیزەکانمان، دەمانترسێنن بە ئاگری جەحەندەم، ئەگەر هاتوو خۆشەویستییان کرد، یان سەمایان کرد، ئەگەریش وەک باڵدارێک چۆن لە کاتی سەربڕیندا لەتاو ئێش، خۆی ڕادەپسکێنێ -هەڵپەڕکێ لەتاو ئێش.-

دەیانبینیت داوای ویقار و ئارامگریی لە خەڵک دەکەن، کەچی نازانن ئەم ویقارە دەسکردە، دوایی خاوەنەکەی بەرەو سەمایەکی دەروونیی پیس دەبات.

*** *** ***

لە سەرەتای ئیسلامەوە شۆڕشگەلێکی شکستخواردوومان بینی، بەتایبەتی لە شاری کوفە. خەڵکی کوفە کە پەیمانێکیان بە ئەمیرێک دەدا، دوایی هەر دەبوایە بدەن لە بنی پەیمان و غەدری لێ بکەن. وای لێهات، لەو ناوچەیەدا جووت وشەی "پەیمان و غەدر" بوونە هاوواتا. تا ئێستایشی بەدەمەوە بێت، خەڵکی عێراق، بەو کەسەی کە غەدر دەکات دەڵێن: "پەیمان دەدات". هۆکاری ئەم پەیمانشکێنییە کۆمەڵایەتییەیش، بریتییە لە: "دووری داخوازییەکانی واعیز، لە ژیانی ڕاستەقینەی خەڵکەوە". خەڵکیش لە واعیزەکانەوە ڕاهاتوون باس لە نموونەی باڵا و بنەمای بەرز بکەن، چونکە هێندەیان لەوانەوە چەنبارە بیستووەتەوە. بۆیە زۆرجار بینراوە کە بە سەرکردەکانیان گوتووە: "هەستن و ببزوون، ئێمەیش لەگەڵتانین". بەڵام هەر کە بینییان سەرۆک شۆڕشی بەرپا کردووە و ئەنجامی شۆڕشەکەیش لەدەستدانی ماڵ و ڕشتنی خوێنی لێکەوتووەتەوە، خێرابەخێرا لە قسەیان پەژێوان دەبنەوە، دەگەڕێنەوە بۆ واقیع و لەو خولیا و خەیاڵاتانە دێنە دەرەوە کە پێشتر بیریان لێ کردبووەوە.

سەرکردەیش وەک ئەو عالەمە، ئەویش پاداشتی لەسەر هەوڵ و ماندووبوونەکانی دەوێت، ئەگەر زانی وا خەڵکەکە خیانەتکارن، ئەویش لە ماڵ و حاڵی خۆیدا لێی دادەنیشێت. سەرکەوتنی سەرۆکێک دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکیش چاوی لێبکەن و ڕێگاکەی ئەم بگرن. لەوانەیە هەندێکجار سەرۆک، هەر بە پاداشتێکی کۆمەڵایەتی داسەکنێت و داخوازیی پاداشتی ماددیی نەکات. خۆیشتان دەزانن، ئەگەر سەرۆک بینیی وا خوڕدەمێک دەوری لێ داوە و ڕێزی بۆ دادەنێن، لە خۆشییان سەری دەدات لە کەشکەشان. مرۆڤ بە خۆشەویستنی ناوبانگ و پێگەی کۆمەڵایەتی، لە ئاژەڵان جودا

دەکرێتەوە. خەڵکێکی زۆر هەن ماڵیش دەبەخشن تا کەمێک پێگە و ناوبانگی کۆمەڵایەتییان چنگ بکەوێت.

ئەگەر بێین و سروشتی بنیادەم بخوێنینەوە، دەبینین هەڵپەهەڵپێکێتی بە دوای ناوبانگدا، کە نە حەدی هەیە نە حیساب. ئەوەیش بزانە، تا ناوبانگەکە زیاتر بێت، هەوڵ و تەقەلای بۆ زیادکردن و پتەوکردنیشی زیاتر دەبێت. ئەمە بریتییە لە خۆشویستنی کورسی. لەو ناوچانەی کە ڕێز لە دەسەڵاتداران دەگیرێت. ئەگەر بینیت، وا خەڵک خەریکن چەپڵە بۆ سەرکردەیەک لێ دەدەن و بە دەوروخولیدا دێن و دەچن، ئەوە باش بزانە، ئەو سەرکردەیە هەموو شتێک دەکات بۆ ڕازیکردنی ئەو جەماوەرە، تەنانەت ئەستەمیش. سەرکردەیش هەر بنیادەمە، هەر لەو قوڕە پێکهاتووە کە ئەوانی لێ پێک هاتووە. ئەویش حەزی لە ناوبانگ و پلەوپایەیە وەک ئەو خەڵکانەی دیکە، بۆیە ئەگەر دیتی، ناوبانگ و شۆرەت، لە ڕێگەی خزمەت و بەدەمەوەبوونەوە نەبێت بەدەست نایەت، ئەوا باکی نییە ئەو کارە قورسەیش ئەنجام دەدات و ئەو ڕێگەیە دەگرێتەبەر کە لای خەڵک بەرزی دەکاتەوە.

زۆرێک لە خەڵکی، وادەزانن، سەرکردەکان هەر بە سروشت ئاوا خزمەتکار و سەخی تەبعن، بەڵام ئەمە لە واقیعدا بەم شێوەیە نییە. سەرکردایەتی، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لەناو کۆمەڵگەدا هەڵدەقوڵێت و پەیدا دەبێت، بۆیە هەرگیز سەرکردە لەو ناوچانەدا دروست نابێت کە خەڵکەکەی سەرکردەیان بەلاوە گرنگ و بەنرخ نییە، بەڵکوو لەو شوێنانەدا دروست دەبێت کە خەڵکەکە، زیادەڕێز لە سەرکردەکان دەگرن. گرفتی هەرەگەورەی ئەم کۆمەڵگەیانەی خۆمان ئەوەیە کە خەڵکەکەی "دووفاقییە"، سەرکردەیشی دەوێت و، لە ناواخنیشیدا تایبەتمەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرکردەی تێدا نییە. ئیدی لێرەدا واعیزەکانی دەربار سەردەردێنن و گرفتەکە قووڵتر دەکەنەوە.

وتمان واعیزەکان پێوەری قورسیان بۆ ئەخلاق داناوە، کە کەمینەیەک نەبێت، کەس لێی دەرناچێت. هەر بۆیە ئەگەر هەر بەحاڵ تۆوێکی سەرکردایەتی لە کەسێکدا سەر هەڵبدات، خەڵکەکە لەباری دەبەن (لە لاپەڕەکانی دیکەدا مەبەستی لەباربردنەکە ڕوون دەکەینەوە). ئەم تۆوەیش پێویستی بە بەخێوکردن و چاودێری و سۆزە، تا گەشە بکات و ببێتە دارێک و خەڵک لە سایەبانیدا وچانێک بدەن.

لەم کۆمەڵگەیانەی خۆماندا، کەس نییە لە ڕەخنە قوتار ببێت. ئیدی خودام دەکرد کەسێکی نەجیبزادەی بەئەخلاقیش بێت، ئیللا هەر دەبێت ڕەخنەی لێبگرن و پێتکی پێوە بنێن -لەبەر ئەوەی، دەیپێون بە پێوەرە نموونەییەکەی(میسالییەکەی) ئەخلاق، وەک پێغەمبەران و ڕابەرانی ڕۆحی- ئیدی ناهێڵن ئەو کەسە هیچ گەشە و نەشەیەک بکات، هێندە بە زمانی زبر و تیژ سەرکۆنە و ڕەخنەی ئاراستە دەکەن. کۆمەڵگەی دووفاقی، کەمترین ڕێژەی کەسی سەرکردە و بەتوانای تێدا دەردەکەوێت. هەر سەرکردەیەک بەحاڵ سەردەربێنێت، خێرا بەر ڕەخنە و توانجی خەڵکی دەکەوێتەوە. لە ئەنجامی ئەو هەموو وەعزەی بەسەریاندا خوێنراوەتەوە، بوونەتە نابیغە و ڕەخنەگری زۆر بەهێزی ئەفلاتوونی، ئەوان عەیبوعار لە هەموو کەسێک دەگرن، هەرچەندە ئەو کەسە بلیمەت و عاقڵیش بێت.

سەرکردە لە کارەکانیدا تەنها پشت بە بەهرە کەسییەکانی خۆی نابەستێت، بەڵکوو پشت بە هەڵسەنگاندن و پشتیوانی جەماوەرەکەیشی دەبەستێت. سەرکردە لە کۆمەڵگە دووفاقییەکاندا، بەکەمی نەبێت پشتیوانی و نرخاندن نابینێت بە خۆیەوە. سەرکردە گەڵ دروست دەکات و گەلیش سەرکردە. گەل ناتوانێت بێکەڵکێک بکاتە سەرکردە، هەروەک چۆن کەسێکی بەهرەداریش ناتوانێت ببێتە سەرداری گەلێک، کە ڕێزی لێنەگرن. لێرەدا هۆکار و ئامانج،

کـارلێکێکی زنجیرەیـی پـێکەوە ئەنجـام دەدەن -بە پێـی دەربڕینـی زانایانی ئەتۆم- بۆیە ئەگەر ویستت لە نهێنیی سـەرکردایەتی کەسێک بزانیت، ئەوا دوو شتی لەبارەوە بپرسە:

یەکەم: لە کەسایەتیی بپرسە.

دووەم: لە ڕێز و پێزانینی خەڵکی بەرامبەری بپرسە.

کۆمەڵگەی دووفاق، هەرگیز ناتوانێت دانی خێر بە سـەرکردەیەک لە سەرکردەکاندا بنێت. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەرانیشدا بژین، ئەوا کۆڵێک عەیبوعاریـان لـێ دەدۆزنەوە. لێرە، سـەرکردە دەبێت لەپێنـاو مەبدەئەکەیـدا بمرێـت، ئینجـا دانـی خێـری پێـدا دەنرێـت، تـا ئەو چرکەسـاتەی زینـدووە، هەر لەبەر پـلار و تـانە و تەشـەردایە. ئەوان بەراوردی هەمووکەس بە "پێغەمبەرانی بێ کەموکووڕی" دەکەن، بۆیە بێگومـان لەچـاو ئەوانـدا هەرکەس بهێنێـت، هەر تـرازووەکەی سـەر دەکات.

*** *** ***

وەعز دەبێتە هۆی چالاککردنی ڕەخنەدانی خەڵک. ئەو پێوەرانەی لە دەمی واعیـزانەوە گوێبیسـتی دەبن، پێوەرگەلێکی زۆر بـاڵان، ئەمـان نـاتوانن جێبەجێی بکەن، بۆیە پەنـا دەبەنە بەر جێبەجێکردنـی لەسـەر خەڵکی دیکە، بەمەیش ڕەخنەگرتنەکەیان بەهێزتر دەبێت. ئەمان عەیبی خۆیـان نـابینن، بۆیە لە ڕێگەی پێوەرە ئەخلاقییەکـانەوە پاسـاو بـۆ کردەوە زشت و بزێوەکانی خۆیان دێننەوە. بەڵام بە هیچ شێوەیەک پاسـاو بـۆ کەسـانی دیـکە نییە، هەر بـۆیە دەیانبینیـت، ئەم ئەو کـافر

دەکات و ئەویش ئەم. ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگە دینییەکاندا زیاتر پەرەی سەندووە، چونکە لەم کۆمەڵگەیانەدا وەعز گەیشتووەتە چڵەپۆپەی خۆی، ئیدی ڕەخنە و بەدواداچوون بۆ عەیب و عاری یەکتریش وەک خۆڵی بیابانە.

ئاشکرایشە، واعیزەکان دەستێکی باڵایان لە ڕەخنەگرتنی کەسانی دیکەدا هەیە. ئەوان پێوەرگەلێکی نموونەیی ئەخلاقیان ئەزبەر کردووە، شەو و ڕۆژ دەیدەنەوە بە گوێچکەی ئەو عالەمەدا. هەر بۆیە ئەم پێوەرانە وەک چەکێک دژی نەیارەکانی خۆیان بەکاردەهێنن. خوا نەکات کەسێک ببینن پێچەوانەی وەعزەکانی ئەمان بجووڵێتەوە، ئیتر دەیدەنە بە جنێو و تانە. تەنانەت لەوانەیە بانگی جیهادیشی لە دژ بدەن.

هەر لە دەمی منداڵیمەوە، هاوەڵێکم هەبوو لە قوتابخانە، کە لە ژینگەیەکی چڕی وەعزیدا گەورە بووبوو، هێندە پڕ ڕەخنە بووبوو، کوڕ نەبوو لە دەست ڕەخنەکانی قوتاری ببێت. ئەو، ڕەخنەی لە خەڵکی دەگرت کە بۆچی لە ڕێنماییەکانی ئاین دوور کەوتوونەتەوە و لە خودا ناترسن. ڕۆژێکیان هەروا وەک ئەو واعیزانەی کە دەگرین، دەستی بە وەعزدان کرد، لە کاتی وەعزەکەدا، وا بینی لە دوورەوە گەدایەکی نابینا بە گۆپاڵیکەوە خەریکە نزیک دەبێتەوە، وەعزەکەی وەستاند و خێرا دەرپەڕی و گۆچانەکەی ڕفاند، ئەو داماوە وەکو چی هاواری دەکرد... کەسێک نەبوو بچێت بەدەمیەوە. لەوانەیە پاساو بۆ کارەکەیشی بهێنێتەوە، بڵێت گاڵتەوگەپم کردووە، گاڵتەوگەپیش هیچ عەیبێکی نییە. بەڵام من دڵنیام، ئەگەر کەسێک هەمان ئەم کارەی بکردایە، ئەوا ئەم برادەرە بەر ڕەخنە و پلاری دەگرت و باش باش سەرکۆنەی دەکرد.

ئەمە ئەو ئاماژەیەی تێدایە کە هەموو کەس بەشی خۆی عەیبوعاری

تێدایە. لە کۆنیشدا گوتراوە: ((شکۆمەندی بۆ ئەو کەسەی چ عەیبی نەبێت)). ئەمە لە حاڵێکدایە کە واعیزەکان وا دەزانن سەلەفی ساڵەح بێعەیب و پەڵە بوون. بەمەش دەیانەوێت هەموو خەڵک بە شوێنپێی سەلەفی ساڵحدا بڕۆن. ئەوەی بە دواداچوونێکی بابەتییانەی ژیانی سەلەفی ساڵەح بکات، ئەوا زۆر جوان تێ دەگات کە ئەوانیش وەک هەموو کەس، هەڵەیان هەبووە، لەچەریی لە دڵیاندا بووە، حەزیشیان لە ناوبانگ بووە وەک نووسەری ئەم دێڕانە. ئەوانیش وەک ئێمە بنیادەم بوون، خواردوویانە، سەردانی بازاڕیان کردووە، کەچی واعیزەکان لە ئێمەیان کردوون بە مەلائیکە -خستوونیانەتە ڕیزی مەلائیکەوە- تا خەڵکی لە ڕیتمی ژیانیاندا چاویان لێ بکەن.

واعیزەکان، وەعزەکانیان گەیاندووەتە هەور، دواتریش هاتوون پیاوانی ئاینییان لە عەیبوعار داماڵیوە و کردوونیان بە پێشەنگ بۆ خەڵکی. وەک چۆن پەیکەرتاشێک پەیکەرێک دەتاشێت، ئاوا ئەم نموونە میسالییەیان خستووەتە بەردەستمان تا وەک ئەوە بین. بەم کارەیشیان ئامانجێکیان بۆ داناوین کە هەر نایگەینێ. هەر بۆیە ئەگەر سەرکردەیەک هەڵکەوێت، ئەوا ئێمە بە شایەنی سەرکردەبوونی نازانین، چونکە هەر کە پێوامان بە پێشەنگە خەیاڵییەکەی کە واعیزەکان بۆیان کێشاوین، ئیتر گرنگییەکەیان لەدەست دەدەن و لاواز دێنە بەرچاو.

سەرکردە پێویستی بە ڕێز و پشتگیری کۆمەڵایەتی هەیە تا هەستێت بە بەجێگەیادنی پەیامەکەی. سەرکردە تەنها پێک نەهاتووە لە کەسایەتی خۆی. ئەو دەمەی خەڵک ڕێز لە سەرکردە دەگرن، ئەوا لە کەسێکەوە دەیکەن بە کەسێکی دیکە. هەر بۆیە لەو شوێنانەی کە ڕێزی زۆر بۆ سەرکردە نیشان دەدرێت، سەرکردەی بەهێز سەر هەڵ دەدەن. بۆیە ئەوەی بەراوردی عێراق بە هەر ناوچەیەکی دیکەی

ڕۆژهەڵات بکات، ئەوا دەبینێت چەندە ناوچەیەکی ڕووتەڵ و وشکە لە بەرهەمهێنانی سەرکردەی بەناوبانگ. لێرە، سەرکردەی دڵسۆز هەتا لووتی بەر "بەردی ئەلحەد" نەکەوێت، کەس دانی خێری پێدا نانێت، دوای چی؟ دوای ئەوەی کە بووە بەشێک لە مێژوو، تەپوتۆزیش لەسەر عەیبەکانی نیشتن و شاردیانەوە. بەڵام لە کاتی ژیانیدا، خەڵکی چاوەچاویان بوو دەی خوایە عەیبێکی لێ دەرکەوێ، لە هەر شەش لاوە خەریکی تانە و تەشەرلێدانی بوون. واعیزەکان هێندە وێنەیەکی خەیاڵییان بۆ کێشاوین، کە هەر دەڕۆین و نایگەینێ، وەک ئەوەی دوای سەراب کەوتبین.

لەو تایبەتمەندییە سەیرانەی کە لە کەسانی دووفاقدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە: ڕێزی هەندێک کەس دەگرن لە کاتێکدا خۆشیشیان ناوێن، هەندێک کەسیشیان خۆش دەوێت کە ڕێزیان ناگرن. بەڕاستی لە نێوان ڕێز و خۆشەویستیدا جیاوازییەکی زۆر زۆر هەیە.

میکیاڤیلی کە باسی دووفاقیی کۆمەڵگەکەی خۆی دەکات، زۆر لەم کۆمەڵگەیەی خۆمان دەچێت. دەڵێت: "دەتوانیت بە شێوەیەکی گشتی بڵێیت: مرۆڤ کائینێکی دووڕووە، زمانلووسە، حەزی لە قازانجە و ڕقی لە زیانە. تا ئەو ساتەی تۆ سوودت بۆی هەبێت، ئەویش دوات دەکەوێت و ماڵ و خوێنت لەپێناودا دەبەخشێت. ئەو سەرکردەیەی کە بە تەنها پشت بە قسەکانیان دەبەستێت، پشتی دەشکێت. ئەو برادەرایەتییەی کە لە ڕێگەی کڕین و فرۆشتنەوە دروستی دەکەن، زوو فس دەبێتەوە، لە هەر چرکەیەک لە چرکەکاندا دەشکێتەوە بەسەریاندا". هەروەها ماکیاڤیلی دەڵێت:"... ئەستەمە لە یەک کاتدا سەرکردە، هەم بەسام بێت و هەمیش خۆشەویست. ئەگەر بژاردەی ئەوەیان خستە بەردەستت کە "بەسام و بێزراو" بیت، یان "بێ سام و خۆشەویست"، ئەوا باشترینیان، بە-سام و بێزراوییە، چونکە خەڵک لە

کەسی تووڕە و تۆڵەسێن دەترسن و سڵ دەکەنەوە، بەڵام دەرحەق بە کەسی خۆشەویست و بێ-دڕک، هەرچییان بوێت دەیکەن. خۆشەویستی شتێکی سەرپێی و دەروونییە، پاش گەیشتن بە مەرامی خۆی، خۆشەویستییەکەی بەو جۆرە نامێنێت، بەڵام بنیامی چزوودار، خەڵکی لە سزای دەترسن. ئەمە شتێکی زۆر ڕوونە لای هەموومان و هیچ موناقەشە هەڵناگرێت هێندە ڕاستە."

ئەوەی ئەم قسانەی میکیاڤیلی بخوێنێتەوە، وا دەزانێت ڕێک لەبارەی خەڵکی عێراقەوە نووسیویەتی. زۆر کەس دەبینین لێرە، کە کەسانێکیان خۆش دەوێت بەڵام ڕێزیان ناگرن، پێی پێدەکەنن و گاڵتەی پێ دەکەن، کام توانجە زۆر ناخۆش و تاڵە پێی دەدەن. ئەمەیش لە ڕوانگەی ئەو (پەند)ـەوە کە دەڵێت: "ئەوەی کە خۆشی دەوێت، ئازارت دەدات". ئەو کەسەی کە هەست بە کەرامەتی خۆی بکات، حەز دەکات لەناو خەڵکیدا جێگەی ڕێز و سڵێکردنەوە بێت، نەک خۆشەویست، بەڵام هەموو کەس پێی بوێرێت. لە کۆمەڵگە ڕاقییەکان (پێشکەوتووەکان)دا، هەستم کرد بە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان "ڕێز" و "خۆشەویستی" کەسەکاندا. ئەوان ئەگەر کەسێکیان خۆشویست، ڕێزی دەگرن و ناوی دەخەنە نێو ناوانەوە. کەچی لە کۆمەڵگەی خۆماندا لەوانەیە پێچەوانەکەی دروست بێت. هۆکاری ئەمەیش، وای بۆ دەچم، هیی ئەو دووفاقییەیە کە لە کەسایەتیماندا دروست بووە. ئێمە هەڵسوکەوتی خێڵەکیمان گرتووە، "بێهێز" سووک سەیر دەکەین و ڕێز لە بەهێز دەگرین، بەڵام لە مێشکماندا بیرۆکەمان ئەفلاتوونییە، شیعاری "نموونەی باڵا دەڵێینەوە". ئێمە ئەگەر کەسێکمان خۆشویست، دڵمان لەگەڵی و شمشێرمان لە دژی دەبێت. بەڵام ئەگەر ڕێزمان لە کەسێک گرت، بەگشتی کەسە ڕێزلێگیراوەکە، یان "شەقوەشێنێک"ـە، یان کوڕ و خزمە شەقوەشێن. ئەو کاتەیش ئێمە

بە زووبان ڕێزی لێدەگرین و بە دڵ بێزمان لێی دێتەوە.

ئاشکرایە چەندە زوڵم و زۆر و داگیرکاریی بەسەر عێراقدا هاتووە. ئەم وڵاتەی ئێمە لە کۆندا پێی گوتراوە "ڕێگەی ئازادکەران- گریق الفاتحین". من وا هەست دەکەم ئێستایشی بەدەمەوە بێت، هەر ڕێگای ئازادکەرانە. هەر بۆیەیشە ڕاهاتوون لەسەر ڕێزگرتن لە ئازادکەری داگیرکەر" الفاتح المسعمر"، ئیتر لە هەر قوماشێک بێت. شمشێر و قامچی هەمیشە بەسەر سەری باپیرانمەوە بووە، خودا بەر ڕەحمەتی خۆییان بخات. خۆ ئەگەر دانەیەکیان چاونەترس و جوامێر بووبێت و قسەی حەقی لە بەرامبەرەوە کردبن، ئەوا شاد کراوە بە ڕەحمەتی شیر و شمشێر، دواتریش ڕاستەوخۆ ڕەوانەی دۆزەخی هەتاهەتاییان کردووە. ئیدی لەم وڵاتەدا کەس نەماوەتەوە، مەگەر دووفاقێکی دووڕوو، لەوانەی کە ڕێزی کەسێک دەگرێت کە خۆشی ناوێت، ئەوەیشی کە خۆشی دەوێت، ڕێزی ناگرێت.

واعیزەکانمان خوایان لێ ڕازی بێت، بەیانیان و ئێواران دوعای خێر بۆ قامچی و شمشێربەدەستەکان دەکەن. ئەوان بە ستەمکار دەڵێن: "چاکت کرد" و بەستەملێکراویش دەڵێن: "خراپت کرد". ئەوان بوون ئامۆژگاریی خەڵکیان دەکرد، کە گلەیی لە ستەمکار نەکەن، بە بۆنەی ئەم کارەیشیانەوە خەڵکی ملیان شۆڕ کرد و ستەم بەرۆکی هەموویانی گرت. فەڕ و بەرەکەتیشیان لەناویاندا هەڵگیرا بەهۆی نییەتە پیسەکانیانەوە، چونکە مرۆڤ لەسەر ئەو نیەتەی کە هەیەتی، ڕۆزیی پێ دەدرێت. گومان لەوەدا نییە، کە خراپترین و بێکەڵکترین سەردەم لەم دەڤەرەدا، سەردەمی عوسمانییەکان بووە. لەو دەمەدا ئەم نیشتیمانە بووبوو بە کەلاوەیەکی پڕ لە دز و جەردە و خوێنڕێژ، کەچی واعیزەکان، لە دوای هەر وتارێکەوە، دەستیان بەرەو عاسمان بڵند دەکردەوە و دەیانگوت: "خوایە بۆ خاتری خۆت، دین و

دەوڵەتمان پێکەوە بۆ سەر بخە."

لە پێغەمبەری خوداوە(د.خ)، گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی:

:" (حدیث مرفوع (قَالَ : وَحَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُهَاجِرٍ ,عَنْ وَائِلِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ,قَالَ : سَمِعْتُ الْحَسَنَ الْبَصْرِيَّ ,يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" : لا تَسُبُّوا الْوُلاةَ ، فَإِنَّهُمْ إِنْ أَحْسَنُوا كَانَ لَهُمُ الأَجْرُ وَعَلَيْكُمُ الشُّكْرُ ، وَإِنْ أَسَاءُوا فَعَلَيْهِمُ الْوِزْرُ وَعَلَيْكُمُ الصَّبْرُ ، وَإِنَّمَا هُمْ نِقْمَةٌ يَنْتَقِمُ اللَّهُ بِهِمْ مِمَّنْ يَشَاءُ ، فَلا تَسْتَقْبِلُوا نِقْمَةَ اللَّهِ بِالْحَمِيَّةِ وَالْغَضَبِ ، وَاسْتَقْبِلُوهَا بِالاسْتِكَانَةِ وَالتَّضَرُّعِ . "

- جوێن بە والییەکان مەدەن. ئەگەر چاکەیان کرد، ئەوە ئەوان پاداشتیان پێ دەگات و ئێوەیش شوکرانەبژێریی بکەن. خۆ ئەگەریش خراپەیان کرد، ئەوە تاوانەکەی لەملیانە، ئەوەیشی لەسەر ئێوەیە بریتییە لە ئارامگرتن. ئەوەیش بزانن کە ئەمانە تۆڵەی خوداییین، لە هەر کەسێکی دەکاتەوە کە خۆی بیەوێت. بۆیە لە بەرانبەر تۆڵەی خوداییدا خۆتان تووڕە و هەڵەشە مەکەن، بەڵکو ملکەچ و سەرنەوی بن". ئەو کاتەی پێغەمبەر(دخ) دەفەرموێت: "جوێن بە سەرکردەکان مەدەن و بەرەنگارییان مەبنەوە بە تووڕەیی و هەڵەشەییەوە"، مەبەستی ئەو والییانە بوو، کە "دەسپەروەردە"ی خۆی بوون و خۆی دانابوون. بەڵام واعیزەکان دەیانەوێت ئێمە سەر حیزکەین بۆ هەرچیی والی ستەمکار و ناڕەسەن هەیە. ئەوان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەریان لەبیرچووەتەوە کە دەڵێت: "گوێڕایەڵی هیچکەس لە شتێکدا نەکەن، کە بێگوێی خودای تێدابێت – لا طاعه لمخلوق فی معصیه الخالق". ئەمانە شتێکیان شتێک بە توندی دەگرن و شتێک بەتەواوی بەرەڵلا دەکەن.

وەک بڵێیت، بە قسەکەی پەیامبەر دڵیان ئاوی نەخواردبێتەوە، قسەی خـوای تۆڵەسـێن و جەباریشـیان هێنـاوەتە گـۆڕێ. تەبەرانـی لە ئەبودەردائەوە، ئەویش لە پەیامبەر(دخ)ـەوە: "کە خـودا فەرمـوویەتی: من خودام، هیچ خـودایەک جگە لە من نییە، خـاوەنی مـوڵکم، خـاوەنی دڵەکانیشم. دڵی پادشـاکانم بەدەستە، ئەگەر بەندەکانم گوێڕایەڵم بن، ئەوا دڵی سەرکردەکانیان بۆ نەرمونیان دەکەم. خۆ ئەگەریش بێگوێی و یـاخیی بـن، ئەوا دڵیـان تونـد دەکەم لەسـەریان تـا بتـوانن سـزای خراپیـان بـدەن. خۆتـان مەشـغوڵ مەکەن بە دوعـای شـەڕکردن لە پادشاکانتان، لەجیاتی ئەوە یادی خودا بکەن بۆ ئەوەی لە خودا نزیک ببنەوە، ئیدی پادشاکانتان وایان لێدێت کە ئێوە دەتانەوێت:

(إنّ الله عزّ وَجَلّ يَقُولُ: أنَا اللهُ لَا إلَهَ إلّا أنَا مَالكُ الْمُلْك وَمَالـكُ الْمُلُـوك قُلُـوبُ الْمُلُوك بِيَدِي ، وَإنّ الْعِبَادَ إذَا أطَاعُونِي حَوّلْتُ قُلُـوبَ مُلُـوكِهِمْ عَلَـيْهِمْ بِالرّأْفَـةِ وَالرّحْمَـةِ ، وَإنّ الْعِبَـادَ إذَا عَصَـوْنِي حَوّلْـتُ قُلُـوبَ مُلُـوكِهِمْ عَلَـيْهِمْ بِالسّـخَطِ وَالنّقْمَةِ فَسَامُوهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ، إذًا فَلَا تَشْغَلُوا أنْفُسَكُمْ بِالدُّعَاءِ عَلَى الْمُلُـوكِ وَلَكِنِ اشْغَلُوا أنْفُسَكُمْ بِالذّكْرِ وَالتّفَرُّعِ إلَى أكْفِكُمْ مُلُوكَكُمْ.".

(بێگومـان ئەم فەرمـوودەیە زەعـیفە و زیـاد لە شـەش سـەرچاوەدا بە لاواز نـاوبراوە، لە پەراوێـزدا بە جـوانی ئامـاژەی پێـدراوە بـۆ ئەو کەسانەی حەزیان لە زانینی زیاترە. (وەرگێڕ).

بەهۆی ئەمەوە، ناچارین ڕێز لە ستەمکار و ملهوڕان بگرین، هەستین بە بەرزنرخاندنیان، گۆرانی و شیعری جوان جوانیـان بە بـاڵادا بڵێین. ئێمە بەبێ ئەوەی خۆشـمان بـوێن، ڕێزیـان دەگـرین. ئەمەیـش بـوویە خوویەکی ڕەسـەن لە دەروونمانـدا و خەلاسـیمان لێی نـایەت بە هـیچ کلۆجێـک. ئەگەر سـەرکردەیەکی دڵسـۆزمان لەنـاودا هەڵکەوێـت و خۆشمان ویست، ئەوە دڵنیابە لێی ناترسین بە هیچ شێوەیەک، چونکە

خراپە و قینی لێ چاوەڕێ ناکەین. بەم کارەیشمان وای لێناکەین کە گیانێکی خۆبەشانەی تێدا دروست ببێت (سەرکردەکە). سەرکردە هەوڵی پێگەی بەهێزی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی دەدات، سوودی چییە ئەگەر خەڵک پێی بڵێن: "بارک الله فیک"، کەچی لەولاوە بەردێکی بۆ نەخەنە سەر بەرد و لە هیچ شتێکدا بە گوێی نەکەن.

ڕاهاتووین ڕیزی شەقوەشێن و چزووەدارەکان بگرین، ئەمە ڕێگەی مانەوە بووە لە سەردەمی باوباپیرانماندا. ئێمە ڕێزی ئەو کەسە دەگرین کە توانای شەڕی هەیە و شەڕەنگێزە، ئەگین ئەو کەسەی کە بێوەیی و بێ چزووە، زیانێکی وای لەدەست دەرناچێت، ئیدی ئەگەر ڕێزی زۆریشی بۆ دانەنێیت کێشە نییە. تەماشای قەیسی کوڕی خەتیم بکە چی دەڵێت:

إذا انت لم تنفع، فجر فإنما یراد الفتی کیما یطر و ینفع

ئەگەر سوودت نەبوو، ئەوا زیان بگەیەنە

چاوەڕوانیی هەر ئەم دووە لە خەڵکی دەکرێت.

**خەلدون جاویدیش دەڵێت:**

"اذا لم تکن ذئبا علی الارض أجردا

کثیر الاذی بالت علیك الثعالب"

ئەگەر گورگ نابیت لەم نیشنیمانەدا

ئەوا گیر بەدەست ڕێوییەوە دەخۆیت.

**زوهەیری کوڕی ئەبی سەلمایش دەڵێت:**

هەر کەس خۆی بەرگری لە چالاوەکی خۆی نەکات بۆی کوێر دەکەنەوە ئەوەیشی ستەم نەکات، ستەمی لێ دەکرێت.

ئەم شیعرانەی ناو ئەدەبیاتی عەرەبی، بوونەتە قسەی سەر زاران و دەماودەم دەگوترێتەوە. بە شێوەیەکی گشتیش، پەندەکان زادەی بەها و پێوەرەکانی کۆمەڵگەن. یەک لە دوای یەک هاتنی ستەمکاران بە دوای یەکدا، وای لێکردووین، ڕێزی کەسی خراپ بگرین لەجیاتی باش. بەمەیش گەورەترین بەهای کۆمەلایەتیمان لەدەست دا، کە مرۆڤ دەشێت شانازی پێوە بکات. بەهۆی ڕێزنەگرتنمان لە دڵسۆزەکان، کەسە دڵسۆزەکان کەمبوونەوە و نەمان. کەس ناوێرێت قسەیەکی حەق و ڕاست بکات، خێرا لە هەموو لایەکەوە سەرکۆنەی دەکەن و تووشی ئازاری دەکەن. پێی دەڵێن: "ئەرە ئەوە تۆ چیتە؟ شێت بوویت؟". ئیدی ئەویش هەست دەکات ڕێگەیەکی سەلامەت هەڵبژێریت باشترە، وەک ئەوەی قوربانیی بدات و هێشتایش لۆمەی بکەن. مرۆڤ هەر مرۆڤە لە هەموو کات و شوێنێکدا. ئەگەر بینیتان سەرکردەیەکی دڵسۆز لە شوێنێکدا سەری هەڵداوە، ئەوا بزانن کە جەماوەرێکی لە پشتە، کە بەرزی ڕادەگرن و سەرسەر و سەرشانی دەخەن، چەپڵەی بۆ لێ دەدەن. لە بارەی غاندی سەرکردەوە بیستوومانە کە دڵسۆز و مەزن بووە. لە خودام داوایە سەرکردەیەکی وەک ئەومان بۆ بنێرێت ( ئامین).

ئەوەی ڕاستی بێت، غاندی تەنها بە دڵسۆزییەکەی نەبووبووە سەرکردەیەکی باش، بەڵکوو ملیۆنان هیندی هەر خەریک بوو بیپەرستن لە خۆشەویستیدا. هەرچەندەیش لەو کاتەدا ستەمی زۆر دەرحەق بە غاندی دەکرا لە لایەن ستەمکارانەوە، بەلام کە ئەو جەماوەرەکەی خۆی دەبینی چۆنن بۆی، ئەویش هێندەی تر دڵسۆز و

دامەزراوتر دەبوو. لە بەخت و ئیقباڵی باشی غاندی ئەوەبوو کە لەناو عەرەباندا لەدایک نەبوو، ئەگینا ئەو کابرایەی کە دیمەنێکی دزێوی هەروەک مەیموون لەناو ئەواندا بوایە، هێندەی ئەرز و ئاسمان توانج و پلاریان پێوە دەنا و پێی پێدەکەنین. تا ئاوا ڕێزی شەقوەشێن و گوندەکان بگرین، هەر سایەیەیان بەسەر سەرمانەوە دەمێنێتەوە. هەرکات ئەم سیفەتە ناشیرینەمان تەرک کرد، ئەوکاتەیش چاوەڕێی کەسی دڵسۆز دەبین.

یەزیدییەکان شەیتان دەپەرستن و وازیان لە "الله" هێناوە. دەستاوێژیشیان بۆ ئەم کارە ئەوەیە: خودا، بە سروشتی خۆی، چاکەی خۆش دەوێت، بۆیە هیچ حەوجەمان بە پەرستن و دڵڕازیکردنی نییە. بەڵام شەیتان شەڕەنگێز و سروشتێکی بەدفەڕی هەیە، هەر بۆیە ئەو لە پێشترە بۆ پەرستن و ڕازییکردن. ئێمە پێکەنینمان بە بڕوای یەزیدییەکان دێت، کەچی لەملاوە، بە خۆمانمان نەزانیوە هەموومان یەزیدین. سەرکردەی دڵسۆز و کەسی سووک و ڕسوا، لە بنەڕەت و سروشتیاندا وەک یەک وان، هەردووکیان بنیادەمن. مرۆ لە ناخەوە خۆپەرستە، خۆی خۆش دەوێت، هەموو کۆششێک دەکات بۆ بەرزکردنەوەی ناوی خۆی. لەم خاڵەدا جیاوازیی لە نێوان کەسی باش و خراپدا نییە. بەرژەوەندی تایبەتیی (کەسێتی) لەپێش هەموو شتێکەوەیە. ئەوەیشی کە پێی دەگوترێت بەرژەوەندی گشتی (المصلحه العامه) ئەوە شتێکی جێگیر نییە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت.

کەسی ساڵح لەناو خەڵکدا ئەو کەسەیە کە بەخت یاوەرێتی، کارێک دەکات هەم خۆی حەزی لێی بێت و هەمیش سوودی هەبێت بۆ خەڵک. ڕاستە ئەو وێڵی دوای بەرژەوەندییە، بەڵام ئەگەر خودا بیکات بەرژەوەندییە کەسییەکانی خۆی، لەگەڵ بەرژەوەندی خەڵکیشدا یەک

بگـرێتەوە ئیتـر ئەم کەسـە بەڕاسـتی بەخـت یـاوەرێتی. سـەرکردە دەیەوێت پێگەی خۆی بڵند بکات، بۆیە خزمەتی گەلەکەی دەکات و بۆیـان دەتـوێتەوە. لەم ڕێگەیەیشـەوە دەگـاتە پـلە و پـایە. ئەو لەم حاڵەتەدا زۆر دڵخۆشە، چونکە کارێک دەکات هەم خۆی پێی خۆشـە، هەم خەڵکیش. ئەو پارادۆکس و بەریەککەوتنێک لە نێوان بەرژەوەندی تاکەکەسی و بەرژەوەندییە گشتییەکاندا نابینێت.

ئەم شـتە تەنهـا بـۆ سـەرکردە ڕاسـت نییە، بەڵکوو بـۆ هەر تـاکێکی دڵسۆز ڕاستە، کە لە یەک کاتدا دەیەوێت خزمەتی خۆی و خەڵکیش بکات. هەموو کەسـە "دەستڕەنگین"ـە هونەرمەندانە لەم پێڕەن، ئیدی هەر کەسە و بە ڕێژە و پلەیەک. داهێنەرێک کە شەوبێداری دەکات، تا شتێک دابهێنێت، ئەو بەم کارەی شتێک دەکات کە هەم دڵی خۆی پێی خۆشـە، هەمـیش کـارەکەی سـوودی بـۆ خەڵـک دەبێت. ئەمە دۆخـی نووسـەر، دکتـۆر، ئەندرازیار ، مامۆسـتا، بازرگـان و کاسبە. هەمـوو ئەمـانە بە کارەکەیـان دەیانەوێت سـوودێک بە خۆیـان و خەڵکەکەیـش بگەیەنـن، ئیتـر هەرکەسـە و بە پێـی بەرەی خـۆی. کـۆمەڵگەی سەرکەوتوو ئەو کۆمەڵگەیەیە، هەمیشە ئەم جۆرە کەسانە تێیدا زۆر دەبـن و سـەرهەڵدەدەن، کە هەم ژیـانی خۆیـان خـۆش دەکەن، هەم ژیانی خەڵکی تریش (بە کارەکانیان). بەڵام کۆمەڵگەی بێفەڕ، هەرگیز ناتوانێت هاوبەشی لە نێوان بەرژەوەندی تاک و کۆمەڵدا بدۆزێتەوە، بەم کارەیشی، ژمارەی دز و حیز و خراپەکار زۆر دەکات.

ئەگەر بێـین و لێکـۆڵینەوەیەک لەسـەر کەسـایەتی سـەرکردەیەک لە سـەرکردە بەناوبانگەکـان بکەیـن، دەبینـین بە شـێوەیەکی زۆر چڕ و نامۆ، خەریکی خزمەتکردنی گەل و خەڵکەکەی بووە. کەسانی بێ ئاگا و کـاس، وا دەزانـن ئەم سـیفەتی خزمەتکـردنە شـتێکی سروشـتی و خوارسـکە، بەڵام نەخێـر، سـەرکردەیش لە سـەرەتاوە وەک هەمـوو

کەسێک وایە. ئەویش سەرەتای ژیانی هەروەک ئەو عەشاماتە وێڵی دوای دوو پاروو نان بووە تا بیکات بە گەرووی منداڵەکانیدا، لەولایشەوە کەمێک پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی پتەو بکات. ئیدی ڕۆژێک لە ڕۆژان، ئەم کەسە سادەیە، جووڵەیەکی کۆمەڵایەتی بە سوودی ئەنجام داوە، لە ڕێگەی سوتفەوە، یان بۆ ئامانج و مەبەستێکی دیکە. بەلام لە بەخت و ئیقباڵی ئەمدا، جووڵەکە دەبێتە جێگای سەرنجی خەڵکی و نرخاندنیان بۆی، کە ئەمەیش وای لێدەکات زیاتر سوور بێت لەسەر کارەکەی و خۆی بۆ یەکلایی بکاتەوە.

هەتاوەکوو خەڵک زیاتر ڕێزی بگرن، ئەمیش دڵسۆز و سوورتر دەبێت لەسەر کارەکەی. ئەم پرۆسەیە ڕێک بریتییە لە کارلێکێکی دووسەرە لە نێوان جوڵەی تاک و نرخاندنی کۆمەڵگەدا. دڵسۆزی تاک تا زیاتر بکات، نرخاندنی کۆمەڵگەیش بۆی زیاتر دەبێت... ئەم دیاردەیە ئێستا ناو دەبرێت بە "هۆکارێتیی خولگەیی یان دەوری (السببیە الدوریە)". ئەو هۆکارەی کە سەرکردە دروست دەکات، تەنها بریتی نییە لە کەسایەتی سەرکردە و ڕێزگرتنی خەڵکی، بەڵکوو ئەوەی زۆر گرنگە ئەو کارلێکە کەڵەکەبووانەیە کە لە نێوان ئەو کارانەی کە سەرکردە ئەنجامی دەدات، لەگەڵ ئەو کاردانەوانەی کە کۆمەڵگە لە بەرانبەر کارەکانی ئەو دەری دەبڕن.

سەرکردەی دڵسۆز، بە خۆی و شتە گرانبەهاکانی خۆی قوربانی دەدات، تا خزمەتێکی گشتی بکات. بۆیە دەیبینیت شەوبێداری دەکات، بەرگەی ئاستەنگ دەگرێت، گرفتی دێتە ڕێ، بەلام هەر گوێشی ناداتێ، وەک ئەوەی لەم قورە دروست نەبووبێت کە خەڵکی دیکەی لێ دروست کراوە. خەڵکی تەماشاکەر، وا دەزانن، ئەم هەست بەخۆی ناکات و خۆی و بەرژەوەندیی خۆی خۆش ناوێت. بەلام ئەوەی ڕاستی بێت، کەسایەتی خۆی تێکەڵ بە کۆمەڵگە بووە. ئیدی ڕۆژ لە

دوای ڕۆژ وادەزانێت بەرژەوەندییە گشتییەکان، بەرژەوەندی تایبەتیی ئەویشن. ئەو خۆی لەیاد نەچووە، وەک ئەوەی هەندێک وێنایان کردووە. بەڵکوو هەوڵی گەشەو نەشەی دەدات وەک هەر کەسێکی دیکە، بەڵام جیاوازیی ئەم لە خەڵکی دیکە ئەوەیە، ئەم هێندە گەشەی کردووە، تا وای لێهاتوو هەموو کۆمەڵگە لە خۆیدا هەڵ بگرێت و ببینێتەوە.

ئەو دەمەی کە خەڵکی هوتاف بۆ سەرکردە دەکێشن، شانازیی بە خۆشویستنییەوە دەکەن، لەبەری دەتوێنەوە، ئیدی هەست دەکات بووەتە ڕەمزێکی زیندوو بۆ ئەو خەڵکە، ئەوکاتە وەها خەڵک و جەماوەرەکەی دەچنە ناو هەست و ویژدانییەوە، کاتێک کە بیر دەکاتەوە، بەتەنها هەست بە خۆی ناکات، بەڵکوو ئەوانیش بوونەتە بەشێکی دانەبڕاو لە کەسایەتی خۆی. بەڵام تاوانبار و خراپەکار، ئەو کەسەیە کە بەخت یاوەریی نەبووە و بەرژەوەندییە کەسییەکانی ڕێک لە بەرانبەر بەرژەوەندییە گشتییەکاندا دەوەستنەوە. ئەمیش هەروەک هەموو کەسێکی دیکە و ئەو کەسەیشی کە دوایی دەبێتە سەرکردە، هەر بە گەڕان بە دوای دوو پاروو ناندا وێڵە، بەڵام بارودۆخە کۆمەڵایەتی و نەفسییەکەی، لە یەکێک لە ڕۆژەکاندا پاڵی بۆ کارێکی زیانبەخش پێوە دەنێت، ئیدی دوای ئەو ڕۆژە تیر لە کەوان دەردەچێت و دەبێتە ملۆزم لە بەرچاوی خەڵکی. هەروەها تاوەکو خەڵکی زیاتر لێی بتارێنەوە، ئەویش زیاتر سوور دەبێت لەسەر بەرەلایی و ئەو شتانەی کە "هۆکاریتی خولگەیی"، ڕوڵێکی گرنگیان هەیە لەسەر دروستبوونی کەسایەتییەکەی، هەروەک چۆن لەسەر کەسایەتی سەرکردەیش هەیبوو، بەڵام سەرۆک لە بەرچاوی خەڵکی گەورە دەبوو، ئەم بچووک دەبێتەوە. لە نێوان گەورەبوون و بچوک بوونەوەیشدا مەودایەکی فراوان هەیە.

زانستی "کۆمەڵناسی" گەیشتووەتە ئەو دەرەنجامەی ڕێژەی تاوان لەناو کەسانی هەژار و بێدەرەتاندا زیاترە وەک لە خۆشڕابوێرەکان. فەقیری بێچارە، دەبێت هەر لە منداڵییەوە دەست بکات بە کاروباری سەخت، سا بەڵکوو بتوانێت هاوکارییەکی دایکوباوکی بکات لە پەیداکردنی قووتی ژیان. ئیتر ئەو بەدرێژایی ڕۆژگارە گەرم و ساردەکان بێوچان کار دەکات، لە دەمی کارکردنیشدا، کەمێک نەبێت ناتوانێت پشوویەک بدات، ئیدی لەم کاتەدا هەست دەکات بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا یەک ناگرنەوە. نەریتە کۆمەڵایەتییەکە داخوازی ئەوەیە کە بەردەوام و بە بێوچان کار بکات، لەولایشەوە سروشتی خۆی حەز بە ئیسراحەت، هەڵاتن لە کاروبار و ئەملاوئەولا دەکات، پێچ لێدەدات تا کەمێک نان و ئیسراحەتی پتری چنگ بکەوێت. ئیدی خۆ ئەگەر چاودێر دیار نەما لەو ناوەدا، دەست بۆ شتانێک دەبات کە بۆ ئەو حەڵاڵ نین. ئەو دڵی بۆ دزی، پەلامار، درۆ، ڕووپامایی و خۆبردنەپێشەوە لێ دەدات، تا بتوانێت لەم ڕێگانەوە شتێک لە باری گرانی خۆی سووک بکات. لێرەوە بەرژەوەندی خۆی پێچەوانە دەبێتەوە لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکان و بنەما بەرزەکانی پێویست بۆ کۆمەڵگە لە ڕاستگۆیی و ویژدان.

مرۆ بەرژەوەندی خۆی لەپێش بەرژەوەندی هەموو کەسێکەوە دەبینێت بە شێوەیەکی گشتی، بۆیە ئەگەر بینیی بەرژەوەندییەکان بەریەک دەکەون، ئەوا بێگومان خۆی لەپێشترە و هیی خەڵکی وەلاوە دەنێت. ئیدی جیاوازی لە نێوان مرۆڤی چاک و خرپدا نییە لەم سیفەتەدا. تاکە جیاوازی لە نێوانیاندا ئەوەیە، یەکێکیان کاروبارەکانی وا ڕێک کەوتوون کە بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا پێک هاتوونەتەوە و هەتا هێزی تێدایە هەوڵی بۆ دەدات و خەڵکیش وا دەزانن ئەم هەوڵ و کۆششانەی لەبەر ئەوانە، بۆیە ڕێزی دەگرن لە

کاتێکدا چەندە خەڵک سوودی لێ دەبینن، خۆیشی ئەوەندەی لێ دەبینێت. بەڵام بنیامی بێکەڵکی داماو، ناچاری کاری قورسکراو، لە خوای داوایە کارەکەی بگۆڕێت یان کەمێک بۆی ئاسانکراو، بەڵام قەت گوێ بۆ نەگیراو، ئیدی مەجبوری دزی، یان پیاوخراپی و حیزی، سا بەڵکوو ئەم کارانەی بۆی ببنە فریادڕەسی، کەمێک لە بارەکەی سووک ببێت.

واعیزەکان تەنها دەیانەوێت بە قسەی ڕووت و قووت، خەڵکی بکەنە بنیامی پاک و تەندروست، ئەوانە ئەوە نازانن کە ڕەوشت و پاکی، بەرەنجامی بارودۆخە نەفسی و کۆمەڵاتییەکانە. ئەوان وا دەزانن ئەخلاق هۆکارە نەک ئەنجام، هەر بۆیە دەیانبینین دەڵێن: "ئەخلاقتان بگۆڕن تا بارودۆخەکەیش بگۆڕێت". بەڵام ئەگەر ویژدانیان هەبا، ڕێک پێچەوانەکەیان دەگوت، چونکە ئەگەر بارودۆخی خەڵکیمان گۆڕی، ئەوا ئۆتۆماتیکی ڕەوشتیشیان دەگۆڕێت.

ئەگەر نارەحەتی و باری گرانی سەرشانی ئەو خەڵکەمان سووک کرد، وامان لێکرد هەست بەوە بکەن کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکاندا یەک دەگرێتەوە، ئەوا ئەوکاتە دەبنە هاونیشتیمانی بەکەڵک و چاک، وازیش لە خراپە و شەڕەنگێزیی دەهێنن. "تۆماس بین" دەڵێت: "هەژاریی، بەربەستە لە بەردەم هەموو فەزیلەت و ئاشتییەکدا. خاوەنەکەی دەگەیەنێتە ئاستێک کە هەموو شتێکی لەلا بێبایەخ دەبێت. ئیدی هیچ بنەمایەک لە ژیانیدا نامێنێت بێجگە لە (بکە و مەکە). گرفتی واعیزەکان ئەوەیە: دەیانەوێت ڕەفتاری بنیادەم بەتەنها لە ڕێگەی "بکە" و "مەکە"ـەوە ڕاست بکەنەوە، وەک بڵێیت هەڵسوکەوت قوڕێک بێت بەدەستیانەوە، چۆنیان بوێت وای لێ داتاشن. دەیشیانبینین داوا لە خەڵکی دەکەن، واز لە بەرژەوەندی خۆیان بهێنن بۆ بەرژەوەندی گشتی. ئەوەیان بیرچووەتەوە کە

بەرژەوەندی تایبەت بنەمای سروشتی مرۆڤایەتییە، خۆ ئەگەر هاتوو ئەو ئەم بەرژەوەندییە تایبەتە پێچەوانەی بەرژەوەندی گشتی وەستایەوە، ئەوا دەبێتە قوربەسەریی و ماڵوێرانی و دەردی بێ دەرمان.

واعیزی ڕاستەقینە، ئەو واعیزەیە کە خەڵکی بانگ دەکات بۆ گرنگیدان بە بەرژەوەندی تاکەکەسی و لە هەمان کاتیشدا بەستنەوە و نزیککردنەوەی لە بەرژەوەندی گشتی. هەروەها کۆمەڵگەی سەرکەوتوویش، ئەو کۆمەڵگەیە کە بەرژەوەندییەکانی خۆی دێنێتە ئاستی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان و ڕایان دەپەڕێنێت. چونکە ئەگەر کۆمەڵگە داوای ئەوەیکرد لە تاکەکان، کە واز لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بهێنن و لە خزمەتی ئەمدا بن، ئەوە باش باش بزانە، ئەو کۆمەڵگەیە دەبێت "کفن"ی بۆ ئامادە بکرێت و خەڵکەکەیش هەموو "انا لله"ی بۆ ئامادە بکەن.

ڕۆژێکیان گوێم لە واعیزێک بوو، لە ئێستگەوە پەند و ئامۆژگاریی گوێگرە بەڕێزەکانی دەدا و دەیگوت: "موسوڵمان هەست بە هەژاریی و ئاتاجی ناکات، بەڵکوو تەنها ئیمانەکەی بەسیەتی کە تێریی بکات لەم جۆرە هەستە بێمانایانە". وام هەست دەکرد کە ئیمانی ئەم واعیزە، هاوشێوەی ئیمانە بە چێژەکەی هاروونە ڕەشید بێت. بە ئیزنی خوا ئەو ژێرسکی تێر دەکرد و حەزەکانی دیکەیشی بە یارمەتی پەروەردگار دەهێنایە دی، بەشێوەیەک کە واعیزەکانی ئامۆژگاریی دەکرد و ئەوانیش لە چێژ و پلەیان بۆ فەراهەم دەهێنا. بۆیە ئەو سوودێکی وەهای لە ئیمانەکەی وەرگرت کە هەر نەبڕێتەوە، خێری دنیا و دواڕۆژی تێدا بەدەست هێنا، دوای ئەوەیش دێت و داوای ئەوەمان لێ دەکات کە دەردی هەژاری لە بیری خۆمان بەرینەوە لەبەر ئەوەی ئێمە مسوڵمانین و پێویستە گوێ بەم شتە

ساکارە کاتییانە نەدەین. من بۆ خۆم دڵنیام ئەگەر بێتوو هۆی هەژار و ڕەجاڵ بوایە، زندیقێکی چاکی لێ دەردەچوو "پەنا بە خودا."

ئیبن ڕاوەندی، ئەوەی کە زەندیقێندرا ، کەسایەتییەکی بەناوبانگی هەیە، دەڵێت:

کم عاقل عاقل أعیت مذاهبه

وجاهل جاهل تلقاه مرزوقا

هذا الذی ترك الأذهان حائرە

وصیر العالم النحریر زندیقا

چەندە ئاقڵ و ژیر، لە مەزهەبیان چەویڵ بوون

گەلحۆیەک خێری بەسەردا ڕژێنراوە

ئە ئەمەیە مێشکی عالەمەکەی تێکداوە

زانای بلیمەتی کردووەتە زندیق

ئەبوو زەڕری غیفاریش دەڵێت: "سەرم لەو کەسە سووڕماوە، کە قوت و پووت لە ماڵەکەیدا نییە و نایشچێتە دەرەوە تا شمشێرەکەی لە کێلان هەڵکێشێ بۆ مەردووم"[102]. لەوانەیە ئەبوزەر لەم قسەیەیدا ئاماژە بۆ بەریەککەوتنە دەروونییەکانی فەقیر بکات، ئەوەی لە نێوان بەرژەوەندی تایبەت و گشتیدا ڕوو دەدات. ئەو ناچارە بخوات، ئەم ناچارییەیش پاڵی بەرەو خراپەکاری پێوە دەنێت. ئەو گرنگی بە بەرژەوەندی گشتی نادات تا کاتێک بەرژەوەندی خۆی لەژێر مەترسیدا بێت. هەر دیسانەوە ئەبوزەر دەڵێت: "کاتێک فەقیریی ڕوو لە باژێرێک دەکات، کوفریش دەڵێت، منیش لەگەڵ خۆت بەرە". وەک

[102]- خالد محمد خالد، من هنا .... نبدأ ص ١٠٠.

دەبینین، ئەبوزەر هاوڕا نییە لەگەڵ جەنابی واعیزدا. چەنـابی واعیـز وا دەزانێت ئەگەر موسوڵمان هەژار کەوت و نان نەبوو بیخوا، ئەوا وەک ئەوەیە نـوێژ و ڕۆژووی گرتبێـت، بەڵام ئەبـوزەر کـوفر و هەژاریـی دەبەستێت بەیەکەوە.

# بەشی چوارەم

## گرفتی پێشینە چاکەکان

## ( مشكلە السلف الصالح)...

واعیزەکان دەیانەوێت بمانگەڕێننەوە بۆ سەرەتای ئیسلام. سەری زمان و بنی زمانیان باسی موسوڵمانەکانی سەردەمی پەیامبەرە (دخ) و دەڵێن: ((تەماشای ئەوان بکەن... ئەوان شوێن ڕاستی کەوتن و سەرکەوتووبوون. ئێمەیش دەبێت شوێنپێیان لە ورد و درشتدا هەڵبگرینەوە، تا وەک ئەوان سەرفرازبین)). ئەمە دنیابینیەکی سەخیف و ترۆیە. موسوڵمانەکانی سەرەتا، سەرکەوتوو بوون و دواتریش تێکشکان، ئێمە دەبێت تەنها بە چاوی پەند و ئامۆژگارییەوە تەماشای مێژووەکەیان بکەین، نەک زیاتر لەمە.

هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت تا ئەزموونی تێکشکان نەبینێت. ئەمە سوننەتی گەردوونە لە هەموو سات و کاتێکدا. ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە پیاوە داناکە (عومەری کوڕی خەتاب) ئاماژەی پێداوە، کاتێک ئیسلامی چوواند بە وشترێک، کە لە سەرەتاوە نەشەوگەشە دەکات و لە دوایشدا تووشی پیری و بێهێزی دەبێت. عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: ((من تەمەنی ئیسلام بە تەمەنی وشترێک دەچوێنم، سەرەتا کۆرپەلەیە، دوایی دەبێتە دووساڵە و

چوارساڵە و شەش ساڵە و دواتریش کەم کەم پیر(ناب) دەبێت، ئایا ئیتر لەو کاتەدا تووشی کەموکووڕی نابێت؟ بەڕاستی ئیسلامیش چووە بە تەمەندا[103])). خوێنەر سەری لەم قسەیە دەسووڕمێت کە کوڕی خەتاب گوتوویەتی لە کاتی فراوانبوونی قەڵەمڕەوی ئیسلامدا و بڵاوبوونەوەی لەسەر زەویدا. چاوەڕوان دەکرا عومەر دڵخۆش و کامەران بێت بە سەرکەوتنەکانی ئیسلام و شایی بگێڕێت... کەچی نائومێد و دڵ-سەغڵەت دەبێت. دەبێت هۆکارەکەی چی بێت؟

واعیزەکان، لەم جۆرە قسانە ناکەنەوە کە لە زاری عومەرەوە دەچوون. ئەوان بەسەر ئەم جۆرە قسانەدا ڕادەبوورن و وەک شتانێکی بێ مانا دێتە بەر دیدەیان، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە نیشانەی دانایی و دووربینی خاوەنەکەی نیشان دەدات. زانستی کۆمەڵناسی هێندەی پشتراستی ئەم قسەیە دەکات، پشتڕاستی هیچ قسەیەکی دیکە ناکات[104]. دەتوانین ئەوەیش بڵێین کە سەرکەوتنی هەر بنەمایەکی کۆمەڵایەتی، شکست بە دوای خۆیدا دەهێنێت. بۆیە سەرکەوتن وەک گۆڕێک وایە کە بنەماکەی تێدا دەنێژرێت. لەم گوتەیەدا مەبەستم عەیبدارکردن و زەمی موسوڵمانانی سەرتا نییە، بەڵکوو ئەمە دیاردەیەکی گشتییە لە هەموو سەردەمەکاندا. موسوڵمانانی سەرەتایش وەک هەموو کەسێکی دیکە بنیادەم بوون و نەریت و خووە کۆمەڵایەتییەکانیان لەسەر جێبەجێ دەبێت و لەگەڵ شەپۆلەکەدا دەڕۆن، ئیدی بیانەوێت یان نا. قورئان دەڵێت: [إن الانسان ليطغى، أن رى رى استغنى - بەڕاستی مرۆ لادەرە، هەر کە شتێکی بینی، خێرا بێنیاز دەبێت]. بە گیانی خۆم و ئێوەیش، هیچکەس لەم بنەما کۆمەڵایەتییانە هەڵاوێرد ناکرێت، مەگەر تاک و تەرا، لێرەولەوێ.

103- طه حسين، الفتنه الكبرى ص ٧٩.

104- Gettys & Dawson، socuology، ch، ٢٥ .

مسولمانانی هەوەڵی سەردەمی پەیامبەر (دخ)، لە بەرانبەر ستەم و نادادپەروەریدا وەستانەوە، بەڵام هەر ئەوەندەی بوونە خاوەنی جاهوجەلال، ماڵ و سامان، ئیدی ئەمانیش پێویستیان بە یەکێک بوو لە دژیان خەبات بکات. ئەبو یوسف دەڵێت: ((کاتێک دەستکەوتەکانی (غنائم) فارسیان هێنایەوە بەردەستی عومەری کوڕی خەتاب، شتی وای تێدابوو کە چاوی ئەبڵەق دەکرد لە گەوهەر و زێڕ و زیو، ئیدی عومەر دەستی کردە گریان. عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێی گوت: "ئەمە ئەو شوێنەیە کە پێویستی بە شوکرانەبژێرییە، چی شتێک دەتگریەنێت؟"، عومەریش گوتی: بەڵام خودا ئەم شتەی بە هیچ قەومێک نەداوە، مەگەر دووبەرەکی کەوتووەتە نێوانیانەوە.[١٠٥]))

پاشاگەلێکی زۆرمان بینی، چی پێش عومەر، چی پاش عومەر. شادومان دەبوون بە هێنانەوەی غەنیمەت و تەپڵی شادییان بۆ دەگێرا، بەڵام عومەر دەگریی و بێتاقەت دەبێت. ئەمەیش دیاردەیەکە کە جێگای تێڕامانە، بەڵام بەداخەوە مێژوونووسان گرنگییان پێ نەداوە و پشتگوێیان خستووە. عومەر بە چاوە تیژەکانی، ئەوەی هەست پێ کردبوو، کە ئیسلام لە پاش بڵندبوون، خلۆر دەبێتەوە. ئەمیش وەک هەموو دەوڵەتەکانی دیکە، دەستکەوتی بۆ دێت، سەربازی بۆ گلێر دەکرێتەوە، بە شەللاق لە پشتی خەڵکی دەدرێت لە پێناویدا.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێت: ((ئەوەی فەرمانڕەوایی بکات، زۆرترین پشک بۆ خۆی دەبات)). ئەم وتەیەیش ئاماژە بەوە دەکات کە ئیسلامیش تووشی ئەو قۆرخکاریی و لادانە دەبێتەوە. بۆیە دواتر لە ئیسلامدا پاشایەتی سەری هەڵدا، کۆیلایەتی و دروستبوونی چینی باڵا دروست دەبێتەوە هەروەک ئەوەی پێش ئیسلام قورەیشییەکانی

[١٠٥]- ابو یوسف، کتاب الخراج، ص ٥٥- ٥٦.

لەسەر بوو لە خۆشڕابواردن و نیعمەت. واعیزەکان هەر بە لۆجیکی کۆن تەماشای بارودۆخەکە دەکەن. بە لۆجیکی نەگۆڕ و دابەشکردنی دوانی (باش و خراپ، یان ڕەش و سپی). جوانی هەر لەڕۆژی بەرێوە هەر جوان بووە، ناشیرینیش تا ڕۆژی سەلا هەر ناشیرینە. بەلام لۆجیکی کۆمەلایەتی نوێ، ئەم جۆرە بیرکردنەوانەی بەلاوە وەک تۆزی بەر بایە، بە لۆجیکی سوڵتان و کاڵفامەکان ناوزەدیان دەکات. لە لۆجیکی تازەدا، جوانی، تا سەر و هەتا هەتا نییە. بەڵکوو ئەو لە بزوتنێکی بەردەمدایە. ئەوەی دوێنێ لەبەر دڵان شیرین بووە، پێدەچێت ئەمڕۆ بێزی لێ بکرێتەوە.

لۆجیکی ئیمڕۆژی ناودەبرێت بە "لۆجیکی پارادۆکسەکان". واتە شتەکە و دژی شتەکە پێکەوە لە یەک کاتدا پێکەوەن[١٠٦]. ئەو شتە گەشە ناکات مەگەر لەگەڵ دژەکەیدا نەبێت. بەمەش خراپە دەگۆڕێت بۆ چاکە، تەنها بە گەشەکردن و بزووتن. واعیزەکان داوای ئەوەمان لێدەکەن کە دەستپێکی ئیسلام بخوێنینەوە، بارەکەللا لە سەرەتای بزوتنەوەکە بکەین، بە شتێکی ئەبەدیی بزانین کە شایەنی گۆڕانکاریی (التغیر) یان شوێنگۆڕکێ (التبدیل) نییە. هەر دامەزرێنەری ئیسلام خۆی، بەم قسەیە ڕازی نییە. محەمەد (دخ)، بە هەنگاوێکی کۆمەلایەتی بەهێزەوە هاتە مەیدان. ئەو دەیشیزانی کە مێژوو شتێکی زنجیرەیی و قۆناغبەندییە، بۆیە پێویستە قۆناغەکان بەبێ ڕاوەستان، نەوە لە دوای نەوە بێن بە دوای یەکدا. پێغەمبەر (دخ)، دەیزانی کە ئیسلام نامۆ دەبێتەوە، وەک چۆن لە سەرەتایشەوە نامۆ بووە. بۆیە ئەو بە هاوەڵانیشی دەگوت، ئێوە موو بە موو دەچنەوە سەر نەریتی میللەتانی پێش خۆتان و دواتریش لێی وەردەگەڕێن[١٠٧]. ئەو لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا پێشبینی ڕوودانی فیتنە و ئاشووبی کردبوو،

---

١٠٦- Elliott... ،p.٦ social Disorganozation .

١٠٧- بڕوانە بەشی الحوض لە بەشی چوارەمی سەحیحی بوخاری.

وەک چۆن لە پاش خۆیشی، خەلیفەی دووهەم (عومەر) پێشبینی شتانێکی کردبوو.

ئەبو موەیهیبە (خزمەتکاری پێغەمبەر، بۆمان باس دەکات، کە شەوێکیان پەیامبەر (دخ) بەدەست ئارەقەکردنەوەوە بێزار بووبوو، ئەوەیش سەرەتای نەخۆشییەکەی بوو کە بەهۆیەوە وەفاتی کرد. بۆیە لەگەڵ مندا (خزمەتکارەکەی)، چووینە لای گۆڕستانەکەی دەرەوەی شاری مەدینە. لە بەردەم گۆڕەکاندا ڕاوەستا، ئابەم چەشنە لەگەڵیان دوا: ((سڵاوتان لێبێت ئەی گرۆی مردووان. پیرۆزبایتان لێ دەکەم کە وەک ئەم خەڵکەی ئێستا گیرۆدە نەبوون. فیتنە وەک پارچەیەک لە تاریکیی شەو بەڕێوەیە، کە کۆتاییەکەی بەستراوە بە سەرەتاکەیەوە. کۆتاییەکەی لە سەرەتاکەی ئاشوبەنگیزترە))[١٠٨]. ئەو دەمەی کە نەخۆشییەکەی تینی بۆ دێنێت، بەرەو مزگەوت بە ڕێ دەکەوێت، عەلی کوڕی ئەبوتالیب و فەزلی کوڕی عەبباس خۆیان دەهاوێنە ژێرباڵییەوە. بە دەنگی بەرز وتاریکی دا، هێندە بڵند بوو وتارەکەی، کە خەڵکی دەرەوەی مزگەوتیش دەیانبیست، گوتی: ((هۆ خەڵکینە، ئاور کڵپەی سەندووە و فیتنەیش وەک پارچەیەک لە شەوەزەنگ دێت بە پیریتانەوە.[١٠٩]))

ئەم بێئومێدییەی پێغەمبەر (دخ)، لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا، مرۆ پەلکێشی ناو دەریای سەرسووڕمان دەکات. ئەمە لە کاتێکدایە کە پەیامبەر لەوپەڕی سەرکەوتندایە، نیمچەدوورگەی عەرەبی ملیان بۆ کەچ کردووە و خەڵکانیش پۆل پۆل دێنە ناو ئاینەکەیەوە. ئەی باشە دەبێت چی پاڵی پێوە نابێت وا نائومێد بئاخڤێت کە لە کاتێکدا خۆی خەڵکی بانگ دەکات بۆ ئومێد و هیوا؟ هەرچۆنی لێک دەدەیتەوە، هەر

---

[١٠٨]- محمد حسین هیکل، حیاه محمد ص ٤٧٠.

[١٠٩]- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٧٦.

مایەی تێڕامانە. من وای بۆ دەچم کە پەیامبەر بەو بیرتیژییەی کە هەیبووە هەستی بەم شتە کردووە، هەروەک چۆن دوایی عومەریش هەمان هەستی بۆ دروست دەبێت. ئەمە سروشتی هەموو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتییە، بەرەو بڵندایی دەڕوات و دوایی سەربەرەوخوا خلۆر دەبێتەوە ئیدی چ درەنگ یان زوو. هەموو سەرکەوتنێک دابەزینی لە شوێنە. ئەبوو بەقای ڕەندی ڕاست دەکات کە دەڵێت:

لکل شیء إذا ما تم نقصان

فلا یغر بصیب العیش إنسان

هەرچی کە کامڵ بوو، دیسانەوە عەیبار دەبێت

مرۆ بە خۆشییەکانی دنیا، لە خۆی بایی نەبێت.

موحەمەد (دخ) دژی دەوڵەمەندەکانی قورەیش جەنگا، لەسەر سووخۆریی و کۆیلایەتی و چەوساندنەوە، بە شێوەیەکی زۆر باش لە کارەکەیشیدا سەرکەوتوو بوو. لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیشیدا، دەستی بەسەر هەموو ئەو سەروەت و ماڵانەدا گرت کە هیی "سوو" بوون و تەنها سەرمایەکەی هێشتەوە لە دەستی خاوەنەکانیاندا. بێگومان ئەم کارەی کە پێغەمبەر پێی هەستاوە، چارەسەری بنچینەیی "خاوەنداریێتی مەزن"ی نەکردووە، بەڵکوو ئەوە تەنها چارەسەرێکی کاتی بوو. خۆی دەبوو ئەم سیاسەتە موحەمەدییە لەپاش مردنیشی بە شێوەیەکی جوان ئاراستە بکرایە نەوە لە دوای نەوە، بەو جۆرەی کە کۆمەڵگە و بارودۆخەکە داخوازێتی. موحەمەد (دخ) توانی لە سەردەمی خۆیدا ئاراستەی کەسە دەوڵەمەندەکان بکات و زاڵ ببێت بەسەریاندا. بەڵام لە پاش خۆی، جۆرێکی دیکەی دەوڵەمەندی هاتە

کـایەوە، ئەویـش بەهـۆی هـاتنەوەی دەسـتکەوتەکانی جەنـگ لەگەڵ ناوچەکان و میرنشینەکانی دیکەدا بوو.

دەوڵەمەنــدە نوێیەکــان، بەو شـێوەیە سـووخۆرییان نەدەکــرد کە موحەمەد (دخ) حەرامی کردبوو، بەڵکوو شێوەیەکی دیکەیان بۆ "ڕیبا" دۆزیبـوویەوە، ئەمـان نەدەهـاتن بەو شـێوەیەی کە خەڵکـی مەکـکە سوویان دەدایە خەڵکی، ئەمانیش بیدەن، بەڵکوو ڕێگایەکی دیکەیـان داهێنـابوو کە حەرام نەکرابـوو لە ڕووی دەق و تێکسـتی ئـاینییەوە. مسـوڵمانە هەوەڵینەکـان، وایـان دەزانـی کە مەبەسـتی پێغەمـبەر (دخ) نەهێشتنی خودی "سوو"ە، لە کاتێکدا ئامانج لە کارەکە ئەوەبوو: "کە پارە و سـەروەت و سامان لە چنگی کەمینەیەک بێتە دەرەوە". بۆیە حەرامکردنـی "سـوو" هۆکـار بـوو نەک مەبەسـت، بەڵام مسـوڵمانانی هەوەڵ خودایـان لێ ڕازی بێت، وەک ئەنجام تەماشـایان کـرد... وەک ئەوەیشی کە مسوڵمانە دەوڵەمەندەکانی ئێستایش هەر هەمان بڕوایان هەیە[110].

هەموو تەشریعێک (یاسادانانێک)، بریتییە لە هۆکارێک بۆ گەیشـتن بە ئامـانجێکی کـۆمەڵایەتی دیـاریکراو. بەڵام گـرفتەکە ئەوەیە خەڵـکەکە خەریکی وشـەکاریی یاسـاکەن و ڕۆح و مەغزاکەیـان بیر دەچێت کە بـۆچی مەبەسـتێک هـاتووە. مسـوڵمانە هەوەڵینەکـان لە سـێ ڕێـگەوە قازانجیان دەکرد:

[110]- نووسەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: یەکێك لە مسوڵمانە دەوڵەمەندەکان پێـی گـوتم کە مـاڵەکەی خـۆی داوەتە یەکێك، کـارەکەی ڕێـك ڕیبـا بـوو، بەڵام بە شێوەیەکی شەرعی پینەی کردبوو، بۆیە بە حەڵاڵی دەیخوارد.

یەکەم: کڕینی کۆیلە و بەردە، پاشان دانیان بە کرێ لە شوێنکارە جیاجیاکاندا و دانانی باج بە سەریانەوە، کە ڕۆژانە کاریان دەکرد، دەبوایە هەندێکی بدەنەوە خاوەنەکانیان[111].

دووەم: پارەیان دەدایە بازرگانەکان، دواتریش قازانجەکەیان بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێک کەوتبوون دابەش دەکرد[112].

سێیەم: مامەڵەی دواخراو. بە شێوەیەک کە یەکێکیان قەرزی دەدایە ئەوی دیکە، بەڵام بە نرخێکی بەرزتر لەوەی بازار. خاتوو عایشە ئەم مامەڵەیەی ناونابوو (ڕیبای خێرا). هەروەها ناوێکی دیکەی لێنابوو، ئەویش "فێڵ لە شەرع کردن"[113].

ئیدی بەم ئامرازانە، مسوڵمانە سەرمایەدارەکان توانییان سامانێکی باش کۆ بکەنەوە کە دەوڵەمەندە موشریکەکان خەونیشیان پێوە نەدیبوو. سەروەتی یەکێک لە مسوڵمانەکان گەیشتبوویە "٤٠٠" هەزار دیناری ئەو سەردەمە. ئەمە سەرەڕای هەبوونی هەزار بەردە و هەزار ئەسپ. داهاتی ڕۆژێکی مسوڵمانێکی دیکە تەنها لە عێراق گەیشتبوویە هەزار دینار، لە ناوچەیەکی دیکە لەمەیش زیاتری دەست دەکەوت. یەکێکی دیکەیش ١٠٠ ئەسپ و هەزار وشتر و دە هەزار مالاتی هەبوو. میراتی یەکێکی دیکە لە مسوڵمانەکان لە زێڕ و زیو هێندە قایم بوو، مەگەر بە تەور بتشکاندایەتەوە، ئەمە بێجگە لە زەویوزار و ئاو و شتی دیکە کە مەزەندە دەکرا بە ١٠٠ هەزار دینار[114]. (وەرگێڕ: مسوڵمانی داماویش گیری خواردووە، دەوڵەمەند دەبێت ئاوای پێ

---

[111]- الصالح علی، التنضیمات الاجماعیە والاقتصادیە.... ص ٢٤٣.

[112]- سەچاوەی پێشوو، ص ١٨٧.

[113]- هەمان سەرچاوە ص ٢٦٣.

[114]- المسعودی، مروج الذهب، نقلا عن صادق عرجون، عثمان بن العفان، ص ٨١- ٨٢.

دەڵێن، فەقیریش دەبێت پێی دەڵێن: ئەو گەمژەیە هەر خەریکی نوێژ و تەسبیحاتە، ئەگینا چی لە دەوڵەمەندی خۆشتر هەیە.)

سەحابەکان، بەندە و کۆیلەی زۆریان هەبووە. لەوانەیە خوێنەر سەری سوور بمێنێت کاتێک ئەو ژمارە زۆرە دەبیستێت و لەوانەیشە بپرسێت باشە ئەم هەمووەیان بۆچی بووە؟ ئەم کویلانە، لە ڕێگەی جەنگەوە پەیدا بووبوون، زۆرینەیشیان خاوەن پیشە و کارزان بوون. ئیدی لە جەنگدا بە دیل گیراون و هێنراونەتەوە بۆ پایتەخت و بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش کراون. ئەوانەیان کە پیشەوەر بوون، ئازادانە دەنێردرانە بازار بۆ کارکردن و ئێواران دەبوا هاتبانەوە و باجی ڕۆژەکەیان دابا، ئەمەیش بریتیی بوو لە باجی کویلایەتی. بۆیە هەریەکەیان ئەگەر شتێکی پەیدا کردبا، ئەوا بڕێکی دەدا بە خاوەنەکەی و ئەویتریشی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی، ئەگەر خێزاندار بوایە. ئیدی هەندێک لە گەورەکان باجی سەختیان لەسەر بەردەکانیان دادەنا و ڕەنگ بوایە ئەوەی دەمایەوە، بەشی گوزەرانی ئەو قوڕبەسەرەی نەکردایە، ئیدی ئەویش ناچار گازەندە بکات بەبێ ئەوەی یەکێک گوێ لە گازەندەکانی بگرێت. ئەو بەردەیە... لە جەنگی دژی خودا و پێغەمبەردا بە دیل گیراوە... بۆیە شایەنی بەزەیی نییە.

ئەم کۆیلانە خۆیان شەکەت دەکەن تا سەروەتی گەورەکانیان زۆرتر بکەن. گەورەکانیان ئیماندار و موجاهیدی ڕێگەی خاوەن و بەردەکانیشیان بێجگە لە نەفرین، شایەنی هیچی دیکە نییە. سەرەتا ئیسلام هات و خەڵکی لە کۆیلایەتی ڕزگار کرد، بەڵام دوایی بووە یەکێک لە هۆکارەکانی زیادبوون و سەرهەڵدانەوەی.

تەبەری دەگێڕێتەوە: ((عومەری کوڕی خەتاب لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا گوتوویەتی، ئاخ ئەگەر ڕێگەم پێ دەدرا، بە خوا هەموو پارەی

زیادەی دەوڵەمەندەکانم بەسەر هەژارەکاندا دابەش دەکرد.[115])) لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت کە عومەر هەستی بە مەترسی ئەو دیاردەیە کردبوو کە ئەگەر هەموو سامانەکان لە خەزێنەی کەمینەیەکی زەنگیندا کۆببنەوە. عومەر هەوڵی ئەوەی دا کە دەوڵەمەندەکان لە شاری مەدینەدا بەند بکات و ڕێگرییان لێ بکات کە بە شارەکاندا بێن و بچن. ئەمەش بوویە مایەی نیگەرانی زەنگینەکان. بۆیە عومەر زیاتر لێی توونـد کردنەوە و پێی گوتن: ((ئەمان دەیانەوێت بەبێ ئەوەی بەشی بەندەکانی خودا بدەن، هەموی بەرن بۆ خۆیان[116])). عومەر بەم بەندکردنەیان، وایزانیوە لە ئاگر دەیانپارێزێت.

وا دەردەکەوێت کوڕی خەتاب بەم کارەی ویستوویەتی تەقینەوەی بۆمبەکە دوا بخات. ئەو بۆمبەی کە هەر دەبێت درەنگ و زوو بتەقێتەوە. ئاگردان ئامادە، سووتەمەنیش بەهەمان شێوە، هەر بەتەنها یەک دەنکە شقارتەی پێویستە. عومەر هەوڵ و کۆششی دنیای دا، تا ڕێگری بکات لەو تەقینەوەیە بە دەستی یەکێک لە ڕەعیەتەکانی خۆی و لە سەردەمی خۆیدا. لە بەخت و ئیقباڵی ڕەشی عوسمانی کوڕی عەفان، بۆمبەکە لە سەردەمی ئەودا تەقییەوە. مێژوونووسان دەڵێن عوسمان لاواز بووە و ئەمەیش بووەتە کارای یاریدەدەری تەقینەوەکە، ئەم وتەیە دەرحەق بە عوسمان ستەمە و مەنتیقی کۆمەڵایەتی بە ڕەوای نابینێت. ئەگەر عوسمانیش وەک عومەر بەهێز بوایە، ئەوا دەیتوانی تەقینەوەی بۆمبەکە دوابخات، بەڵام هەرچۆنێک بوایە نەیدەتوانی ترسناکییەکە بنبڕ بکات. چونکە ئەو بۆمبە هەر دەبوو بتەقێتەوە، ئیدی لە سەردەمی ئەمدا، یان دوای ئەم. هەر دەبوو لە زنجیرەی خەلیفەکاندا، خاڵێکی لاواز دەرکەوتایە، بارودۆخەکەیش بتەقیایەتەوە. هەبوونی کەسانی لەڕادەبەدەر زەنگین، لە تەنیشت

[115] - بنوارە: صادق عرجون، سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٩.

[116] - تەها حوسەین، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٧٩

کەسانی ڕەجاڵ و بێشێو لە یەک کۆمەڵگەدا، لە یەک گەڕەکدا، دەبێتە هۆی تەقینەوەی باروودۆخ، ئیدی چ درەنگ چ زوو. هەرچەندە ئەم دەوڵەتمەندیی و زەنگینییە بەهۆی ئاین، ئەخلاق یان کەسایەتییەوە بێت، خەڵکی هەر لە بەرچاویان ناشیرینە و ڕقیان لێیەتی.

لە هاوینی ١٩٥٠، سەردانی شاری ئەسکەندەرییەم کرد، بەندەری میسری شکۆمەند. جیاوازییەکی چینایەتی وام بینی، کە دەروونم هەستی بە نائارامی کرد. لە ڕۆخی ڕووبارەکەدا دەوڵەمەندەکان چۆنیان ڕادەبوارد و شەهوەتیان تێر دەکرد، دوو گەڕەک ئەولاتریش، هەژاری داماوی بێدەرەتان لە ناخۆشترین وێنەدا دەبینرا. ئیدی لەو دەمەدا زانیم، لە "میسر"یش تەقینەوەیەک بەڕێوەیە. ئەم جیاوازییە لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامیشدا هەبوو، دەوڵەمەندەکان خشتەزێڕەکانیان بە تەور دەشکاند، هێندە تیرەیان ئەستوور بوو. لەولایشەوە هەژار، ئاوی دەکوڵاند بۆ شێوی ئێوارە، بۆ شەویش زەوی دەکردە ڕاخەر و ئاسمانیش بالیف. دەڵێن عومەر جارێکیان لە شەوێکی زستان و سەرمای دەم بە گوێزان، تێپەڕی بەلای ماڵە بێوەژنێکی عەیالداردا، منداڵەکان دەگریان، بینی وا ژنەکە ئاوی خستووەتە ناو مەنجەڵێکەوە و لە ژێریشەوە ئاگری بۆ کردووەتەوە، سا منداڵەکان وا بزانن ئەوە شێوە و کەمێکی دیکە ئامادە دەبێت. دەڵێت عومەر بەم شتە زۆر نیگەران بوو، هەستا و چوو هەندێک ئازوقەی بۆ هێنان[١١٧].

مێژوونووسان ئەم چیرۆکە وەک چاکە و فەزڵی عومەر بە نموونە دەهێننەوە. بەڵام لەو ئاماژەیە گرنگتر ئەوەیە کە باروودۆخە کۆمەلایەتییەکەی ئەو سەردەمەمان پێ نیشان دەدات، کە فەقیر چلۆن ژیاوە، لە چی گوزەرانێکی سەغڵەتدا بوون و ژیاون. بە سوتفە

[١١٧]- بشير يموت، الفاروق ص ٦٤ – ٦٥.

ئەوجارە عومەری لە حاڵی ئەو ماڵە ئاگادار دەبێت، ئێ ئەی دەبێت چەند ماڵی دیکەیش هەبووبن؟ خۆ سوتفە هەموو دەم هاوڕێی بنیادەم نییە. ئەو بارودۆخەیش لەسەردەمی عومەردا شتێکی سەرتاسەریی بوو، هەموو ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەویی گرتبوویەوە. ئێ خۆ عومەریش زانستی پەنهان(غەیب)ـی پێ نییە تا هەرچی ماڵە هەژارە پێ بزانێت. ئەبو یوسف دەگێڕێتەوە: ((عومەری کوڕی خەتاب خەریک بوو لە شام دەگەڕایەوە، دیتی وا کۆمەڵێکیان داناوە لەبەر خۆر و زەیتیشیان کردووە بەسەریاندا. عومەر پرسی: چییە، لەسەر چی ئاوایان لێ دەکەن؟ وتیان: پێویست بووە سەرانە بدەن، بەڵام نەیانداوە، بۆیە سزایان دەدەین تا دەیدەن. عومەر پرسی: ئەی ئەمان قسە و پاساویان چییە؟ وتیان: "دەڵێن نیمانە و ناتوانین". عومەر کە ئەمەی بیست، قیراندی، پیس قیراندی، لە هاوارەکانی خۆی و گوتی: "بەرەڵایان بکەن، داوای شتێکیان لێ مەکەن کە نەیتوانن، من لە پێغەمبەری خودام بیستووە (دخ) فەرموویەتی: "ئازاری خەڵکی مەدەن، ئەوانەی لە دنیا ئازاری خەڵکی دەدەن، خودا لە ڕۆژی سەڵادا سزایان دەدات"[١١٨])). دیسانەوە سوتفە یارمەتی عومەری دا، کۆمەڵێک خەڵکی بینی سزا دەدران بەهۆی سەرانەی سەپێنراوەوە.

لە توانای تاکەکەسێکدا نییە کە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی چاک بکات لە هەموو لایەکەوە. ئەو ئەگەر بتوانێت، ئەوا تەنها لە لایەکەوە دەتوانێت و بەس. ئەمە قۆناغێکی حەتمی هەر گەشەسەندنێکی کۆمەڵایەتییە، بۆیە تەنها تاکە کەسێک دەرەقەتی ئەم کارە نایەت، مەگەر لە سنوورێکی دیاریکراودا. ئیسلام بووبووە دەوڵەتێکی کراوەی خاوەن باجگر، شەللاقوەشێن، فەرمانبەر، والی و ئەمیر. ئیدی سروشتی باجگر و والی و شەقوەشێن ئەوەیە کە ڕەق و زبر بێت

[١١٨]- بڕوانە ئەبو یوسف، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٥٠.

لەگەڵ ژێردەستەکانیدا. ئەمەیش سروشتی هەموو دەوڵەتێکی کلاسیک بووە، ئیدی ئەگەر جیاوازییەکت شک ببردایە لە نێوان دوو دەوڵەتدا، ئەوا جیاوازییەکان لە جۆردا نین، بەڵکو تەنها لە پلە و دەرەجەدان. هەتا باجی سەپێنراو هەبێت لەسەر خەڵک، ئەوا خەڵکی بەهەر ئامرازێک بۆیان بلوێت لێی هەڵدێن. والیش ناچارە توند و ڕەق بێت لەگەڵیان، ئیدی چ بە شمشێر یان بە قامچی، ملکەچکردن.

ئەبو یوسف لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێت: ((یەکێک لە هاوەڵان بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕین، خەریک بوون سزا دەدران لەسەر سەرانە، بۆیە ئەم کارەی پێ ناخۆش بوو، چوویە لای ئەمیرەکەیان و پێی گوت: دەست هەڵگرێت. هەروەها هاوەڵێکی دیکە شتێکی هەر لەم جۆرەی بینی، ڕەخنەی گرت لە کارەکەیان[١١٩]. لە ڕاستیشدا، عومەر هەمیشە وەسیێتی والییەکانی دەکرد، کە سەختگیر نەبن لەمەڕ بابەتی سەرانە. بەڵام ئاریشەکە لەوە ئاڵۆزتر بوو کە بە وەسێت، نامە یان نووسین چارەسەر بکرێت. ئەوە سروشتێکی کۆمەڵایەتییە و دەربازبوون لێی زۆر ئەستەمە. ئەگەر ئامۆژگاری و وەسێت جارێک سوودی هەبوو بێت، دە جاران نەیبووە، ئەگەر توانیبێتی والییەکانی بخاتەوە سەر ڕێتمی چاکە و خێر تا خۆی زیندووە، ئەوا لە پاش مەرگی، هەموو دەچنەوە سەر قەوانە کۆنەکە. ئاشکرایشە، ئەم باج و سەرانەیەی کە ئا بەم شێوە قێزەونە کۆ دەکرێتەوە، دوایی دەچێتە گیرفانی زەنگینەکانەوە تا سامانیان هەر لە "برەو"دا بێت. خۆ لەو دەمەیشدا ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان نەبوون، وەک "نەخۆشخانە"، "خوێندنگە" و "پەناگە" تا داهاتی باج و خەراجی تێدا سەرف بکرێت.

عومەر تەکنیکێکی نوێی دابەشکردنی سەروەتی داهێنا، جیاواز لەوەی "ئەبوبەکر". ئەبوبەکر بە یەکسانی شتی بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد.

[١١٩]- بڕوانە ئەبو یوسف، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٥٠.

هاوەڵەکان گازەندەیان لێکرد و گوتیان: خەڵکی یەکسان نین لە جیهاد و بەرواری مسوڵمان بوونیان، بۆیە ناکرێت وەک یەکیان بەرکەوێت. ئەبوبەکریش وەڵامی بەم شێوەیە دانەوە: "ئەو شتانەی کە ئێوە ناوتان هێنان لە چاکە و ئیمان و ئەم شتانە، من کارم بەسەریانەوە نییە، پاداشتی ئەوانە لای پەروەرێنە، ئەمەیش بژێویی ژیانە و یەکسانی لە هەموو شتێک باشترە"[120]. بەڵام عومەر بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی ئەبابەکر دابەشی دەکرد، دروشمیشی لەم کارەیدا بریتی بوو لە: "ئەوانە یەکسان ناکەم کە شانبەشانی پێغەمبەر جەنگاون لەگەڵ ئەوانەی دژی جەنگاون". بەم کارەیشی خەڵکەکەی کردووە بە پلە پلە لەسەر ئاستی زوو یان درەنگ ئیمانهێنان و جەنگیان بۆ ئیسلام و سەرخستنی.

ئەم ڕێگەیەی عومەر لە بنچینەدا شتێکی باشە. وەک لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، هاوەڵان دوو جۆر بوون. هەندێکیان لەگەڵ پێغەمبەر و لەسەر پێغەمبەر، لە سەرەتاکانی ئیسلامدا، درک چووە بە دەست و پلیاندا، دردۆنگی لە کاری ئەمانە ناکرێت، ئەمانە دڵسۆز بوون. بنیادەم هەرگیز لەسەر بڕوایەک تا نەچووبێتە ناو ناوەوەی دەروونی، بەرگەی سزا ناگرێت. بۆیە ئەو سەرەتا ناسەقامگیر و ئەستەمە، وەک بێژنگێک پاک و پیسی کەسەکانی کرد، ئەوانەی دڵسۆز و بەئەمەکی ڕێبازەکە بوون، پێیدا تێپەڕبوون. ئێ هێندێک لە هاوەڵان، لە پاش سەرکەوتنی ئیسلام و زۆربوونی دەسکەوت ئیمانیان هێنابوو، باوەڕی زۆرێک لەمانە ڕواڵەتی و دەستکرد بوو[121]. ئیدی عومەر جیاکارییەکی لە نێوان ئەم دوو گرۆهە لە خەڵکی کرد، سا بەڵکوو زۆرینەی سامان و موڵکەکان لە گیرفانی مسوڵمانە دڵسۆز و ڕاستەقینەکاندا بێت. بەڵام عومەر شتێکی لە یاد چووبوو کە:

---

[120]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٠ بەرەودوا.

[121]- ئەحمەد ئەمین، فجر الاسلام ص ٧٢.

مسوڵمانی دڵسۆز و ڕاستەقینە ئیمانەکەی سست نابێت تا ساماندار نەبێت، ئیدی سروشتی بنیادەم وایە، هەرکە زەنگین بوو ئیمانیشی لاواز دەبێت، مەگەر کەسێک پەروەرێنم ڕەحمی پێ بکات. وا دەردەکەوێت عومەر لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا هەستی بەکارەکەی کرد بۆیە گوتبووی: "ئەگەر دەمتوانی و ڕێگەم پێ دەدرا، هەموو زیادە-ماڵی دەوڵەمەندەکانم وەردەگرت و بەسەر هەژارە کۆچەرەکاندا دابەشم دەکرد". لەوانەیە عومەر ئەم کارەی جێبەجێ کردبا، ئەگەر خەنجەرەکەی ئەبی لوئلوئی پیس بەری پێ نەگرتایە.

لە پاشان عوسمانیش هەر لەسەر ڕێوڕەسمەکەی عومەر بەردەوام بوو، بەڵام بە هەندێک جیاوازییەوە کە عومەر نەیکردبوون:

یەکەمیان: بەری بۆ دەوڵەمەندەکان شل کرد، بۆ هەر کوێیەک دڵیان پێی خۆشە بڕۆن، ئەمە لە کاتێکدا عومەر لە مەدینەدا بەندی کردبوون.

دووەم: ئەو هەندێک ناوی لە لیستی هەژارەکاندا زیاد کرد، ئەوانیش کۆمەڵێک هاوەڵ بوون کە دوای فەتحی مەککە مسوڵمان بووبوون، لە سەردەمی عومەردا بڕێکی کەمیان وەردەگرت. عوسمان بڕێکی پێدان کە لە هیی کۆچەر و پشتیوانەکانیش زیاتر بوو، وا بزانم بەم کارەی ویستوویەتی قەرەبووی ئەو ماوەیەی پێشوویان بۆ بکاتەوە.

سێهەم: ئەو ڕێگەی بە زەنگینەکان دا، کە خۆیان زەکاتەکەیان بدەن بە هەژاران، ئەمە لە پێشتردا "باجگر" دەهات و خۆی بڕە زەکاتی لە دەوڵەمەندان دەسەند لە پاش خەمڵاندن. بەڵام لە سەردەمی عوسماندا کابرا خۆی دەیدا ئەگەر ویستبای. عوسمان ئەم کارەی لە ڕوانگەی "لابردنی نارەحەتی و شەرمەزاربوون"ـی دەوڵەمەندەکانەوە لەلایەن کەسانی خراپەکارەوە. لەوانەیە ئەم کارەی عوسمان ڕێخۆشکەر

بوو بێت بۆ دەوڵەمەندەکان تا سست ببنەوە لە زەکاتدان. ئیدی لە پاش ئەمە، پێرێک لە سەرمایەداری زەبەلاح بەدیارکەوتن، بە دڵی خۆیان دەهاتن و دەچوون و مامەڵەیان دەکرد، بەبێ هیچ کۆت و بەندێک. لەم کاتەدا "ئەبوزەڕ" دەرکەوت، ئەو واعیزەی کە بەردەوام و بەبێ وچان، ئالای جەنگی دژ بە سەرمایەداران بەرز کردبوویەوە"[122]. ئەبوزەڕ بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت و هاواری دەکرد: هۆ زەنگینەکان، ماڵەکانتان بەسەر هەژاراندا دابەش بکەن و هەر لە پەسا ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە: [ئەو کەسانەی زێڕ و زیو کۆ دەکەنەوە و لە ڕێگەی خودا بەختی ناکەن، تۆ ئاگاداریان بکەرەوە لەو ئازارە بەژانەی کە تووشیان دێت - الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ]. دەڵێت عوسمان گوتوویەتی وا مەکە، گوتوویەتی وا مەکە، ئەویش گوتوویەتی: عوسمان ڕێگەم لێ دەگریت ئایەتی خودا بخوێنمەوە؟[123]

وەک دکتۆر تەها حوسەین دەڵێت: "ئەبوزەڕ ڕقی لەوە بوو کە ئیمام پارەی ناحەق بە دەوڵەمەندان بدات، چونکە ئەمە دەوڵەمەند دەوڵەمەندتر دەکات و هەژاریش هەژارتر، پێویستە ئەم پارەیە لە خزمەتی گشتیدا سەرف بکرێت، نەک بدرێتە کەسانێک کە پێویستیان پێی نییە"[124]. ئەبوزەر بنەمایەکی نوێی داهێنا لە ئیسلامدا، کە هێشتایش تازەیە. خۆ ئەگەر بێتوو یەکێک لەم سەردەمەدا ئەو قسەیەی کردبا، بێ سێ و دوو بە زەندیقیان دەناساند و ناویان لە شاران دەزڕاند. ئەبوزەڕ بڕوای وابوو، تەنها زەکات بەس نییە، زەکات بڕێکی کەمە و لە گوزەرانی هەژاران شتێکی وا ناگۆڕێت. ئەو

---

[122] صالح علی، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٦.

[123]- تەها حوسەین، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص ١٦٣.

[124]- سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص ١٦٥.

بڕوای وابوو، دەوڵەمەندەکان دەبێت هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە هەڵیانگرتووە، دابەشی بکەن بەسەر هەژاراندا بە جۆرێک بەشی خۆیان و ماڵ و منداڵیانی لێ هەڵگرن و بەس. بەڵام عوسمان بڕوای وابوو ئەوەی کە پێی دەڵێن زەکات، بەسە و خەڵکی دەتوانن ئەویتر لە ماڵ و سامانەکەیان هەڵگرن و هەرچی لێ دەکەن دەیکەن (وەرگێڕ: خۆی لە ڕاستیدا قسەکەی عوسمانی کوڕی عەففان لە سروشتی مرۆڤایەتییەوە نزیکە و هەر ئەمەیش ڕاستە، ئەگینا ئەو ئەزموونەی ئەبوزەر لە یەکێتی سۆڤیەتدا تاقی کرایەوە، چونکە کەس نەیدەتوانی لە کەس زیاتری هەبێت، ئیدی هیچکەس خۆی ماندوو نەدەکرد، مێشکی نەدەخستە ئیش بۆ داهێنان، چونکە لە ئەنجامدا هەر ئەوەندەی دەبەنگێکی لاوازیان دەدایە کە مێشی لە دەمی هۆی دەر نەدەکرد.) وەک دەردەکەوێت، ئەبوزەر خەریکی ئاو بێژانەوە بووە، ئەوەی کە ئەم داوای دەکات شتێکی ئەستەمە، چلۆن دەوڵەمەندەکان بەم شتە ڕازی دەبن؟ لەحاڵێکدا ئەوان ئەهلی حەل و عەقد(پیاوماقوڵ)ن لە دەوڵەتدا. دەوڵەمەندان چۆن دەسبەرداری ئەو ماڵ و سامانە دەبن بە ئاسانی. ئەبوزەڕ هەر بەردەوام بوو لە بانگەوازی خۆی، ماندووبوونی نەدەزانی، لەبەر ئەم هەڵوێستەیشی دووجار شاربەدەر(نەفی) کرا. جارێکیان بۆ "شام" و جارێکیشیان بۆ "ڕەبزە"، هەر لەوێیش کۆچی دوایی کرد.

واعیزەکان دەربار، بە شوێن پێی ئەبوزەردا نەچوون، بگرە بە بێئاگا و دوور لە گرۆی موسوڵمانانیان دەزانی. لیژنەی فەتوای زانایانی ئەزهەر کۆبوونەوە لە سەردەمی مەلیک فاروقدا، بەکۆی دەنگ تانەیان لە ئەبوزەڕ دا، تۆمەتباریان کرد بە دواکەوتنی هەوەس و دەرچوون لە کۆدەنگیی زانایان[١٢٥]. هەروەها شێخ "موسا جاراللە"یش

---

[١٢٥]- ڕۆژنامەی شەعبی بەغدادی، بە ژمارەی ١٣ی کانونی دووەمی ١٩٥٤.

تەقریبەن هەمان قسەی هەیە، ئەبوزەر لە دیدگاری شێخدا کەسێکی بێئاگایە. ئەو لە بارەیەوە دەڵێت: "ئەو خەزیک بوو فووی بە ئاگری فیتنەدا دەکرد بە دیدگای کورتمەودای، هەرچەندە ئەو ناوبانگی بە زوهد و تەقوا و وەرع دەرکردبوو، ئەو کاریگەر بووبوو بە بانگەوازی فێڵبازان و بووبووە کوێرە ئامرازێکی بابەتەکە. ئەو نەیدەزانی کە عوسمان لەو زاناتر و زاهیدتر و لەخواترسترە، هەروەها دڵسۆزتریشە بۆ دین و موسوڵمانان"[١٢٦].

پاشان ئوستاد موحیبوددین خەتیب هات، سەرنووسەری گۆڤاری ئەلئەزهەر بوو، ویستی تانەی لێ بدات و دیدگاکەیشی بە دیدگایەک پێناسە بکات کە زیانی هەیە بۆ بەرژەوەندی مسوڵمانان. ئەو لایەنگیریی وەلی ئەمرەکان دەکات، ئەوانەی ئەبوزەڕیان شاربەدەر کرد. دەڵێت ئەوان لەوە زیاتر نەیاندەتوانی خزمەتی ئیسلام و مسوڵمانان بکەن[١٢٧]. ئەم ئوستاز "موحیب الدین"ـە دەیەوێت، هەموو موڵک و سامانەکان هەر لە دەستی خاوەنەکانیاتدا بمێننەوە، لە دیدگای ئەمدا، ئەم کارە سوودی بۆ موسوڵمانان هەیە. لەوانەیە ئەم وا بزانێت کە بەتەنها وەعزی ئاینی بەسە بۆ ئاراستەکردنی ئەم ماڵ و سامانانە تا ببێتە هۆی زیادبوونی هێزی مسوڵمانان وسەرکەوتنیان و خۆشگوزەرانییان. ئەو بڕوای وایە کە دیدگای عوسمان لە دیدگای ئەبوزەڕ پەسەندترە لە بابەتی زەکاتدا، هەر بۆیە دەڵێت: ((... لە پاش ئەداکردنی فەرزی زەکات لە لایەن خاوەن موڵکەوە، ئیدی ئەو کەسە لەژێر تاقیکردنەوەی پەروەردگاردایە کە چۆن و بە چی شێوەیەک

---

[١٢٦]- موسی جاراللە، الوشیعە... ص ب س.

[١٢٧]- بنوارە ئەو پەراوێزانەی کە بەرێز محب الدین الخطیب لەسەر کتێبەکەی "العواصم من القواصم"ی قازی ئیبنولعەرەبی نووسیویەتی، ص ٧٤ ـ ٧٧.

هەڵسوکەوت بە سامانەکەیەوە دەکات، یارمەتی مسوڵمانانی پێ دەدات. ئیدی ئەگەر بازرگانە، لە ڕێگەی بازرگانەکەیەوە، یان چێنەرە، لە ڕێگەی زەوی و زارەکەیەوە، خۆ ئەگەریش پیشەوەرە، لە ڕێگەی پیشەکەیەوە. ئیسلام لە دەمی خۆیدا سوودی باشی بینی لە سامانی هاوەڵە دەوڵەمەندەکان. بۆیە بازرگانی کەسێکی مسوڵمان، کە بێباکیان بکات لە شتومەکی دوژمنەکانیان، ئەوا ئەمە خۆی بۆخۆی بە "هێز" هەژمار دەکرێت بۆ مسوڵمانان، بەو ڕێژەی ڕاستگۆییەی کە خاوەنەکەی هەیەتی. بە هەمان شێوەیش کارگەی تاکێکی مسوڵمان، کشتوکاڵی کەسێکی مسوڵمان. نیەت لەم کارانەدا بەهایەکی گرنگی هەیە. بە کورتی مسوڵمان دەتوانێت بێسنوور دەوڵەمەند ببێت بەو مەرجەی حەڵاڵ بێت، هەمیشە خۆی لە کۆیلایەتی بپارێزێت، شوێن جوانکاریی و شتی پڕوپووچی شارستانیەت نەکەوێت. پاش ئەوەی زەکاتی دا، ئەوەی دەمێنێتەوە و زیادەیە، وەک ئەمانەتی پەروەردگارە لای ئەم زەنگینانە. بۆیە دەبێت بەشێوەیەک هەڵسوکەوتی پێوە بکات کە لە خزمەتی هێز و تفاق و خۆشیی مسوڵماناندا بێت. بەڵام ڕێگەکەی ئەبوزەڕ، کە نەدەبوو ماڵ و سامان لای مسوڵمان شەو بکاتەوە لە بەرژەوەندی مسوڵماناندا نەبوو. ئەو ڕێگەیەی کە ئێستا مسوڵمانە دەوڵەمەندەکانی لەسەری دەڕۆن، بۆ خۆیان دەژین، ڕادەبوێرن، شکۆی ئیسلام و مسوڵمانانیشیان هەر بەلاوە گرنگ نییە، خودی دەوڵەتەکەشیان بەلاوە تڕۆهاتە، ئائەم ڕەفتارانە هیچیان لە ئیسلام نییە، ئیسلام هەرگیز ئەو کەسانە ناناسێت کە نایناسن.))[١٢٨]

بەڕێز ئەلخەتیب لە قسەکانیدا هیچ جیاوازییەکی نییە لە واعیزەکانی سوڵتان. بە ڕەوای دەبینێت دەوڵەمەندەکان سەروەت کۆ بکەنەوە، دواییش دێت بە سزای خودا دەیانترسێنێت. هۆ ئەگەر وەعز سوودی

---

[١٢٨]- ابن العربي، ص ٧٥، (الحاشیه).

بـۆ کەس هەبـوایە، ئەوا بـۆ ئەم ملهـوڕانەی دەبـوو، ئەوانەی کە لەو کاتەی خەریکی پەرستنی خاوەن، قوڕ دەدەن بە ماڵی بەندەکانیشیدا. ئەو کەسـەی کە خەریـکە وەعـزی دەوڵەمەنـدەکان دەکـات تـا سـامانەکەیان لە ڕێـی بەرژەوەنـدی گشـتیدا بەکـار بهێـنن، وەک ئەو کەسە وایە داوا لە شێتێک بکات کە ئاقڵ بێت. ئیدی شێت هەر کارێکی هەڵیتوپەڵیـت بکـات، ئەو هەر کـارەکەی خـۆی بە باشـترین کـار و، خۆیشی بە سالاری هۆشمەندەکان(سید العقلا) دەزانێت. هەر نەنگی و هەڵەیەکیش لەئارادا بێت، تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی ئەوانی تر و بە شێتیان دەزانێت.

واعیزەکان سروشـتی مرۆڤیـان لەبیرچووە، کە بـارودۆخی نەفسـی و کـۆمەڵایەتی کاریگەرییـان لەسـەری هەیە، دواتـریش ئەم جـێکەوت و کاریگەرییـانە لە ڕێـگەی ئـاین و فەزیـلەتەوە خـاڵیی دەکـاتەوە. ئەم شۆڕشـە زەبەنـدانەی دەسـتی مـرۆڤ، ڕێـک وەک دەمـانچەیەک وایە بەدەستی منداڵێکەوە. ئیدی تۆ هەرچەندێکت وەعز و ئامۆژگاریی کرد، کە زیان بە خەڵکی نەگەیەنێت، بەڵام ئەو هەر کە بچووکترین هەلی بۆ هەڵکەوت، خێرا دەسڕێژێکی باش دەکات بەناو خەڵکدا.

وەک ئەوەی قورئـان ئامـاژەی کـردووە، لادان و توغیـان هاوپەیمـانن لەگەڵ دەوڵەمەندیدا. ئەمەیش نهێنییەکی تێدایە کە شارەزایانی زانستی لـۆجیکی کـۆن تێـی نەگەیشـتبوون، چـونکە ئەوان خەڵکیـان بەسـەر دەستەی "باش و خراپ"دا دابەش کردبوو. ئیدی ئەوەی چاک بوایە، هەر بە چـاکی دەمـایەوە، خـراپیش هەر بە خـراپ. ئەوان مەزەنـدەی جەوهەری مرۆیـان وەک کـانزایەک کردبـوو، کە هەرگیـز پێکهـاتەکەی ناگۆڕێت. بەڵام ئەم دیدگایە لە لایەن لۆژیکی ئیمرۆژیی(مۆدیرن)ـەوە نەرێ کـراوە. هەمـوو کەسـێک، لە هەر سـاتێکدا، هەم چـاکە و هەم خراپ. کەسایەتی مـرۆڤیش لە ئەنجامی بەریەککەوتـن و کـارلێکی ئەم

دوو جەمسەرەوە دروست دەبێت، جەمسەری باشە و خراپە. جیاوازی مەردوومیش لەم دوو هێزەدا شتێکی رێژەییە. جێکەوتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان وایان کردووە، لای هەندێک، رێژەی باشە زیاتر بێت وەک لەوانی دیکە. ئەوەیشی کە پێی دەڵێن ویست و ئیرادە، لەم بوارەدا زۆر بەکەمی ئیش دەکات. ئیدی زۆرینەی خەڵک ئەو کاریگەرییانەی کە لەسەریانە، دوایی ناتوانن لە رێگەی لۆژیک و ئاین و شتی لەو جۆرانەوە لەسەر خۆیانی لابەرن.

پێشینەکان وا یاندەزانی، مرۆڤ لە سەرەتادا بیر دەکاتەوە، پاشان کارەکە ئەنجام دەدات. بەڵام لە راستیدا رێک پێچەوانەکەی دروستە. نموونەی ئەم کەسە، وەک ئەو کەسە "شەوکوێرە" وایە کە شەقێکی لە سەگێکدا لە کاتێکدا نەیشی دەبینی، خەڵکەکە سەریان سوورما و لێیان پرسی: بۆچی واتکرد؟ ئەویش وەڵامی دانەوە: کە ئەو بەدەستئەقەست وایکردووە و مەبەستیشی کوشتنی سەگەکە بووە. بنیادەم لە زۆرێک لە شتەکانیدا، پاڵنەرێکی لاشعوری هەیە لە بارودۆخە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکاندا و دواتریش پاساو دەهێنێتەوە بۆ کارەکانی. دەوڵەمەندی، مرۆ تووشی سەرسامبوون بە خودەوە دەکات. رێگەی هەندێ کاری پێدەدات کە پێشتر نەیدەتوانی بیانکات.

هێزی شەڕ لە ناواخنی مرۆڤدایە، ئەم هێزە لە مرۆڤ نابڕێت لە رێگەی پاڵنەری ئاینی یان ویژدانییە، مەگەر چەند کەسێکی کەم نەبێت. ئەگینا مرۆ ئەگەر حەزی لە شتێک کرد، هەر دەیکات، تەنانەت دێت دەقە ئاینییەکان بەو جۆرەی کە دڵخوازی خۆیەتی راڤە دەکات. بینیمان کە چۆن لە سەرەتای ئیسلامدا قورئان و فەرموودەیان کردبووە دەسکەلای هێرشکردنە سەر یەکتری و ئەم ئەوی پێ دەکوشت و ئەو ئەمی کافر دەکرد. هەر گرووپێک لە گرووپەکان یەک

بەرچاک ئایەت و فەرموودەی هەڵگرتبوو تا لە دژی بەرانبەرەکەی بەکاری بهێنێت. ئێستایشی بەدەمەوە بێت گرووپە ئیسلامییەکان هەر بە ئایەت و فەرموودە شەڕ دەکەن. هەر گرۆهە و کۆمەڵێک ئایەت و فەرموودەی حازرە بۆ لێدانی بەرانبەر.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێت: ((قورئان چەند دیوێکی هەیە[129])). مەبەستی لەوەیە کە قورئان چەند لێکدانەوەیەک هەڵدەگرێت. بۆیە هەر گرۆهە و دەتوانێت شتێ لە قورئان هەڵگۆزێت و بیکاتە دەسکەلای کارەکەی خۆی. ئیدی ویژدان بێتوانایە لە ڕاوەستاندنی کەسێک لە کارێک کە حەزی لێیەتی. وەک لە کۆمەڵناسیی نوێدا دەرکەوتووە، ویژدان بەهایەکی ڕێژەییە[130]. ویژدانی مرۆڤ ئازار نابینێ، ئەگەر هاتوو سزای کەسێکی دا کە دژی خۆی بیر دەکاتەوە، یان لە گرووپێکی دژی گرووپەکەی ئەمانە. بنیادەم هەڵدەکوتێتە سەر دوژمنەکەی و خوێنی دەڕێژێت، ماڵی بەتاڵان دەبات و دڵیشی مورتاحە وەک نە بای بینیبێت نە بۆران. موسوڵمانەکانیشمان بینی لە سەرەتای ئیسلامەوە، کە چۆن نەیارەکانی خۆیانیان لەناو دەبرد، ئەوانەی کە بە پێچەوانەی ئەمانەوە بیریان دەکردەوە، ئیدی لە پاش جەنگیش ژن و ماڵەکەیان دەبردن بەتاڵان، دواتریش بەڵگە و بورهانیان دەهێنایەوە کە ئەم کارەیان لەپێناو ئاینی خودادا کردووە.

دەگێڕنەوە، لە پاش کوژرانی حوسەین، ژن و ماڵەکەی بە سەبایا دەبەن بۆ شام، بە ناونیشانی سەبایای "یەزید" گەورەی مسوڵمانان. دەڵێت لەم کاتەدا شێخێکی دینداری بەتەمەن، خۆی داوە بەسەر گۆپاڵەکەیدا و زۆر دڵخۆشە بەم دەسکەوتانە و سەرکەوتنی

[129]- خالد محمد خالد، من هنا... نبدأ، ص ١٧٤.

[130]- - Landis، socail control، ٥٦- ٥٧ p .

مسوڵمانان، پاشان کەمێک نزیک بووەوە و پێی گوتن: ((سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئێوەی تێکشکاند و گەورەی مسوڵمانانیش لە ئێوە بەرخورددار بوو))[131]. ویژدانی ئەم پیاوە بەتەمەنە ئایندارە زۆر ئارامە، کاتێک کۆمەڵێک ژن دەبینێت بە سەبایا گیراون و بەسەر کۆڵی وشتر لە دوورەوە هێنراون، تەنانەت ئەمەی بە سەرکەوتنی موسوڵمانان هەژمار کرد. دەڵێن لە کۆتاییدا پیاوەکە زانیی کە ئەمانە نەوە و کچانی پێغەمبەرن، گریا ئەمان گریانێک...[132] . سەیر و سەمەرە لێرەوە دەست پێدەکات، دەڵێت ئەو گریا لەبەر ئەوەی زانی سەبایاکان لە کچانی پێغەمبەرن، ئەمەش ئەو مانایە دەگەیەنێت، کە ئەگەر لە نەوە و خاندانی پەیامبەر (دخ) نەبوونایە، پێویستی بە خەم و گریان نەدەکرد. لە دیدگای ئەم "مامەپیرە"وە تەنها خاندانی پەیامبەر شایەنی بەزەیین، ئیدی خەڵکی تر، چ باکیکتە، با ببرێن و هەتک بکرێن و مامەڵەیشیان پێوە بکرێت. ئەمەیە لۆژیکی مرۆڤ، دڵی بەکەس ناسووتێت مەگەر ئەوانە نەبێت کە خۆشی دەوێن و بە گرنگیان تەماشا دەکات.

پەیامبەر کە هات، وەک ڕەحمەتێک بۆ هەموو جیهان هات، بەڵام شوێنکەوتووەکانی کردیان بە ڕەحمەت بۆ تاکە گرووپێک.

لەمەوە تێدەگەین کە ئاین و ویژدان نابنە بەربەست بۆ کردنی کارێک کە مرۆ پێی هەڵدەستێت. بەڵکوو جێکەوتەی بارودۆخەکە زۆر کاریگەری لەسەر بنیادەم بەجێ دەهێڵێت. هەر بۆیە ڕاستکردنەوەی ئەخلاقی خەڵک و کۆمەڵگە لە پاش ڕێکخستنەوەی بارودۆخیانەوە دەکرێت، تا بارودۆخەکە کەسی باش هەڵنەگرێت چۆن چۆنی کارەکە

[131]- بڕوانە سید الأهل، زینب، ص ٨٥ – ٨٦.
[132]- سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٨٦.

سەرکەوتوو دەبێت؟ بۆیە تەنها لە ڕێگەی ترساندن و موژدەدانەوە خەڵکی ناگۆڕدرێن، بەڵکوو دەبێت ئاووهەواکەیش سازگار و هەماهەنگ بکرێت. وا دەردەکەوێت کە ئەبوزەرِیش ویستبێتی بەرەو ئەم ئامانجە هەنگاو بنێت، ئیدی چ خۆی زانیبێتی یان نا. ئەها ئەو دەیویست "زیادەماڵ"ی دەوڵەمەندەکان ببەخشێتە هەژارەکان. لەوانەیە ئەو وا یزانیبێت، ئەوانەی خەریکی کۆکردنەوەی زێڕ و زیون، وردە وردە بەرەو خراپە بڕۆن، ئیدی چی خۆیان هەستی پێ بکەن یان نا. ئەو خۆشڕابوێرییەی لە زێڕ و زیوەوە بنیادەم تووشی دێت، "بینایی" دەشێوێنێت، هاوسەنگی بیرکردنەوەی تێک دەدات، ناتوانێت دواتر شتەکان وەک ئەوەی هەن ببینێت. ئەوەی شایەنی باسە، بە درێژایی مێژوو، خۆشگوزەرانەکان بانگەوازکەری ستەم و باوباپیران-پەرستی بوو. تەماشای قورئان بکە لە سورەتی زوخروف ٢٣ و ٢٤:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴿٢٣﴾ * قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ الزخرف: ٢٣ - ٢٤

قورئان لێرەدا باسیان دەکات، کە هەمیشە پێغەمبەرانیان بە درۆ زانیوە، بەو مانایەی هەمیشە بەرهەڵستی هەر جۆرە نوێکارییی و تازەبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەکەن، ئەمەیش سروشتی دەوڵەمەند و دەسڕۆیشتووەکانە. دەوڵەمەندی خۆشڕابوێر تازەبوونەوەی خۆش ناوێت، ئەو خۆی دڵخۆشە، ئەوەی حەزی لێیەتی دەتوانێت بە دەستی بخات و خەڵکانی دەورووبەری ڕێزی دەگرن، بۆیە هیچ پێویستییەکی بە گۆڕانکاری و شت نییە، نەبادا خۆشی و سامانەکەی لەدەست بچێت.

وا دەردەکەوێت، دەوڵەمەندەکانی سەردەمی عوسمان ڕووبەڕووی عوسمان بوونەوە وەک چۆن کاتی خۆی ڕووبەڕووی پێغەمبەر بوونەوە. پێغەمبەریش بە بیرتیژیی خۆی دەیزانی پاشتر چی ڕوو دەدات. بوخاری لە سەحیحەکەی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە پەیامبەر فەرموویەتی: ((هێندێک لە هاوەڵانم لە ڕۆژی سەڵادا بێبەری دەکرێت لە خواردنەوەی ئاوی حەوزی کەوسەر، منیش دەڵێم: خوایە خۆ ئەوانە هاوەڵی منن، وەڵامم دەدرێتەوە کە: تۆ نازانیت لە پاش تۆ چییان کردووە ئەمانە، ئەمانە بەرەوپاش وەرگەڕان.)) [١٣٣]

هێندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان هەوڵی ناوزڕاندی ئیسلامیان داوە بە ڕێگەی ناڕاستەوخۆ. ئەوان هەمیشە باس لەو خوێنڕێژی و ململانێیەی مسوڵمانەکان دەکەن کە پاش ماوەیەکی کەم لە وەفاتی پێغەمبەر ڕوویدا. وەک بڵێی دەیانەوێت بەراوردی بکەن بە مەسیحییەکانی پاش وەفاتی مەسیح. ئەوان دەڵێن هاوەڵەکانی موحەمەد، دەستیان کردە شەڕ و خوێنڕێژی و یەکتری کافرکردن، بەڵام هاوەڵەکانی مەسیح هیچ شتێک لەمانەیان نەکرد. بەڕاستی پێتان بڵێم، ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ واعیزەکانی ئێرەدا. ئەوان بێئاگان لەوەی ئەگەر هاوەڵەکانی مەسیحیش وەک هاوەڵەکانی موحەمەد سەربکەوتنایە، فەتحی وڵاتانیان بکردایە بەو خێراییە لەڕادەبەدەرە، خێر و دەسکەوت و کەنیزەیان دەهێنایەوە و دەبووە جێگەی مشتومڕ و دواتریش هەرا و جەنگیان. ئەمە سروشتی مرۆیە لە هەموو سات و کاتێکدا.

---

[١٣٣] - باب الحوض، الجزو الرابع صحيح البخاری.

مامۆسـتا موحیـب الـدین خەتیـب دەڵێـت: ((لە گەورەتـرین درۆکـانی مێژوو ئەوەیە: بگوترێت کە هاوەڵانی پەیامبەر دوژمنایەتی هەبووە لە نێوانیانـدا[١٣٤])). هەروەهـا دەڵێـت: ((لە پـاش سـێ نەوە لە ئیسـلامدا، شـتێکی سـەیر دەرکەوتبـووە، ئەویـش دروسـتبوونی کۆمەڵێـک مێژوونووس کە مێژووەکەیان شێواندووە و تا خۆیان لە شەیتان یان دەسەڵاتدارەکان نزیک بکەنەوە، هـاتوون وتوویـانە: هـاوەڵان بە ڕەحـم نەبوون لە نێوان یەکتریدا، بەڵکوو دوژمنی یەکتری بوون و یەکتریيان بەر نەفرین داوە. هەر خەریکی چـاڵ هەڵکەنـدنبوون بـۆ یەکتـری[١٣٥])). (وتەی وەرگێڕ: ئەگەر بۆ یەک چرکە واز لە مێژوو بهێنین و تەماشای دەقی قورئـان بکەیـن لەمەڕ پەیوەندی هـاوەڵان بە یەکتـرەوە، دەبینـین قورئان گوزارشت لەوە دەکات کە لە نێوانی یەکدیدا بەڕەحـم بـوون [رحماء بینهم]، بەرانبەر بە دوژمنانیش [أشداء على الكفار]بوون، واتە توند و الكفـار]بوون، واتە تونـد و زبـر بـوون لەهەمبەر کافرانـدا. ئەمە پەسـنی قورئـانە بـۆ هـاوەڵانی دەوروپشـتی جەنـابی ریسـالەت پەنـا، بەڵام ئەوەیش دەبێت لە بەرچاو بگرین، ئایا کێ بە هـاوەڵ دادەنرێت و ئەو ئایەتە باسی کامە لە هاوەڵان دەکات. باقی وەسەلام.)

وا دەردەکەوێت ئوستاز خەتیب هـاوەڵانی لە جۆرێکی دیکەی مرۆڤ هەژمـار کردبێـت کە ئێمە نـایزانین، ئەگینـا مـرۆڤ هەر مرۆڤە. ئەگەر بەم چاوە سروشـتییەوە تەماشـای کەسـانی نـاو مێژوومـان کـرد، ئەوا دەتـوانین پەنـدیان لـێ وەرگـرین. ئێمە مێـژوو دەخـوێنین تـا سـوود و پەندی لێ وەرگرین، ڕێگای ئەمرۆمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە. تـا وابزانین ئەوان جۆرێکی دیکەی مرۆڤ بوون کە ئەو شتانەیان بەسەردا نـایەت کە بەسـەر خەڵکـی ئاسـایدا دێـت، ئەوا نـاتوانین لە مێژووەکەیـان تێبگەین و دەبێتە هۆی بەرچاو لێڵی. ئێمە ئەوانمان کردووەتە پێشەنگ

[١٣٤]- محب الدين الخطيب، حملـه رسالـه الاسلام الاولون، ص ٤.

[١٣٥]- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٨.

و پێشەنگی خۆمـان تـا بە شـوێنیاندا بـڕۆین، لە کاتێکدا ئـێمە لەوان تێنەگەیشـتووین، بەم کارەیشـمان ڕێـک وەک ئەوەی دوای سـەراب کەوتبین.

بوخاری دەگێڕێتەوە لە سەحیحەکەیدا: جارێکیان هاوەڵان دەمەقاڵێیان بوو لە بەردەم پێغەمبەردا، کارەکە گەیشـتە شـەڕە نەعل[١٣٦]. هەروەها دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر لە کاتی نەخۆشییەکەیدا، فەرمانیدا پێنووس و تێنووسی بۆ بهێنن تا شتێکیان بۆ بنووسێت کە لە دوای ئەو وێڵ و سەرگەردان نەبن، هێندێک لە ئامادەبووان نەرێی قسەکەیان کرد و وتیان ئەو ئاگای لە خۆی نییە چی دەڵێت، بۆیە بووە مشتومڕ لە نێوانیاندا، پێغەمبەریش فەرمانیدا "هەستن بچنە دەرەوە" و شتەکەیش کە بڕیاربوو بۆیان بنووسێت بەداخەوە نەینووسی. ئەم هەواڵە دەبێتە جێگەی سەرسووڕمانی توندڕەوەکان و بڕوای پێ ناکەن. لە ڕاستیدا ئێمە ڕاستی و درۆی ئەم قسەیە بەتەواوی نازانین، لەوانەیە هەر لە بنەڕەتەوە درۆ بێت، بەڵام هێشـتا ئەمە بەواتـای ئەوە نـایەت کە هاوەڵان شتی وەهایان لێ ناوەشێتەوە. ئەوان وەک هەموو ئەو خەڵکە بنیام بوون، تووشی گرفت بوون، جەنگاون، حەسوودیان هەبووە، جێگەوتی ڕق و قین لە کارەکانیاندا هەندێکجار بەدی کراوە، ئیدی لەم شتانەدا وەک هەر کەسێکی دیکەبوون.

ئوستاز خەتیب دەڵێت: ((ئوممەتی موحەمەد هەر بەرەو چاکە دەڕوات لە هەر کات و شوێنێکدا، بەو مەرجەی بە شوێنپێی سێ جیلی یەکەمدا بـڕوات. بەڵکـوو هەر کەس دەیەوێـت ڕاسـتی بەجـێ بگەیەنێـت لەم سـەردەمەدا، دەبێـت وەک ئەوە بکـات کە هـاوەڵان و شـوێنکەوتەی

[١٣٦]- شرف الدين، الفصول المهمه، ص ١٤٦.

هاوەڵان کردوویانە تا بگەنە ئاست و پلەی ئەوان))[137]. بەڕێز خەتیب داوامان لێ دەکات شوێن ڕێگەی سەحابەکان بکەوین تا سەرفرازبین، ئەو ئەوەی بیرچووەتەوە کە سەحابەکان لە سەردەمی عوسماندا بوون بە دوو بەرەوە، بەرەی عوسمان لەلایەک، بەرەی ئەبوزەریش لەلاکەی تر، ئەوەی کە دەیویست زیادە سامانی دەوڵەمەندەکان دابەش بکات بەسەر هەژارەکاندا، ئەویتریشیان دەیویست لەلایان بمێنێتەوە، هەردەمیش لەزیادبووندا بێت. ئەمانەیش دوو ڕێچکەی ناتەبان و، کۆکردنەوەیان ئەستەمە.

ئەوەی کە جێگەی ئاماژەیە: ئێستە لە سەردەمێکدا دەژین کە خەڵکی گرنگی زۆر دەدەن بە چارەسەرکردنی ئەم گرفتانە. هەموو بیریارە هاوچەرخەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە، "هەژاریی بکوژ" و "دەوڵەمەندی ڕەها" دوو دیاردەی هەرە زشتن، هەر کۆمەڵگەیەک ئەم دوو دیاردەیەی تێدابێت هەرگیزاوهەوگیز سەرفراز نابێت. بۆچوونەکەی بەڕێز خەتیب بۆ سەردەمەکەی هاروونە ڕەشید گونجاوە، بۆ نموونە: کاتێک خەڵکی وایان دەزانی سامان بە دەستی پەروەردگارە، دەیدات بە هەرکەس خۆی بیهەوێت و نایشیدات بە یەکێک کە نەیەوێت، بەڵام ئەمڕۆ لە سایەی خوداوە تێگەیشتووین، سامان شتێکی کۆمەڵایەتییە و لە کۆمەڵگەیشدا گەشە دەکات و پێدەگات لەژێر سایەیدا. زەنگینی و خۆشگوزەرانی و لادان، هەرسێکیان هاوواتای یەکترین، یەکێکیان لە کۆمەڵگەدا سەر هەڵنادات مەگەر ئەوانیتریش لەگەڵ خۆی دەهێنێت. دەوڵەمەندێکی خۆشڕابوێر وەک حاکمێکی ستەمکار حەز و ئارەزووی هەیە... دواتریش کۆمەڵێک پەیدا دەکات کە شەرعیەت دەدەن بە بەرجەستەکردنی شەهوەتەکانی بە بەڵگەی عەقلی و نەقلی.

[137]- محب الدين الخطيب، المصدر السابق، ص ٧.

لەو قسـانەی کە لە مـوحەمەدەوە –دروودی خـودای لەسـەر بێـت- گێڕدراونەتەوە: ((کەس نییە کە لە سوڵتانێکەوە نزیک دەبێتەوە، مەگەر بەو ئەنـدازەیە لە خـودا دوور دەکەوێـتەوە. هەتـا شوێنکەوتوویشـی زیاتر بن، شەیتانەکانیشی زیاتر دەبن. هەتا سەروەتیشـی زیـاتر بێت، لێپرسـینەوەی ئەسـتەمتر دەبێـت))[138]. ئەمە دانـاییەک و ڕاسـتییەکی تێدایە کە شـایەنی بیرلێکردنەوەیە. وەک پێشـتریش گوتمـان: پاڵنەری ئاینی و ویژدانی و ئەم شتانە، ڕێگەی لێ ناگرێت لە کردنی کارێک کە خۆی زۆری خەز لێیەتـی، مـرۆ حەز دەکـات، شـەهوەتی هەڵـدەچێت، تەمـاح پەیـدا دەکـات، خۆشەویسـتی دەکـات، لەم شتانەیشـدا تەحەدای ویژدان و ئاین دەکات.

بەڕێز ویلز لە بارەی لادانەکانی نیرۆنەوە دەڵێت: ئەو لە سروشتیدا، وەک هەموو کەسێکی دیکە وابوو. هەروەهـا دەڵێت: ((ئەوانەی کە وا دەزانـن نیـرۆن سروشـتێکی جیـاوازی هەبـووە لەچـاو خەڵکی دیکەدا، ئەوا پێویسـتە یەکەمجـار تـوێژینەوە لەسـەر سروشـتیان بکرێـت، لە بارەی ئەو کارە و بیرە زشتانەی کە دێت بە زێنیانـدا))[139]. هەروەهـا ویلز دەڵێت: هەموو ئەو بیرۆکە شاراوە دزێوانەی دێنە دەروونمـانەوە و توانـای کـردن و بەدیهێنیمـان نییە، ئیـدی نایـانکەین لەبەر نەتـوانین نەک نەویسـتن، کەچـی خەڵکـی وادەزانـن ئـێمە کەسـانێکی باشـین و دووریـن لە بیـری خـراپ و کـاری خـراپ. خـۆ ئەگەر وەک نیـرۆن ئەمانیش هەلیان بۆ هەڵکەوێت، ئەوا بێ سێ و دوو ئەنجامی دەدەن و خۆیان لە بەرچاوی خەڵکی سووک و ڕسـوا دەکەن. نیرۆن کۆمەڵێک لە شەقوەشێن و ماساوچی بە دەوروخولیدا بوون کە بەبێ فەرمـانی ئەم، پەنجەیـان نەدەکـرد بە ئـاودا، هەمـوو فەرمانەکانیـان جێبەجـێ

---

[138]- احمد الهاشمي، مختار الاحاديث النبويه، ص ١٤٨.

[139]- - H. G. Wells، outline of history .

دەکرد. ئیدی هەر بیرێکی خراپ بەخەیاڵیدا بهاتایە، خێرا دەربارەکانی بۆیان جێبەجێ دەکرد. بۆیە جیاوازی نیرۆن لەگەڵ ئەماندا تەنها بەجێگەیشتنی حەزەکانی بووە، بەڵام ئێمە حەز دەکەین بەبێ هاتنە دی و گەیشتن بە حەزەکانمان))[١٤٠]. هەریەک لە ئێمە بە جۆرێک لە جۆرەکان نیرۆنێکین بۆ خۆمان، هەموویشمان لادەدەین ئەو ساتەی کە بەدەسەڵات و سالار بووین.

دەسەڵاتی ڕەها و دەوڵەمەندیی نائاسایی، کۆمەڵێک دەرگای شەهوەت و حەز و شت لەمرۆدا ئاوەڵا دەکەن، کە تەنها بۆ ئەم کەسانە دەکرێنەوە. ئەوەیش بزانین کە بەرپرسیارێتی ستەم، بەتەنها لە سەرشانی ستەمکار نییە، بەڵکوو لە سەرشانی ئەوانەیشە کە ڕێگایان بۆ خۆش و ئاسان کردووە. قورئان دەڵێت:

[قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ١٦ ﴾ الإسراء:

خوێنەر سەری لەم لۆژیکەی قورئان سوور دەمێنێت، کاتێک خۆشگوزەرانەکان تەواو دەستیان دایە بەرەڵایی لە باژێڕێکدا، ئیدی سزای خودا شایەنیان دەبێت و لەناویان دەبات، ئەمەیش شتێکی سەیرە. بەڵام سەرسوورمانەکەمان کەم دەبێتەوە ئەگەر زانیمان ستەمکار بەتەنها خۆی کاری لەبەر ناڕوات، بەڵکوو تەواو لادەدات کاتێک بەربەستێکی نایەتە ڕێ پێشی پێ بگرێت لە بەرەڵایی و لادان. نیرۆن بووە نیرۆن کاتێک خزمەتکارەکانی، شەقوەشێنەکانی هەموو بە جارێک ڕێگەیان بۆ تەخت و بەرین کرد تا بە هەوەسی خۆی تێخوڕێت و ئەوەی دەخوازێ بیکات. ئەگەر تۆیش لە جێی ئەودا بای، ئەوا تۆیش دەبوویتە نیرۆن.

---

[١٤٠]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەبـوزەڕ نەرێـی کەنـزی دەکـرد، کەنـزیش لە زمانەوانیـدا ئەو مـاڵە دەگرێتەوە کە زیادەیە-زیادەماڵ، ئەو دەیگوت بنیادەمی ئیماندار نابێت لە حەوجەی خـۆی زیـاتر سـامانی هەبێـت. هەروەهـا دەیویسـت عوسـمانیش تونـدوتۆڵ بکـاتەوە لەسـەر لێسـەندنەوەی زیادەمـاڵی دەوڵەمەندەکان و دابەشکردنیان بەسەر هەژارانی باژێر و نـاوچەکەدا، هەروەک ئەوەی عـومەریش بەر لە مردنـی ویسـتی ئەنجـامی بـدات. گومـانی تێدا نییە، هەندێک لە هـاوەڵان پشـتگیری قسـەکەی ئەبـوزەڕ بـوون، بە پشتبەسـتن بە سـوننەتی پێغەمـبەر. لە پێغەمـبەرەوە (دخ) باسکراوە کە نەهی لە کەنز کردووە وەک گوێڕایەڵییەک بۆ فەرمانی قورئان کە دەڵێت:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ * يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ ﴾ التوبة: ٣٤

ڕۆژێکیـان بیلالـی حەبەشـی هـاتە لای پەیـامبەر -بـیلال ئەمانەتـداری پارەی پێغەمبەر بوو- و پێی گوت: ((جەنـابی پێغەمـبەری خـودا، ئەوە هەموو قەرزەکانتم بژارد، هیچ لە سامانەکەت نەمـاوە بێجگە ئەم دوو پـارچە زێـڕە. پەیـامبەریش فەرمـووی: تـا لەو دوانەیـش ئاسـوودەم نەکەیت ناچمەوە ماڵەوە)). ئیدی لەبەر ئەوەی بـیلال ئەو ڕۆژە کەسـی نەبینییەوە پێویستی بەو پارەیە بێت، ئەو شـەوە پەیامبەر لە مـزگەوت مایەوە. بۆ سبەی خـودای مـن و تۆ ویسـتی دوو هەژار دەرکەوتن و بـیلال پـارەکەی وێ دان، بە پێغەمـبەری گـوت: "خـودا نەجـاتی دایـت لێیان"، پێغەمبەریش فەرمووی: "سوپاسی پەروەرێنم دەکەم")). هەمـان شـێوەی ئەم چیرۆکە لە عەلـی کـوڕی ئەبوتالیب قەومـاوە، ئەم پیـاوە

ئارامی نەدەگرت تا ئەو ماڵەی کە دەهاتە دەستی دابەشی نەکردایە بەسەر هەژاراندا. ئەو دەترسا خاووخلیچکی لێ ڕووبدات و خێرا نەگاتە یارمەتی ئەو کەسەی کە پێویستی پێیەتی. شەوان خەوی لێ نەدەکەوت ئەگەر بیزانیایە ئەم ماڵێکی زیادەی لەلایە و هەژارێکیش هەیە بێ شێو سەری ناوەتەوە.

ئەم چیرۆکە لای ئەبوزەڕیش هەیە، کاتێک زۆرینەی ماڵەکەی دەدایە فەقیران، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە عومەر ساڵانەیەکی باش باشی بۆ ئەبوزەڕ بڕیبووەوە بەهۆی ئەوەی لە ڕیزی موسوڵمانە هەوەڵینەکان بوو. ئەگەر ئەبوزەر ویستبای، دەیتوانی ببێتە سەرمایەدار، بەڵام ئەو بە جۆرێک ماڵەکەی دەبەخشییە هەژاران کە لە کاتی مردنیدا پارەی کفنی نەبوو[141]. موعاویە جارێکیان ویستی فێڵی لێ بکات یان بەرتیلی بداتێ، هەستا بە ناردنی هەزار دیناری زێڕی درەوشەدار بۆی، ئەبوزەڕیش زۆر بەخێرایی بەش بەشی کرد بەسەر هەژاراندا، کاتێک بۆ سبەی معاویە داوای پارەکەی لێ کردەوە، وتی بەخوا یەک فلسی تۆمان لەلا نەماوە، سێ ڕۆژمان مۆڵەت بدەرێ تا بۆتی کۆ کەینەوە[142]. عەینی شت لە سەلمانی فارسیش قەوماوە، ئەو لەوەی پێی دەدرا لە بەیتولماڵ، هەمووی دەدایە هەژاران، ئەوەی دەیخوارد هیی دەستی خۆی بوو. دەڵێن بەشی قوتی ساڵێکی لە ماڵەوەدا هەڵدەگرت، لێیان پرسی بۆ وادەکەیت؟ وتی تا بە دڵێکی ئاسوودەوە پەیوەندی لەگەڵ پەروەرێنمدا ئەنجام بدەم[143]. وا دەردەکەوێت سەلمان وای داناوە کە کەنز، زیادەماڵێکە کە لە قوتی ساڵێک زیاتر بێت. لەوانە ئەو وایدانابێت کە دەوڵەمەندی بێسنوور و هەژاری کوشندە ئیمان سست دەکەن، بۆیە قوتی ساڵێکی پاشەکەوت کردووە

---

[141]- عبدالحمید السحار، بلال موذن الرسول، ص ٦٩- ٧٠.

[142]- عباس العقاد، عبقريه الامام. ص ٥٢.

[143]- عبدالله السبيتي، سلمان الفارسي، ص ٦٤.

تا لە ئیمانی دڵنیابێت و خودا نەخواستە نەکەوێتە کوفرەوە بەهۆی هەژارییەوە. ئەو بەم کارەی ویستوویەتی نێوەندگیرییەک لە نێوان زەنگینی و هەژاریدا بکات و ئیمانی خۆی بپارێزێت.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتوویەتی: ((خواری چوار هەزار درهەم نەفەقەیە و خەرجی، سەرتریشی کەنزە و زیادەماڵ))[144]. وا دەردەکەوێت عەلیش هەمان قسەی کردووە کە سەلمان کردوویەتی، هاتووە و بڕێکی دیاری کردووە کە چوار هەزار درهەمە، تا ببێتە زەمان و مسۆگەرییەک بۆ ژیان و کاتی گرفت و بەلا. ئیدی لەمە زیاتر بریتییە لە کەنز و حەرامە، دەبێتە هۆی پانکردنەوەی خەڵکی و ستەم. هەروەها عەلی گوتوویەتی: ((هیچ لێدانێکی خودایی هێندەی برسێتی بەئازار نییە)). بۆیە برسێتی بەئازارە و ئیمان لە سەردا هەڵدەفڕێنێت، وەک چۆن باڵندەیەک لە قەفەس دەڕوات. ئەمەیش هەر هەمان مانای قسەکەی "ئەبوزەڕ"ـە، کە دەیگوت: هەرکات فەقیری ڕووی کردە باژێڕێک، کوفریش پێی دەڵێت: بمبە لەگەڵ خۆت. بەڕاستی چاوەڕێی ئیمانێکی تەندروست لە کەسێکی بێدەرەتان و هەژار ناکرێت، هەروەک چۆن چاوەڕێیشی ناکرێت لە کەسێکی فرە سەروەتمەند.

ئەبوحەنیفە دەڵێت: ((شایەتی کەسێک وەرنەگرن کە لە ماڵەکەیدا "ئارد" نەبێت. من وای بۆ دەچم، ئەبوحەنیفە ئەم بڕوایەی لە عەلی و ئەبوزەڕەوە وەرگرتبێت. وەک ئاشکرایە ئەبوحەنیفە پشتی بە قسەکانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب پتەو بووە[145]. ڕەجاڵێک کە لوقمەیەک بۆ شێوی ئێوارە لە ماڵدا شک نەبات، ئەگەری هەیە غەش و فێڵ و درۆ بکات، تا لە برسێتی کە ڕەحم نازانێت خۆی ڕزگار

---

[144]- ابن قتيبه، عيون الاخبار، ج ١، ص ١٤٥.

[145]- بنواڕە: ئادەم متز، الحضاره الاسلاميه، ج١، ص ٣٥٣ (حاشيه).

بکات. بەلام ئەوەی کە ئاشکرایە، واعیزەکانی سولتان، بڕوایان بەم قسانە نییە، یان لێی تێناگەن. وا دەزانن مسولمان وەک فریشتە (ملائکە) هیچ ناخوات، تا برسی تریش بێت خۆشەویستی بۆ خودا و پەیامبەرەکەی زیاتر دەبێت، کەچی لە ڕاستیشدا ئەم وەک هەموو کەسێکی دیکە مرۆیە و ئەگەر بینی خۆی یان منداڵەکەی برسییانە، بەبێ هەلاوێرد، هەر لە سەرەتاوە تا بنەتا بەر جوێن و نەفرین دەدات.

پێغەمبەر (دخ) زۆر دوعای ئەوەی دەکرد: ((اللهم اني اعوذ بك من جهد البلاو، وقال له: وما جهد البلاو يارسولالله؟ فقال: "قله المال، و كثره العيال")). نزای دەکرد خودا لە "بێدەرامەتی و منداڵ و عەیال کەوتن بەسەردا" بیپارێزێت (منداڵ زۆریی). پەیامبەری خودا باش لە نهێنیی سروشتی مرۆڤ تێدەگەیشت، دەیزانی کە بە سروشتی خۆی سست و لاوازە. خۆ ئەگەر بێتوو خۆی لەگەڵ کۆمەڵگەدا نەسازێنێت، ئەوا هەر بە ڕۆژی ڕۆشنا دادەڕووخێت و تووشی هەتەران پەتەران و بێئیمانی دەبێت. ئێمە ناتوانین ببینە خاوەنی ئیمانێکی ساغلەم، کە هەژاری بە کەڵبەکانی قەپیان لێ بگرێت و دەوڵەمەندیش مێشێک میوانی نەبێت.

هەموو کەسێک، دەیەوێت بخوات، ئیدی ئەگەر هیچی دەست نەکەوت، گۆشتی مرۆ دەخوات. خۆ ئەگەریش تێروتەسەل بوو، ئەوا دەست دەکات بە فسقوفجور، ئەملاولاکردن، چاو لەدەرێ بوون و لادان. لە بارەی مرۆڤەوە گوتراوە: "ئەگەر هەژارکەوت، دزی دەکات و ئەگەریش دەوڵەمەند زیادەڕۆیی". بۆیە ئێمە بە وەعز و نەسیحەت ناتوانین سروشتی ئەم جۆرە لە جوقەوەر بگۆڕین. ئیهـ ئەگەر یەک، دوان یان سیان گوێیان لێ گرتیت، ئەی ئەو زۆرینەیەی کە دەمێنێتەوە؟ خەڵکی بەسەر ڕێگەی هەزاران ساڵەی خۆیاندا دەڕۆن و لەم کارەیشیاندا چاریان ناچارە. دەبینین واعیزەکان بەیانیان و

ئێواران هەر هاواریانە و خەڵکی دەترسێنن، کەچی ئەو عەشاماتە، چۆن دەچنە ژوورەوە، ئاوایش هێنەوە دەرەوە... وەک ئەوەی هیچیان هەر نەبیستبێت. لێرەولەوێ، تاک و تەرا، ڕیش بەر دەداتەوە و دەست دەکات بە زوهد و خواپەرستی، ئەو بڕوای بە قسەکانی واعیز کردووە، واعیزیش پێی دڵخۆش دەبێت، وا کەسێکی پەیدا کرد شوکور، کەچی ئەو هەزاران هەزار کەسەی دیکەی بیر دەچێتەوە کە هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر نەبووە.

دەوڵەتە هاوچەرخەکان ئێستا پلانی هاوئاستکردنی دانیشتوانەکەیان هەیە، دەیانەوێت زۆرینەی خەڵکەکە بکەنە ئاستێکی مامناوەند. دەوڵەتی ڕاقی و سپۆرت ئەمڕۆ بەوە دەپێورێت کە چەندە دانیشتوانەکەی دوورە لە هەژاری کوشندە و دەوڵەمەندی لەڕادەبەدەر. حکومەتە مۆدێرنەکان باجی چەند بەرانبەر دەخەنە گەردنی زەنگینەکان. لەوانەیە خوێنەری سەرەگێژەی پێ بکەوێت کاتێک ئەو ڕێژە زۆرە لە باج دەبیستێت کە خراوەتە سەر داهاتی دەوڵەمەندەکان و قازانجەکانیان. حکومەت ئەم باجە لەوان دەستێنێت و دەیداتەوە بە هەژاران و لە ڕەجاڵی و دەسکوتی دەیانپارێزێت تا تووشی کوفر و زندیقی نەبن. یەکێک لە هەرە مەزنترین و گرنگترین کارێک کە دەوڵەتی مودێرن دەیکات ئەوەیە: کە دەبێت ئاستی چینی هەژار بەرز بکاتەوە، ئەویش بە وەرگرتنی زیادەماڵی دەوڵەمەندان و دابەشکردنی بەسەر هەژاراندا.

هەرچی دەوڵەتە کلاسیکییەکان بووە، لەم چەمکانە تێنەگەیشتووە و لێی بێباک بووە. دەوڵەتە کۆنەکان شتی گرنگی سەرەتا و کۆتاییان بریتیی بووە لە دابینکردنی ئاسایش. پاراستی ئاسایشیش واتە پاراستنی فەرمانڕەوا و پشتیوانی لێکردنی. ئەمەمان زۆر بە ڕاشکاوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بینی. جەنابی والی هەر خەمی سەرەتا و

بنەتای هەر ئەوەبوو کە هۆزە عەشایەرەکان ڕێک بخات و شۆڕشگێڕ و نارەزاکانیش داپلۆسێنێت. هەر لەم ڕوانگەیەیشەوە هیچیان لە سیاسەتوانی هەڵ نەدەکراند بێجگە لە بەهێزکردن و زیادکرنی سوپا. ئەوەیشی کە پەیوەندی بە خوێندنگە و نەخۆشخانە و شتە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە، شتانێکی دووەمی بوون و زۆر گرنگ نەبوون، بۆیە وڵات بووبووە خەرابستان.

واعیزەکانیش هەر دەستەونەزەر، لە خودای ئاسمانەکان و زەوی دەکرد، کە کەری کوری کەر- سوڵتانی موسوڵمانان بپارێزێت.

ئیمامی قورتووبی لە کتێبی تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەبوزەر خۆی بەتەنها پەیرەوی لە مەزهەبەکەی دەکرد، لە حەرامکردنی کەنزدا. قورتووبی پێی وایە ئەم ڕێچکەیەی ئەبوزەر توندە و پێویست ناکات موسوڵمانان پەیرەوی لێ بکەن. دواتریش دێتە سەر بابەتی حەرامکردنی "کەنز" و بە جۆرێک تەئویلی دەکات، ڕێک پێچەوانەی بەرژەوەندی مسوڵمانانی سەردەمی "عوسمان"ـە و دەڵێت: ((وا دەردەکەوێت ئەوەی کە لە "ئەبوزەر"ـەوە دەگێڕدرێتەوە ئەوەیە کە: ئەم ئایەتە لە سەردەمی نەبوونی و کەمدەستی موهاجیرەکاندا بووە، لەو کاتەیشدا بەیتوڵماڵ شتێکی وای تێدا نەبووە تا پێغەمبەر هاوکارییانی پێ بکات،ساڵی قاتوقڕیش هوجوومی بۆ هێنابوون. بۆیە نەرێی هەڵگرتنی زیادەماڵییان لێکرابوو، ئەوەی لە پێویستی خۆیان زیاترە، ڕێگەیش نەدرابوون هیچ زێڕ و زیوێکی زیادە هەڵگرن. بەڵام پاش ئەوەی خودا دەرگای ڕۆحمی خۆی بۆ کردنەوە، ئیدی بارەکەیشی لەسەر ئاسان کردن، لە هەر دووسەد درهەم، پێنج درهەم، لە بیست دیناریش، نیو دینار ببەخشن وەک زەکات، نەک هەموو سەروەتەکەیان. پەیامبەر ئەمەی بۆ ڕوونکردبوونەوە.))[١٤٦]

[١٤٦]- صادق عرجون، المصدر السابق، ص ٣٨- ٣٩.

لەمەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئیمامی قورتوبی وایدەبینێت، کە لە سەرەتای ئیسلامەوە کەنز حەرام بووە، ئەمەیش لەبەر هەژاری و دەستکورتی مسوڵمانان، بەڵام پاش ئەوەی کە لە نیعمەت بەش دران و بارودۆخیان باش بوو، ئەوا ئیتر هەبوونی کەنز کێشە نییە. بەڕاستی ئەم قسەیە نیشانەی کورتبینی و نەزانینە. ئەوەیش بزانن، مسوڵمانە هەوەڵینەکان کاتێک لە سەردەمی عوسماندا دەوڵەمەند بوون، لە بەرانبەرەوە کۆمەڵێک هەژارکەوتوون بەهۆی درەنگ ئیمان هێنانیانەوە. پەیامبەر بۆ ئەوە نەهاتووە کە تاقمێکی کەم لە مسوڵمانە هەوەڵینەکان -بەتەنها دەوڵەمەند بکات، بەڵکو ئەو هات تا ببێتە مەرهەمی زامی هەمووان، ڕۆشنکەرەوەی دڵان. ئەمەیە دیدگای ئێمە سەبارەت بە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا، ئەو نێردرابوو سا بەڵکوو ببێتە ڕەحمەت بۆ گشت گشت.

قورتوبی هەموو جەخت و سەرنجی لەسەر بەرژەوەندی مسوڵمانە هەوەڵینەکانە. ئیدی ئەو ڕەش و ڕووتە بە دەرەک، کە ئاو دەکوڵێنن و لەسەر خۆڵ دەنوون. خەلیفەی نوخوست(یەکەم) بڕوای وابوو کە پێشینەی مسوڵمان بوون و جیهاد و لەگەڵ پێغەمبەردا بوون، پاداشتی ئەمانە هەمووی لای خودایە و ئەو بڕیاری لەسەر دەدات. بەڵام بژێوی شتێکە پەیوەندی بە هەموو کەسێکەوە هەیە و دەبێت هەمووکەس تێیدا یەکسان بن، ئیدی چ زوو ئیمانی هێنابێت یان درەنگ[١٤٧].

عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش هەمان بیرکردنەوەی ئەبوبەکری سدیقی هەبوو. عەلی لە وتاری بوونە خەلیفەیدا گوتی: ((هۆ گەلۆ... سبەی یەکێک لە ئێوە، ئەوانەتان خودا پێداون، ماڵ و زەوی چاکتان هەیە، مەزرا و جۆباری ڕەوانتان هەیە، کەنیزەی ناسک و ئەسپی

[١٤٧]- ئەبو یوسف: المصدر السابق، ص ٥٠.

بەرزیشـــتان هەیە، نەیەن و بڵـــێن: ئەوە کـــوڕەکەی ئەبوتالیـــب لە مافەکانی خۆمان بێبەری کردووین. هەرکەسێک لە ئێوە ئەگەر فەزڵێک لە خۆیدا بەسەر ئەوانی ترەوە دەبینێت لەبەر ئەوەی هـاوەڵی پێشینی پێغەمـبەر بـووە، ئەوا فەزڵ لای پەروەدگـارە، خێـر و پاداشـتیش ئەو دەیانداتەوە. بەڵام هەر کەسێک داخڵی ئاینەکەمـان بوبێت و ڕووی لە ڕووگەکەمـان کردبێـت، ئەوا مافەکـان و سـنوورەکانی ئیسـلامی پـێ دەدرێت. ئێـوە بەنـدەی خـاوەن و مـاڵیش مـاڵی خـۆدایە، بە یەکسـانی بەسەرتانیدا دابەش دەکەم، لەمەدا کەس لە سەروو کەسـەوە نییە، بۆ ئەوانەی کە تەقوایـان زیـاترە، لای خـودا پاداشـتی باشـتر و زۆرتـر هەیە.))[١٤٨]

وا دەردەکەوێت کە ئیمامی قورتـووبی هـاوڕا نییە لەگەڵ ئەبوبەکر و عەلیـدا. لەوانەیە وا بزانێـت ئیسـلام هـاتووە تـا کۆمەڵێـک لە خەڵکـی دەوڵەمەند بکات، ئەوانی تـریش پشـتگوێ بخـرێن. وەک ئەوەی مـاڵ و سـامان تەنهـا بـدرێت بە مسـوڵمانە دڵسـۆزەکان. ئەوە نازانێـت کە مسوڵمانی دڵسۆزیش هەر کە سـووچی دراو و زێڕی بینی و کەمێک خۆی گرت، ئیمانەکەی و دڵسۆزییەکەیشی لاواز دەبێت. ئێمە بەڕاستی سـەرمان سـوورماوە لە دیـدگای ئیمـامی قورتـووبی، کە ئـایەتێکی مەحکەمی قورئان نەسخ دەکات، ڕێگەی داوە بە پشتگوێخستن و کار پێنەکردنی، بە بەهانەی گۆڕانی بارودۆخ. بەڕاسـتی ئێمە سـەرمان لەم دیـدگایە سـوورماوە. قورتـووبی بـڕوای وایە دەتـوانین ئایەتێـک یـان فەرمودەیەک لەکار بخەین، ئەگەر هاتوو لەگەڵ بارودۆخی نوێدا پێک نەهاتەوە. من وای بۆ دەچم، قورتـووبی خـۆی لەگەڵ خۆیـدا تووشـی ناکۆکی بووە، ئەو و فەقیهە هاوشێوەکانیشـی بڕوایان وایە کە ئـایەت و فەرموودەکـــان بـــۆ هەمیشـــەن و لەگەڵ هەمـــوو بـــارودۆخ و

---

[١٤٨]- طه حسین، الفتنه الکبری، ج ٢، ص ٩٩.

سەردەمێکیشدا دەگونجێن. ئەوان دەڵێن: حەڵاڵ حەڵاڵە... حەرامیش حەرام تا ڕۆژی پەسڵان. هەروەها هەر گۆڕانکارییەکیش بیدعەیە، هەر بیدعەیەکیش گومرایی و گومڕاییش بەرەو ئاگری بە بڵێسە خاوەنەکەی دەبات.

خۆ ئەگەر یەکێک لە ئێمە گوتمان: دانی زەکات بەتەنها بەس نییە، باجیش دەبێت شتێکی بەرەوژوو-چوو(تصاعدی) بێت، ئەوا تووڕە دەبن و خۆیان شین و مۆر دەکەنەوە و، دەڵێن: ئەمە گۆڕانکارییە لە فەرمانی هەمیشەیی خودا. وا بزانم ئەمان ڕێگە بە گۆڕانکاری لە ئەحکامەکاندا دەدەن لەبەر بەرژەوەندی دەوڵەمەندەکان. بەڵام ئەگەر پێچەوانە هاتەوە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەواندا، ئەوا خێرا ناتۆرەی زندیقی لە خاوەن بیرۆکەکە دەنێن.

# بەشی پێنجەم

# عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئـ

لەبارەی ئەم کەسایەتییەوە، قسەوباسێکی فراوان هەیە. هێندێک لە مێژوونوسـان دەڵـێن: ئەو پیـاوەی کە ئەبـوزەڕی هانـدا لە دژی عوسمان، "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئـ" بوو. شۆڕەتەکەیشی بریتی بوو لە "ئیبن سەودا."

هەر ئەو مێژوونووسانە دەڵێن: ئەم ئیبن سەبەئە هەستاوە بە چەندین کاری دیکە، ئەمە بێجگە لە هەڵنانی ئەبازەڕ دژی عوسمان. بە بڕوای ئەوان ئەو بزوێنەری سەرەکی شۆڕشەکەی دژی عوسمان بوو. هەر ئەوبوو نەیهێشت ئاشتی لە نێوان عەلـی و عایشـەدا لە جەمەل ڕوویدات. هەروەها بیرۆکەی "گەڕانەوەی پاش مردن" دەدەنە پاڵ ئەم کابرایە. بە بڕوای ئەمان ئیبن سەبەئـ داهێنەری ئەم بیرۆکەیە بووە، کە پێشتر شتی لەم بابەتە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا نەبووە.

یەکێک لەو کەسانەی لەم بارەیەوە قسەی کردووە، دکتۆر "ئەحمەد ئەمین"ـە، ئەو دەڵێت: ((... ئەو بـوو کە ئەبـوزەڕی هانـدا بەرەو ئیشتراکییەت. ئەو بوو خەڵکی لە شارەکان دژی عوسمان هاندەدا. عەلـی وەک خـودا نـاوزەد کـرد. ئەوەی کە لە مێـژووی ئەوەوە دەخوێندرێتەوە، شتانێکی زۆری کـردووە بـۆ تێکدانی ئیسلام، ئەو کـۆمەڵەیەکی نهێنـی دامەزرانـدبوو کە شـتەکانی ئەمیـان پەخـش

دەكــردەوە. پەردەی ئیسلامەتیشــی دابــوو بە خۆیــدا، تــا لەژێریــدا هەرچێكــی ویســت بیكــات))[149]. هەروەهــا دەڵــێن ئەم ئیــبن ســەبەئە بیرۆكەی وەسییەی هێناوەتە بوون، ئەوەی كە هەموو پێغەمبەرێك وەسییەكی هەبێت، وەسیەتی پێغەمبەریش: عەلی كوڕی ئەبو تالیب بووە.

وەك دەردەكەوێــت، كەســایەتی عەبــدوڵلای كــوڕی سەبەئــ كەسایەتییەكی زۆر سەیرە. دەبێت توانایەكی دەروونی لەڕادەبەدەری هەبووبێت تا بتوانێت ئەم هەموو كاریگەرییەی لەسەر مسوڵمانان جێهێشتبێت، ئیدی چی كاریگەرییەكیش: شۆڕش بەرپا دەكات، ڕێگری لە ئاشتی دەكات، ئایدیاگەلێكی نوێ دەخزێنێتە ناو ئاینەكەوە، كە پێشــتر نەبــوون و نەبیســتراون، جێكەوتیشــیان بــۆ هەتــا هەتــایە دەمێنێــتەوە. ئەو مێژوونووســانەی كە باســی ئیــبن سەبەئــ دەكەن، نەیانتوانیوە بە شێوەیەكی پوخت و جوان باسی كەسایەتییەكەیمان بۆ بكەن. ئێمە هیچ شتێك لەم بڕادەرە عەجیبە نازانین بێجگە لەوەی پێشتر یەهودی بووە، خەڵكی یەمەن بووە، دایكیشی خەڵكی حەبەشە بووە. لە سەردەمی عوسماندا هاتووەتە مەدینە و ئیسلامی خۆیی ئاشكرا كردووە، دواتر چۆتە باژێڕەكانی دەوروبەر و خەڵكی دژی عوسمان هانداوە شانبەشانی بڵاوكردنەوەی شتەكانی دیكەی خۆی، هەروەهــا بانگەشــەی ئەوەی كــردووە كە عەلــی كــوڕی ئەبوتالیــب خودایە.

لێكۆڵینەوەی ژیانی ئەم كەسایەتییە كەمێك ئاڵۆزە، چونكە ئێمە كار و جێكەوتەكــانی زیــاتر دەزانــین وەك لە ژیــان و كەســایەتی و سیفەتەكانی. ڕۆژێكیان بیستم یەكێك لە قەشەكان خەریكە گاڵتە بە ئیســلام دەكــات و دەیگــوت: ((بــڕواننە ئەم ئــاینە! لە كــاتی ئەوپەڕی

[149]- أحمد أمين، المصدر السابق، ص٢٦٩ (حاشيه).

عیـززەت و دەسـەڵاتدا بـووەتە بـووکەڵەی دەسـتی تەنهـا پیـاوێکی غەریـبەی نەناسـراو، کە میـژوو شـتێکی وای لەبـارەوە نازانێـت. لەو ساتەی هاورێکـانی موحەمەد دەسـتیان بەسـەر ناوچەکانـدا گرتبـوو، لەناکاو یەهودییەکی نەناسراو خۆی تێخزاندن و کاری لێ سەغڵەت کـردن بەبـێ ئەوەی یەکێـک دەسـتێکی لـێ بەرز بکـاتەوە یـان تێـی بسرەوێنێت.))

دکتـۆر تەهـا حوسـەین بـڕوای وایە: ((عەبـدوڵڵای کـوڕی سەبەئـ کەسـایەتییەکی دروسـتکراوە. ئەو لە بـڕوای دکتـۆردا: دروسـتکراوی دەستی کۆمەڵێکە کە کاریان پێی بووە، بۆیە کەسایەتییەکی لەم جۆرە بـوونی نەبـووە وەک ئەوەی مێژوونووسـەکان باسـیان کـردووە)). بەڵـگەی دکتـۆریش لەم بـابەتەدا ئەوەیە کە: مسـوڵمانان لە دەورانـی عوسماندا هێندە سست و دەبەنگ نەبوون کە کابرایەکی تازە ئیسلام بەو جۆرە لەسەر پەنجە بیانخولێنێتەوە.

هەروەهـا تەهـا حوسـەین دەڵێـت: ((زۆر ئاسـان بـووە بـۆ والییەکـامی عوسـمان کە خەبەرچنـی لەمەڕ ئەم کـابرایەوە بـکەن و بەخێرایـی عوسـمان لە بـارودۆخی ئاگـادار بکەنەوە، یـان بەلانـی کەم نـامەیەکی ڕەوانە بـکەن. خـۆ ئەوان بلیمەت بـوون لە شـوێنکەوتن و نەفیکردنـی کەسـانێکدا کە تاوانیـان لەچـاو تـاوانی "ئیـبن سەبەئـ"دا هەر ئـاوخواردنەوە بـووە)). لە پـاش ئەمەیش، تەهـا حوسـەین دێتە سـەر بـابەتی هانـدرانی ئەبـوزەر لەلایەن "ئیـبن سەبەئـ"ـەوە و، دەڵێـت: ((... قسـەی هێنـدە قـۆڕ و زیـادەڕۆم وەک لەم بـابەتەدا بیسـتووە، لە هـیچ بـابەتێکی دیـکەدا نەبیسـتووە، وەک ئەوەی ئەبـوزەڕ پێویسـتی بە کەسـێکی تـازە بێـت تـا فێـری ئەوەی بکـات کە هەژار مـافی بەسـەر زەنگینـانەوە هەیە و خـودایش گوڕەشـەی لەو کەسـانە کـردووە کە "کەنز" هەڵدەگرن و لەڕێگەی خودادا نایبەخشن)). بەڵام دکتۆر ئەحمەد

ئەمین دیدگایەکی جیاوازی هەیە. ئەو دەڵێت: ((هێندێک لە لێکۆڵەران باس لە وەهمی بوونی کەسایەتی "ئیبن سەبەئـ" دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە بۆ سەلماندنی قسەکەی ئەوان.))

ئێمە لێرەدا دەکەوینە دووڕیانێکەوە: ئەویش ئایا "ئیبن سەبەئـ" کەسایەتییەکی ڕاستەقینەی هەبووە، یان وەهمێک و دروستکراوی دەستی تاقمێک؟ ئەمە پرسێکی گرنگە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت خوێندنەوە بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی بکەن و دەرس و وانە لە ڕووداوەکان وەرگرن. ئێمە دەتوانین پرسەکە بە جۆرێکی دیکە لێ بکەین: ئایا کۆمەڵگەکەی ئەو سەردەمە واجۆی کەسێک بووە کە پەمپی بدات و شەڕەنگێزیی و فیتنەئەنگێزیی بکات؟ لەوانەیە مێژوونووسان، ئەوانەی چیرۆکی "ئیبن سەبەئـ"یان بۆ گێڕاوینەتەوە، وایان دانابێت کە کۆمەڵگەی ئیسلامیی ئەو سەردەمە زۆر هێمن و ئارام بووە، هەموو قایل و دڵەرخەیان بوون، هیچ شتێک نەبووە دڵیان سەغڵەت و قەلەق بکات. من وا دەزانم ئەو مێژوونووسانە لە تاقمی واعیزە ئەرستۆتالیسییەکانن، کە هێشتا لەسەر لۆجیکی کلاسیک هەنگاو دەڕۆن. ئەمانە ئەو دەمەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەبینن، تووشی شۆک و سەرەگێژە دەبن، وەک بڵێیت ئەمە شتێکی شاز و نامۆیە لە کۆمەڵگەدا. بەڵام لۆجیکی هاوچەرخ(مۆدێرن)، بزووتن لەناو کۆمەڵگەدا بەشتێکی سروشتی و بنەڕەتی کۆمەڵگەکە دەزانێت. ئەو هەمیشە لە جووڵە و گۆڕاندایە، دەستەواژەیەکی زانستیشیان بۆ داناوە بەناوی "پرۆسە Process"

لۆجیکی هاوچەرخ بەلایەوە ئاساییە کاتێک دەبینێت کۆمەڵگە بزۆکە، بەڵکو ئەوکاتەی کۆمەڵگە مەنگ بوویەوە، ئەو دەپرسێت ئەوە چییە وا کپ و ماتن؟ داسەکنان(سکون) لە دیدگای لۆجیکی مۆدێرنەوە

نەخۆشییە، بەڵام بزۆکی و جووڵە ئەو شتەن کە لە زۆربەی کاتەکاندا کۆمەڵگەی لەسەر بنیات دەنرێت و دادەمەزرێت.

ئەوکاتەی کە ئەبوزەر بەدیارکەوت، کۆمەڵگەی ئیسلامی بە دەست گرفتێکی گەورەی کۆمەڵایەتییەوە دەتلایەوە. جیاوازی هەژار و دەوڵەمەند ئەرز و ئاسمان بوو، بنیادەم بێزی لێی دەهاتەوە. بۆیە بە بڕوای دکتۆر تەها حوسەین، ئەبوزەر پێویستی بە کەسێک نەبوو بیرۆکەی ئیشتراکی بخاتە مێشکییەوە. ئەو شۆڕشانەیش هەر دەبوا روویان دابا، بۆیە هیچ پێویستی بە لێکدانەوە نییە، بەڵکوو ئەگەر شۆڕش یان فیتنەیە ڕووینەدایە، ئەوکات دەبوایە لە هۆکاری بێدەنگیی خەڵکیمان پرسیبا"[150].

منیش وەک دکتۆر تەها حوسەین، بڕوام وایە کەسایەتی "ئیبن سەبەئ" شتێکی وەهمی بێت. وایش دەردەکەوێت کە ئەم کەسایەتیە سەیرە، هەر بە دروستکردن دروست کرابێت. ئەو دەوڵەمەندانە دایانهێناوە کە شۆڕش لە زیانی ئەوان کۆتایی پێ دێت. ئەمە سروشتی چینی خۆشگوزەرانە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا. هەموو شۆڕشێکیش کە ڕوو دەدات، لە لایەن نەیارانی شۆڕشەکەوە تانەی لێ دەدرێت بە دەستی دەرەکی. هەر ئەمەیە پرۆفیسۆر "سمیل" ئاماژەی پێ داوە، لە لێکۆڵینەوەکەیدا لە بارەی "نامۆ"Stranger ـەوە"[151].

ئەوەی کە شایەنی باسە لەم بابەتەدا، هەر لەو سەرەتایەیشەوە، قوڕەیشییەکان موحەمەدیان تۆمەتبار دەکرد، کە شتەکانی لە

[150]- تکام وایە لە خوێنەر جیاوازی لە نێوان فیتنە و شۆڕشدا بکات، جیاوازییەکەیشیان شتێکی ڕێژەیی و ئیعتیبارییە، هەموو بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سەرەتا بە فیتنە ناودەبرێت، بەڵام ئەگەر سەری گرت، دواتر پێی دەڵێن شۆڕش و شۆڕشی پیرۆز (نووسەر).

[151]- Sciences of sociology،Park & Burgess.

غولامێکی مەسیحی(نەسرانی)ـەوە وەردەگرێت بەناوی "جوبەیر".[152]
هەروەها بێتەوە، دەیانگوت: بیرۆکەکانی لە "بوحەیرای راهیب" و "سەلمانی فارسی"ـەوە وەردەگرێت . ئیدی ئایەتێک لە قورئان دابەزی و نەرێی ئەم بیرۆکەیەی کرد:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ النحل: ١٠٣

ئێمە دەزانین کە ئەوان دەڵێن ئەوە کەسێک فێری ئەم شتانەی دەکات، بەڵام زمانی ئەوان- ئەوان مەبەستیانەکە موحەمەد فێر دەکات - عەرەبی نییە و ئەم زمانەیش- هیی قورئان- عەرەبیەکی رەوانە].

لەمەوە روون دەبێتەوە کە قورەیش بانگەوازەکەی موحەمەدیان دەدایە پاڵ عەجەمەکان -بێگانەکان-ـەوە. ئیدی جارێکیان دەیانخستە ئەستۆی کەسێکی مەسیحی خەڵکی رۆم. جارێکیش کەسێکی فارسی کە ئەوە سەرچاوەی ئیلهامەکانی موحەمەد. بەڵام پاش ئەوەی کە هاتنە ناو ئاینە تازەکەوە و سوودیان لێ بینی، وردە وردە تۆمەتەکەیشیان کاڵ کردەوە، خۆ ئەگەر بێتوو قورەیش نەهاتنایەتە ناو ئەم ئاینەوە، ئەوا تا کوڕاوکوڕیان هەر ئەم تۆمەتەیان دەبەخشییەوە، وەک چۆن بۆ "ئەبوزەڕ"ی هەژار هەر دەیڵێنەوە.

هەموو جووڵە و ئاینێکی نوێ کە دێتە ئاراوە، خۆشگوزەرانەکان دەیدەنە پاڵ دەستی دەرەکی. ئەمەیش ئەو شتەیە کە پرۆفیسۆر "سمیل" روونی کردووەتەوە لە بارەی قۆناغە جیاوازەکانی مێژوو. هەر بەراستی خۆشگوزەرانەکان نایانەوێت خەڵکی چاو و گوێ بدرنەوە، تەنها تۆزێک شت نەبێت کە لە باب و باپیرانیانەوە بۆیان جێماوە. خۆ ئەگەر هاتوو یەکێک بە نەفەسێکی تازە و دیدگایەکی

---

[152]- محمد حسین هیکل، حیاه محمد ص ١٣٦.

نوێوە هاتە مەیدان، خێرا پێی دەڵێن ئەمە "بەکرێگیراوی بێگانەکانە". ئەم تۆمەتەیش زۆر بەخێرایی لە لایەن دەبەنگەکانەوە بڕوای پێ دەکرێت. ئەم تۆمەتە بەردەوام دراوەتە پاڵ ڕیفۆرمخوازەکان، ئیدی خۆ ئەگەر کارەکەیان -شۆڕشەکەیان- سەری گرت و جڵەوی دەسەڵات کەوتە دەستیان، ئەوا تۆمەتەکە دەپووکێتەوە، خۆ ئەگەر شۆڕشەکەیان داڕووخا، ئەوا نەوە لە دوای نەوە، ناویان لە هەژماری خیانەتکاراندا دەنووسرێتەوە.

بیری نوێ و ئایدیای تازە، ئەگەر کۆک نەبێت لەگەڵ بەها کۆمەڵایەتییەکان، نەریت و ڕێوڕەسمە باوەکاندا، ئەوا خەڵک پێی ڕانایەن بەئاسانی. سەرباری ئەوەی بە کوفر و زەندەقەیش لە کۆمەڵگەدا دەناسرێت. بەڵام هەر ئەم بیرۆکانە، لە پاش ماوەیەک کە خەڵکی پێی ڕادێن، ئەوا وەک بەشێک لە ئاینی لێدێت، ئیدی ئەمجارە بە پێچەوانەوە، ئەوەی بڕوای پێ نەبێت کافرە یان زەندیق.

مێژوو لەسەر دوو قاچ دەڕوات بەڕێوە، پێویستە کاتێک یەکێکیان بەرەوپێشەوە دەڕوات، ئەویان ڕاوەستێنێت تا بەرەوپێشچوونەکە ڕوو بدات. ئەمەیش ڕێک لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکاندا دەبینین، کە لایەک چەق دەبەستن و لایەکەی تریش نوێخوازییان دەوێت، بەرەوپێشچوونیان دەوێت، گۆڕانیان دەوێت. پێکدادان لە نێوان ئەم دوو تاقمەدا تەواو نابێت تا کۆمەڵگەکە زیندوویەتی تێدا بێت. پاشان هەر یەکێک لەم دوو تاقمە ئەویتر بە تۆمەتی ناشیرین تۆمەتبار دەکات. نوێخوازەکان لە چاوی پارێزکارەکاندا زەندیق و کافرن، چەقبەستووەکانیش لە دیدگای نوێخوازەکاندا کەسانی پیس و ستەمکار، بخۆری ماڵی خەڵکین بە حەرامی. گرفتەکە لەوەدایە، هەموو ڕیفۆرمخوازێک پاش سەرکەوتن، چەق دەبەستێت و ڕیفۆرمخوازێکی دیکەی بە شێوەیەکی دیکە لێ تاین دەبێت. پێشتریش ئاماژەمان پێدا،

سەرکەوتن خودی "گۆڕ"ە بۆ شۆڕش، واتە هەرکە سەرکەوتیت، ئیدی لەوساتەوە شۆڕشەکە بەرەو مەرگ گلۆر دەبێتەوە. شۆڕشگێڕ، کۆڵ نـادات و هەر بەرەو هیـوا کۆشـش دەکـات، بەڵام هەرکە گەیشـتە ئامانجەکەی و تەپڵی سەرکەوتنی لێدا و شیرینی سـەرکەوتنی خوارد، ئیدی ئەم ئیسـراحەت و خۆشـییە دەبێتە هـۆی تەنبەڵـی. خـوێنگەرمی تەنها لە کەسانی بێبەشکراودا بەدی دەکرێت، هەرکە ئەم بێبەشکراوە دەسـەڵاتی پەیـدا کـرد و بەسـەر نەیارەکانیـدا سـەرکەوت، ئیـدی حەز دەکات مێژوو وەک "گای ناو خومخۆرک" ڕاوەستێت و هیچ تەکانێک بەرەوپێشـەوە نەدات. ئینجـا دەشـبێتە ستەمکارێکی خۆش-ڕابوێر، کە دەیهەوێت هەموو کەسیش وەک خۆی دڵخۆش بن... ئەی هاوار...

مێـژوو هەر لە بزووتنـدایە، سـارد نـابێتەوە، هەردوو پێـیەکەی لە کـارلێکی بەردەوامـدان. ئەو قـاچەی ئەمـڕۆ دەجووڵێـت، سـبەی دەوەستێت و قاچەکەی دیکە دەکەوێتە جووڵە و بزووتن. دەتوانرێت کۆمەڵگە بە ئاوێک بچوێنرێت کە خراوەتە سەر ئاگر، ئەوەی لەژێرەوە دەکوڵێـت، پـاش کەمێـک دیـتە سـەرەوە، دواتـریش ئەوەی سـەرەوە دەچێتەوە خـوارەوە. ئـابەم چەشـنە دەبینـین ئـاوەکە لە جـووڵەیەکی بەردەوامـدایە. ژێـرەوە دەچێتە سـەرەوە و سـەرەوەیش بـۆ ژێـرەوە دەڕوات. ئەمە بـریتییە لە لـۆژیکی نـوێی کـۆکەرەوەی دژەکـان، ئەو شـتەی بەلای لۆژیکی کلاسیکەوە قەبووڵنەکراوە. لای ئەوان ڕاسـتی هەر بە ڕاسـتێتی تـا ڕۆژی قیـامەت دەمێنێـتەوە. لـۆژیکی کلاسـیک، لـۆژیکی سـولتان و خۆشـگوزەرانەکانە[١٥٣]. سـولتان خـوی بەوەوە گرتـووە: هەرکە فەرمـانی دەرکـرد، خێـرا بـۆی جێبەجـێ بکرێت. بـۆ نمـوونە ئەو فەرمـان بە بنیاتنـانی کۆشـکێک دەکـات، ئیـدی پـاش ماوەیەکی کورت یان تۆزێک درێژ، دەبینێت کۆشکەکە ئامادەیە. ئەو

---

١٥٣- Dewey،Logic، ٨٤ p.

چوزانێت ئەم کۆشکە چۆنچۆنی بنیات نراوە، کێ و کێ زەحمەتیان تێدا کێشاوە، چەن کرێکار و ئەندازیار ئارەقەیان تێدا ڕشتووە. ئەو دەبینێت وا کۆشکەکە ئامادەیە، ئیدی وا دەزانێت دنیا هەمووی کون فەیەکونە.

ئەوە تەنها خودایە کە دەڵێت: ببە، ئیدی شتەکە دەبێت. بەڵام بنیادەم لەسەر هێڵی هەوڵ و کۆشش دایە بۆ ئەوەی شتێکی ویست بە هەوڵدان دەستی بکەوێت. هەر بۆیە لۆژیکی ماندووبوون جیاوازە لە لۆژیکی خۆشگوزەرانی.

واعیزەکانی سوڵتان وا دەزانن دادپەروەری و عەدل کارێکی ئاسانە، بۆیە دەبینیت شەو و ڕۆژ، بە هەستانەوە و دانیشتن، هەر دەڵێن دادپەروەر بن دادپەروەر، لە کاتێکدا ستەم هەر لە جێگەی خۆیدایە، دونیایش هەر لەسەر قەوانە کۆنەکەی خۆی دەسووڕێتەوە. دادپەروەری بەرهەمی بیرکردنەوەی ڕووت و قووت نییە، هەروەک ئەوەی ئەفلاتوون گوتوویەتی، بەڵکوو ئەنجامی کارلێکی بەردەوامی نێوان ستەم و ستەمکارە. سروشتی مرۆ لەسەر ستەمکاریی بەردەوام دەبێت ئەگەر ڕێگرێکی جدیی لە بەردەمیدا دروست نەبێت، پاشان: مرۆڤ هەر لە بنچینەوە ستەمکار نییە، وەک ئەوەی هەندێک کەس وا دەزانن، بەڵکوو لە بنەڕەتدا دادپەروەریی خۆش دەوێت، بەڵام نازانێت چۆن بیگاتێ. ئەو ستەم دەکات و نازانێت ئەوە ستەمە، بەڵکوو بە عەینی دادپەروەری دەزانێت، کە دەیشبینێت دەوروبەر فیکە و چەپڵەی بۆ دەکوتن، ئیدی تەواو دڵنیا دەبێتەوە لەوەی کە خۆی سێبەرەکەی خودایە لەسەر زەویدا.

دادپەروەری کۆمەڵایەتی ناهێتەدی، تا پادشا و سوڵتان لەژێر هەڕەشەی لابردندا نەبن ئەگەر هاتوو ستەمیان کرد. دەسەڵاتدارەکانی دەوڵەتانی هاوچەرخ، ئەو دادپەروەرییەیان لەوەوە نەهێناوە کە هەر

خۆیان لە بنەڕەتدا چاکن و بە شێوەیەکی تەندروست بیر دەکەنەوە، بەڵکوو ئەوان هەر ناتوانن ستەمکار بن، خۆ ئەگەر دەستیان دایە ستەم وەک باوباپیرانیان، ئەوا لە پێشیانەوە خەڵک وەستاون بە کاغەزی دەنگدانەوە لە ڕۆژی هەڵبژاردندا. بەم هۆیەوە فەرمانڕەوا هاوچەرخەکان بوونەتە پەپوولە و خاکی خاکی بوونەتەوە، ئیدی نە کەنیزەک دەکڕن، نە کۆشکی بڵند بڵند. تەنانەت وایلێهاتووە، فەرمانڕەوا هاوچەرخەکان شانازی بە هەژارییانەوە دەکەن، ئێمەیش وەک فریشتە لێیان دەڕوانین کە لە ڕاستیدا فریشتەیەک بوونی نییە. بەڵکوو ئەویش بنیادەمە، بەڵام ئەوەی کە وایلێکردووە وەک فریشتە دەرکەوێت، ئەو چاوەی جەماوەرە کە یەک چرکەیش لێی دوور ناکەوێتەوە و هەمیشە لە کەمیندایە بۆی. بۆیە قوڵپەقوڵپی خەڵکی ئێستا، قوڵپەقوڵپێکی هێمن و ئارامە، دێت فەرمانڕەواکەی خۆی هەرماوە و جارێک دەگۆڕێت. بەڵام کۆمەڵگەی کۆن، هەموو لەژێر هەڕەشەی شمشێر و قامچیدا بوون، بەدەگمەن نەبێت، هەڵبژاردن نەبینراوە، بۆیە جووڵانەوە کۆمەڵایەتییەکانی جاران، بە شێوەیەکی سست (درەنگ درەنگ) ئەنجامدراوە، بەڵام لەگەڵ سستیکەدا توندوتیژی تێدا بەکار هاتووە. کاتێک شۆڕشگێڕەکان بە شمشێر هاتوون، دەسەڵاتیش بەشمشێر وەڵامی داونەتەوە، لەم نێوەندەیشدا خوێنێکی زۆر ڕژاوە.

واعیزەکان خەم بۆ مسوڵمانە هەوەڵینەکان دەخۆن کە تووشی ڕکابەرایەتی و دووبەرەکی بوون. پاشان هۆکاری ئەم دووبەرەکییەشیان خستووەتە ئەستۆی کەسانی وەک "ئیبن سەبەئ" و کەسانی تر. ئەوان ئەوەیان بیرچووەتەوە کە ئەم بەریەککەوتن و دووبەرەکییە هەر دەبوایە ڕووی بدایە. خۆ ئەگەر ڕووینەدایە، ئەوا ئیسلام دەبوویە کالای بەدەستی گورگ و دز و خوێنڕێژان، ئیدی لە

هەمـــوو لایەکەوە تێـــی بەردەبـــوون. پەیـــامبەر (دخ) دەفەرمووێـــت: ((اختلاف أمتي رحمه))[١٥٤]، بەڵام واعیزەکان لەم قسەیە تێناگەن، ئەمان نازانن چۆنچۆنی "جیاڕایی" دەبێتە هۆی ڕەحمەت بۆ خەڵکی. ئەمان وا دەزانن کۆی مسوڵمانان پیرۆزن و ناکرێت بە هیچ جۆرێک لێیان لا بدەیت، خۆ ئەگەریش یەکێکیان لێ تەرە ببێت -وەک ئەبوزەڕ- ئەوا زەنـدیقە یـان کـافر، بێگـوێیی خـودا و پێغەمـبەرکەی کـردووە. هەر بەمەیشەوە نەوەستاون، بەڵکوو هەموو گفتوگۆیەکی کراوە و ئازادیان قەدەغە کردووە، سا نەبادا ببێتە هۆی گومان لەسەر بڕوا پیرۆزەکان، یان ببێتە جێگەی ڕەخنە لە گرۆهی مسوڵمانان.

ئەوان وەهـا تووشـی دۆگمـای فیکـری دەبـن، کە هەمـوو لایەنەکـانی بەرجەسـتە دەکەن، ئیـدی دەبـنە کەسـانێکی دۆگمـای عەیـارە ٢٤. لە واقیعیشدا دۆگمابوون و ملکەچبوون بۆ سوڵتان دوو شتی جیاوازن. کۆمەڵێک "شیعار" و "مارش"یشیان لە خۆیانەوە پێچاوە، بۆ نموونە: "ئەوەی بە "مەنتیق"ـەوە خەریک ببێت، ئەوە زەندیق بووە" یان "هەر کەس لە گوێڕایەڵی سوڵتان بترازێت، ئەوە کافرە". هیچ دردۆنگییەک لەوەدا نییە کە: جیـاڕایی و ملمـلانێ سەردەکێشـن بـۆ بێ-هەیبەتـی و لەدەسـتدانی هەوا (ئەوە دۆخە تـایبەتە دەروونییەی کە لای دوژمنـدا دروسـت دەبێـت دەربـارەی تـۆ، و وای لێدەکات سـڵت لـێ بکـاتەوە). خۆی لە ڕاستیدا گرفتەکە دووسەرەیە، یان دیلیمایە Dilemma، وەک ئەوەی زانایانی کۆمەڵناسیی ناویـان لێنـاوە. بـۆیە کـۆمەڵگە لە نێـوان دوو شتی دژبەیەکدا ڕاوەستاوە، یان ئەوەتا لەسـەر ڕێگەی ملکەچیی و چەقبەسـتوویی ڕێـگە دەبڕێـت، یـان نوێبـوونەوە و جیـاڕایی. کـۆمەڵگەی سـەرکەوتوویش ئەوەیە کە نێوەنـدە-ڕێگـایەک بۆخـۆی بدۆزێتەوە، تـا دەرگـا ئـاوەڵا بێت بـۆ نوێخوازەکـان کە گوزارشـت لە

---

[١٥٤]- ابن خلدون، المقدمه، ص ١١٨.

خۆیـان بـکەن، بـۆیە لە ئێسـتادا دەوڵەتە مۆدێرنەکـان ئەم میتـۆدە جێبەجێ دەکەن.

کۆمەڵگە مۆدێرنەکان ڕێگایەکی نوێیان دۆزیوەتەوە: ئەویش "دەنگدان" و "هەڵبژاردن"ـە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ. ئیدی لەم ڕێگەیەوە دەرگا بە ڕووی نوێخوازاندا دەکرێتەوە کە بگەنە مەبەست و ئامانجەکانیـان لە ڕێگەی دەنگدانێکی تەندروستەوە. هەر چەندسـاڵ جارێک، دەبینین کۆمەڵانی خەڵک دێن و بە کارتەکانی دەنگدان، ئەو کەسە هەڵدەبژێرن کە دەغـدەغەی چاکسـازی لە کەللەیـدا دەردەکەوێت. ئەگەر بمانەوێت سیسـتەمی هەڵبـژاردن سیسـتەمێکی بێعەیـب بێـت، ئەوا هەڵە بیرمـان کـــردووەتەوە، ئەو چـــونکە دەســـتکاری بنیـــادەمە، هەرگیـــز لە کەموکووڕتی بێبەش نابێت. بەڵام سـەرباری هەمـوو شـتێک، دەتـوانین بڵێین تاوەکوو هەڵبژاردنەکە تەندروسـتتر بێـت و زیـاتر گوزارشـتی لە بڕیـاری جەمـاوەر کردبێـت، ئەوا مەترسـی شـۆڕش و هەڵچـوونی کۆمەڵایەتیش بەو ڕێژەیە کەم دەبێتەوە.

فەیلەسووف "لیمان" لە بارەی هەڵبژاردنەوە دەڵێت: ئێستا هەڵبژاردن جێگەی شۆڕشـی جـارانی گرتـووەتەوە، لە بـڕوای ئەودا، هەڵبـژاردن بریتییە لە شۆڕش بەڵام بە ڕووخسارێکی دیکەوە، کە تێیدا جێگۆڕکێ کـراوە بە کـارتی دەنگـدان و گـوللە (فیشـەک)"، لیمـان بەم جـۆرە گوزارشـت لە ئایدیاکەی خۆی دەکـات "Ballots imstead of buullets" واتە کارتی دەنگدان لە جێگەی گوللە. وەک ئاشکرایشـە، ئەو کۆمەڵگـانەی کە نـاتوانن لە ڕێـگەی هەڵبژاردنـی تەندروسـتەوە فەرمانڕەواکانیان لابدەن، خێرا پەنا بۆ شـۆڕش و تونـدوتیژی دەبەن وەک بژاردەیەکی هەمیشە بەردەست.

ئیسلام شورای داهێنا، هەرچەندە ڕێگەیەکی چاک و باشە، بەڵام پێش سـەردەمەکەی خـۆی کەوتبـوو، وەک بڵێیـت هێشـتا عەقڵـی خەڵـکەکە

شتی وەهای پێ هەرس نەدەکرا. هەر بۆیە ماوەیەکی زۆری بەسەردا نەچوو هەڵوەشایەوە و، بارودۆخەکە گەڕایەوە سەر قەوانە کۆنەکەی شیر و شمێر. هیچ کەسیش سەری لەم شتە سوورنەمێنێت، ئەمە کارێک بوو، هەر دەبوو ڕوویدابا، چونکە هەڵبژاردن تەنها کارێکی فیکریی پەتی(مجرد) نییە، بەڵکوو نەریتێکی کۆمەڵایەتییە، کە لە ڕاهاتنی خەڵکییەوە سەرچاوە دەگرێت، پشت دەبەستێت بە بەها و نەریتەکان کە بۆیان جێماوە. هەر بۆیە، ڕێک لە پاش ٥٠ ساڵ لە وەفاتی پەیامبەر (دخ)، حوکمی قامچی و شمشێر سەری هەڵدایەوە، سیستەمی شورای سەرلەبەر لەناوبرد، چونکە بەها کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە، بە هیچ کلۆجێک لەم سیستەمە تێنەدەگەیشت.

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: ((سی ساڵ خەلیفایەتی و دواتر پاشایەتی دەگەڕێتەوە))[١٥٥]. ئەم فەرموودەیە لەوانەیە درۆبێت بەدەم پێغەمبەرەوە، یان لەوانەیە فەرموودەوانان دایان تاشیبێت تا وێنای سەردەمی مەعاویەی پێ بکەن لە گۆڕینی شێوازی دەسەڵاتەکەدا. بە هەر جۆرێک بێت، ئەمە وێنەی گوزارشتە کۆمەڵایەتییە باوەکەمان بۆ دەکات لەلای فەرموودەوانانی ئەو دەمە، ئەو کاتەی کە بینییان وا موعاویە، فەرمانڕەوایەتی لە شوراوە گۆڕی بۆ پاشایەتی، سوپایش بە هەموو شێوەیەک لە خزمەتیدان. پاش ئەمە، ئیدی خەڵکی بوونە دوو بەرەی دژ. بەرەیەکیان دەیانگوت: دەبێت ملکەچی سوڵتان بین، هەرچەندەیش زاڵم و ستەمکار بێت. بەرەی دووهەم: هاواریان دەکرد بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین. بەهۆی ئەوەی سوڵتان شمشێری هەبوو، دەبوایە شۆڕشگێڕەکانیش شمشێر هەڵگرن، هەر بۆیە بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی بە بەریەککەوتنی شمشێری دۆگما و شمشێری ڕیفۆرمخوازەکان ئەنجامی دەدا بە دەستەوە. هەر

---

[١٥٥]- ابن العربی، العواصم من القواصم، ص ٢٠٠.

گرووپەیش بۆ سەرخستنی خۆی، پەنای دەبردە بەر قورئان و حەدیس، تا بەرامبەر بگەوزێنێت. ئەمبەر دەیانگوت: "پێویستە گوێڕایەڵی سوڵتان بین و هەر کەسیش لە جەماعەت دەچێت، کافری رەسەنە". ئەوبەریش دەیگوت: "رێگری لە خراپە واجبە و دژایەتیکردنی ستەمکاریش جیهادە". کۆمەڵگەی ئیسلامی ئا بەم بەریەککەوتنانە بەرەوپێش چوو، بەڵام لە سەردەمی خۆیدا نرخی ئەو بەرەوپێشچوونە خوێن و ماڵێکی زۆر زۆر بووە. بە شێوەیەکی گشتی، بەرەوپێشچوون "باج"ی دەوێت، چونکە ئەوە تەنها بیرۆکەیەکی پەتی نییە لە بیری فەیلەسووفاندا، بەڵکوو ئەوە کارلێکی ترش و تاڵی بەردەوامی بەرەی ریفۆرمخواز و موحافیزەکارە.

تۆ بیهێنە پێش چاوت، ئەگەر خەڵکی هەموو موحافیزەکار بوونایە، ئەوا کۆمەڵگەی بەشەری وەک جیهانی هەنگ و مێرووولەی لێ دەهات، ملیۆنان ساڵ تێدەپەڕی و ئەمان هەر لە شوێنی خۆیاندا دەبوون. فەرموودەیەک دراوەتە پاڵ پەیامبەر، کە پەیوەندییەکی ئەوتۆیشی نییە بەم بابەتەی ئێستامانەوە، لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەمە واتا(مەفهوم)ـەکەیەتی: ((داوام لە خودا کرد، کە قەومەکەم بە وشکەساڵی لەناو نەبات، داواکەی پەسەند کردم. تکام لێکرد کە قەومەکەم بە خنکان لەناو نەبات، هات بەدەم داواکەمەوە. داوای ئەوەیشم لێکرد کە قەومەکەم بەرنەبنە یەکتری و لە دژی یەک نەجەنگن، ئەمەیانی پەسەند نەکرد)). خودای موحەمەد مافی خۆیەتی کە قەومەکەی موحەمەد بچن بەگژی یەکدا، ئەو نایەوێت کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی بەستووی داخراو بێت. خودای موحەمەد ئەو خودایەیە کە موسا باسی دەکات: ((إن هي الا فتنتك تضل بها من تشا وتهدي بها من تشا- ئەمە بەڵا و تاقیکردنەوەی خۆتە، تا هەندێک هیدایەتی پێ وەرگرن، هەندێکیش گومرا ببن)). خودایش لە گفتوگۆ

لەگەڵ پێغەمبەر (دخ) دەفەرمووێت: ((ئەگەر خودا تۆ ویستبای، ئەوا هەموو خەڵکی لەسەر یەک ڕێگا کۆ دەکردەوە، بەڵام هێشتایش جیاڕان، مەگەر کەسێک خودا ڕۆحمی لەگەڵ کردبێت، هەر بۆ ئەمەیش خودا ئادەمیزادی دروست کردووە (بۆ ئەم جیاوازییە)- ((ولو شاو ربک لجعل الناس أمه واحده، ولایزالون مختلفین، الا من رحم ربک)). لە ڕواڵەتدا، وا دەردەکەوێت کە خودا بنیادەمی بۆ ئەم جەدەلی خێر و شەڕە دروست کردبێت، ئیدی لەم ڕێگەیەیشەوە بەرەوپێش بچن کە سنووری نییە (ئەم ڕێگەیە)

ڕۆژێکیان لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی بەغداد نووسیبووم: ((خودی پەیامبەر کەسێکی شۆڕشگێڕ و نوێخواز بووە، هەوڵی تازەگەریی داوە تا هێزی تێدابووە، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە ئەمرۆ پیاوانی ئاینی دەبینین، پەنگیان خواردووەتەوە و لە جێگەی خۆیاندا وەستاون و ڕێگە بە هیچ تازەگەرییەک نادەن، لە کاتێکدا بێزراوترین شت لای پێغەمبەر ئەوەبوو کەسێک بڵێت: ((ئێمە باوباپیرانی خۆمانمان دینیوە ئاوایان کردووە، ئێمەش هەروەک ئەوان دەکەین)). بۆ خۆی یەکێک لە واعیزەکانی سوڵتان وەڵامی دامەوە بەم چەشنە: ((یەک مسوڵمان پەیدا ناکەیت ئێستا لەسەر زەوی، بڵێت: إنا وجدنا... ئێمە باوباپیرانمان...، بەڵکوو دەڵێت: ئەمە کتێبی خودایە لە بەردەستماندا، لە هیچ لایەکەوە کونی تێ نابێت، بە درۆ ناخرێتەوە. لەولایشەوە پێغەمبەر شکۆدارتری کردووە بەوەی گوتوویەتی: "دوو شتی بەنرخم لە پاش خۆم بۆ جێهێشتوون، ئەگەر پێڕەوییان لێ بکەن، ئەوا تووشی گومرایی نابن، کتێبی خودا و سوننەتی خۆم"، ئێمەیش لەسەر پەیمانەکەمان سوورین و پابەندی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرین. ئیدی با دکتۆر ئەگەر دەیەوێت شتێکی تازەمان نیشان بدات کە لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەر تازە تر بێت، ئەوا با

بیهێنێت.))[156]

هەر بەڕاستی من سەرم لە وەڵامدانەوەی بەردەوامی ئەم واعیزانەی سوڵتان سووڕماوە، ئەمان بە دەستێکیان کتێبی خودایان بەرز کردووەتەوە، وەک چۆن یارانی مەعاویە لە جەنگی "صەفین"دا وایان دەکرد، دەیانگوت: وەرن، ئەمە قورئانە و با بگەڕێینەوە بۆی. ئەمانە ئەوەیان بیرچووەتەوە کە قورئان چەند دیوێکی هەیە - هەروەک ئەوەی عەلی گوتوویەتی-، بۆیە هەر جەماعەتە و دەتوانن بەشی خۆیان شتی لێ هەڵگۆزن و بیدەن بە نەخشی نێوچەوانی نەیارەکانیاندا.

ئێمە دەبینین بە ئاشکرا کتێبی خودا نەریتی هەڵگرتنی کەنز دەکات، کەچی سوڵتانەکان هاتوون تەئویلی شتەکەیان کردووە، چوون لە حەدیسی پێغەمبەر شتی پێچەوانەی ئەویان دۆزیوەتەوە، ڕەوایەتییان داوەتەوە بە هەڵگرتنی کەنز. ئێ ئێوە بڵێن ئەمە چ تەفسیرێکە؟ شوێنکەوتنی کتێبی خودا، مانای ئەوە نییە هەموو بەیانییەک بیخوێنیت، یان ماچی کەین و بیخەینە سەر تەوقی سەرمان، یان بە ئاوی ئاڵتوون بینووسینەوە و کەیف و سەفای پێ بکەین. بەڵکوو گەورەترین مەشخەڵێک کە قورئان هەڵیکردووە، بریتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی زوڵم و ستەم و پاوانخوازیی.

[156]- ئەوەی کە لە هەمووی سەیرترە، خاوەنی ئەم بابەتە، من بەوە تۆمەتبار دەکات کە کاریگەری مەسیحییەکانم لەسەرە، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر بە شتێکی پێچەوانە تۆمەتباری کردم، ئەویش تۆمەتی شیوعیەت بوو. ئەو لە قسەکانیدا هاوین و زستانی کۆکردووەتەوە -وەك دەڵێن-، ئەمەیش جێگای سەرسووڕمان نییە، هەردوو تۆمەتەکە نووسەر بە هەڵگری بیری دەرەکی تۆمەتبار دەکەن، واتە دەستێکی لەپشتەوەیە. نووسەر.

واعیزەکان سەری زمان و بنی زمانیان هەر ئەم قسەیەی قورئانە: ((أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ)). ئەوان بەم قسەیە مەبەستیانە بڵێن: گوێ لە مشتی سوڵتان بن، هەرچەندەیش ستەمکار بێت. خۆی قورئان داوای گوێڕایەڵیی سێ شتی کردووە، یەکەم خودا، دووەم پەیامبەرەکەی، سێیەم فەرمانڕەوا، بەڵام واعیزەکان یەکەم و دووەم دەپەڕێنن و یەکسەر دەچنەسەر سێیەم، هەموو جەختێکیان لەسەر گوێڕایەڵیی "ئولیل ئەمرە"، واتە سوڵتانەکان. گومانی تێدا نییە، بەگوێکردنی خودا و پێغەمبەر لە پێشترە لە هیی فەرمانڕەوا، خۆ ئەگەر دژ بێنەوە، ئەوا دەبێت فەزڵی یەکەم بدرێت بە هیی دووەمدا. فەرموودەیەکی پێغەمبەریش لەم بارەیەوە دەڵێت: ((بە گوێی هیچ کەسێک نەکەن، ئەگەر قسەکەی پێچەوانەی قسەی خودا بوو.))

***

وتمان لۆجیکی نوێی کۆمەڵایەتی، لۆجیکێکی پارادۆکس و بزووتنە(التناقض والحركە)، ئەمەیش پێچەوانەی ئەو لۆجیکە جێگیرە پەنگخواردووەیە کە واعیزەکان پێڕەوی لێ دەکەن. خۆی ئەگەر ڕاستیت بوێت، ئەم لۆجیکە تازەیە، بە مەعنای کەلیمە تازە نییە، پەیامبەر موحەمەد بە شێوەیەک لە شێوەکان مزگێنییەکەی داوە. دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((هەموو سەد ساڵ جارێک، خودا کەسێک دەنێرێت تا ئاینەکە بۆ نوێ بکاتەوە)). لێرەوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەریش زانیویەتی، ئاینەکەی لەگەڵ دۆگماییدا سەروکاری نییە، کتێبی خودایش بەتەنێ بەس نییە تا خەڵکی لە لادان بپارێزێت، بۆیە پەیامبەر هەواڵی هاتنی موجەددیدەکان دەدات، لە هەر

سـەد سـاڵ جارێکدا. شـتێکیش کە زۆر شـایەنی باسـکردنە، ئەویـش باسـکردنی ژمـارەیە لە زمـانی عەرەبیدا، کاتێـک یەکێک دەڵێت سـەد، ئەمە گوزارشـتە لە مـاوەیەک (مـوددەیەکی زەمەنـی)، نەک ڕێـک سـەد سـاڵی ڕەبەق، کـاتەکە بە پێـی داخـوازیی بـارودۆخە کـۆمەڵایەتییەکە دەگۆڕێت.

مـن وا گومـان دەبەم کە پەیـامبەر (دخ)، پێشـبینی داڕووخـانی مـاوە ماوەی نەتەوەکەی کردبێت، بۆیە ئەگەر نوێکارێک(موجەددید) نەیەت، ئەوا ئوممەتەکەی بێگۆتا تووشـی لەناوچوون و داتەپین دێت. پاشـان مێــژووی کــۆمەڵایەتی بە ســاڵ و مانــگ ناپێورێــت، بەڵکــوو ئەوە مێژوویەکـی پێکەوەبەنـدە، کە بە چەنـدین قۆناغـدا دەڕوات و بە پێـی چەندین هۆکاری بەرەوپێشـچوونی کۆمەڵایەتی. من وا گومـان دەبەم کە پێغەمـبەر خـۆی زانیـویەتی کە ئـاینەکەی تووشـی ئەم داڕووخـانە دەبێت نەوە لە پاش نەوە، ئەگەر کەسانێک ماوە ماوە نەیەن و ئاینەکە نوێ بکەنەوە.

ئـاینی ئیسـلام بەوە لە ئاینەکـانی دیـکە جیـا دەکـرێتەوە، کە فەرمـانی ئەمر بە چاکە و ڕێگری لە خـراپە لە شـوێنکەوتووەکانی دەکـات. هەر خودی پەیامبەر خۆی دەفەرمووێت: ((ئەگەر بینیت ئوممەتەکەم لەوە دەسڵەمینەوە، کە بە زاڵم بڵێن: تۆ زاڵمیت. ئەوا دەسـتیان لـێ بشـۆ)). ئەم واجبە ئیسـلامییە -واجبـی ئەمـر بە چـاکە و ڕێگـری لە خـراپە- فەرمانێکی سـەیرە و بنیادەم بەرەو بیرکـردنەوە پەلکێش دەکـات. ئەم فەرمانە وا لە هەڵگری ئایدیاکە دەکات، ڕەخنە بگرێت و سڵ لە زاڵـم نەکاتەوە، زۆر بە ڕاشـکاوی پێـی بڵێـت: "تـۆ زاڵمیـت". ئەگەر کەسـێک لێکـۆڵینەوەی دەروونناسـییانەی بـۆ سـتەمکاران کردبێـت، دەبینێـت هەرگیز ئەم جۆرە لە ڕەخنەگرتنیان قەبـووڵ نییە، فەرمـانی کوشـتنی بێــژەری قســەکان دەدەن. هەر لێرەیشــەوە دەبینــین کە پەیــامبەر

گوزارشتی لەم جۆرە کارە بە جیهاد کردووە و فەرموویەتی: ((هەر مسوڵمانێک ستەمی لێکرا و هەستا بە بەرەنگاربوونەوەی ستەمەکە، لەسەری کوژرا، ئەوا شەهیدە)). لێرەیشەوە جیهاد لە ئیسلامدا پۆلێنکرا بۆ دوو جۆر. یەکەمیان: جیهادی دوژمنی کافر، دووەمیشیان: جیهادی مسوڵمانی ستەمکار. ئیدی مسوڵمانانیش بوونە دوو بەرە، بەرەیەکیان جەختی لەسەر جیهادی دوژمنی کافر دەکردەوە، مسوڵمانی ستەمکاری لە بیری خۆی بردبوویەوە. گرووپەکەی دیکەیش رێک بە پێچەوانەوە، دوژمنی دەورووپشتی پشتگوێ خستبوو، هەر خەریکی مسوڵمانە ستەمکارەکان بوو. لەوانەیە هەر ئەم هۆکارەیش بووبێت کە گرووپی یەکەم هەستاون بە تۆمەتبارکردنی دووەم بە دەستی دەرەکی.

*** *** ***

واعیزەکان هەستان بە تەئویلکردنی هەردوو دەستەواژەی "فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە" بە جۆرێک کە لەگەڵ فەلسەفەی "ملکەچکردن بۆ سوڵتان"دا بگونجێت. ئەمان هاتن ئەم واجبە مەزنەیان کردە وەزیفەیەکی حکومیی بێفەڕ، دەسگاکەیان ناونا (الحسبە) واتە لێپرسینە. لەم کارەیشدا سوڵتانەکان دەسگیرۆییان کردن و جۆرێک لە پۆلیسیان بۆ تەرخان کردن، هەر رێک وەک پۆلیسی شارەوانی ئێستا، کە بە بازاڕ و کوچەوکۆڵاندا دەرۆیشتن و فەرمانیان بە چاکە و رێگریان لە خراپە دەکرد.

ئیبن خەلدون لەم بارەیەوە دەڵێت: ((لە بارەی "الحسبە"ـەوە، ئەمە ئەرکێکی ئایینییە، بۆ فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە دامەزراوە،

کە ئەویش فەرزێکە لەسەر مسوڵمانان. کەسی شیاوی بۆ تەرخان دەکرێت، کارەکەی خۆیشی پێ دەگوترێت، کە ئیشی ئەو چی و چییە، لەسەر ئەم کارەیشی هاوکاریی وەردەگرێت، ئەو بە شوێن شتە دزێوەکانی کۆمەڵگەدا دەگەڕێت، بە پێی توانای خۆی 'پاداشت و تەمبێ'ی خەڵکەکە دەکات. خەڵکی هاندەدات بەرەو بەرژەوەندیی گشتی، ڕێگری دەکات لەسەر ڕێگادا دانیشتن و بەرتەسک کردنەوەی ڕێگای خەڵکی، ڕێگری دەکات لە خاوەن کەشتییەکان، تا باری زۆر هەڵنەگرن، بەو خاوەن ماڵانەیش -کە ماڵەکانیان بۆ کرێ داناوە- دەڵێت، کە ماڵەکانیان لە سەروبەندی داتەپیندان، هەستن و ماڵەکانیان سەرلەنوێ نۆژەن بکەنەوە، سا نەبادا زیان بە ڕێبوارێک بگەیەنێت، هەروەها ڕێگرییکردن لەو مامۆستایانەی لە قوتابییە منداڵەکان دەدەن، لە کاتی وانەوتنەوەدا.))

پێغەمبەر (دخ)، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەی پێویست کردووە، تا قەومەکەی بەرەنگاریی ستەم و ستەمکاران ببنەوە. بەڵام سوڵتانەکان شتەکان بە ئاقارێکی تردا برد، قامچییان دایە دەست پۆلیسەکان، تا بەرببنە نێزەی بەقاڵ و مامۆستا و کۆڵبەری هەژاری ناو بازارەکانەوە. بە بڕوای من: باشترین ڕێگەی هاوچەرخ بۆ جێبەجێکردنی ئەم سوننەتەی پێغەمبەر، بریتییە لە سندووقەکانی دەنگدان، کە مسوڵمان تا هێزی لە ئەژنۆدایە، لەم مەیدانەدا خۆی ماندوو بکات. ئەمەیە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەی هەرە مەزن و بەسوود لە ئەمڕۆدا.

پێشینان، وایان دەزانی، کە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە لە کاتێکدا واجب دەبێت لەسەر مسوڵمان، کە مەرجەکانی هاتبنە دی. ئەوان دەیانگوت، تاکە مسوڵمانێک ناتوانێت خۆی بەتەنێ، لە بەرانبەر سوڵتانێکی دارودەستە دارەوە ڕاوەستێت -کە سەدان سەگی پاس

داوە-، بۆیە ڕێگەیان داوە بە بێدەنگبوون و ملکەچی لە بەرانبەر سوڵتانەوە، ئەم واجبە هەرە مەزنەیان پشتگوێ خستووە.

وەک ئاشکرایە، ئەم سەردەمەی ئێستامان، چەندین ئینقیلاب و شۆڕشی بە خۆیەوە دینیوە. ئیدی هەر دەوڵەتێک تۆ دەیبینیت، هەرچەندیش دروستکراو و کارتۆنیی بێت، هەر شوێنێکیان دۆزیوەتەوە بۆ دەنگدان و هەڵبژاردن. بۆیە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، پێویستە لەسەر مسوڵمان، ئەم مافەی خۆی بە هەموو شێوەیەک بەکار بهێنێت، هیچ دریغی و کەمتەرخەمییەکی تێدا نەکات. خۆ ئەگەر بێتوو من لە عەمامەبەسەرەکان بوومایە، ئەوا بە ڕۆژی ڕۆشنا فەتوای واجببوونی بەشداری دەنگدان و هەوڵ و کۆششم بۆی دەدا، کەمتەرخەمیشم بە تاوانێکی نەبەخشراو لەقەڵەم دەدا.

مسوڵمانی ئەمڕۆ، ڕاهاتووە لە بەکەمتەماشاکردنی هەڵبژاردن، ئەسڵەن هەر نایەت بە بای خەیاڵیشیدا کە بڕوات دەنگەکەی بدات، ئەگەر بنکەی دەنگدانەکەیشی نزیک ماڵەکەی، یان شوێنکارەکەی بێت. مسوڵمان ئەوەی بیرچووەتەوە کە "فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە" واجبێکە لە گەردەنی. بەڕاستی من هیچ ڕێگەیەک بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە نابینمەوە بێجگە لە بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکان، ئیدی بە هەر جۆرێک لە جۆرەکان بێت. پاشان، ئەو سووک تەماشاکردنەی مسوڵمان دەرحەق بە هەڵبژاردن، وایکردووە هەڵبژاردن ببێتە ئامرازێک بە دەستی ستەمکاران و خۆشگوزەرانەکانەوە، بە دڵی خۆیان قاچی لێ ڕاکێشن. خۆ ئەگەر هەموو خەڵکی، بە پاڵنەرێکی بەهێزی "ئاینیی"ـەوە بەشداری بکەن، ئەوا ستەمکارەکان لە داخا دەدڕێن- شەق دەبەن- کە ئەو جۆشوخرۆشەیان بینی لە دەروونی خەڵکیدا. لەوانەیە زیادەڕۆییمان نەکردبێت، ئەگەر گوتبێتمان: تاوەکوو خەڵکی بەهەندتر تەماشای

هەڵبـژاردن بـکەن، بەشـداری جـددی تێـدا بـکەن، ڕێگـری زیـاتر لە ستەمکاران دەکرێت کە بە دڵی خۆیان چییان بوێت لێی بکەن، وەک ئەوەی ئەمڕۆ دەیکەن.

من تەحەددای پیاوانی ئایینی دەکەم لەم بۆچوونەدا، با بێن لێکۆڵینەوە و بەدواداچـوون بـکەن، بەڵام بەداخەوە، ئەمـان دەماغیـان تەبـع بـووە لەسـەر شـێوازی واعیزەکـانی دەربـار، لەم شـتانە تێنـاگەن. تەنـانەت ئەمان هەر نایانەوێت ئاوەزی خەڵکی بجووڵێت بەرەوپێشـەوە، نەبادا چاو و گوێیان بکرێتەوە و لە دژی وەلی ئەمر ڕاپەڕن. من لەوەیش دەترسـێم، تۆمەتبـارم بـکەن دیسـانەوە بە دەسـتی دەرەکـی و بەکرێگیراوی بێگانان، چونکە وادەزانن، من هەڵگری بیری ڕووخێنەر و نامۆم. ئینجا لە بڕوای ئەماندا، هەموو ئایدیایەکی نوێ، ڕووخێنەرە و پێچەوانەی بیروباوەڕ و نەریتی باوانمانە، ئیدی قۆناغی دواتریشیان لە هێرش ئەوەیە: دەڵێن هەموو ئەم بیرە نامۆیانە زیانی بۆ دین هەیە و ئاین دەڕووخێنێت.

فەرموودەیەک لە پەیامبەرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((ئیسلام بە نـامۆیی -غەریبـی- سـەری هەڵـدا، هەروایـش نـامۆ دەبێـتەوە، وەک سـەرەتای سـەرهەڵدانی، بەهەشـتی توبـا بـۆ نامۆکـان))[157]. ئەم

---

[157]- ئـەم فـەرمـوودەیـە بـە ٢٣ شـێواز هـاتووە، کـە هـەموویـان ئـەم بـەشـەیان تێدا هاوبەشە کە دەڵێت:

عن أبـی سعید الـخدری رضـی الـلـه عنـه قال: قال رسول الـلـه صلـی الـلـه علیـه وسلم: "بدأ الإسلام غریبا، وسیعود غریبا کما بدأ، فطوبی للغربـاو"، ئیدی لـە هـەندێکیانـدا پـارچـەیـەك یـان دوو بـڕگـەی زیاتریشـی لـەگـەڵـدایە کە دەڵێت: "الـذین یصلحون عنـد فسـاد النـاس"، ئـەوانـەی کاتێـك خـەڵکـی خـەریکی فـەسادن، ئـەمـان چاکە دەکـەن، ئـەمـەیش وای کـردووە کـە پـلـەکـەی زۆر بـەرز بێت و هـەندێکی لـە فـەرموودەزانـان بیگـەیـەننە ئاستـی تـەواتـور. وەرگێر.

دەستەواژەی "نامۆ"ـیە، دەمباتەوە بیری لێکۆڵینەوەکەی پرۆفیسۆر "سمیل" کە لەمەڕ واژەی "غەریب" ئەنجامی دابوو. ئیسلام لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا بەوە تۆمەتبار کرا، کە بزوتنەوەیەکی نامۆی دەرەکییە، پاشان ئەبوزەڕ بانگەوازە ئیشتیراکییەکەی بڵاو کردەوە، دیسانەوە تۆمەتباریان کرد بە بانگەوازکاری بنەمای نامۆ، خۆیشیان ناونا کەسە نامۆکە. هەر لە ڕاستیشدا ئەبوزەر کەسایەتییەکی نامۆی هەبوو، پەیامبەر دەرحەق بە وی، دەیگوت: ((ڕەحمەتی پەروەرێن لە ئەبوزەڕ بێت، بە تەنیا دەڕوات، بە تەنیا دەمرێت و زیندوویش دەکرێتەوە.))[158]

ئەوەی جێگەی تێرامانە، ئەبوزەڕ، تاکە بیابانشین بووە بەر لە کۆچ ئیمان بهێنێت، ئەو دەمەی کە پەیامبەر بێهێز و بێ دەسەلات بوو ئەو بڕوای پێ هێنا. بیابانشین سروشتیان وایە، شوێن کەسی بێ دەسەلات ناکەون، ناچنە ناو ئاینێکی لاوازەوە، ئەوان حەزیان لە هێزە، بە هەموو شێوەیەک بێزیان لە بێدەسەلات دێتەوە. هەر بۆیە دەبینرا چۆن مەسخەرەیان بە پێغەمبەر دەکرد لە کاتی بێتوانابییدا، بەلام هەر کە دەسەلاتی پەیدا کرد، پۆل پۆل و چین چین، هەر خەڵک بوو خۆی دەکر بەناو ئاینەکەیدا. ئەمەیش شایەنی بیرلێکردنەوەیە، تاکە بیابانشینێک، لە یاسا بەدەر بێت و ڕیزپەر بکات، ئەو تاکە کەسەیش ئەبوزەڕی هاوڕێمان بوو. تەنانەت ئەو بڕوای بە موحەمەد هێنا بەر لەوەیشی بیبینێت. ئەو لەبەر ئەم کارەی، لە لایەن هۆزەکەیەوە

---

[158]- عبدالحمید السحار، أبوذر الغفاری، ص١٥٨- ١٦٠. ئەم فەرموودەیە لای حافز ئیبن حەجەر زەعیفە "الإصابە (١٢٩/٧)" هەرچەندە لای زۆرێکی دیکەی ئەهلی سوننە پەسەندە، کە دواینیان ئەلبانییە، بەلام لە ڕیزبەندی ڕاوییەکانیدا کەسێك هەیە بە ناوی "بریدە بن سفیان" کە بوخاری دەڵێت: قسەی لەسەرە و دارەقوتنی دەڵێت: مەتروکە و نەسائیش دەڵێت: لە مەسەلەی فەرموودەدا ئەم کەسە لاوازە. (وەرگێڕ)

گاڵتەیەكی زۆری پێ كرا. عەبدووڵلای كوڕی سامت دەگێڕێتەوە، كە ئەبوزەڕ پێی گوتووە: ((برازاكەم، من بە سێ ساڵ بەر لە بینینی پێغەمبەر، دەستم بە نوێژ كردبوو))، عەبدوڵلا دەڵێ لێم پرسی، ڕووت لە كوێ دەكرد بۆ نوێژ؟ ئەویش وەڵامی دابوویەوە: ئەو شوێنەی كە خودا ڕێنوێنی بۆ كردبووم.

ئەبوزەڕ هەر لە پەیامبەران دەچوو، لەوانەیشە پەیامبەر بووبێت بەڵام بە شێوەیەكی جیاواز، ئەو پیاوەی بەر لە هەموو بیابانشینان ڕووی لە خودا كردووە، پاشانیش پێش هەموویان كەوتبوو بە شۆڕش دژی موترەفەكان. ئەبوزەڕ موترەفەكان -خۆشڕابوێرەكان-ی بەوە تۆمەتبار دەكرد، كە ئەوان دەڵێن: ((دەستەكانی خودا قوچاوە و خودا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەند))، ئیدی ئەو لۆمەی كردن و گوتی: ئەگەر ئەوە قسەی ئێوە نییە، دەی فەرموون لەوە ببەخشن بە هەژاران كە خودا پێی داون. عوسمان زۆر بە توندی لێی تووڕە بوو، بەوانەی دەوروبەری گوت: ((یان ئەوەتا لێی دەدەم، یان دەیكوژم، ئەو لە گرۆی مسوڵمانان خۆی تەرە كردووە، یان ئەوەتا لەم زەوی و ئاوە دووری دەخەمەوە)). عەلیش پێی گوت: ((من قسەی كابرای ئالی فیرعەونت پێ دەڵێم، ئەگەر درۆ دەكات، درۆكەی دەكەوێتەوە بە ملی خۆیدا، خۆ ئەگەریش ڕاست دەكات، ئەوا شتێكیش بەر ئێوە دەكەوێت، بێگومان خودایش ڕێنمایی كەسانی موسریف و درۆزن ناكات))، عوسمان لەم قسەیەی عەلی دڵگران بوو، بەوەیش تۆمەتباری كرد، كە ئەوە ئەوە ئەبوزەڕ هان دەدات بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی)). لە كۆتاییدا عوسمان ئارامی لەبەر بڕا، ئەبوزەڕی لە مەملەكەت دوورخستەوە بۆ 'ڕەبزە'، فەرمانیشتی دەركرد كە كەس ماڵاوایی لێ نەكات. وەك دەردەكەوێت، عەلی گوێی لەم قسەیە نەبووبێت، یان لەوانەیشە گوێی لێبووبێت و پشتگوێی خستبێت، بۆیە خۆی و دوو

کـوڕەکەی (حەسـەن و حوسـەین)، عەقیلـی بـرای و بـرازاکەی، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر خواحافیزییان لێ کرد، بە هـاوڕێیەتی یەک کەسی دیکەیش، ئەویش هەر وەک ئەبوزەڕ نـامۆ بـوو، ئەوکەسـەیش عەممـار بـوو، عەممـاری کوڕی یاسر[159]. دەڵێن: عوسـمان لە عەممـار زیز بووبوو، لەبەر ئەوەی چووبوو بۆ ماڵاوایی ئەبوزەڕ، بۆیە عەلیش هاتبوو لۆمەی عوسمانی کرد لەسەر کارەکەی، عوسمان ئەویشی بە دوورخسـتنەوە ترسـاند. لەم کـاتەدا کۆمەڵێک لە هـاوەڵان هـاتن و بە عوسـمانیان گـوت: "تـۆ کە لە کەسـێک زوویـر دەبیـت، دووری دەخەیتەوە، بەڵام بارودۆخ ئاوا ناڕواتە سەر"، ئیدی عوسمان دەستی هەڵگرت لە دوورخستنەوەی عەلی و عەممار[160].

ئەم بـابەتەی ئەبـوزەڕ، وەک ئەو دەنکەشـقارتەیە بـوو، کە ئـاگرەکەی هەڵگیرسـاند، ئەو ئـاگرەی عـومەر دەترسـا لە سـەردەمی ئەو هەڵبگیرسـێت، بـۆیە هەرچەنـدی پـێ دەکـرا، موراعـات و مـودارای بـارودۆخەکەی دەکـرد. عـومەر هەواڵـی هەڵگیرسـانی ئـاگرێکی نزیـک مەودای دابـوو، خـۆ ئەگەر عـومەر بمـایە تـا ئەو کـاتە، ئەوا ڕەنـگە شـتانێکی زۆرمـان لێ ببینیـایە بـۆ کپکـردنەوە و سـاردکردنەوەی ئەو ئاگری فیتنەیە، یان دڵڕاگرتنـی خەڵکەکە بە پێی توانـا بە شـێوەیەکی ئاشتیانە. لەوانەی عوسمان هێندە حەکیم و دانا نەبووبێت تـوانیبێتی شـتێک لەم بـابەتە ئەنجـام بـدات، عوسـمان کەسـێکی نەرمونیـان و بە بەزەیـی بـوو، زۆر لای کەسـوکارەکەی خـۆی خۆشەویسـت بـوو. ئەم تایبەتمەنـدییانە بـۆ پیاوێـک لەنـاو مـاڵ و منـداڵی خۆیـدا شـتێکی زۆر باشـە، بەڵام بـۆ پیاوێـک کە چـارۆکەی کەشـتی بەدەسـتەوە بێـت، لە دەریای پڕ مەوج و شەپۆلدا، ناگونجێت.

---

[159]- عبدالحمید السحار، أهل. البیت، ص٦٨

[160]- تەها حوسەین، المصدر السابق، ج١، ص١٦٥.

وەک ئەوەی دکتۆر تەها حوسەین ئاماژەی پێ دەکات، لە سەردەمی عوسماندا، کۆمەڵێک خاوەن موڵکی زەلام زەلام و زەخم بەدیار کەوتن، بە بۆنەی ئەمەیشەوە ڕەشە خەڵکێکی زۆر بێبەش کران. ئەمەیش کارێک بوو، تەژی لە ترسناکی، وەک ئەوەی بەرمیلە بارووتێک لە پەنا پشکۆیەکەوە دابنێیت، بە تایبەتی ئەگەر لەو نێوەندەیشدا واعیزێکی ئاوا جەربەزەی وەک ئەبوزەڕ بێت و بچێت، کە بانگەوازی یەکسانی و دادپەروەری بکات.

*** *** ***

مێژوونووسان ئۆباڵی ئەم فیتنەیە دەهاونە ئەستۆی "عەبدوڵلای کوڕی سەبەئ"، ئەو یەهوودییەی کە هاتە ناو ئیسلامەوە بۆ فێڵ و تەڵەکە. لە بارەی "عەبدوڵلای کوڕی سەبەئ"ـەوە دەڵێن: ئەو چاوی بەو گەشەسەندنەی ئیسلام هەڵنەدەهات، بۆیە بڕیاری دا بێت و لە بنی دەرهێنێت و بیتەپێنێت بە سەری خاوەنەکانیدا، ئەو لەعنەتلێکراوە لە کارەکەشیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، سەرکەوتنێکی بێوێنە. لە ڕاستیدا، خاوەن سامانە زەخمەکان، ئەوانەی لە دەورانی عوسماندا پێگەیشتبوون، هەستان بە لەئەستۆنانی هەموو ئەم لەبەریەکهەڵوەشانانەی کۆمەڵگە، باسکردنی سەروەت و سامانی ئەمان لەناو خەڵکیدا، سا بەڵکوو لەم ڕێگەیەوە ئەو هێرشانەی کە لەسەریانە دامرکێتەوە.

ئەو کارانەی کە دراونەتە پاڵ "عەبدوڵلای کوڕی سەبەئ"، هیچ کەسێک ناتوانێت ئەنجامیان بدات، مەگەر ئەو کەسە زۆر عەبقەری، یان ساحیر و خەوێنەری موگناتیسی بێت، ئەگینا کەس لە ئەستۆی

هەڵناگرێت. دەبێت ئەو خاوەن چاوێکی موگناتیسی بەردشکێن بێت، یان ئەوەندە هێزی دەروونی بڵند بێت، خەڵکی هەمووی لە بەرانبەری ببنە مەڕ و خێرا جێکەوتی قسەکانی لەسەریان دەرکەوێت بەبێ ئەوەی خۆیان بە خۆیان بزانن. لە ڕاستیدا ئەگەر کەسێکی لەم جۆرە لە سەردەمی عوسماندا دەربکەوتایە، ئەوا هەرچۆنێک با، شتێکمان لە بارەیەوە هەر دەست دەکەوت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوورمانە، ئێمە هیچ شتێکمان دەست ناکەوێت لەو کتێبە دایکانەی (سەرەکی) کە باسی سەردەمی عوسمان دەکەن. هیچ یەکێک لە مێژوونووسان باسی ئەم کابرایەیان نەکردووە، تەبەری نەبێت، ئەویش لە تەنها ڕیوایەتێکدا باسی کردووە، ڕیوایەتەکەی "سەیفی کوڕی عومەر". وابزانم مێژوونووسانی دواتر، هەموویان لەسەر بنەمای ئەم تاکە ڕیوایەتە ئەو شارە لە ڕیوایەتیان داهێناوە و درووست کردووە، بۆ مەبەست و مەرامە مەزهەبییەکان بەکاریان هێناوە. ئەوەی کە زیاتر بنیادەم تووشی واقوڕمان دەکات، کۆی مەزهەبە ئیسلامییەکان کۆکن لەسەر ئەم چیرۆکانەی "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئ" و، ئایدیا و بیرۆکەی گەورە گەورەی لەسەر بنیات دەنێن. من لە هیچ شوێنێکی مێژوودا، چیرۆکێکم نەبینیوە هێندەی ئەم چیرۆکە سەخیف و سووکە، دەماودەم و پشتاوپشت گێڕدرابێتەوە. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بێت، ئەم چیرۆکە لەگەڵ مەبەستی هەموو مەزهەبەکاندا یەک بگرێتەوە و لە هەموولایەکەوە خزمەتیان بکات بۆیە ئاوا ڕەواجدارە.

ڕەحمەتی خودا لەو بلیمەتەی ئەم چیرۆکەی داهێنا، بەڕاستی شتێکی داهێناوە لە تەپڵ و زووڕنا سوودی کەمتر نییە بۆ خەڵکی، هەموو چینەکان دڵخۆشیی خۆیانی پێ دەدەنەوە، چ دڵشاد و چ دڵتەنگ، چ فەقیر و چ زەنگین، هەموو لەبەری دەحەسێنەوە. شیعە باسی "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئ" بە خراپە دەکەن، تانە لە ڕەوشتی دەدەن،

لەولاشەوە دڵی پێ خۆش دەکەن، چونکە زیاد لە پێویست سەنا و وەسفی عەلی کردبوو، تەنانەت لە کۆتاییەکاندا بە خودای زانیبوو، لەوانەیە لەم ڕوانگەیەوە تۆمەتی ڕۆچوونی زۆر لە خۆشەویستی عەلی لەسەر خۆیان لابەرن. ئەوان دەڵێن، عەلی، هاوڕێکانی "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئ"ی سووتاند و خۆیشی شاربەدەری مەدائین کرد. ئیدی شیعە بەم بەردە دوو نیشانەیان شکاندووە، یەکێکیان پاکانەیان دەسکەوتووە تا ڕۆبچن لە خۆشویستنی ئیمامەکەیاندا، دووەمیشیان ئەوەیە کە خۆیانیان بێبەری کردووە لە "سەبەئییەکان" خوا بەر نەفرەتیان بخات.

هەرچی ئەهلی سوننەیشە، ئەمانیش سوودی باشیان لە چیرۆکەکانی "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئ" وەرگرتووە. ئەوان سەحابەکانیان هەموو خۆش دەوێت، هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەوەی بەر لە فەتح ئیمانی هێناوە و ئەوەی دوای فەتح، ئەوان مەروان و مەعاویەیشیان خۆش دەوێت، عەلی و ئەبوزەڕیان خۆش دەوێت. ئەوان هەر یەکێکیان خۆش دەوێت کە ئەگەر بۆ یەک ڕۆژیش بووبێتە هەمنشینی پێغەمبەری خودا. لە بڕوای ئەهلی سوننەدا هەموو ئەمانە هەڵبژێردراو و باشترینەکانن، رضی الله عنهم و رضوا عنه. لێرەدا تووشی گرفتێکی گەورە دەبنەوە، ئەویش: ئەم هاوەڵانە جەنگ و هەرا و جوێنیان بە یەکتر داوە، هەندێکیان هەندێکیانیان کافر کردووە، چۆن دەکرێت باشترین و هەڵبژێردراوترین ئاوەها بەرببنە یەک و بجەنگن؟ ئەهلی سوونە دەڵێن: هەموو هۆکاری ئەم جەنگ و هەرایە "عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئ" بووە، هەر ئەو بوو ئاگری شۆڕشی دژی عوسمان هەڵایرساند، هاوەڵانی دا بە تەنگەی یەکتریدا، بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، ئەو بوو ڕێکەوتنەکەی تێک دا، ئەو کاتەی خەریک بوو بە تەواوی ڕێک بکەون. هەر بۆیە دەبینین، "عەبدوڵڵای کوڕی

سەبەئێ تاوانی ئەو عالەمەی هەموو دراوە بە شاندا، بە خوا ئەگەر ئەم کەسایەتییە ڕاستەقینە بوایە، ئەوا گلەیی دەکرد لەو هەموو تاوانەی کە خراوەتە ئەستۆی و دەگریا، کە ئەم ئاگای لە هیچ نییە و ئاوا تۆمەتیان داوەتە پاڵی. بارودۆخەکە وەک ئەو پەندەی لێهاتووە کە دەڵێت: گۆزەی شکاو، هەموو بەردی تێ دەگرن.

*** *** ***

وەک ئاماژەمان پێ دا، هەموو ڕاچەنینێکی تازە، بەوە تۆمەتبار دەکرێت، کە دەستی زەندیقەکان و بێگانەی لە پشتەوەیە. خۆ ئەگەریش سەر بگرێت و دەسەڵاتی بکەوێتە دەست، ئەوا دەبێتە ئەسڵی دین و بەشێک لەو میراتە موقەدەسە. ئەگەر ئەو بزووتنەوە ئیشتراکییەی کە ئەبوزەڕ بانگەشەی بۆ دەکرد، سەر بکەوتایە، ئەوا ئەم پیاوە دەبووە کەسایەتییەکی زۆر زۆر بەناوبانگ و گرنگی مێژووی ئیسلام. مێژوونووسانیش وەک کەسایەتییەکی "بیرتیژ"ی دانا لە قەڵەمیان دەدا. بەڵام بزووتنەوەکەی فەشەلی هێنا، بۆیە لای زۆرێک بە "هەوەسباز"، بێئاگا" و "دەستی بێگانە" ناسێنرا.

ئەبوزەڕ بە دوورخراوەیی و بێکەسی وەفاتی کرد، یادی لە دڵی کەسدا نەمایەوە بێجگە لە عەلی و عەمار و چەند دانەیەکی تر. خۆ ئەگەر بێتوو سەربکەوتایە، ئەوا ئەمڕۆ لەوانەیە بەغدادیان بە ناوی "شاری ئەبوزەڕ"ـەوە لەجیاتی "شاری ڕەشید" بانگ کردایە. ئەمە سروشتی دنیایە، ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب باسی کردووە بە: ((ئەگەر دنیا ڕووی لە یەکێک کرد، ئەوا فەزیلەتی خەڵکی تریش دەدەن بە ئەم، خۆ ئەگەر بێتوو پشت لە یەکێکیش هەڵکات، ئەوا

جوانییەکانی خۆیشی پێ ڕەوا نابینێت.))[161]

داخی گرانم، خەڵکانێک دەبینین لە بیریار، فەیلەسووف و حەکیم، لەگەڵ دنیایدا دەڕۆن و هەمان حوکم دەدەن کە دنیا دەیدات لە بارەی خەڵکەوە. لەوانەیە سووتفە کەسێک بڵند بکاتەوە، ئیدی هەرچی جوانی و چاکە و فەزیلەتە دەدرێتە پاڵی، هۆکاری سەرکەوتنەکەیشی دەدەنە پاڵ زەینی ڕۆشن و عەقڵی بە کەماڵی. ئەگەر سەیری بارودۆخەکە بکەین، جاری وا هەیە کەسێک بەخت یاوەریتی و لە جەنگێکدا سەرکەوتوو دەبێت، یان دوژمنەکەی دەمرێت و ئەم بە سەریدا زاڵ دەبێت، ئیدی هەموو بەدڕەوشتییەکانی دەبنە چاکە و باشە و لە مەجلیسان باس هەر دەبێتە باسی ئەو. بە پێچەوانەیشەوە جاری وا هەیە، بنیادەمێکی ڕاساڵ و بلیمەت لە کارێکدا سەرکەوتوو نابێت، ئیدی خەڵکی زەڕەبین دەخەنە سەر عەیبەکانی و ئۆباڵی فەشەلەکەیشی دەخەنە نیەتخراپی و بیرکۆڵی خۆیەوە. پێیشی دەڵێن: بەکرێگیراوێکی بێگانەکان بووە و ئێستا ئیشیان پێی نەماوە. بۆ نموونە خوێنەر تەماشای جووڵانەوەی عەباسییەکان بکات، فارس هەستان بە کارەکە دژی عەرەب، لە کارەکەیشدا سەرکەوتنێکی باشیان بەدەست هێنا، کەچی دوایی مێژوو دەڵێت: ئەم شۆڕشە گەورە بەنرخە، ئەنجام درا تا شکۆی ئاین بگەڕێتەوە جێگای خۆی و سوننەتی پەیامبەریش زیندوو بکرێتەوە. با ئێمە گریمانەی ئەوە بکەین کە ئەم شۆڕشەی فارس پێی هەستا، سەری نەگرتبا، هەر خۆیشی زۆری نەمابوو کە مەڕوانی گوێدرێژ سەرکەوێت بەسەر سوپای بەنی عەبباسدا و هەر لە جێدا یەکەم دەردوو، بزووتنەوەکەی لە ڕیشە هەڵکێشایە. ئەگەر ئەمە ڕوی بدایە، ئەو کاتە مێژوونووسان دەیانگوت: ئەمە بزووتنەوەیەکی مەجوسییانە بوو، دەیویست فرسەت

[161]- محمد عبده، نهج البلاغه، ج٣، ص ١٥٣.

لە ئیسلام بهێنێت. پاش ئەمەیش چەندەها بزووتنەوەی دیکەی فارس سەری هەڵدا و عەباسییەکانیان هەر لە جێدا هەموویان لەناو برد، ئەم بزووتنەوانەی دیکەیش مێژوو وەک زیندووکەرەوەی مەجوسییەت ناوی لێنان کە هاتبن بۆ تەلکێشانی پەلوپۆی ئیسلام.

*** *** ***

لە مێژووی هاوچەرخیشدا تۆمەتگەلێکی زۆر ئاراستەی هەموو ریفۆرمخواز و شۆڕشگێڕەکان دەکرێت. زۆر دوور نیە لێمانەوە ئەو ڕۆژەی کە عەرەب لە بەرانبەر خاقانی کوڕی خاقان -سوڵتانی مسوڵمان-ەوە بەرزەپێ هەستانەوە سەرپێ، داوای مافی خۆیانیان کرد، ئیدی عەرەب تۆمەتبار کرا بەوەی کە بانگەشە بۆ زەندەقە و "غەربزەدەیی" دەکات و دەیانەوێت لەژێر سایەی خەلیفەی خودا لەسەر زەوی بێنە دەرەوە. ئەو دەمەیشی کۆربەندی عەرەبی لە ساڵی ١٩١٣ لە پاریس گرێ درا، عوسمانییەکان گوتیان، ئەو کۆنگرەیە کۆنگرەی سیخوڕ و وەکیلەکانی ڕۆژئاوایە، ئیدی ئەم قسانە بوونە هۆی لەدایکبوونی ئەم بەیتانەی خودا لێی خۆشبێت، شاعیری عێراقی "الرصافی"، کە هیشتایش لەناو دەروونی کتێبەکاندا پارێزراوە[١٦٢].

إذ راح يستنجد الافرنج منتصفا

كأنه حمل يستنجد الذيبا

لو كان في غير باريس تألبهم

ما كنت أحسبهم قوما مناكيبا

---

[١٦٢]- دیوان الرصافی، قصیده ((ماهکذا)).

مەعرووف ڕەسافی، گلەیی ئاڕاستەی عەرەبە نەتەوەییەکانی ئەو سەردەمە دەکات کە لە فەرەنگەکانەوە ئیلهام وەردەگرن، ئەم تۆمەتەیش تۆمەتێکی باوی سەرزاران بوو لەو سەردەمەدا لە هەموو ناوچەکانی قەڵەمڕەویی عوسمانیدا.

لە کۆتاییشدا دەوڵەتەکەیان لەناوچوو، سوڵتانی مسوڵمانانیش بە ڕەحمەتی خودا چوو، هەموو سیخوڕەکانیش بوونە پاڵەوان، لەسەر کورسیی دەسەڵات داسەکنان. خۆ ئەگەر ئەم دەوڵەتە پڕشکۆیە سەرکەوتایە، ئەوا مەعرووف ڕەسافی دەبووە شاعیری ئیسلام و باجی ڕێز و شکۆمەندییان دەکردە مل و سەر سینەی، جاسووس و غەربزەدەکانیش بۆ گۆڕ و دۆزەخی هەتاهەتایی. ئێستایش کە سەرکەوتن دەستی ئەوانە کەوت کە داوای مافی خۆیانیان دەکرد، وا خەریکن مافی دەورووپشتەکان فەرهوود دەکەن. ئائەمەیە دەور و زەمانە، سەر کورسی دێنێتە خوارەوە و ئەوەیشی دوێنێ لەسەر زەوی دەخەوت، ئێستا لە تەلاری بڵند بڵندا دەیگوزەرێنێت.

شۆڕشگێڕەکان هەموو بوونە مافیا و شەقوەشێن، ئێستا ڕەشوڕووت دێن و داوای مافی خۆیان لەمان دەکەن.

عەبدوڵلای کوڕی سەبەئ لە هەموو سات و شوێنێکدا هەیە، هەموو شۆڕشێکی نوێ، لەوانەیە ئیبن سەبەئێکی لە پشتەوە بێت، ئەگەر شۆڕشەکە سەرکەوت، ناوی ئیبن سەبەئ نامێنێت، ئەگەریش فەشەلی هێنا، ئەوا هەموو نەهامەتییەکە خول خول دێتەوە سەر سەری ئیبن سەبەئ ئەم ئیبن سەبەئە داناسەکنێ، ئۆقرە ناگرێت، لە هەموو سەرە ڕێگایەکدا کەمینی داناوە، تا ئەو چرکەساتەی ستەم بوونی هەبێت، ئەگەری بوونی هەریەکەمان بە سەبەئی، ئەگەرێکی بەرزە، پەنام بە پەروەرێنم دەگرم لەم کارە.

# بەشی شەشەم

## قوڕەیش

لە بەشی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد، واعیزەکان لەوە ڕاهاتوون کە پیاوەکانی مێژوو بکەن بە دوو بەرەوە، بەرەی چاک و بەرەی خراپ، لەمەیشەوە هەرچی پۆخڵەواتە دەیدەن بە سەروگوێلاکی خراپەکاندا، گشت فەزیلەت و جوانی و جوامێرییە بۆ چاکەکان. بۆیە دەکەونە ملەجەڕێ، ئەگەر هاتوو خەبەرێکت بۆ هێنان، دژی ئەم ڕێسایە بێت کە دایان ڕشتووە، کەسی چاکەخوازی ناو مێژوو، تا ئەو ڕۆژەی فوو بە شاخە بزنەکەدا دەکرێت، لە چاکەخوازیی خۆی ناکەوێت. ئیدی خراپەکاریش لە سەر تا خواری کارەکانی، هەموو چەوتی و لاساری و دەبەنگییە.

ئەم پۆلێنکردنە دوانەییە (التصنیف الثنائی)، پۆلێنکردنێکی ناواقیعییە، چونکە لە بنەڕەتدا بنیادەم هاڕاوەیەکە لە چاکە و خراپە، هیچ کەسێک بێبەش نییە لە کاری چاک و کاری خراپ، جیاوازی نێوان کەسەکانیش لەم بابەتەدا ڕێژەییە، واتە جیاوازییەکە لە پلەدایە، نەک لە جۆردا. ئەو کەسەی لە هەموو عەیبێک دوورە، ئەوە فریشتەیە، نەک بنیادەم... هەر کەسێکیش هەندێک لە خەڵکی بکات بە فریشتە لێمان، ئەوە یان فێڵکەرە، یان فێڵلێکراو.

چاکە و خراپە، دوو دەستەواژەی ئیعتیبارین، هەر کەسە و لەژێر

چاویلکەی خۆیەوە تەماشایان دەکات و بەو پێوەرانەیش دەیان پێوێت کە ڕاهاتووە و گەورە بووە لەسەریان. تێبینی ئەوە بکە، هەموو کەس وا دەزانێت خۆی لەوانی دیکە نزیکترە لە حەق و ڕاستییەوە. مقۆمقۆی نێوان خەڵکی، لەسەر خێر و شەڕ نییە، وەک ئەوەی واعیزەکان گومانیان بۆی چووە، بەڵکوو هەردوو لا جەنگیانە لەسەر خێر، بەڵام بە دوو ئیعتیباری جیاواز، دوو دیدگای جیاواز بۆ خێر[١٦٣]. هەر لایەک، شتەکانی خۆی بە خێر دەزانێت و ئامادەیشە لە پێناویدا شەهید ببێت و خوێنی بڕژێت.

ئەوەی جێی دڵتەنگییە، مێژوونووسەکانیشمان، هەر وەک واعیزەکان، هاتوون و کۆمەڵگەیان پۆلێن کردووە بۆ ئەم دوو پۆلە. ئیدی کاتێک لێکۆڵینەوە بۆ پیاوانی مێژوو دەکەن، دێن و لایەک دەکەنە کەسی ماقووڵ و لایەکەی تریش بە شەڕەخۆرە. لێرەیشەوە هەموو تایبەتمەندییە جوانەکان دەبەخشنە باشەکان و سیفەتە ناشیرینەکانیش بە دیاری دەدەن بە نێوچەوانی خراپەکاندا. خۆ ئەگەر یەکێکیان هەواڵێکی نەگونجاو دەرحەق بە چاکەکارێک ببیستێت، خێرا سەرلەبەری هەواڵەکە بە درۆ دەخاتەوە، ئینکاری بوونی شتی لەو بابەتە دەکات. لێرەوە، ئاوەزی مێژوونووسان وەک بێژنگێکی لێ دێت، ئەوەی کە بە هەوای خۆیان بخوات، وەری دەگرن و ئەوەیشی بە کەیفی خۆیان نەبێت، تانە لە ڕاستێتییەکەی دەدەن.

ئەگەر بێیت و تەماشای مێژووی ئیسلامی بکەیت، دەبینیت، هەر تایەفەیەک مێژوویەکی تایبەتی خۆیی هەیە، جودا لە هی ئەوانی دیکە. هەر گرۆهە و کۆمەڵێک پێوەر و پێوەدانگی هەیە، کە لە باوەڕوا ئاینییەکەیەوە هەڵی هێنجاوە. ئیدی لێرەوە هەموو ڕووداوەکانی مێژوو، پیاوەکانی مێژوو، بەم پێوەرانەی خۆی دەپێوێت. ئەوەیشی

---

[١٦٣] - - Leys، Ethics and social policy، ٢٥٧ p .

لەگەڵ ئەم پێوەندانگانەدا یەک نەگرێتەوە، بێ سێ و دوو، دەدرێت بە دیواردا.

*** *** ***

لە بەشی ڕابردوودا ئەوەمان باس کرد کە، هاورێکانی پێغەمبەریش وەک هەموو کەسێکی دیکە، بنیادەم بوون، بیریان لای خۆیان و بەرژەوەندی خۆیان هەبووە، بەهـا کۆمەڵایەتییەکان و گـرێ دەروونییەکان، هەردووکیان جێکەوتیان لەسەر ڕەفتار و سلوکیان هەبووە. خۆ ئەوان فریشتە نەبوون تا دوور بن لە تاوان و هەڵە. بەڵام مێژوونووسان خوا عەفوویان بکات، کارێکیان کرد لە ژیاننامەکانیان، کە عەیب هەڵنەگرێت، هەر هەواڵێکیان لە بارەوە باس کردبن، هێندەیان بەمدیو و بەودیودا هێناوە، تا لە کۆتاییدا کردوویانە بە فەزیلەت و جوانی بۆیان. ئیدی نەیارەکانیشیان پشکی باشی ئەم شەخەڵ و پەخەڵەی مێژوویان بووە بە نسیب، ئەوەی کە تۆ لە ناشیرینی بێزراوی دەیبینیت، بووەتە قیسمەت و نسیبیان لای مێژوونووسان. ئەمانە لای ئەوان هەر مادە خامەکەیان شەڕە، بۆیە بە هیچ کلۆجێک خێری لێ وەدەست ناخرێت. بۆ نموونە: مێژوونووسان هەرچییەک عەیبە داویانەتە پاڵ ئەبوجەهل و وەک سرنجیش چۆن ئاو هەڵدەمژێت، ئاوا فەزیلەتەکانیان لێ هەڵگوشیوە، دانە دانەیان لێ تەلکێشاوە. کەچی لەولاوە دێن و ئەو دۆست و هاوەڵانەی کە لە دوایین ساتەکاندا شایەتوومانیان هێنا، لە هەرچی ناپەسەندییە دووریان دەخەنەوە، بەرگی جوانی و پاکییان دەکەن بە باڵادا.

جیاوازی نێوان ئەبوجەهل، بێجگە ئەبوجەهل لە عاقڵەکانی قوڕەیش،

لە ڕووی کەسایەتییەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆ نەبوو، زۆربەیان هەر خەریکی چەوساندنەوەی بێدەرەتانەکان و خۆفەرزکردن بوون. ئەوان لە یەک تۆپە قوماش بوون، ڕاستە لە هەندێک شتا جیاوازییان هەبوو، بەڵام جیاوازییەکە لە پلەدا بوو، نەک لە جۆردا. بەخت یاوەری ئەبوجەهل نەبوو، ئەو زوو لە جەنگی بەدردا و لە ڕیزی موشریکەکاندا کوژرا، بەمەیش نەفرینی ئەبەدی بۆ خۆی دەستەبەر کرد. خۆ ئەگەر سوتفە یارمەتیدەری بوایە و لەو جەنگە بە سەلامەت دەرچوایە و لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا ئیمانی بهێنایە، ئەوا دەبووە کیباری هاوەڵان و هەڵگری ئاڵای شەکاوەی ئیسلام و دینی خودای سەر دەخست. ئەم بابەتە پەیوەندی بە سوتفەوە هەیە، ئاگات لێیە سوتفە چی گەمەیەک دەکات بە داهاتووی بنیادەم؟ ئەمەیش شتێکە هەموو ڕۆژێک دەیبینین و لەبەر چاوماندایە.

بەڵام مێژوونووسان بە شێوەیەکی میسالی -ئایدیالی- تەماشای شتەکە دەکەن، هیچ درێژکراوەیەکی لە واقیعەوە پێ ناگات، واقیع پشتگیری ئەم جۆرە بیرۆکانە ناکات. شتی وا نییە، پیاوێک موحەمەد (دخ) ببینێت و لەسەر دەستی شایەتوومان بێنێت، ئیدی سروشتی لە خراپەوە، بە یەک چرکە ببێتە نوورێکی ڕووت، پاش ئەوەی پێشتر تاریکییەکی مەحز بووە. ئێ ئەمەیش شتێکە ئێمە باش دەزانین لەگەڵ واقیع و حەقیقەت و سروشتی مرۆییدا نایەتەوە. مرۆ بە تەنیا بە چوونە ناو ئاینێکەوە، یان ناونووسین لە بارەگای حیزبێک گۆڕانی بەسەردا نایەت، عەقیدەیش زۆر بە کەمیی نەبێت، نابێتە هۆی گۆڕانکاری لە ئاکاری بنیادەمدا. ئێمە ئێستا خەڵکانێک دەبینین، کە هەریەکەو ڕووە و ڕووگەیەک نوێژ دەکەن، بەڵام ڕەوشت و ئاکاریان هەر وەک خۆیانە.

مێژوونووسان وا دەزانن مرۆڤی کۆن، وەک مرۆڤی هاوچەرخ

نەبووە، ئەمەیش هەڵەیەكی زەقە، مرۆڤ هەر مرۆڤە، كۆن و نوێی بۆ نییە، ئەو ڕەوشتەی كە لە خەڵكی ئیمرۆیدا دەیبینین، دەكرێ هەر لە كۆنیشدا هەبووبێت. زۆرێک لەو پیاوانەی كە شانبەشانی ئەبوجەهل، لە ئیسلامیان دەدا، ڕێگرییان لێ دەكرد و شوێنكەوتووەكانیان دارکاریی و فەلاقە دەكرد، لە كۆتاییەكاندا هاتنە ناو ئیسلام و بوونە باشترینەكان، خودایش دەرگای ڕەحمەتی خۆیی بۆ ئاوەڵا كردن و لە جەنگەكاندا شوێنی خۆیان گرت و جەنگسان، لە دیدگای مێژوونووسانەوە بونە كەڵەپیاوانی مێژوو، شاپیاوانی ئیسلام، مەشخەڵانی ڕێگەی هیدایەت و نوور. خۆ ئەگەر تیرێكی وێڵ بهاتایە و یەكێكیانی كوناودەر بكردایە و لە مەیدانی شەڕدا دژی موحەمەد (دخ) بكوژرایە، ئێستا لە ڕیزی نەفرینلێكراوان بوو، شوێنی جەحەندەمی پڕ لە ئاگری بەبڵێسە بوو.

یەكێک لە هەڵە زەقەكان كە دامەنی مێژوونووسانی گرتووە، ئەوەیە: ئەمان وا دەزانن مسوڵمانە هەوەڵینەكان لە یەک چركەدا (لەپڕدا)، لە خراپییەوە گۆڕان بۆ چاكە، ئەوان خۆیانیان لە مەڕ سروشتی بنیادەمەوە لە گێلی داوە. ئەمە هەرگیز ڕاست نییە، مرۆ تەنها بە گوتنی شایەتوومان ببێتە فریشتە، لە كاتێكدا پێشتر كەسایەتییەكی خراپی هەبووبێت. ئەی ئەو هەموو گرێ دەروونی و بەهاكۆمەلایەتییانە چۆن ئاوا لە یەک چركەدا سفر دەبنەوە و شتی جوان و زوڵاڵ جێگەیان دەگرێتەوە؟ پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: ((الناس معادن، خیارهم فی الجاهلیه، خیارهم فی الاسلام [١٦٤]-مرۆ وەک

[١٦٤]- بڕوانە ابن خلدون، المقدمە، ص ٣٤. ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی موسلیمدا هەیە بە ژمارە ٢٦٣٨، بە كەمێك زیادەوە، ((الناس معادن كمعادن الفضە والذهب .خیارهم فی الجاهلیە خیارهم فی الإسلام إذا فقهوا. والارواح جنود مجندە. فما تعارف منها ائتلف. وما تناكر منها اختلف))

کانزایە، ئەوەی لە جاهیلییدا باش بووبێت، کە هاتە ناو ئیسلامیش هەر باش دەبێت-)). لەوانە پەیامبەر بەم قسەیەی مەبەستی ئەوەبێت کە، خراپەکاری ستەمکار، تەنها بە هاتنە ناو ئیسلام، نابێتە کەسێکی باشی چاکی بەسوود، ئەو هەر بە ستەمکاری دەمێنێتەوە، پاشان کارە زشتەکانی بە نوێژ و ڕۆژوو وتەسبیحات دادەپۆشێت.

*** *** ***

پرۆفیسۆر "غوین" لە توێژینەوەکەی لەمەڕ ئاینی مەسیحی دەڵێت: ((ئەو دەمەی کە ئیمپراتۆر "قوستەنتین" و شەقوەشێن و ئاغا و گەورەکان چوونە ناو ئاینی مەسیحییەوە، ئیدی خێری ئاینەکە بەخشرا، پێش ئەمان، ئاینەکە ئاینێکی شۆڕشگێڕانە بوو، بە شۆڕشەکانیشی داوای دلۆڤانی وچاکە و تەقوای دەکرد، بەڵام هەر هێندەی ئەم ئاینە کەوتە دەستی ئیمپراتۆر، دەوڵەت کەوتە پشتیوانیلێکردنی، ئیدی لەو دلۆڤانییەوە، بوویە سیستەمێکی خوێنڕێژیی و ستەم. کراسی خێر و تەقوا و ڕەحمەتی لەبەردا داماڵرا

دانتی، شاعیری بەناوبانگی ئیتالی، شیعرێکی لە بارەی ئەو بارودۆخەوە نووسیوە: بە هاتنە ناو مەسیحییەتی تۆ، شەڕ و خراپەی زۆر پەیدا بوو، بەڵێ بە بۆنەی تۆوە، مەسیحییە هەوەڵینەکان، هەموو بوونە موترەف و خۆشڕابوێر.

دەتوانین بڵێین ئەم قسەیەی "غوین" لەمەڕ مەسیحییەتەوە کردوویەتی، بۆ ئاینەکەی پێغەمبەر موحەمەدیش (دخ) ڕاستە. بە داخڵبوونی قورەیش، ئەو هۆزە سووخۆرە لادەرە، ئیسلامیان بەرەو فەساد و

خراپە و لادان برد. ئیسلام لە سەرەتاوە، شۆڕشێکی هەرە مەزن بوو لە دژی ستەمکارەکانی ناو قورەیش، هەروەک چۆن مەسیحییەت شۆڕش بوو دژی ستەمکاریی قەیسەرەکان. هاتنە ناو ئیسلامی قورەیش، لە لایەکەوە باش بوو، لە لایەکیشەوە خراپ. لە لایەکەوە کردیە دەوڵەتێک کە خەڵکی ملی بۆ کەچ بکات، بەڵام لەو لاشەوە بوویە سیستەمێکی ستەمکاریی و ڕزگارکردنی ناوچەکانی دیکە، کە هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ کیسرا و قەیسەردا.

*** *** ***

قورەیش هەتا هێزی تێدا بوو، لە دژی موحەمەد جەنگا، شوێنکەوتووەکانیشی بە سەختی سزا دەدا. مێژوونووسان دەڵێن: ئەوان لە دژی موحەمەد جەنگان، لەبەر خاتری خوداکانیان، بەڵام لە واقیعدا ئەوان لەبەر بەرژەوەندی خۆیان جەنگان، لەبەر پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و کەرامەتی هۆزەکەیان جەنگان. ئەوان وایانزانی ئەم ئاینە تازەیە، دەست بەسەر کەعبە و بازار و بازرگانییەکانیاندا دەگرێت.

قورەیش تاکە هۆزی ناو عەرەب بوو، کە خەریکی بازرگانی بوو، هەر خۆی ڕێوڕەسمی حەجی بەڕێوە دەبرد، سەرپەرشتی بازاڕە ئەدەبی و بازرگانییەکانی دەکرد کە لە وەرزی حەجدا ساز دەکران. بەمەیش سامانێکی فراوان و پلەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزی بەدەست هێنابوو. زەمەخشەریی دەڵێت: ((قورەیش دوو کاروانی دەر دەکرد، لە زستاندا کاروانێکیان بەرەو یەمەن، هاوینانیش دەچوونە شام، بە دڵی خۆیان دەیان خوارد و پارەیشیان پەیدا دەکرد، لە گەشتەکانیاندا یەک خەم

چییە نەیانبوو، لەبەر ئەوەی خەڵکی حەرەم بوون -مەککە-، خزمەتکارانی بەیت بوون. هیچ تەنگەژە و ڕێگرییەکیان لێ نەدەکرا، ئەمە لە کاتێکدابوو، خەڵکانی دیکە ڕووت دەکرانەوە و هێرشیان دەکرایە سەر)). مانای ئەمەیش ئەوەیە کە ڕێوڕەسمی حەج، سەرچاوەیەکی ئابووریی باشی قورەیش بووە، کە بووبوویە سەنەدێک بۆ بەردەوامی بازرگانی لەگەڵ هۆزەکانی دیکە، ئەمە بێجگە لە پێگەی بەرزی کۆمەڵایەتیش بۆیان.

ئیدی لە ناکاو پێغەمبەرێک هات و ئەم خودا بەردینانەی قورەیشی بە بێدەسەڵات لەقەڵەم دا، بۆ نوێژەکانیشی، ڕووی لە "بەیتولموقەدیس" کرد. بۆیە قورەیش هەستیان بە قەلەقیی پێگە و ڕێگەی خۆیان کرد، ئەگەر تا زووە ئەم نەمامە لە بن هەڵنەکێشن. بۆیە بەربوونە نێزەی بانگەشەکارەکەی و شوێنکەوتووەکانی لەم پێناوەدا. بەڵام لە کۆتایدا موحەمەد توانی قورەیش بهێنێتە ناو دینەکەی خۆیەوە، لەم کارەیشدا سێ فاکتەر هاوکاری بوون:

1 - پێغەمبەر "ڕووگە"ی لە "بیت المقدس"ەوە، گواستەوە بۆ کەعبە. دواتریش شوێنکەوتووەکانی هەڵنا، ڕوو لەوێ بکەن، بەو ناونیشانەی ئەوێ ماڵی خودایە. ئامانجی موحەمەد لەم کارەیدا بە تەنها، بریتی بوو لە تەواوکردنی بتەکانی ناو کەعبە، خودی کەعبەیش لە لای هەر بە پیرۆزیی مایەوە.

2 - موحەمەد (دخ) ڕێگەی دانا کە شوێنکەوتەکانی بە شمشێر بەرگری لە ئاینەکەیان بکەن، بەم شەریعەتە نوێیەیش توانی، بە تەواویی قورەیش دەستەپاچە و لە پەلوپۆ بخات. لێرەیشەوە کە هۆزەکانی دیکەیش ئەمەیان بینی، هەموو پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینەکەوە.

3 - موحەمەد (دخ) دڵی هەموو سەرگەورەکانی قورەیشی ڕاگیر کرد و نزیکی خۆیی کردنەوە و ناوی لێنان (مولفە القلوب)، پاشان پلەوپایەی پێ دان و لە دەستکەوتی جەنگیش، بە باشی بەشی دەدان.

هەر ئەو ڕۆژەی کە فەتحی مەککەیان کرد، شەوەکەی پێغەمبەر ڕۆیشت و هەموو بتەکانی مەککەی شکاند، ئیدی کە بەیانی قورەیش لە خەو ڕابوون، دینییان وا هەموو بتەکان لەگەڵ خاک و خۆڵدا تێکەڵ بوون، هیچ خەمێکیان نەخوارد و خێرا چوونە ناو ئاینی نوێوە.

بەڕاستی سەیرە، قەومێک بیست و شتێک ساڵ، خەریکن لەبەر خوداکانیان دەجەنگن، دواتر لە ناکاو دەیانبینن وا تەختی زەمین بوون، کەچی هەر نایەت بە بای خەیاڵیاندا، وەک بڵێیت هەر هیچ ڕووی نەدابێت و مەراقیشی بۆ ناخۆن. ئەمە دیاردەیەکی سەیرە، ئاماژەی ئەوەمان دەداتێ کە، قورەیش هیچ دڵسۆزی خوداکانی نەبووە، بەڵکوو چەند قات لە بیری بەرژەوەندی و کەرامەتی خۆیدایە. کاتێک کە بینی بەرژەوەندی پارێزراوە و کەرامەتیشی بڵندە لەم ئاینە نوێیەیشدا، یەکسەر وازی لە خودا کۆنەکان هێنا و هاتە نێو ڕیزە نوێیەکانەوە.

*** *** ***

بەڵام لە بێشانس و ئیقباڵی ئەم ئاینە نوێیە ئەوە بوو، دامەزرێنەرەکەی، لە سەرەتای سەرکەوتنەکەیەوە کۆچی دوایی کرد، ئیدی ئەو قسەیە ڕاست دەردەچوو کە دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەر زیندووبا، ئەوا قورەیش ئەو ڕێگەیەی نەدەگرت کە پاش مردنی پێغەمبەر گرتی. دردۆنگی لەوەدا نییە، کە پێغەمبەر دڵی

قورەیشییەکانی بە سەروەت قایل کرد، بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە نازانین، ئەی دواتر بە چی ڕاگیری دەکردن؟ کەسایەتی موحەمەد (دخ) زۆر دووربین و چاوتیژ بوو بە شێوەیەکی زۆر تایبەت. لەوانەیە لە سەرەتاوە بە سەروەت و لە بنەتایشدا بە تەعالیم و بەها ئاینییەکان ڕام و کەویی کردبان.

مردنی پێغەمبەر لەو سەرەتایەوە، زیانێکی قەرەبوو نەکراوە بوو، بۆ ئیسلام. لەو بڕوایەدام هیچ کەسێک ناتوانێت بە تەواوەتی زیانەکان بخەمڵێنێت. مسوڵمانەکان گریان بۆ موحەممەد، گریانێکی زۆر زۆر، بەڵام سەرقاڵی بە بابەتی جێنشین و خەلیفایەتییەوە، تا ڕادەیەک کۆستەکەی لە بیر بردنەوە.

*** *** ***

هاوڕێی هەرە نزیکی پێغەمبەر بووە جێنشین، ئەبوبەکر، ئەم پیاوە لە قورەیش بوو، بەڵام لە ڕووی کیبر و فیز و هەوەسەوە، لەوان نەدەچوو. پیاوێکی نەرمونیان بوو. یەک جاریش لە تەمەنیدا، چ پێش یان پاشی ئیسلام، خۆی بەسەر کەسدا هەڵنەکێشابوو. لە نموونەی ئەم لەناو قورەیشدا دەگمەن بوو، ئەو یەکەم کەس بوو لەناو مەزنەکانی قورەیشدا، کە ئیمانی هێنا[١٦٥]. من وا گومان دەبەم، ئەبوبەکر بڕێک لە ڕق و قین لە دەروونیدا هەبووە بەرانبەر بە قورەیش، هەر بۆیە مەزاجی لەگەڵ مەزاجیاندا پێک نەدەهاتەوە. ئەوان "خۆبەگەورەزان"، ڕێز و بەزەییان بەرانبەر کەسانی خواری خۆیان نەبوو، بەڵام ئەم، هەیبوو. کچەکەی خۆی، خاتوو عائیشە کە باسی

[١٦٥]- عباس العقاد، عبقريه الاسلام، ص٤٣.

دەکات دەڵێت: "چاو بە فرمێسک، دڵ بە غەم و هەمیشە ئەسەفی بۆ خەڵکی دەخوارد."

لە کاتی غەزووی شامدا، عەمری کوڕی عاس، سەری سوپاسالاری لەشکری دوژمنی بۆ ناردبوو. ئەبوبەکر زۆر بە خراپی نەریی ئەو کارەی کرد. کە بینیان وا سەخت گرتوویەتی، وتیان ئاخر ئەوانیش وایان لە سەربازەکانی ئێمە کردووە. ئەبوبەکر گوتی: "جارێکی دیکە، کەس سەرم بۆ نەهێنێت". خۆ ئەگەر بەراوردی ئەم کارە و ئەوەی دواتر قورەیشییەکان کردیان لە سەرلێکردنەوە و ژن بردن و دەستدرێژی کردنە سەریان، ئەوا جیاوازییەکی زۆر زۆر دەبینین. هەر ئەو دەمەی ئەبوبەکر خەلافەتی گرتە دەست، خالیدی کوڕی وەلید و ئەبوسووفیان خۆیان تووڕە کرد، ئێ گومانیش لەوەدا نییە کە ئەمانە سەرکردەی قورەیش بوون. خالید هات بۆ لای عەلی و گوتی: "ئەی ئەبو حەسەن، هەی کوڕی عەبدولمەناف، ئایا دۆڕان؟" عەلیش وەڵامی دایەوە: "ئایا ئەمە زۆرانبازییە یان جێنشینی؟"

ئەبوسووفیانیش خۆی تووڕە کرد و وای هەژمار دەکرد، کە ئەمە نەکسەیە بەسەر قورەیشدا هاتووە، چونکە قورەیش وەک بنەماڵەیەکی چەوساوە تەماشای ماڵی ئەبوبەکریان دەکرد. هەر ئەبوسووفیان، هات بۆ لای عەلی و عەباس و گوتی: "ئەی عەلی... ئەی عەباس... چۆن دەبێت لە کاتێکدا ئەمان لەناو قورەیشدا خانەدان نین و لە نزمترینی قورەیشن! سوێند بە خودا، ئەگەر بمەوێت، خەڵکی لێ پڕ دەکەم -لە ئەبوبەکر- و پیاو و سوارچاکان دەنێرمە سەری و هەمووی لێ دەسەنمەوە. عەلیش وەڵامێکی نزیکی لە وەڵامەکەی خالیدی دایەوە[١٦٦]. لەوانەیە ئەبوسووفیان هەر لە ناخی دڵیەوە دەغەز لە دڵ بوو بێت بەرانبەر بە ئیسلام، بۆ ئەبوسووفیان ئاسان نەبوو ئەو

[١٦٦]- عباس العقاد، ابو الشهداء، ص٢٥-٢٦ .

هەموو دژایەتییەی کە کردبووی لەگەڵ "موحەمەد"دا، لە بیر بکات، دووریش بۆی مەڕۆ، ئەگەر لە ناواخنی ناو دەروونیدا، گرێی دژە ئیسلام و مسوڵمانان خڕ نەبووبێتەوە، گرێیەکیش کە ماوەیەک بووبێت دروست بووبێت، ئەوا لە ماوەیەکی کورتدا لاناچێت.

عەباس عەقاد لە بارەی ئەبوسووفیانەوە دەڵێت: ((تا ماوەیەکیش دوای مسوڵمان بوونی، ئەو هەر وای دەزانی سەرکەوتنی ئیسلام، سەرکەوتن بووە بەسەر ئەمدا و ئەوە ئەمە ڕووخاوە و شکستی هێناوە)). ئەم قسەیەیش کەم لە ڕاستییەوە نزیک نییە، ئەگەر پیاوێک بیست و چەند ساڵ، لە دژی بزووتنەوەیەک بجەنگێت، جەنگانێک کە بە خوێن کۆتایی هاتبێت، چۆن ئەستەم نییە بیری بچێتەوە، لە حاڵێکدا مەجبوور بووە بێتە ناو ئاینەکەیشەوە. ئەبوسووفیان سوپای ئیسلامی بینی کاتێک هاتنە ناو مەککەوە، هات و بە هاوڕێکەیی گوت -عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب-: "ئەی ئەبول فەزل... بەڕاستی برازاکەت ئەمرۆ بەدەستەڵاتە"، وەک بڵێیت موحەمەد دەسەڵاتی ویستبێت و ئەمڕۆ دەستی کەوتبێت.

ئەو "بەها" لاشعوورییانەی کە بە تێپەڕبوونی کات، لای بنیادەم پەیدا دەبن، بە خێرایی و لە شەو و ڕۆژێکدا ناپوکێنەوە. لەوانەیە هاوڕێیەتی بەشەر بکەن تا ناو گۆڕ. ئەبوسووفیان وای دەزانی محەمەد پێشبڕکێ و مونافەسەی ئەو دەکات لە بوونە سەرداری عەرەبان، بۆیە کە بینی موحەمەد ئاوا بەدەستەڵاتە، ئیدی خۆیی بە دۆڕاو هاتە بەرچاو. ڕۆژێکیان ئەبوسووفیان چاوی بڕیبووە پێغەمبەر، چاو بڕینێکی سەیر، لە کاتێکدا لە خۆیی دەپرسیی، خۆزگە بمزانیایە ئەم پیاوە بە چ شتێک بەسەر مندا سەرکەوت؟ ئەم جۆرە تەماشاکردنە لای پێغەمبەر ئاڵۆز نەبوو، هات بەرەو لای ئەبوسووفیان و دەستی کێشا بە ناوشانیدا و وتی: "بە خوا، لێم

بردیتەوە ئەبوسووفیان."

دەڵێن: ئەبوسووفیان، لە قووڵایی ناو دەروونییەوە حەزی دەکرد، مسوڵمانان لە جەنگی حونەیندا تێک بشکێن، ئەو جەنگەی یەکسەر دوای فەتحی مەککە ئەنجامیان دا. دەڵێن لە سەرەوەتاوە کە مسوڵمانان خەریک بوو تێک دەشکان، بە دڵخۆشییەوە هاواری کردووە:"ما أراهم يقفون دون البحر"، وەک بڵێیت حەزی کردووە دوای تێکشکانیان، هەڵیش بدرێنە ناو ئاوەوە. کاتێک جەنگی یەرموک قەوما، ئەبوسووفیان هوتافی بۆ سوپای ڕۆم دەکێشا، حەزی دەکرد بەسەر سوپای موحەمەد"دا سەرکەون (وەرگێڕ: لە ڕاستیدا ئەم قسانە دەڵێی قسەی بەرئاگردانن، ئەم پیاوە ئەگەر دەغەز لە دڵیش بووبێت، هێندە مناڵ نەبووە، ئاوا بە ئاشکرا دڵی خۆی بکاتەوە.)

ئێمە ئەم شتە بە دوور نازانین، بەتایبەت کاتێک لێمان ئاشکرا بوو، کە ئەبوسووفیان هەڵگری بەها خێڵەکییەکانە، هێندەی بەتەنگ شۆڕەتی خۆی و بنەماڵەوەیە، هێندە بەتەنگی ئاین و سەرکەوتنی بیروبڕواوە نییە. ئیدی هەر کەسێک شارەزایی لە بارەی دابونەریتی هۆزە عەرەبییەکانەوە هەبێت، نموونەی زۆر لەم جۆرانە دەبینێت. تاکێکی خێڵەکی، دە "پێغەمبەر" و "وەلی"ت بۆ سەر دەبڕێت، بەس بەو مەرجەی سووکایەتی بە خێزان و بنەماڵەکەی نەکرێت. ئەو لە عەقڵی ڕووکەشیدا مسوڵمانە و لە عەقڵی باتینیدا خێڵەکی.

*** *** ***

ئەبوبەکر وەسیەتی کرد، پاش خۆی عومەر بکەنە خەلیفە. عومەریش لە ئەبوبەکر زیاتر بێزی لە قورەیش دەهاتەوە. ئەوایش ڕقیان لە خۆی

و لە خەلافەتەکەیشی بوو. ئەم شتە بە ڕوونی دیارە لە قسەکانی ئەبوبەکر کە بۆ عەبدورەحمانی کوڕی عەوفی کرد -یەکێک بوو لە سەروەتمەندە بەناوبانگەکانی قورەیش-. ئەبوبەکر لە نەخۆشییەکەیدا، کە هەر بە بۆنەی ئەوەیشەوە کۆچی دوایی کرد، گوتی: ((ئەوەی لە ئێوە دەیبینم ئەمرۆ، ئێشی لە ئێشی نەخۆشییەکەم زیاترە، من کاروباری ئێوەم گرتە ئەستۆ و ئازادیشم کردن دەرحەق بە خۆم، هەریەکەتان دەیەوێت شتەکە بەلای خۆیدا داتاشێت، وا خەریکن لە خۆشیی دنیا دەخۆن و دونیا ڕووی لێ ناون، کە حەریر و دیباجتان دەستکەوتووە، هێندە خۆشی ڕادەبوێرن، کاتێک یەکێکتان لەسەر خوریی ئازرەبی ڕادەکشێت، هێندە بەلایەوە ڕەق و زبرە، وەک ئەوەی لەسەر پەلکی دارخورما ڕاکشابێت. سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، سەری خۆتان لە لاشەتان بکەنەوە، زۆر باشترە لەوەی لە خۆشییەکانی دنیادا نغرۆ ببن. پاشان وریای ئەو خەڵکەبن و ڕێگایان لێ مەشێوێنن.))[١٦٧]

هەر لە "بنەڕۆژ"ەوە قورەیش دڵیان بە کارەکەوە نەبوو، چونکە دوو پیاو کاروباریان وەئەستۆ گرتبوو، هیچیان لە بنەماڵە بەناوبانگەکانی قورەیش نەبوون، ئەبوبەکر لە "بەنی تەیم" بوو، عومەریش لە "بەنی عەدی" ، هیچکام لەم دوو بنەماڵەیەیش سەردار و خانەدان نەناسێنرابون لەناو قورەیشدا لە دەورانی جاهیلیدا.

عومەر هەر لە سەرەتای دەستبەکاربوونیەوە، نووسراوی دەرکرد، خالیدی لەسەر کار لابرد لە سوپاسالاری سوپای موسوڵمانان. مێژوونووسان زۆر ڕۆچوون لە شیکردنەوەی هۆکاری لە کارلادانی خالید، کە لە ڕواڵەتدا هۆکارێکی ئاشکرای نەبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی سوپای مسوڵمانان پێویستیان بە سەرکردەیەکی کارزانی وەک

---

[١٦٧]- عباس العقاد، عبقرية الصديق، ص ١٩١ – ١٩٢.

خالید هەبوو، کە سەریان بخات بەسەر سوپای ڕۆمدا. گەورەترین گومانم کە ئەوەیە: عومەر حەزی نەکردووە یەکێک لە ئەشرافی قورەیش ئەم کارە گەورەیەی لە ئەستۆدا بێت، لەوانەیشە ترسابێت خەڵک بدەن بە قەڵداوێکدا ئەم قورەیشییانە.

عومەر سەرانی قورەیشی بەوە تۆمەتبار دەکرد، کە لە جیهاددا زۆر خۆیان ماندوو ناکەن، نایەنە ڕیزەکانی پێشەوە تا لە ڕێگەیدا گیان ببەخشن. دەڵێن لە یەکێک لە جەنگەکانی شامدا، خالید بینی وا عەکریمەی کوڕی ئەبوجەهل لەگەڵ یەکێکدا شەڕێتی و خراوەتە ژێر، هات و سەری خستە سەر ڕانی و گوتی: "لە داخی ئیبن حەنتەمە، ئێمە هەر شەهید نابین". مەبەستی خالید لە ئیبن حەنتەمە سووکایەتی بوو بە عومەر. تەبەری دەگێڕێتەوە: "قورەیش هەراسان بووبوون بە دەست عومەرەوە، ئەو لە مەدینە ئابلۆوقەی دابوون، نەیدەهێشت گەشت بکەن بۆ شارەکان، ئەو زۆر بە ڕاشکاویی گوتبووی: قورەیش دەیانەوێت هەموو نیعمەتەمانی خودا بەتەنیا و بەبێ بەندەکانی خودا بخۆن، سوێند بەخوا تا من زیندووبم، ناهێڵم. لە سەرەڕێگای (حرە) ڕادەوەستم و دەست دەخەمە گەرووی‌انەوە، تا بەرەو ئاگر نەڕۆن)). عومەر ناسرابوو بە خۆشەویستی بۆ ئەعراب (دەشتەکییەکان)، ئەو لە سەرەمەرگدا وەسیەتی کرد چاک بن لەگەڵیاندا، چونکە ئەوان "ماددەی خامی ئیسلامن". ئەمەیش ئەو مانایە دەگەیەنێت، ئەم ڕێک بە پێچەوانەی قورەیشەوە تەماشایان دەکات، لەو سەردەمەدا قورەیش خۆیان لە ئەعراب بە بەرزتر تەماشا دەکرد، ئەوان خۆیانیان بە دامەزرێنەر و بنیاتنەری ئیسلام لەقەڵەم دەدا، هەروەک دواتریش باسی دەکەین[١٦٨].

[١٦٨]- الطبری، تاریخ الرسل والملوك، ج٥، ص ٨٦.

لە سەردەمی عومەردا خەڵکی دوو چین بوون، چینێکی بڵند، کە پێک هاتبوون لە ئەشرافەکانی قورەیش، چینێکی نزمیش، کە پێک هاتبوو لە خێڵەکی و ڕەشە خەڵکی ئەو دەوروبەر و بیابانانە. هەرچی عەجەمە، لەو دەورانەدا ڕۆڵێکی وەهایان نەبوو، چونکە ژمارەیەکی وەهایان لێ مسوڵمان نەبووبوو. لە سەیروسەمەرەکان ئەوەبوو، عومەر هەستا بە دانانی "عەمماری کوڕی یاسر" بە والی "کوفە"، "سەلمانی فارسی"ش وەک والی "مەدائین"، لە کاتێکدا ئەم دوانە بەر لە هاتنی ئیسلام بەردە بوون. لەوانەیە ئێستا ئێمە ئەم هەواڵەمان بەلاوە گرنگ نەبێت کە دەیبیستین، بەڵام لەو ڕۆژگارەدا لە عەجیب و غەریبی مێژوو بوو، بەتایبەت لە دیدگای قورەیشەوە، بۆ قورەیش ئاسان نییە، عەبدێک لە عەبدەکانی ببینێت ئێستا بووەتە سالاری ناوچەیەکی بەرفراوان.

دەڵێن: ئەبوسووفیان و سوهەیلی کوڕی عەمر و سێ چوار دانەی تر، لە سەرگەورەکانی قورەیش، لە بەردەرگای عومەر وەستابوون، مۆڵەتی چوونەژوورەوەیان دەخواست، عومەر ڕێگەی نەدان و ڕێگە سوهەیب و بیلالی دا بچنە ژوورەوە، لە کاتێکدا ئەوان دوو کەسی ڕەشوڕووت بوون. دەڵێت: ئەبوسووفیان فووی تێ بووبوو لە داخا و گوتی: "لە ژیانمدا وەک ئەمڕۆم لێ نەهاتووە، تۆ سەیرکە، ڕێگە بەو کۆیلانە دەدات و ئێمەیشی ئاوا ماتڵ کردووە لە بەردەرگاکەی. شتێ کە جێگەی پێکەنینە، دەڵێن: عومەر دادگایی خالیدی کوڕی وەلیدی کرد، لەبەر ئەوەی بەرێوڕەسمی کۆنی قورەیش پاداشتی دابوو بە شاعیرەکان، کاتێک عومەر لێی پرسیبوو، ئەو پارەیە، پارەی خۆت بوو، یان هی مسوڵمانان؟ خالید بێدەنگ بوو بوو، ئیتر بیلال بە عەمامەکەی سەری دادەکەنێت و دەیبەستێتەوە و خالیدیش هیچ قسەیەک ناکات (وەرگێڕ: خەریکە کتێبەکەمان دەبێتە ئەلف لەیلەولەیلە، ئەوەی ڕاست و درۆیە، هەمووی تێدا دەبینینەوە). ئەم شتە ئێستا بۆ

ئێمە ئاسانە کە بیری لێ دەکەینەوە، پاش ئەوەی بیلال لە دیدگای ئێمەدا بووەتە پیاوێکی پیرۆز و مەزن، بەڵام لەو سەردەمەدا شتێک بووە، دڵی خستۆتە تەپەتەپ. لە کاتێکدا بەندەیەکی ڕەشی حەبەشی، هەستێ بە بەستنەوەی قارەمانێک و سەرکردەیەک لە سەرکردەکانی قورەیش بە عەمامەکەی و ئەویش متەقی لێوە نەیەتە دەرێ. عومەر تەنها بەمانە دەستی لە قورەیش هەڵنەگرت، کە عەبدە کۆنەکانی خۆیان زاڵ بکات بەسەریاندا، بەڵکوو شتێکی زۆر لەمە قورس تریشی ئەنجام دا، ئەو هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی پشکی "المولفە قلوبهم - دڵڕاگیرکراوەکان" لە دەستکەوتی جەنگ، کە قورەیش لەمەیان وەردەگرت، لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەی یەکەمیشدا. پشکی "دڵ ڕاگیرکراوەکان" لە قورئاندا باسکراوە و فەرزە و ناکرێت مرۆ خۆی لێ لە گێلی بدات. بەڵام عومەر گوێی بەمە نەدا. ئەو شتێکی لە قورئان نەسخ کردەوە تا سووکایەتی و زیان بە قورەیش بگەیەنێت. پاساوی عومەر بۆ کارەکەیشی دەیگوت: "پێغەمبەر ئەو ڕۆژانە بۆیە دەیدانێ، چونکە ئاینەکە لاواز بوو، پێویستی بە پشتیوان هەبوو، بەڵام ئەمڕۆ ئاین بەهێز و بتەوە، بۆیە پێویستمان بە دڵڕاگیرکردنی کەس نییە تا قایلیی بکەین و بیهێنینە ناو ئاین."

ئەوەی کە نامۆیە: ئەوەتا عومەر بە ڕۆژی ڕۆشنا ئایەتێکی قورئان نەسخ دەکاتەوە و هەر نایەت بە خەیاڵیشیدا، خۆ ئەگەر داماوێکی ئەم چەرخ و خولە ئەم کارە بکات، هەرچی بەلای زەمین و ئاسمانە دەیبارێنن بەسەریدا. عومەر لەمەدا تەشای بەرژەوەندی ئیسلامی کردووە. ئەو پابەند نەبووە بە ڕووکەش و حەرفیێتی دەقەکانەوە، وەک ئەوەی پیاوانی ئاینی لەم چەرخەدا دەیکەن.

دیارە کە عومەر ڕقی لە قورەیش و قورەیشیش ڕقیان لەو بوو، ئەمە هەر لە سەرەتای بانگەوازەوە دەستی پێکرد. عومەر خۆی ئەم

ڕقلێبوونەوە دووسەرەی نەشاردۆتەوە، بەتایبەتی لە ڕۆژی "سولحی حودەیبییە"دا، ئەو کاتە پێغەمبەر ویستی وەک نێردراوی خۆی بینێرێت بۆ مەککە، عومەر گوتی: "ئەی پێغەمبەری خودا، بەڕاستی من لە گیانی خۆم دەترسم، خۆت دەزانیت لە مەککەیش کەسێک لە بەنی عودەی نییە، تا داڵدەم بدات، قورەیش لە دوژمنایەتی و ڕقی من بێخەبەر نین. بەڵام دەتوانم کەسێکت پێ بڵێم، کە بۆ ئەم کارە لەمن باشترە، ئەویش "عوسمانی کوڕی عەففان"ە. خۆ ئەگەر هەم عومەر و هەمیش قورەیش ئاوا بەم دوژمنایەتییە بزانن، ئیدی لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا چۆن دەتوانێت بەتەواوەتی بیری بچێتەوە.

*** *** ***

ئەوەی کە شایەنی باسە: عومەر مەیلی بەلای عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا هەبوو، زۆریش، نەک کەم. لەولایشەوە عەلی، یەکێک بوو لە هەرە ئێسک قورسترینی بوونەوەران لای قورەیش. عەلی بێزی لە قورەیش دەهاتەوە، قورەیشیش بێسنوور ڕقیان لە عەلی دەبووەوە. عومەر، عەلی کردبووە ڕاوێژکاریی خۆی. سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: عومەر پەنای بە خودا دەگرت لە چارەسەرکردنی گرفتێکدا، ئەگەر عەلی لەوێ نەبوایە. عومەر کچێکی عەلی مارە کردبوو، بە ناوی ئوم کەلسوم، قورەیش بەم کارە مێشکیان تەقی، وا یانزانی بەم کارە خەلافەتی بۆ جێ دەهێڵێت.

بە دوور نازانرێت عومەر ویستبێتی وەسیەت بکات لە پاش خۆی عەلی بکەنە جێنشین. لەوانەیشە لە فێڵ و تەڵەکەی قورەیش ترسابێت بۆیە ئەو کارەی نەکردبێت. قورەیش نەیاندەویست جێنشینایەتی بۆ

یەکێک لە بەنی هاشم بمێنێتەوە، ئەمەیش لە قسەکانی عومەردا دەردەکەوێت، ئەو دەمەی خەریکبوو لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی عەباسدا قسەی دەکرد و ئەمەیش کورتەی قسەکەیانە: "قورەیش حەزناکەن هەم پێغەمبەرایەتی و هەمیش جێنشینایەتی لە بەنی هاشمدا کۆببێتەوە". وا دەردەکەوێت قورەیش ڕقیان لە بەنی هاشم بووبێت هەر لە ساتەوەختی سەرەتای ئیسلامەوە، نەیانویستووە وازی لێ بێنن.

قورەیش دەیانویست جێنیشانەیەتی بۆ عوسمان بێت، چونکە ئەو لە گەورەترین بنەماڵەی قورەیشە، ئەویش "بەنی ئومەییە"یە، سەرەڕای ئەوەی کە عوسمان بە نەرمونیانی و خۆشەویستی کەسوکاریی ناسرابوو. قورەیش ئەمیان وەک باشترین کاندید دەهاتە پێش چاو، تا بگەنە ئامانجەکەی خۆیان. عومەر بەراوردێکی لە نێوان "عەلی" و "عوسمان"دا کرد. ((لە پەسنی "عەلی"دا، گوتی: "ئەگەر عەلی بێتە جێنشین، ئەوا خەڵک لیی ڕادەپەڕن" و "ئەگەر عوسمانیش ببێتە جێنشین، ئەوا کوڕانی "ئەبو موعیت"، دەکەونە نێزەی خەڵکی و ئەوسا عوسمان ڕێگریش بکات، ئەوا لەناوی دەبەن))[١٦٩]. لەوانەیە عومەر حەیران بووبێت، ویستبێتی عەلی ببێتە جێنشین، ئەوکاتە قورەیش لە دژی هەستنەوەو ئیدی دەبێتە گرفت و فەرتەنە بۆ ئیسلام.

دەڵێن: کۆمەڵێک لە هاوەڵان چوونە ژوورەوە بۆ لای عومەر، پاش ئەوەی "ئەبو لوئلوئ" خەنجەرەکەی لێدابوو، پێیان وت، خەلیفەیەکمان بۆ دیاری بکە، ئەویش گوتی: ((ئەگەر ئەبو عوبەیدەی جەڕاح زیندووبا، ئەوم دەکردە خەلیفەتان. خۆ ئەگەر خودایش لێی پرسیبام لە ڕۆژی سەڵا، بۆچی ئەمت هەڵبژارد، دەمگوت: من خۆم لە

---

[١٦٩]- - سید قطب، المصدر السابق، ص١٦٢.

پێغەمبەرەکەیم بیستووە، گوتوویەتی: ئەبو عوبەیدە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە. ئەگەر "سالم"ی مەولای ئەبی حوزەیفەیش زیندووبا، ئەوم دەکردە سەردارتان، ئەگەر لەبارەی ئەمیشەوە لێم بپرسرێتەوە، ئەوا دەمگوت: پێغەمبەر فەرموویەتی: "سالم خودای زۆر خۆش دەوێت."

من وا هەست دەکەم، عومەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەیویست عەلی کاندید بکات، بۆیە نەیویستووە ڕاستەوخۆ ناوی ببات و بە هێما و ئیشارەت تێی گەیاندوون. عومەر وەسفی ئەبی عوبەیدە دەکات بەوەی ئەمینی ئەم ئوممەتەیە، لەولاوە هاوەڵان دەزانن کە لەوە زیاتر پەسنی عەلی کردووە کە وتوویەتی: "عەلی بۆ من، وەک هاروون وایە بۆ موسا". دیسانەوە عومەر، لە پەسنی "سالم"دا گوتی: پێغەمبەر فەرموویەتی: "سالم خودای زۆر خۆش دەوێت"، ئەمە لە کاتێکدا هاوەڵان دەزانن کە لەمە زیاتری لەبارەی عەلییەوە گوتووە: "خودا و پێغەمبەری خۆش دەوێت، خودا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت". ئیدی ئەم دوو فەرموودەیە لەناو خەڵکی و لە سەرزاران بڵاوبووە. ئەوەندەی من گومان دەبەم، عومەر بە باسکردنی فەزڵی ئەبو عوبەیدە و سالم، دەیویست سەرنجی ئامادەبووان بەلای عەلی و فەزڵی عەلیدا ڕابکێشێت، ئیدی قسەکانیش نەبوونە جێگای سەرنجی ئامادەبووان، چونکە عەلی لای زۆربەیان خۆشەویست نەبوو.

سالم و ئەبوعوبەیدە بە شتانێک بووبوونە شایەنی خەلیفایەتی، کە عەلی لەوە زیاتری لە هەگبەدا بوو، ئەی کەواتە بۆچی عەلی نەکرایە جێنشین؟ زۆر ڕوونە کە عومەر بە قسەکانی، دەیویست ئاماژە بە شایەنبوونی عەلی بکات بە شێوەی ڕەمز و ئیشارەت، عاقڵیش ئیشارەتێکی بەسە. لەوانەیە خوێنەر بڵێت: خۆ عومەر خۆی دەیتوانی جێنشینی خۆی دەستنیشان بکات و خەڵکیش بە کارەکەی ڕازی بن و ملکەچی بن. بەڵام ئەوە ئێمە ئێستا هەروا بە چاوێکی سادەوە

تەماشای بارودۆخی ئەو دەورانە دەکەین و نازانین چ پیلانگێڕییەک لە ئارادا بووە.

پێشتر بینیمان چۆن قورەیش ناڕازی بوون لە جێنشینایەتی عومەر، ئەمە هێشتا ئەو دەمە، قورەیش لە لایەنی دارایی و هێزەوە لە لاوازیدا بوون و هێزوپێزیان بۆ نەگەڕابووەیەوە لە پاش ئەو لێدانە توندانەی کە پێغەمبەر لێی دابوون. بەڵام لە کۆتایی دەورانی عومەردا، قورەیش هێز و سامانیان بۆ گەڕایەوە. بەڵێ لە سەردەمی عومەردا زۆرێک لە نفوزە لەکیسچووەکانی بۆ گەڕایەوە. بۆیە عومەر خۆیشی ترسی لێ نیشتبوو، دەترسا لە فێڵ و تەڵەکەکانیان. خۆ ئەگەر بێتوو عومەر، عەلی بکردایەتە جێنشین، ئەوا قورەیش زەمین و ئاسمانیان هەڵدەگێرایەوە بەسەر دووژمنە سەرسەختەکەیاندا -عەلی.-

*** *** ***

لە پاش مەرگی عومەر، گرفتە گەورەکەی شورا ڕووی دا، موونافەسەکە لە نێوان هەردوو کاندیدان: عەلی و عوسماندا زۆر توند بوو. عوسمان کاندیدی قورەیش و عەلیش کاندیدی ئەعراب و ڕەشوڕووت و مەوالییەکانی وەک عەمار و ئەبوزەڕ و سەلمانی فارسی بوو. لەوانەیە قورەیش شەوی هەڵبژاردنەکە نەنوستبن و خەو لە چاوانیان نەچووبێت. یان لەوانەیە ئەو شەوە هەرچییەک لە هۆکار و وەسیلە هەیە گرتبێتیانە بەر، تا پاڵپشتی زیاتر بۆ کاندیدەکەیان کۆ بکەنەوە.

ئەو کاتەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، هەستا و ویستی دەنگی خۆی بداتە یەکێک لە کاندیدەکان، عەمار هاواری کرد و وتی: "گەر

دەتەوێت مسوڵمانان تووشی ناکۆکی نەبن، بەیعەت بدە بە عەلی". لەولاوە: عەبدوڵلای کوڕی سەرح وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەگەر دەقەوێت ناکۆکی نەکەوێتە ناو قوڕەیش، بەیعەت بە عوسمان بدە."

ئەم گرژییە ئاماژەیە بۆ ئەو هەست و بیرۆکانەی کە لە دەروونیاندا خووتەخووتەی دەکرد. عەمار بە ناوی مسوڵمانانەوە، ئیبن سەرحیش بە ناوی قوڕەیشەوە دەدوا. دواتریش عەمار و ئیبن سەرح، دەستتیان کردە دەمەدەمە. عەمار بە ئیبن سەرحی دەگوت: ((تۆ لە کەیەوە بوویتە ئامۆژگاریکاری مسوڵمان؟)). یەکێک لە پشتیوانەکانی بەنی ئومەییە لەولاوە هاتەجواب و وتی: ((خەریکە سنووری خۆت دەبەزێنێت هەی کوڕی سومەییە، تۆ کارت چییە؟ قوڕەیش خۆیان کاری خۆیان ئەنجام دەدەن)). لێرەوە چوارچێوەی فکریی عەمار دەردەکەوێت کە لە تەنگ بەرژەوەندی مسوڵماناندا بووە، بە چاوپۆشی لە چینایەتی. بەڵام بەنی ئومەییە، بابەتەکە هەر وەک بابەتێکی خێزانیی ناو قوڕەیش تەماشا دەکەن، تا چۆن فەرمانڕەوایەتی بەسەر مسوڵماناندا بکەن.

پاش ئەوەی بە تەواوی بەیعەت بە عوسمان درا، عەلی هەستایەوە ڕووبەڕووی ئیبنو عەوف و گوتی: ئەمە یەکەمجارتان نییە ئاوا بدەن بەسەرماندا، بەڵام ئارامگرتن کارێکی باشە، والله المستعان علی ما تصفون.

*** *** ***

قوڕەیش ئەو ڕۆژەیان کردە زەماوەند، کە عوسمانی تێدا هەڵبژێردرا. لە هەموویشیان دڵخۆشتر شێخەکەی قوڕەیش بوو، ئەبوسووفیان.

دەڵـێن ئەبوسـووفیان ئەو ڕۆژە لەنـاو کەسـوکارەکەیدا بە بێـدەنگی گوتی: ((ئەرێ خۆ بێگانەمان تێدا نییە؟)) پاش ئەوەی دڵنیا بوو هەموو خۆیـانەن، دایە هـاوار و گـوتی: "ئەی بەنـی ئـومەییە، تـۆپ لە قـاچی خۆتاندایە، سوێند بەوەی ئەبوسووفیان سوێندی پێ دەخوات، من هەر چاوەڕێی ئەمە بووم بۆ ئێوە، دەبێت بۆ نەوەکانیشتانی بهێڵنەوە بە میراتیی."

هەروەهـا ئەبوسـووفیان پـاش مـاوەیەک بەلای گۆڕەکەی "حەمزە"ـی مـامی پێغەمـبەردا ڕۆیشـت، کە لە شـەڕی "ئوحود"ـدا، کوژرابـوو، شەقێکی هەڵدایە گۆڕەکەی و وتی: "ئەی باوکی یەعلا، ئەو شتەی تۆ دەجەنگایت لەسەری لەگەڵمان، ئێستا بە میراتی بۆ ئێمە ماوەتەوە". ئێمە نازانین ئایا هەر بەڕاستی ئەبوسووفیان ئەم قسەیەی کردووە یان نا؟ بەڵام هیچ بە دووری نازانین لە ئەبوسووفیان. خۆ ئەگەر بە کردەوەیش ئەم کارەی نەکردبێت، بێگومان لە دڵیدا ئەم قسەوباسانەی هەمـوو کردووە. ئەبوسـووفیان نەیدەتوانی دووژمنـایەتی لەمێـژینەی خـۆی و جەنـگ و هەرای جـارانی لەگەڵ مسـوڵماناندا لە بیـر بکـات. لەوانەیە سـەرکەوتنی ئیسـلامی بە شکسـتی خـۆی هەژمـار کردبێت، وەک پێشـتریش ئامـاژەمـان پێـی دا. بە دووریـش نازانرێـت، هەر ئەبوسـووفیان بووبێـت، بە ناڕاسـتەوخۆ، ئیلهـامی خسـتبێتە دڵـی مەعاوییەی کوڕیەوە و ڕایچەناندبێت بۆ گەڕاندنەوەی شکۆ و مەجدی قوڕەیش، ئەوەی کە موحەمەد (دخ) تێکی شکاند.

لە بەشی یەکەمدا گوتمان: مرۆ ناتوانێت لە شەو و ڕۆژێکدا زاڵ ببێت بەسەر سروشت و نەریتە باوەکانیدا و بیانگۆڕێت، تەنها بە چوونە نـاو ئـاینێکەوە، ئەگەریـش بتوانێت، ئەوا تەنهـا هەنـدێک لە ڕووالەت و دیمەنی دەرەوەی دەگۆڕێت. لە بارەی عەقڵی باتنییەوە -ناوەکییەوە- شتێکی زۆر زۆر کەمی بۆ دەگۆڕدرێت. (وەرگێڕ: خۆی لێرەشدا عەلی

وەردی خەریکە تووشی هەمان هەڵەی لۆجیکی کۆن دەبێت، کە وایان دەزانی، خراپ تا ڕۆژی قیامەت هەر خراپە، ئەمیش خەریکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەمان هەڵە دەکاتەوە، لە کاتێکدا لە لاپەڕەکانی پێشوودا دژی ئەم ئایدیایە دەدوا، نازانم ئێوەی خوێنەریش هەستی پێ دەکەن، یان هەر وەرگێڕ وایە؟)

مرۆ بە تەواوی خۆیشی نازانێت گرێکانی قووڵایی ناو دەروونی، چەن و چۆنن، ئەو ساڵانێکە هاوڕێیە لەگەڵ ئەم گرێیانەدا و تێکەڵی بوون، بۆی جیا نابێتەوە، ئیدی ئەگەر ئێمە داوا لە کەسێک بکەین، کە لە ژینگەی (أ) پێگەیشتووە، وەک کەسێک بێت کە لە (ب) گەورە بووە، ئەوا ستەممان لەو داماوە کردووە و داوای شتی ئەستەممان لێ کردوە.

من وا گومان دەبەم، ئەبوسووفیان، موعاویە و مەروان و ئەوانی دیکەیش، لە سەرکردەکانی قورەیش، ئەوانەی کە ئیسلام لە شکۆی کەمکردنەوە، هەتا دواین چرکەساتی تەمەنیان ئەو سەرشۆڕییەیان بیر نەچوویەوە، دەیان ویست ئەو شتە لەدەستچووەیان وەچنگ بخەنەوە. ئەوەی کە پێویستە بگوترێت، ئەوەیە، پێغەمبەر ڕقی لە مەروان و باوکیشی بوو، ناوی لێ نابوون "وەزەعی کوڕی وەزەع"، واتە "پیسی کوڕی پیس" و، لە مەدینەیش نەفی کردبوون ، تا سەردەمی خەلیفەی یەکەم و دووەمیش هەر لە "مەنفا"دا بوون. بەڵام هەر کە عوسمان بوویە جێنشین، ئەمانەی هێنایەوە مەدینە و کچەکەیی لێ مارە کرد و کردیە وەزیری دەستەڕاستی خۆی. لەوەیە لە زاراوە ڕامیارییەکانی ئەمڕۆدا ببێتە موربەدەست یان سەرۆکی دیوان.

ئیدی ئەم جۆرە کەسانەی کە لەسەر دژایەتی موحەمەد و ئیسلام گەورە بوون، هەرگیز ناتوانن بەو ماوە کەمە دڵیان خاوێن بکەنەوە.

لە بەختی ڕەشی ئیسلامیش، کەسانێکی زۆر زۆری لەم چەشنە داخڵی ناو ئیسلام بوون. ئەمانە هەرچەندەش دواتر دڵسۆز بوون بۆ ئاینەکە، بەڵام هەر گـرێ دەروونییەکـان لە ناخیانـدا ڕوابـوو، نەیدەهێشـت بە تەواوی بە ڕێگەی مسوڵمانە دڵسـۆزەکاندا پێ هەڵگرن. ئەوان لەسـەر ئەو ڕێڕەوە دەڕۆیشتن کە ساڵەهای سـاڵە لەسـەری ڕاهـاتوون، ئیدی چ پێ بزانن یان نەزانن.

**** **** ***

قوڕەیش زۆر دڵخۆش بوون بە خەلافەتی عوسمان، وەک سەرکەوتنی خۆیـان گوزارشـتیان لـێ دەکرد. ئەم سـەرکەوتنە هێندە بە جـۆرێکی ناشرین گوزارشتی لێ کرا، خەڵکەکەیش بێزاربوون کاتێک قوڕەیشیان بەم جۆرە بینی. ئەوانەی لە هەمـوو کەس زیاتریـان پێ نـاخۆش بـوو، بریتی بوون لە مەوالی و خەڵکە ڕەشوڕووتەکە. مەوالییەکان ئەوەیان بیر نەچووبوویەوە کە بە دەستی قوڕەیش چیان بەسەرهاتبوو بەر لە بانگەواز. ئەو سووکایەتی و شتانەی لە دەستیان بینیبوویان، بووبووە گرێیەکی دەروونی لە لایان و بیریان نەدەچووەوە. ئیدی ئەعرابییش - خەڵکی بیابـان- بیزیـان لە قـوڕەیش دەهـاتەوە، لەبەر خۆبەزلزانینیـان بەسەریاندا، پێیان ناخۆش بوو کە تاکە هۆزێک -قوڕەیش- زاڵ ببێت بەسەر هەموولایەکدا و هەرچی دەستکەوت و پلەوپایە هەیە بیبات بۆ خۆی.

"ئەبوزەر" وەک زمانحاڵی ئەعراب دەدوا، "عەممار"یش وەک وتەبێژ و زمانحـاڵی مەوالـی و چەوسـاوەکان. لەو سەردەمەیشـدا مەوالییەکـان کەمینەیەکی زۆر کەم بـوون، هەمـوو ئۆبـاڵی شۆڕشـەکە لە ئەسـتۆی

عەرەبدا بوو.

ئەگەر بە شـــێوەیەکی بـــابەتیی، لەم شۆڕشــــە بکـــۆڵینەوە، ئەوا ئەنجامەکەی دەگەینەوە ئەوەی کە ئەم ململانێیە لە نێوان قورەیش و ئەعرابدا بووە. چونکە ئەو هەموو سەروەت و سامانەی لە ئەنجامی فتوحـاتە عەرەبییەکـانەوە دەگەڕایەوە مەدیـنە، هەمـووی دەچـووە گیرفـانی قورەیشـــەوە، شـتێکی زۆر کەم نەبێـت، هـیچ بەر هـۆزە عەرەبەکان ناکەوێت. ئەعراب وەک بڵێیت دەیانگوت: ئەوە ئەمان بوون مەمالیـک و ناوچەکانیـان فەتـح کـردووە، ڕازی نەبـوون هەمـوو دەسـتکەوتەکان بچێتە هەگبەی کـۆمەڵێکی کەمیـنەوە -کە قـورەیش بـوون-. مێژوونووسـان دەڵـێن: سـەرەتای دەرکەوتنەکـانی شۆڕشـی سەر عوسمان لە کوفەوە سەری هەڵدا. هۆکاری سەرەکیشی بریتیی بـوو لە وتـارەکەی سـەعدی کـوڕی عـاس کە وتـی: "سـەواد هەمـوو باغـــاتی قورەیشـــن". ئیـدی یەک دوانێـک لە عەشـایەرەکان بـۆی هەسـتانەوە و گوتیـان: نەخێـر "سـەواد" بەشـە دەسـتکەوتی جەنگـی خۆمانە، پشکی قورەیش هیچ زیاتر نییە لە پشکی هەر کەسێکی دیکە لە مسوڵمانان."

ئەم قسـەیەی کە والیـیە قورەیشـییەکەی کـوفە لە دەمـی داخزابـوو، حاڵوباڵی ئەعرابی ئەو دەڤەرەی بەسەر یەکدا تێک دا. ئیدی وەفدێکیان ڕەوانەی لای موعـاوییە کرد بۆ شـام، هەڵبەت بە فەرمـانی عوسـمان. بـۆیە ئەگەر تەماشـای ئەم گەنگەشـەیەی نێـوان ئەمـان و مەعـاویە بکەیـن، دەبینـین هەمـوو گرفتەکـان لە دەوری قـورەیش دەخـولێتەوە. معـاویەیش ڕسـتەیەکی گـوت ئـابەم شـێوەیە: ((... ئێـوە کـۆمەڵێکن لە عەرەب... بیسـتوومە نارەزاییتـان لە بەرانـبەر قورەیشـەوە دەربڕیـوە، بەڵام بـاش بزانن، ئەگەر قـورەیش نەبـوایە، ئێوە ڕەزیـل دەبـوونەوە، وەک چـۆن پێشـتر لە ڕەزالەتـدا دەژیـان... سـەرگەورەکانتان وەک

قەڵغـان وان بۆتـان، تـا ئەمـرۆش)). یەکێـک لە ئامـادەبووان وەڵامـی دایەوە: ((چەندە ئەم مەسـەلەی قورەیشـەمان لەسـەر ئاڵۆز دەکەیت... تەماشاکە، عەرەب لە بەرهەمی شمشێری خۆیان دەخۆن، قورەیشیش بازرگانی دەکەن)).

پاش کوژرانی عوسـمان، خـاتوو عایشـە وەسـفێکی شۆڕشـگێڕەکانی کـــــرد، کە زۆر ڕوون و ڕەوان ئامـــــاژەی بەوە دا کە عەرەب و مەوالییەکان بوون ئەو شۆڕشـەیان ئەنجام دا. وتـی: ((هـۆ گەلـۆ... ئەو غەوغایەی خەڵکی ناوچەکان ناویانەتەوە، لەگەڵ خەڵکی نـاوچەی ئـاو و کۆیلەکانی شـاری مەدینە، هەموو پێکەوە دوێنی کۆبوونەوە لە دژی ئەو کـابرا کـوژراوە بەسـتەزمانە.... سـوێند بە خـودا پەنجەیەکـی عوسـمان بەنرختـرە لە هەزارانـی وەکـو ئێـوە)). هەروەهـا عەلـیش وەسفێکی شۆڕشگێڕەکانی کرد، کە نزیک بـوو لە وەسـفەکەی خـاتوو عایشەوە، لە کاتێکدا داوای تۆڵەی خوێنی عوسمانیان کرد، لە وەڵامـدا گـوتی: ((مـن چـی لە خەڵکانێـک بکەم، کە ئەوان خـاوەنی ئێمەن، نەک ئـێمە خـاوەنی ئەوان. ئەوەتـا عەبـدەکانی خۆتـان لەگەڵیـان دەسـتیان تـێکەڵ کـردووە، ئەعـرابیش پشـتیوانیان دەکەن، هەرچێکیـان بوێـت لەناوتاندا دەیکەن، ئایا شـێوازێک شـک دەبەن تـا هێزمـان بەسـەریاندا بشکێت و نەهێڵین ئاوا بکەن؟)).

لەوانەیە دوژمنـایەتی ئەعـراب بـۆ قـورەیش شـتێکی حەتمـی بووبێـت، چونکە قورەیش دەوڵەتمەندترین هۆزی نـاوچەکە بـوو بەر لە ئیسـلام، سەرپەرشـتیار و ئـاوگێڕی کەعـبە بـوون، پارێزگـاری بتەکـان و برەوپێدەری بازار و کەسابەت بوون، ئەسـپیان لە ئەدەبدا تـاودرابوو، کە ئەم شـتانە هەمـوو لە وەرزی حەجـدا بەڕێـوە دەبـران، بـۆیە عەرەبەکان لەو وەرزەدا ڕوویان لەوێ دەکرد و خەڵاتیان لە قورەیش لە سـەرکارەکانیان وەردەگرت. قـورەیش دەیانویسـت ئەو پلەوپـایەی

جاران وەچنگ بخەنەوە لە نێوان عارەباندا. بیریان چووبوو کە بارودۆخ بەتەواوی گۆڕاوە...

عەرەب بەر لە ئیسلام دەهاتنە سەردانی مەککە، لەوێ خەڵات و شاباشیان لە قورەیشان وەردەگرت، عەرەبیش لە بەرانبەر ئەم چاکە و بەخششەی قورەیشدا، ڕێزی کاروانە بازرگانییەکانیان دەگرتن و ڕێگایان بۆ ئامادە و تەخت دەکردن، ئیدی بارودۆخەکە وەک دەسەوامی لێ هاتبوو، هەردوو لا چاکەیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد. بەڵام لە سەردەمی ئیسلامدا بارودۆخەکە گۆڕا. ئیدی لەوساوە عەرەب وایان دەزانی خاوەن فەزڵ و شکۆی خۆیانن، ئەوە بە شمشێری ئەمانە میرنشینەکان فەتح کراون، دەسکەوت و غەنیمەت وەچنگی مسوڵمانان کەوتووە، ئێستا بە چی مافێک قورەیش دەیەوێت زۆرینە و پشکی شێری دەسکەوتەکان بەرێت بۆ خۆی و سەرباری ئەمانەیش، بیەوێت زەمامی بارودۆخ بە دەستی خۆیەوە بێت.

ئەو چەلەحانێیەی لە نێوان مەعاویە و خێڵەکییەکانی کوفەدا ڕووی دا، ئاماژەیە بۆ ئەو شتە. موعاویە باسی فەزڵ و کەماڵی قورەیشی بۆ دەکردن، کە ئەگەر ئەمان نەبوونایە، هۆزەکان، هەروەک پێش ئیسلام پەرتەوازە دەبوون. وەڵامی ئەمانیش ئەوەبوو: قورەیش هیچ بەرتەرییەکی نییە بەسەر کەسی دیکەدا لە ئازادکردنی مەمالیکەکاندا، چونکە ئەوان هێشتایش خەریکی بازرگانی خۆیانن. هەر جەماعەتە لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە تەماشای بارودۆخەکەیان دەکرد، کەس دانی خێری بە مافی ئەوی دیکەدا نەدەنا. ئەمەیش سروشتی بنیادەمە لە هەر سات و شوێنێکدا.

*** *** ***

وتمان: قورەیش زۆر ئەرخەیان بوو بە بەیعەتی عوسمان، هێند دڵخۆش بوون، نەیاندەتوانی بیشارنەوە. بەڵام وەک دەردەکەوت، ئەم دڵخۆشییە زۆر تووڵی نەکێشا، وەک دەڵێن: "زۆری پێ نەچوو، بێهۆشی خەلاسی هات و "ئاوەز" گەڕایەوە ناو سەر". خەلیفە عوسمان لەو دەمەدا، پاوێکی "چەوتاوی ڕەقهەلاتوو" بوو لە نێوان هەشتا بۆ نەوەد ساڵیدا. ئیدی قورەیش نەیان دەتوانی زۆر دڵخۆش بکەن بە مانەوەی ئەم سوڵتانەیان، شێخەکەیان -عوسمان- درەنگ یان زوو دەمرێت. قورەیش وەک مانگی چواردە لێی ئاشکرا بوو، کە پاش عوسمان، عەلی دەبێتە جێنشین و هەموو ئەو شتانەی دیسانەوە بنیاتیان نابوو، سەرلەبەری تەخت و تاراج دەبێتەوە. هەرچۆنێک دێنینە پێش چاومان، قورەیشمان زۆر بە سەغڵەتی دێتە بەرچاو لە سەردەمی عوسماندا، بە تایبەتتر، ساڵەکانی کۆتایی خەلافەتەکەی. قورەیش دەبوو خۆی ئامادە بکات بۆ ئەو پێشهاتانەی لەپاش مەرگی عوسمان دێنە پێشەوە، حساب و کیتابی خۆیان پێشوەختە بکەن.

ئەبوسووفیان لە دەورانی عوسماندا مرد، معاویەی کوڕی بوویە سەرداری قورەیش. معاویەیش لە مێژوودا بە: "چاوتیژی" و "زەینرۆشنی" و لێزانترین -فێڵزانترینی-" ناو عەرەب ناسرابوو. بە هیچ شێوەیەک نەدەکرا معاویە بێ خوتەخوتە و بێخەیاڵ بێت لە سەردەمی عوسماندا. هەر دەبوا شتێکی کردا بۆ ئەو خەتەرەی کە بەرێوەیە.

گرفتەکە لەوەدا بوو، سەردارەکانی قورەیش، لەوانە نەبوون کە هەر لە سەرتاوە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جیهادیان کردبێت، واتە لە پێشینەکانی مەیدانی جیهاد و تێکۆشان نەبوون. زۆرینەیان لە بەری کوفر و شەریکدانەرەکان بوون و لە دژی سوپای ئیسلام بە خەستی جەنگابوون. ئیدی لە دیدگای ئەو خەڵکەدا، هیچ یەکێکیان شایەنی

بوونبەجێنشینی عوسمانیان نەبوو. عوسمان خۆی تاکە مەرد بوو لە نێوان ئەشرافی قورەیشدا، کە ئیمان و کۆچ و جیهاد و بەخشینی بەخشی بوو بە ئاینە تازەکە. ئیدی ئەوانی دیکە لە قورەیش کە هاتبوونە ناو ئیسلامەوە، لە خەڵکە چەوساوەکەی ناو قورەیش بوون، بەڵام بنەماڵە بەناوبانگەکانی ناو قورەیش، وەک "بەنی ئومەییە" و "بەنی مەخزووم"، ئەمانە لە دوژمنی هەرە سەرسەختی ئاینەکە بوون. ئەوەیشی کە لە کۆتاییدا ئیمانیان هێنا، ئیمانێکی شلوشۆڵ بوو. وام دێتە بەرچاو، معاویە شەو و ڕۆژ لە بیری داهاتووی قورەیشدا بووە، لەوانەیە لە بیری ئەوەدا بووبێت، قورەیش دوای عوسمان، لەسەر دەستی عەلی تەفروتوونا دەبێتەوە، وەک چۆن پێشتر لەسەر دەستی موحەمەد لێی قەوما.



کاندیدی هەرە بەهێز، لە دوای عوسمان عەلی بوو، لە پاش عەلیش، تەلحە و زووبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و عەبدوڵای کوڕی عومەر بوون. بێگومان معاویەیش لە هیچکام لەمانە دڵئەرخەیان نەبوو. هەریەک لەمانە نزیکتر بوون لە تێگەیشتن لە ڕۆحی ئیسلامەوە، تا کەسانی ناو قورەیش. ئەوان ناتوانن وەک ئەبوسوفیان بە تەنگی هۆز و دەستخستنی دەسەڵاتەوە بن، هەرچەندەیش بارودۆخ گۆڕابێت.

بینیمان چۆن زووبەیر پەشیمان دەبێتەوە لە جەنگەکەی بەسرەدا، کاتێک عەمار لە سوپاکەی عەلیدا دەبینێت و قسەکەی پێغەمبەری (دخ) بیر دەکەوێتەوە کە فەرمووبووی: "جەماعەتێکی سەرکەش عەمار

دەکوژن"، تەلحەیش داوای لێخۆشبوونی لە خودا دەکرد لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا لەسەر ئەو کارەی لە دەستی قەومابوو. بینیمان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسیش چۆن تەرکەدنیا دەکات لە پاش کوژرانی عوسمان. هەرچی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، ڕێک وەک بابی خۆی، زاهید و خاوەن تەقوا و دادپەروەر. ئیدی بەلامانەوە سەیر نییە، ئەگەر معاویە قەلەق و شپرز بێت لەمەڕ داهاتووی قوڕەیش بەدەست ئەمانەوە.

مێژوو بۆمانی باس کردووە کە، معاویە هەر لە دەورانی عومەرەوە، خەریک بوو لە شام بنەی قایم دەکرد و نەرمە نەرمە جێگای خۆش دەکرد، تا شام بکاتە پایتەختی دەوڵەتەکەی داهاتووی. معاویە لە شام وێنەی قەیسەر و کیسرا حوکمی دەکرد، وەک ئەوەی بیەوێت کۆمەڵگەی شامی ئامادە و ئامادە بکات، تا بڕوایان بە چینایەتی هەبێت و بیریان بەلای یەکسانی و ئەو شتانەدا نەبێت کە ئیسلام هێنابووی. ناوچەکانی دیکەی قەڵەمڕەوی ئیسلامی لەسەر بنەمای یەکسانی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی بەڕێوە دەبرا. خەڵکەکە هەموو لە یەک ئاست و پلەدا بوون، وەک دندانی شانە، بە شێوەیەک هەر خراپەکارێک دەچووە دۆزەخ، ئەگەر سەرداری قوڕەیشیش بوایە، هەژارێکیش کە "ئەسپی لە گیرفانیدا سەوزەڵی خانم دەڵێت"، دەچێتە بەهەشت ئەگەر چاکەکار بێت. بەلام لە شام شتەکە بە پێچەوانەوە بوو، وا دەردەکەوت معاویە هەموو بیرۆکەیەکی لە بارەی یەکسانی و شتەوە نەڕی دەکرد، نەیدەهێشت داخڵی شام ببێت. ئیدی ئەو دەمەی ئەبوزەر دەستی بە بانگەوازەکەی خۆی کرد لە شام، مەعاویە نامەیەکی ئاراستەی عوسمان کرد و، ئاماژەی بەوە دا کە، ئەبوزەر لێرە وەزعەکەی تێکداوە و دەیەوێت شامی شەریف بشێوێنێت. ئیتر عوسمان ئەبوزەڕی هێنایەوە بۆ مەدینە. مانای ئەمە ئەوەیە: مەعاویە

نەیدەویست وەزعەکە لە خۆی بشێوێنێت و شام هەر بە شەریفی بمێنێتەوە، ئیدی بەلایەوە گرنگ نییە ئەم گرفتە بکەوێتە هەر ناوچەیەکی دیکەی دەوڵەتانی ئیسلامییەوە. مەعاوییە لەم کارەیدا سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا، تا گوێڕایەڵی خەڵکی شام بوویە نموونە و پەندی سەر زاران.

مەسعودی لە بارەی خەلکی شامەوە دەڵێت: ((لە بارەی گوێڕایەڵی ئەوانەوە بۆ مەعاویە، بیستوومە کە لە دەورانی جەنگی سەفیندا لە ڕۆژی چوارشەممەدا نوێژی جومعەی پێ کردبوون و یەک کەسیان فزەیان لەدەم دەرنەچووبوو...)). عومەر ئەو کاتەی سەردانی شامی کرد، بینی وا معاویە لەناو کەژاوەدا و پاسەوان و ئەم شتانەی بە دەوردان، ڕێک وەک پادشاکانی سەردەمی کۆن دەهات و دەچوو. عومەر خۆی تووڕە کرد و هاواری بەسەردا کرد: ((وەجاخی کیسرا ڕۆشن دەکەینەوە ئەی مەعاویە؟)) مەعاویەیش پاساوی بۆ کارەکەی هێنایەوە کە خەریکە بەرەو دوژمن دەڕوات و پێویستی بە ئامادەسازی و جوانکاریی جەنگ هەیە. ئیبن خەلدون بڕوای وایە، عومەر قایل بووە بە پاساوەکەی مەعاویە، پاشان ئیبن خەلدون بەرگری لە مەعاویە دەکات کە بەو دیمەن و شێوازە کیسراییانە، نەیویستووە خۆی فەرز و زاڵ بکات بەسەر خەڵکیدا، لە بڕوای ئیبن خەلدوندا، مەعاویە لەم کارەیدا مەبەستی خاتری خودا بووە.

بەڕاستی من سەرم لە قسەکانی ئیبن خەلدون ماساوە، چونکە هەموو کەس لە کارەکانیدا بانگەشەی خاتری خودا دەکات، بەڵام شتەکە تەنها بەند نییە بە بڕوا و بیری بنیادەمەوە، بەڵکوو ئەوەیە کە لاشعووری ئاڕاستەی دەکات، واتە ئەو هەوا و هەوەسە، یان بوغز و قین و خۆشەویستییە لاشعورییەیە مرۆڤ ئاراستە دەکات. بۆیە بەلای ئێمەوە ئەوە گرنگ نییە کە مرۆڤ لە دڵی خۆیدا بیری لێ دەکاتەوە،

بەڵكوو ئەوەی كە گرنگ و شایەنی حسابـبۆكردنە، ئەو گرێ دەروونی و كۆمەڵایەتییەیانەی كە لە ڕێگەی عەقڵی ناوەكییەتی - باتینی-ەوە ناڕاستەوخۆ مرۆ ئاڕاستە دەكەن.

معاویە دەیویست بەسەر دوژمنانی ئیسلامدا سەركەوێت، بۆیە ڕێگە و ڕیوڕەسمی ئەوانی دەگرتە بەر، ئەم شتەیش لای سیاسییەكان ڕێگەپێدراوە، بەڵام لە دیدگای كەسە ئاینییەكانەوە ڕێگەپێنەدراوە. ئاین ئامانجی لە جەنگ، خودی جەنگەكە نییە، بەڵكوو لەم ڕێگەیە دەیەوێت بنەمای عەدالەت بچەسپێنێت، ئەو عەدالەتەی كە خۆی بڕوای پێیەتی. خۆ ئەگەر مەبەست لە جەنگەكانی تەنها سەركەوتن بێت، هیچ بە لای بنەمای عەدالەتدا نەڕوات، ئەوا مۆركی ئاینی لێ دادەماڵدرێت و دەبێتە دەوڵەت. ئەو كاتەیش ئاین دەبێتە ئامرازێك بە دەستی سیاسییەكانەوە، بۆ مەرامی خراپ و داگیركاریی بەكاری دەهێنن. من هەرگیز بڕواناكەم عومەر، دڵی بەو وەڵامەی موعاویە سووكنایی هاتبێت، وەك ئەوەی ئیبن خەلدون وا دەزانێت. من دەڵێم عومەر شتێكی دیكەی لەناو دەروونیدا پەنهان كردووە -یان لە شتێكی دیكە ترساوە.-

*** *** ***

عومەری كوڕی خەتاب كوژرا بەر لەوەی ئەو بەكتریایەی كە خەریك بوو بداتە لەشی ئیسلام لەناوبەرێت. پاش ئەویش عوسمان هات و لە دەورانی ئەودا قوڕەیش هۆشیان بەبەردا هاتەوە. هەرچی سالار و سەرگەورەیان هەبوو، هەموو ڕوویان كردە شام، تا لەوێ سەردەمی نوێیان (العهد الجدید) دامەزرێنن. مێژوونووسان دەڵێن: قوڕەیش تامی

میوەی شامیان کردبوو، بۆیە ڕوویان لەوێ کرد و جێگیر بوون تێیدا، بەڵام ئەم قسەیە "هەتەران و پەتەران" زیاتر هیچی دیکە نییە، بەڵکوو قورەیش تامی خەڵک و کۆمەڵگەی شامییان کردبوو، کە معاویە دایمەزراندبوو. تەنانەت ئامادەیشی کردبوون بۆ پەسەندکردنی چینایەتی. لەوانەیە زۆرمان نەگوتبێت، ئەگەر وتبێتمان، لە سەردەمی عوسماندا، شام بووبوویە پایتەختی ئەو دەوڵەتەی ئیسلام کە بەڕێوەبوو دابمەزرێت. هەڵەیشمان نەکردووە ئەگەر وتبێتمان، خەلیفەی کردەیی -فیعلی- لەو کاتەدا مەعاویە بوو. بەڵگەی ئەم قسەیەش: هەر کەسێک عوسمان نەفی کردایە، یان گرفتێکیان هەبوایە، خل خل دەچوونەوە لای مەعاویە. ئەوەتا ئەبوزەڕ چوو بۆ ئەوەێ، شۆڕشگێڕەکانی کوفە و بەسرە هەر چوون بۆ لای ئەو، تا ڕەئی خۆی لە بارەیانەوە بڵێت.

دەڵێن: کابرایەکی زاهید هەبوو لە بەسرە، هەرچی حەڵاڵی خودایە لە خۆی حەرام کردبوو. زانرابوو کە گۆشتی لە خۆی حەرام کردبوو، ژنی نەدەهێنا و ئەوشتانە. والی بەسرەیش لە بارەی گوزەرانی ئەم پیاوەوە نامەیەکی ئاڕاستەی عوسمان کرد، عوسمانیش ڕەوانەی لای معاویەی کرد تا بزانێت چییە و چی نییە. دەڵێت معاویەیش سەیرێکی کابرای کرد و کەمێک هەڵسەنگاندنی بۆ کرد و لای خۆی گلی دایەوە، لە شام چونکە هیچ خەتەرێکی نەبوو. لەمەوە ڕوون دەبێتەوە، مەعاویە هەڵسووڕێنەری کردەیی سیاسەتی ئیسلام بوو لە سەردەمی عوسماندا، هەر کەس بیرۆکەیەکی تازەیی هێنابا، ئیدی خەتەر بوایە یان نا، دەنێردرا بۆ لای معاویە تا هەڵسەنگاندێکی بۆ بکات بزانێت چۆنە و چۆن نییە و بڕیار لەسەر چارەنووسی بدات. ئەگەر بێ دڕک و چزوو بوایە، لای خۆی لە شام دەیهێشتەوە، ئەگەریش تۆزێ "گرفتەوەر" بوایە، نەیدەهێشت لە شام ببینرێت و حەواڵەی شوێنێکی

دیکەی دەکرد تا شام هەر بەشەریفی بمێنێتەوە. وایش دەردەکەوێت، مەعاویە بەلایەوە گرفت نەبووە لە ناوچەکان دیکە چی بقەومێت لە ئاشووب و غەوغا، ئەو هەموو خەم و خەیاڵێکی هەر لای شام بوو، دەیویست بیپارێزێت لە هەر جۆرە بیرکردنەوەیەکی ئازاد و هۆشیارییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی. هەموو خەلیفەکانی دیکەی بەنی ئومەییە لەسەر ئەم پەیڕەوە دەڕۆیشتن لە پاش مەعاویە. ئەوان نەیاندەهێشت بە موو کەسێکی لۆجیکی خاوەن ئاوەز دەرکەوێت، زووبەزوو لە شام تەرەیان دەکرد و نەیاندەهێشت لەو دەورووپشتەدا پەیدای ببێت.

مەعاویە سوننەتێکی بۆ بەجێهێشتن، ئەویش هێشتنەوەی شام بوو، بە شەریفی و بێدەنگی، خنکاندنی هەر ئازادییەکی بیرکردنەوە، سا نەبادا خەڵکی چاو و گوێ بدڕنەوە، هەر خۆیان بەسەر هەموو ناوچەکاندا دەسەڵاتدار بن. ئیدی لەم سیاسەتەیشدا سەرکەوتنێکی باشی بە دەست هێنا. ئەوان لەگەڵ هەموو ناوچەکانی دیکەدا دەجەنگان بە سوپا گوێلەمشتەکەی شام. شایەنی باسە ناوچەکانی دیکەیش زۆر بەو شێوەیە سیستەم و ڕێکوپێکی تێدا نەبوو، پڕابوون پڕا، ئیدی ئەمەوییەکان دەیانتوانی بە سوپاکەی شام، ناوچە لە دوای ناوچە لە هەموویان بدەن، لە کۆتایشدا بەسەر هەموویاندا زاڵ بوون.

ئەم سیاسەتەی کە مەعاویە دایهێنابوو، هەر ئەوەبوو کە لە سەردەمی هاوچەرخدا مۆسۆلینی پراکتیزەی دەکرد. مۆسۆلینی دەیگوت: گرۆهێکی کەمی ڕێکخراو، دەتوانێت بەسەر گرۆهێکی زۆر و زەبەندی پەرتەوازەدا سەر بکەوێت، حیزبە فاشستییەکەیشی هەر لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراند و سەرکەوتنی گەورەیشی بەدەست هێنا، وەک لای هەموو کەس ئاشکرایە. مەعاوییە سەرقاڵی بەهێزکردنی جێگەوپێگەی خۆی بوو لە شام و، گرنگی نەدەدا بە ناوچەکانی دیکە. لەوانەیە هەر

نەیویستبێت دەغدەغە و مقۆمقۆ لەو ناوچانە ببڕێت، سا نەبادا لە پاش عوسمان لەسەر کەسێک ڕێک بکەون، ئیدی ئەوکاتە، ئەمیش دەتوانێت دانەدانە فیزیـــان بســـووتێنێت. هــیچ بە دووریــش نازانــدرێت، ئەوە مەعــاویە بووبێــت شۆڕشــەکەی پەرە پێـدابێت، کاتێـک بینیبـووی وا خەریـکە ســەر هەڵـدەدات، ویسـتبێتی لەنـاو ئەو ئـاوە لـێڵەدا بۆخـۆی دەست بکات  بە ڕاوەماسی. لەوانەیشە مەعاویە بە مەروانی گوتبێت، لەولاوە لای عوسمانەوە قوڕەکە خەستتر بکاتەوە، تا مەردووم بەربنە نێزەی یەک و شۆڕشەکە خێراتر ڕوو بدات و کارەکەیش هەوەس و هەوای تێکەڵ ببێت.

شۆڕشەکەی دژ بە عوسمان، شۆڕشێکی بە بەرنامە نەبوو، هەرچەند داوای یەکســـانی و دادپەروەرییـــان دەکـــرد، بەڵام بە شـــێوەیەکی پەرتەوازە و ناڕێـک دەجـوولانەوە، بـێ بەرنـامە و پـلان بـوون. کـێ دەزانێت، لەوانەیە مەعاویە سوودی لەم ئاشووبە بینیبێت و هەندێک سـیخوڕی خزانـدبێتە نـاو شۆڕشـگێڕەکان تـا وەزعەکە بشـێوێنن بە بێدەنگی. مێژوونووسان دەڵێن: ئەوەی پلانی ئەم شۆڕشـەی دانـابوو، ئەو کابرا پیسە بووە، ئیبن سەبەئ بەڵام من وای بۆ دەچم، هەر ئەو مەعــاویە ئەفســـانەی ئیــبن ســـەبەئی دروســت کردبێــت و پلانێکــی کردەیشـیی بـۆ تەشـەنەکردن و بڵاوکـردنەوەی ئەفسـانەکە دانابێت تـا خەڵکـــی تەواو بـــڕوا بـــکەن. ئـــێمە لە ڕۆژگـــاری ئەمڕۆمانـــدا سیاسـەتوانەکان دەبینین چۆن سیخوڕەکانی خۆیان دەخزێننە ڕیزی شۆڕشـە مەدەنییەکـان، تـا دۆخەکە بشـڵەقێنن و شـۆڕش بە نەزۆکـی لەولاوە بگەڕێتەوە.

*** *** ***

ئەوەی سیاسەتی مەروانی خوێندبێتەوە لە کاتی شۆڕشەکەدا، دەبینێت ئەم کابرایە چەندە حۆل و دەبەنگانە بەو ناوەدا هاتووە و چووە. پرسیارێک لێرەدا سەر هەڵدەدات، ئەویش: ئەوە خێرە مەروان لە سەردەمی عوسماندا کابرایەکی دەبەنگ و کوێرپێک بووە، کەچی دوای کوژرانی، بووە ئەفەندییەکی زێن ڕۆشنی دووربینی خاوەن ئاوەز؟ من مەروان تاوانبار دەکەم بەوەی، گەورەترین هۆکاری کوژرانی عوسمان ئەو بووە. مەعاویەیش بە هاندانی مەروان تۆمەتبار دەکەم.

قازی ئیبنولعەرەبی بڕوای وایە، مەروان یەکێک بووە لە کەسایەتییە عادلەکانی نێوان گەورە هاوەڵان، هەموو فەقیهی ناوچەکان لەسەر: ((گەورەیی خۆی و ئیعتیباری خەلافەتەکەی، پەتەوی فەتواکانی و وەرگرتنی فەرمووودە لێیەوە)) کۆک بوون. هەر دوای ئەوە ئیبنولعەرەبی دەڵێت: ((بەڵام سووک و ڕسواکانی مێژوو شتانێک دەڵێن، با بۆ خۆیانی هەر بڵێن)). دواتریش مامۆستا محب الدین خەتیب دێت و پشتیوانی لە قسەکانی ئیبنولعەرەبی دەکات، پشتیوانییەکی بەتینی لێ دەکات و دەڵێت: بە هیچ کلۆجێک مەعقول نییە کە مەروان هەڵسووڕێنەری ئەم فیتنەیە بووبێت، لە کاتێکدا هیچ بەرژەوەندییەکی خۆیشی تێدا نەبووبێت. ئوستاز خەتیب هەرچی تاوانە دە ئۆبالی سەبەئییەکانی دەهاوێت، لەسەری هەموویانەوە مالیکی ئەشتەر. ئەو وایدەبینێت کە سەبەئییەکان لە کوشتنی عوسماندا بەهرەوەر بوون، بەڵام مەروان هیچ سوودێکی نەبردووە. ئەمەیش بۆچوونێکی سەمەرەیە، لە ڕاستیدا بە بڕوای من، هیچکەس هێندەی مەڕوان و هاودیدەکانی مەڕوان لە قوڕەیش بەهرەوەر نەبوون لە کوژرانی خەلیفەی سێیەم.

کاتێک یەکێک دەیەوێت بکەری تاوانێک بدۆزێتەوە، دەبێت سەرەتا لەو

کەسانەوە دەست پێ بکات کە بەرژەوەندییان لەو ڕووداوەدا هەیە، چونکە بە شێوەیەکی سروشتی، مرۆ حەز ناکات تووشی تاوانێک ببێت، ئەگەر بەرژەوەندییەکی تێدا نەبینێتەوە. نزیکترین کەس کە هەستێت و تاوانێک ئەنجام بدات ئەو کەسەیە کە بەرژەوەندی هەیە لە بارودۆخەدا، ئەمە ئەو بنەمایەیە کە لێکۆڵەرانی تاوانی هاوچەرخ لەسەری دەڕۆن، ئێمەیش هیچ ڕێگریێکمان لەپێش نییە کە بەم تیۆرییە نوێیە تەماشای فیتنەی کوشتنی عوسمان بکەین. ئەوەی کە ئێمە بێین و بڵێین ئەم کوشتنە کاری ئەو کەسانەیە کە خۆیان هەر لەسەر شەڕەنگێزی ڕاهاتوون، ئەوە بیرکردنەوەیەکی کاڵوکرچە و لەگەڵ ئەو دەروونناسییە مرۆییەدا یەکناگرێتەوە کە زانراوە لەمەڕ مرۆڤەوە.

ئوستاز خەتیب گوزارشت لە مەروان بە پیاوێکی ماقوڵ و ڕاساڵ دەکات و وا نابینێت شتی لەو جۆرە زشتی لێ بوەشێتەوە. ئەوەی بیرچووەتەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا کاری زۆر لەمە زشت و ناپەسەندتری کردبوو، تا پێغەمبەر شاربەدەری کرد و نەیهێشت بێتەوە بەو ناوەدا، هەر بە شاربەدەرکراوی لە تائیف مایەوە تا سەردەمی خەلیفەی سێیەم. لە دیدگای خەتیبدا، مەروان بووبووە پیاوچاکێک. لەبەر ئەوەی دواتر بووبووە خەلیفەی موسوڵمانان و ناوی چووبووە لیستی ئەمیرە مسوڵمانەکانەوە. ئەمە پیشەی واعیزەکانی سوڵتانە لە هەموو دەوروخولێکدا. ئەوان وا دەزانن هەچکەس دەسەلاتی گرتەدەست، ساڵحە، کەچی ئەوەی شۆڕش دژی سوڵتان بکات بە ناپیاو و بێهۆش و تاوانباری لەقەڵەم دەدەن.

ئەگەر قۆناغبەندی بەر لە کوژرانەکەی عوسمان بکەین، دەبینین مەروان شتانێکی زۆری ئەنجامداوە، هەر لە هاندانی شۆڕشگێڕەکانەوە تا ڕێگری سوڵح و ئاشتی لە نێوان ئەوان و عوسماندا. ئەوەی بە جوانی لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانە بۆ وەزعەکە

بکات، هەرگیز مەروانی بەئەستۆ پاکی بۆ دەرناهێندرێت و تۆمەتی کەنەکردنی دەداتە پاڵ.

**دەتوانین بارودۆخەکە بکەین بە سێ قۆناغەوە:**

قۆناغی یەکەم: هاتنی شۆڕشگێڕەکان بۆ مەدینە، داواکارییەکانیان لە دادپەروەری و شوێنکەوتنی سوننەتی دوو خەلیفەکەی پێشی خۆی. ئەوەبوو شۆڕشگێڕەکان گەڕانەوە زێدی خۆیان پاش ئەوەی عوسمان ڕەزامەندی بۆ دوو داواکارییەکەیان دەربڕی.

قۆناغی دووەم: گەڕانەوەی شۆڕشگێڕەکان پاش قەیرێک بەرەو مەدینە، ئەمە پاش ئەوە هات، لە ڕێگەدا نامەیەکیان بینی، کە مۆری عوسمانی لێدرابوو، تێیدا فەرمان بە والی میسر کرابوو، بە گەیشتنەوەی ئەم جەماعە، دەستبەجێ هەموویان لەناوببرێن.

قۆناغی سێیەم: تەوقدانی ماڵەکەی عوسمان بە بەردەوامی تا ئەوەی ڕۆژێکیان دایان بەسەریدا و کوشتیان. ئەگەر بێین و توێژینەوە بۆ قۆناغی سێیەم بکەین، دەبینین مەروان هەمیشە بەربەست بووە لە نێوان پێکهاتنی ئەم دوو بەرەیەدا.

عوسمانمان بینی، لە سەرەتاوە نەرمونیان وەک سیفەتی هەمیشەیی خۆی، داوای لێخۆشبوونی لە خودا دەکرد و دەگریا و خەڵکیش لەگەڵی دەگریان تا ڕیشیان لە ئەسرینان تەڕ دەبوو. جارێکیان لە وتاردا وتی: ((ئەگەر من هاتمە خوارەوە... ئەوا با وەفدێکتان بێت بۆلام، هەر گرفتێکتان هەیە، بیڵێن با بۆتانی چارەسەر بکەم، هەر داواکارییەکیشتان هەیە، بیڵێن تا جێبەجێی بکەم)). عوسمان هەر نەگەیشتە ماڵەوە، مەروان هات و تانەی لێدا کە تۆ زۆر ترسنۆک و بێتوانایت، ئابەم شێوەیە: "سوێند بە خوا، بەردەوام بوون لەسەر

هەڵەیەک کە دوایی داوای لێخۆشبوونی لەسەر بکەیت، زۆر باشترە لە تەوبەیەک کە لە ترسان ئەنجامی بدەیت)). هەر گەرماوگەرمیش چووە لای شۆڕشگێڕەکان و بە دەنگی بەرز گوتی: ((ئەوە چیتانە دەڵێی بۆ تـاڵانی و بـڕۆ هـاتوون، دەک دەموچاوتـان خـواتەوە، هـاتوون ئەم دەسـەڵاتەمان لـێ بسـەنن؟ سـوێند بە خـوا دەسـتمان لە خەنەدا نییە بۆتان)). ئەم قسانەیش هێندە تفت و تاڵن، هـیچکەس لە بەرانبەریانەوە بێـدەنگ نابێـت. مەروان جێنشـینایەتییەکی عوسـمانی وەک مـوڵکی قـورەیش نـاوزەد کـردووە، شۆڕشگێڕەکانیشـی وەک مونافیسـی قورەیش. جارێکی دیکەیش هەر مەروان لە مزگەوت هەستاوەتەوە و گوتوویەتی: ((سـوێند بە خودا، ئەگەر دەتانەوێت با شمشێر حوکمی نێوانمان بکات)). عوسمان لەسەر ئەم قسەیەی، لۆمەیەکی باش باشی دەکـات بە بەرچـاوی خەڵـکەکەوە. ئیـدی لە کۆتاییـدا عوسـمان بەڵێننامەیەکی بۆ شۆڕشگێڕەکان نووسی، تێیدا هاتبوو:

١. هەر کەس دوورخراوەتەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە.

٢. ئەوەی بێبەشە، بەشی دەدرێت.

٣. دەسکەوتی جەنگ بە یەکسانی دابەش دەکرێت.

٤. کەسی شیاو دەخرێتە پلە و پۆستەکانەوە.

ئیـدی شۆڕشـگێڕەکان گەڕانەوە بـۆ ناوچەکـانی خۆیـان لە پـاش بەڵێننـامەکە. بەڵام لە ڕێـگەدا سـوارچاکێکیان بینـی، لە سـوارەکانی دەوڵەت بە وڵاغی دەوڵەتەوە کە نامەیەکی پێیە بۆ والی میسر و تێیدا فەرمـان دراوە بە کوشـتنی ئەم جەمـاعەتە، نـامەکەیش سـەرمۆری عوسمانی لێدراوە. ئیدی خوێن بەرچاوی گرتن و بە هەڵەوداوان ڕێی مەدینەیان گرتەوە بەر. عوسمان ئەستۆپاکی خۆی لەو کارە ڕاگەیاند، هەر نایشـچێت بە عەقڵدا عوسمان داوای وەها کارێک بکات لە والی

میسر، ئەم شتە زۆر دوورە لە سروشتی عوسمانەوە تەنانەت داوای کوشتنی یەک کەسیش بکات. ئـێ ئێستا دەبێت کێ ئەم نـامەیەی نووسیبێت و مۆرەکەیشی لێ دابێت؟

ئوستاز خەتیب دەڵێت: هەبێ و نەبێ، ئەمە کاری سەبەئییەکان بووە، هیـی مـالیکی ئەشـتەر و ئەوان. ئەو دەڵێـت: "هـیچ کەسـێک هێنـدەی ئەشتەر بەرژەوەندی لە نوێبوونەوەی فیتنەکەدا نەبووە". بەڵام ئوستاد عەقاد بڕوای وایە ساختەکارەکە خودی مەروان بووە، ئەو هەرچـی خراپە و ڕەشـییە لەم فیتـنەیەدا، هەمـوی دەیداتە لای مەروان. عەقـاد دەڵێـت: ((... ئەگەر مەروان دەسـتی لەم فـێڵەدا نەبـوایە، ئەوا زۆر بەئاسـانی دەیتـوانی ڕاسـتی بـابەتەکە بزانێـت، ئەویـش تەنهـا بە پرسـیارکردنێکی سـادە لە سـوارچاکەکە، لە کـاتی دەرکەوتنـی ڕاستییەکەیشدا، ئەستۆی ئەو پاک دەبووەوە و دەبووە خاوەن عیزەت و ڕووی نەیارەکانیشی ڕەش دەبوو، هەمـوو ئەو دەمهەڵبەستانەیشـی کە باسـی ئەو دەکەن لە خۆشـکردنی ئـاگری جەنـگ، هەمـوـوی دادەمرکـایەوە، بەڵام ئەو تەنـانەت ئەم پرسیارەیشـی نەکـرد، بەوە کیفایەتی کرد کە تۆمەت بخاتە ئەستۆی ئەوانەی کە ئەمیان تاوانبار کردووە.))

شۆڕشگێڕەکان مەروانیان بە ساختەکردنی نامەکە تۆمەتبار دەکرد، مەروانـیش خۆیـانی بە تەزویرکـردنەکە تۆمەتبـار دەکـردەوە. باشـە لێرەدا کامیان ڕاست دەکەن و کامیان نایکەن؟

هێندێک لە مێژوونووسـان مەروان تاوانبـار دەکەن، چونکە هـیچکەس بوێری ئەوەی نەبووە مۆری خەلیفە بەکار بهێنێت بێجگە لە مەروان، چونکە ئەم بەڕێوەبەری دیوان و وەزیری خاوەن متمانەی بوو. من وای بـۆ دەچـم، مەروان دڵقەبـز بووبێـت بەوەی کە شۆڕشـگێڕەکان بەسەلامەتی و بەبێ هەراوهوریا گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، بۆیە

ئەو نامەیەی زۆر بەپەلە ساختەكردووە. ئەوەی كە بنیام سەری لێی دەئاوسێت، ئەم سوارچاكەی كە هەڵگری نامەكەیە، هەر ڕێك لەگەڵ قافڵەی شۆڕشگێڕەكاندا دەكەوێتە ڕێ و لە ڕێگەیشدا خۆی نیشانی ئەوان دەدات، هەندێك جاریش تەواو نزیكیان دەبێتەوە، لێ دەپرسن ئەرە تۆ كێیت؟ ئەویش دەڵێت: من نێردراوی خەلیفەم بۆلای والی میسر. ئیدی دەستگیری دەكەن و دەیپشكنن، لەو كاتەدا نامەكە پەیدا دەكەن و دەبینن بە مۆری عوسمانەوە فەرمان بەكوشتنیان دراوە.

بەڕاستی بارودۆخەكە لە لووتكەی عاجباتیدایە. هیچ لێكۆڵەرێك نییە لە كاتی ڕوومالّی ئەم بابەتەدا تووشی دەهشە و سەرەگێژە نەبێت، ئەم كارە بەخەستی بۆنی پیلانگێڕیی لێ دێت، بەڵام ئایا پیلانگێڕەكان كێن؟ قورەیش یان سەبەئییەكان؟

ئەو پرسیارە با خوێنەر خۆی وەڵامی بداتەوە...

لە كۆندا وتراوە: 'دەسەڵات نەزۆكە'، ئەمرۆیش دەگوترێت: 'سیاسەت دڵی نییە'. ئەمە ئەو شتەیە لە هەموو كایەكاندا تێبینی دەكرێت ئەو دەمەی سیاسەت خۆی تێ دەخزێنێت. سیاسییەكان گوێیان لێ نییە، پێغەمبەری خودا دەكوژن، ئەگەر دینیان بووەتە لەمپەر لە ڕێگەی چوونە سەر كورسی. لە مێژووی ئیسلامدا هیچ كارەساتێك هێندەی كوژرانی عوسمان، زیانباریی نەگەیاندە ئەم ئاینە نوێیە. مالّی ئەوە برمێت كە نەخشەكەی بۆ كێشا. ماڵەكەی بەراوەژووبێت ئەو كەسەی دەستی لەم كارە ئاشووبەنگێزەدا هەبوو بۆ خاتری فەخری عالەم. شۆڕشگێڕەكان گەمارۆی ماڵەكەی خەلیفەیان دابوو، دەیانگوت یان دەبێت دەستلەكارترازان بنووسێت، یان دەكوژرێت. ئەی باشە عوسمان بۆچی دەستی لەكارنەترازاند؟ ئەمەیش پرسیارێكی دیكەیە كە مێشك تووشی ئاڵۆش دەكات! عوسمان پیرەپیاوێكی نەوەدساڵە، تێری لە دنیا هەڵكڕاندبوو، ئیدی بۆ وازناهێنێت و كارەكە ناسپێرێت بە

شورا؟

مێژوونوس "بیلازەری" دەگێڕێتەوە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر چووە لای خەلیفەی سێیەم، ئەو دەموساتەی کە ماڵەکەی گەمارۆ درابوو. کە چووە لای، ئەم گفتوگۆیە لە نێوانیان ڕوویدابوو:

عوسمان: بنواڕە ئەمانە چییان دەوێت... دەڵێن: یان دەست هەڵگرە یان دەتکوژین.

عەبدوڵلا: ئایا تۆ کەسێکی نەمریت لە دنیا؟

عوسمان: نەخێر.

عەبدوڵلا: ئایا لە کوشتن زیاتر هیچیان لەدەست دێت.

عوسمان: نەخێر.

عەبدوڵلا: ئایا بەهەشت و دۆزەخی تۆ بەدەست ئەوانە؟

عوسمان: نەخێر.

عەبدوڵلا: دەی کەواتە کراسی خودا لەبەرت دامەماڵە، ئەگینا دوای تۆ ئەم شتە دەبێتە نەریت، هەر دەسەلاتدارێکیان بەدڵ نەبوو، پێی دەڵێن: یان دەتکوژین، یان دەبێت دەست لەکار بترازێنیت.

من هەرگیز بڕوا ناکەم ئەم قسەیە هیی ئیبن عومەر بێت، ئەگەری زۆری هەیە هیی مەروان بێت. جێنشینایەتی کەی کراسی خودایە؟ ئەوە کەرەستەی میللەتە، ویستیان دەیدەن و نەیانویست، دەیدەنە کەسێکی دیکە. ئەمە چەمکی شورایە، ئەوەی کە ئیسلام هێنای. بەنی ئومەیە شورایان هەر لە ڕەگەوە وشک کرد، لە جێگایدا سیستەمی میراتگیرییان دانایەوە -وەک چۆن بەر لە ئیسلام هەبوو-. ئەوان وەک چۆن کوڕێک لە باوکییەوە کراسێک یان پارچەزەوییەکی بۆ جێ

دەمێنێت، ئاوەهایش موڵک و دەسەڵات. لەوانەیە هەر ئەمەیش بە بیری مەرواندا هاتبێت لەو ساتەدا. لەوەیش دەچێت مەروان ئەم شتەی چپاندبێت بە گوێی عوسماندا و شتەکەی لەلا شیرین کردبێت و عوسمانیش نکوڵی لە وازهێنان کردبێت، چونکە ئەمە کراسێکە و خودا دووریویەتی بۆ بەری ئەم و هیچکەسیش بێجگە لە خودا ناتوانێت لەبەری داماڵێت.

سەحابەیەکی بەساڵاچوو لە ماڵەکەی عوسمان نزیک بووەوە لە کۆتا کاتژمێرەکانی گەمارۆدا، بە دەنگی بەرز هاواری ویستی ئامۆژگاری عوسمان بکات دەستبەردار ببێت تا خوێن نەڕژاوە. بۆ خۆی تیرێک لە ماڵەکەی عوسمانەوە ئاراستەی ئەم قوڕبەسەرە کرا و هەر لە جێدا پووکی چنی و مرد. لە پاش ئەمە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو.

دەکرێت بزانین ئەوە کێ بو ئەم تیرەی هاویشت؟ بۆچیش هاوێژرا؟

گومان لەوەدا نییە، ئەم گەمارۆیەی ماڵی عوسمان یەکێک بو لە جەنگە هەرە یەکلاکەرەوەکانی مێژوو. شۆڕشگێران دەیانویست لایدەن و خۆیان بچنە جێگەکەی. قوڕەیشی دەیانویست خەلیفە بکوژرێت بەرلەوەی بڕیاری دەستلەکار ترازان واژۆ بکات، تا لە ڕێگەیەوە بتوانن شۆڕشگێران بە بکوژی خەلیفە تۆمەتبار بکەن و هەر لەوێدا بینەقاقای شۆڕش بگرن و بیتۆپێنن و لاشەکەیشی دوور فڕێدەن. قەدەریش هەر ئەوەی ویست کە ئەمان ویستیان.

خۆ ئەگەر عوسمان توانیبای لە دوایین چرکەساتدا، خەلیفایەتی لە خۆی داماڵێت، ئەوا ئەگەری زۆر بەهێز، عەلی دەبووە جێنشین. ئەگەر ئەمەیش ڕوویدابا، مێژوو بە ئاقارێکی دیکەدا دەڕۆیشت جیاواز لەوەی ئێستا پێدا ڕۆیشتووە. ئیبنولعەرەبی دەڵێت: ئەوە عوسمان خۆی بوو دەرگای بۆ شۆڕشگێران کردەوە تا بێنە ژوورەوە و

دەستی لێ بەرز بکەنەوە و بیکوژن. ئەگەر ئەم قسەیە ڕاستیش بێت، مانای وایە یەکێک لە نزیکانی عوسمان دەرگاکەی کردووەتەوە تا بێنە ژوورەوە. هەرگیز ڕێی تێناچێت عوسمان خۆی بێت و بە دەستی خۆی دەرگا بکاتەوە و خۆی تووشی تەهلوکە و کوشتن بکاتەوە. دکتۆر تەها حوسەین پێی وایە: "عوسمان لە کۆتا ساتەکانیدا ویستوویەتی دەستبەرداری خەلافەت بێت و کارەکە بسپێرێت بە شورا، تا بەرگری لە خوێنڕێژی بکات. ئەم دیدگایەیش ماقوولە و ڕێی تێدەچێت، چونکە عوسمان هەر خۆیشی حەزی لە ئاشتی و ئاسایش بوو.

ڕێی تێدەچێت مەروان هەستی بەم نیەتەی عوسمان کردبێت و ویستبێتی جوولەیەکی بەپەلە ئەنجام بدات تا کارلەکار نەترازاوە. دەرچوونی مەروان و هەندێکی دیکە لە چەکبەدەستانی بەنی ئومەییە لە کۆتا چرکەساتەکان و داوای جەنگ و زۆرانبازیکردن لە شۆڕشگێڕان وەک ئەوەی لە مەیدانی جەنگدابن، عوسمانیش لەولاوە داوای لێ دەکردن ئارام بگرن، بەڵام هەر گوێیشیان بۆ نەگرت و وەڵامیشیان نەدایەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی سوێنیان لێ بخوات شمشێرەکانیان دانێن. ئیدی هەندێکیان شمشێرەکانیان دانا، بەڵام بەنی ئومەیە دایان نەنا، لەو دەمەی شەڕوهەرا دەستی پێکرد، یەکێک لە ماڵەکەی عوسمان بەپرتاو هاتە دەرەوە و گوتی: "ئەرەوەڵا عوسمانمان کوشت."

دەڵێن: لە کۆتا ساتەکاندا سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لەلای عوسمان بوو، گوێی لێگرت و دوابەدوای خۆی گەڕایەوە تا عەلی بدۆزێتەوە، ئیدی لە مزگەوت عەلی پەیدا کرد و پێی گوت: "زووکە ئەبوحەسەن، هەواڵێکم بۆ هێناویت کە کەس هەواڵی وای پێ نییە، خەلیفەکەمان ڕەزامەندیی دەربڕیوە کە دەستبەرداری خەلیفایەتی بێت، زووکە و

فریاکەوە و سەری بخە)). لەم قسانەدا بوون، یەکێک خۆی کرد بە مزگەوتدا و هاواری کرد: "عوسمان کوژرا". عەلی تووڕە بوو کە ئەم هەواڵەی بیست و گەیشتە ئەوێ و لۆمەی هەردوو کوڕەکەی کرد کە ئەوان چۆن هێشتوویانە شتی وەها ڕوو بدات لە کاتێکدا ئەوان چووبوون بۆ پارێزگاری لە بەردەمماڵەکەیدا. تەلحە وەڵامی دایەوە: لێیان تووڕە مەبە نەفرینیان لێ مەکە، ئەگەر مەروان نەبوایە نەدەکوژرا. لە هەموو ئەم ڕووداوانەوە تێدەگەیت شتێکی شاراوە لەئارادا بووە، ئاڵۆزی لە هەر شەش-لاوە دەوری ئەم کوشتنەی خەلیفەی سێیەمیان داوە.

*** *** ***

دکتۆر تەها حوسەین پرسێکی گرنگ دەورووژێنیت، کە شایەنی بیرلێکردنەوەیە. لای لێکۆڵەرانی پێشین وەڵامێکی ئەوتۆ دەست ناکەوێت، یان لەوانەیە بەلایانەوە گرنگ نەبووبێت یان هەر بیریان بەلایدا نەچووبێت. پرسیارەکەیش ئەمەیە: بۆچی والییەکانی عوسمان دەسپێشخەرییان نەکرد و عوسمانیان نەپاراست بەر لەوەی شۆڕشگێڕەکان ئابلۆقەی بدەن و دواتریش بیکوژن؟ زیاتر لەمەیش دەپرسێت: عوسمان والییەکانی ڕاهێنابوو، هەموو ساڵێک لە وەرزی حەجدا بێنە سەردانی. ئەوە خێربوو ئەو ساڵە هەموو لە ماڵەوە دانیشتبوون و خۆیان لکاندبوو بە زەویدا؟ عوسمانیش هێندە گوزەرانی تەڵخ بوو، خۆی نەیتوانی حەج بۆ خەڵکەکە بکات و مەجبوور بوو بە ئیبنو عەباس بڵێت: تۆ بڕۆ حەج بۆ خەڵکی بکە! لەمەیش هێشتا نامۆتر: وەک مێژوونووسان دەڵێن: ئیبنوعەباس

نامەیەکی لە لایەن عوسمانە پێبوو بۆ خەڵکی، کە تێیدا باسی گرفتە هەنووکەییەکانی دەکرد و تێیشیدا بەرگری لە نەفسی خۆی دەکرد. ئیبنوعەباس نامەکەی بۆ خەڵکی خوێندەوە، پاش تەواوبوونی خوێندنەوەکە، خەڵکەکە بە جۆرێک بڵاوەیان لێکرد، وەک بڵێیت هیچیان نەبیستبێت. والییەکەی مەککەیش قەپی کردبوو بەزەویدا و بەزۆریش ئەلفێکی لە زار دەرنەدەچوو، خەڵکیش نەیاندەگوت ئەرێ تۆ بڵێیت نهێنیی ئەم شتە چی بێت.

دکتۆر تەها حوسەین دەیەوێت خۆی وەڵامی پرسەکە بداتەوە و دەڵێت: "خەڵکی ئومێدبڕاو بووبوون لە عوسمان، بێزار بوون لە سیاسەتەکەکانی. لە دیدگای منەوە ئەم قسەیە ورد(دەقیق) نییە، گریمان خەڵکەکە سوودیان لە عوسمان نەبینیوە، ئێ خۆ والییەکان کەوتبوون بەسەر نەرماییدا؟ شەهرستانیش دەڵێت: والییەکانی عوسمان نەرێی ئەوەیان کرد کە هاریکاری عوسمان بکەن لەو مەینەتییەدا، ئاوا قەباعەتباریان کرد تا خستیان بەسەر ئەجەلی خۆیدا. ئەم قسەیەش بەشێک لە ڕاستی تێدایە. لە ڕواڵەتدا والییەکانی عوسمان خەریکی شەوەپیلانێک بوون، خودایش خۆی بەتەنیا دەزانێت ئەو پیلانە چی بووە؟.

ئاشکرایە مەعاویە سوپایەکی بۆ هاوکاری عوسمان ناردبوو، بەڵام سوپاکە لە "شیوی قورا" نزیکی مەدینە بنەی خستبوو، بنەیان لەوێ هەڵنەگرتەوە تا بیستیان عوسمان کوژراوە، هەر کە بیستیشیان، بە پشتی خۆیاندا ڕاستەوڕاست گەڕانەوە بۆ شام، وەک بڵێیت چاوەڕێی ڕووداوەکە بووبێتن.

*** *** ***

هەمــوو مێژوونووســان هــاوڕان لەســەر ئەوەی عوســمان لە نیــوەی یەکەمــی خەلافەتەکەیدا لەســەر ســوننەتی پێشــینی خــۆی ڕۆیشــتووە، دواتــر گۆڕانکــاریی بەســەر سیاســەتیدا هــاتووە. ئەمەیــش جێکەوتــی لەســەر خەواریجەکــان دانــا. ئەوان لە ســەرەتاوە دانیــان بە دروســتی خەلافەتی عوسماندا نابوو، بەڵام دواتر دەیانگوت ئەو گۆڕاوە و وەک جــاران نەمــاوە. ئــێمە لێــرەدا نامانەوێــت لێکــۆڵینەوە لە دیــدگای خەواریجەکــان بکەیــن تــا بزانین چەنــدە لە ڕاستییەوە نــزیکن، بەڵکوو تەنها مەبەستمانە ئەو وەک یەکییە ببینین کە لە نێوان قسەی ئەمــان و قسەی مێژوونووســەکاندا، ئەو مێژوونووســانەی کە کەمێک لەمەوبەر باسمان کرد. وا دەر دەکەوێت مســوڵمانی ئەو ســەردەمەیش هەروەک خەواریج دەرکیان بەو گۆڕانکارییە لە بەرنامەی عوســماندا کردبێت و ویستبێتیشیان نهێنییەکەی بزانن.

تۆزێــک قەبــووڵکردنی ئەم قســـەیەی خەواریـــج لەمەڕ عوســـمانەوە قورســە، لە ســەرەتاوە چــاک و لە کۆتــاییەوە خــراپ. ناکرێت کەسێک ئــاوا لەناکــاو ئەتــواری بگۆڕێــت، بەتــایبەتیش لە قــاڵبی عوســمان، ئەو پیاوەی هەموو تەمەنی پەروانەی پێغەمبەر بووە، لەو ناوەدا هاتووە و چووە و جیهادی کردووە و مــاڵی بەخشــیوە. ئەو گۆڕانە لەناکــاوەی ئەتواری خەلیفەی سێهەم، نهێنییەکی لە ناواخندا حەشار درابوو، باشە دەبێــت ئەو شــتە چــی بێــت لە ســلووکی عوســـماندا ڕوویــدابێت لە ساڵەکانی کۆتاییدا؟

(وەرگێڕ: ئێمە هەقمان بە کەسایەتی بەڕێزی خەلیفەی سێیەمەوە نییە، لەم کورتە قســەیەدا دەمانەوێت دادگاییەکی نووســەر بکەیــن، ئەویش: ئەگەر تەماشــا بکەیــن خۆیشــی تووشــی هەمــان هەڵە دەبێــتەوە کە ئاڕاســـتەی خەڵکــی دیــکەی دەکــات، ئەو ڕەخــنە لە خەڵکــی دەگرێــت بەوەی: چــۆن دەبێت بڕوایــان وابێت، بــاش تــا قەرەی قیــامەت باشــە،

خراپیش هەر خراپ، کەچی خۆی لە کەسایەتیی "خەلیفەی سێیەمی بەڕێز"دا تووشی هەمان هەڵە بووە، ئێمە مەبەستمان کەسەکە نییە کە هاوەڵی خۆشەویست عوسمانە، بەڵکوو ڕەخنەمان لە میتۆدەکەیە کە نووسەر چۆن هەمان هەڵە دووبارە دەکاتەوە کە پێشتر وەک چەک دژی نەیارەکانی بەکاری دەهێنێت.)

من وا گومان دەبەم ڕەفتاری عوسمان لە کۆتاییەکاندا گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێت، بەڵکوو گۆڕانکاریی لە داروودەستە و پێوەندەکانیدا ڕوویداوە. بە دوور نازانرێت هەر لەو ساتەوە قورەیش خەریکی کەنەکردن بووبێتن، تا نەبادا ئەمجارەیش تۆپ لە قاچیان ببێتەوە. خۆ عوسمان لەو دەمەدا تەمەنی لە هەشتا و نەوەددا بوو، ئەگەریش شۆڕشگێڕەکان نەیانکوشتبا، هەر خۆی پاش ماوەیەک لەسەر جێی وەفاتی دەکرد. خودا کردی و عوسمان بە دەستی شۆڕشگێڕەکانەوە کوژرا و بووە خێر بۆ قورەیش، لە بۆنەی ئەم کوژرانەیشەوە ئەوان دەتوانن بگەنە ئەو ئامانجەی کە گۆڕانی بە بالایدا دەلێن. خۆش لەوەدایە، کراسەکەی عوسمان و پەنجە قرتێنراوەکانی خێزانەکەی بەپەلە دەگاتە دەستی مەعاویە، وەک ئەوەی ئەم کارە بە شەو نەخشەی کێشرابێت. لەوانەیە پیلانەکە بە ورد و درشتی داڕێژرابێت و هەموویشی وەک ڕۆژی ڕۆشنا هاتبێتە دی.

*** *** ***

هەرچۆنێک بێت، مەعاویە بە جۆرێک کوژرانی عوسمانی قۆستەوە، کە وێنەی نەبێت لە هیچ کوێ. لەسەر زەویدا نەبینراوە بە "کراس"ێک دەوڵەتێک دابمەزرێت وەک کراسەکەی عوسمان بە ڕەحمەت بێت.

مەعاویە لەسەر مینبەری شام کراسەکەی بەرز دەکردەوە و خەڵکی لەگەڵیدا شیوەنیان دەگێڕا و دەیانگوت: "وا عوسمانا- هۆ عوسمان گیان، عوسمانمان ڕۆ"... ئیمامەکەمان بە مەزڵوومی کوژرا... قورئان دەڵێت:

قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾﴾ الإسراء: ٣٣

مەعاویە ئەم ئایەتەی بەکار دەهێنا لە بەرژەوەندی خۆی و لەناو هەموو شامدا بڵاوی کردبووەوە کە: "ئەوە ئەوە وەلی عوسمان و ئەو داوای تۆڵەی خوێنی دەکات، سەریش دەکەوێت ئیزنی خودا". هەر بەڕاستیش مەعاویە بە ئیزنی خودا سەرکەوت.

مەعاویە لە کاتی هەڵایسانی شۆڕشەکەدا سەردانی عوسمانی کردووە و ئامۆژگاریی کردووە کە عەلی و تەلحە و زوبەیر لەناوبەرێت، گەر ئەم ئەوان نەکوژێت ئەوان ئەم دەکوژن. عوسمانیش قسەکەی ڕەد کردووەتەوە، ئیدی مەعاویە داوای ئەوەی کردووە ئەم بکات بە تۆڵەسێنی خۆی، ئەگەر هاتوو کوشتیان، عوسمانیش ڕەزامەندی دەربڕیوە. ئەگەر ئەم گێڕانەوەیە ڕاستبێت، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی مەعاویە دەیزانی چەندە لە سوودی ئەوە عوسمان بە دەستی ئەم شۆڕشگێڕانە بکوژرێت، لەوانەیە باش باش خۆی بۆ ئامادە کردبێت.

ئەگەر کراسەکەی عوسمان نەبوایە، زۆر ئەستەم بوو مەعاویە ببێتە خەلیفە. چۆن دەکرا کەسێک کە خۆی و باوکیشی لە دژی پەیامبەری خودا بە سەختی جەنگابوون، لە پاش ماوەیەکی کورت ببێتە جێنشینی ئەو پێغەمبەرە؟ ئەوەی کە سەیرە: مەعاویە داوای خوێنی عوسمانی لە عەلی دەکرد، بەڵام هەر کە سەرکەوت، ئەوەی باسی نەما خوێن و

تۆڵە و کوشتنەوەی بکوژانی عوسمان بوو. هێندێک لە دۆستانی، تۆڵەی خوێنی عوسمانیان بیر خستبوویەوە لە کاتێکدا دنیای لە ڕوودا تەخت بووبوو، بەڵام ئەو فی فی لێدەهات. دەڵێت کچەکەی عوسمان هات و داوای خوێنی باوکی خۆی کرد، مەعاویەیش پێی گوت: ((برازاکەم... خەڵکی گوێڕایەڵیمان(طاعه) دەکەن، ئێمەیش ئەمانمان داونەتێ. ئارامگریەکمان نیشانداون کە بنەوەی هەموو تووڕەییە، ئەوانیش گوێڕایەڵییەک کە بنەکەی هەموو قینە. وەک دەبینیت هەموو کەس شمشێری لە کێلاندایە- نازانین ئەگەر بارودۆخەکە بقڵیشێتەوە، لە سوودمان تەواو دەبێت یان لە زیان. باشترە تۆیش برازای گەورەی ئیمانداران بیت تا ببیتە کەنیزەکی دەستی ئەم و ئەو...)). ئەم دانپێدانانەی مەعاویە سەیرە. دەترسێت ئەگەر تۆڵەی بکوژانی عوسمان وەرگرێتەوە، خەڵکی لە دژی ڕاپەڕن و لەسەر کورسییەکەی ڕامالرێت و خەلافەتی لێ بسەنرێتەوە، کەواتە بە کراسەکەی عوسمان خەلیفایەتی دەویست.

مەعاویە پێشتر داوای بکوژانی عوسمانی لە عەلی دەکرد، هیچ سازشێکی نەدەکرد لەسەر داواکارییەکەی. بەڵام هەر کە دەستی لە سووچی کورسییەکە گیربوو، پاساوی بۆ پەیدا کرا و خەڵکیش پاساوەکانیان لێ قەبووڵ کرد. شتێکی سەیری دیکەیش ئەوەبوو، کاتێک عەلی بووە جێنشین، هیچ تۆڵەیەکی لە بکوژانی عوسمان نەکردەوە، بگرە پلەی باشدا دایدەنان و خۆشی دەویستن و بەخێوی دەکردن. ئوستاز خەتیب پاساوی کارەکەی عەلی بەوە دەهێنێتەوە، کە ئەوان بەهێز بوون و ئەم نەیتوانیوە بەسەریاندا زاڵ بێت. خۆ ئەگەر بیکوشتنایەتەوە، ئەوا دەرگای ئاشووبێکی بەسەر خۆیدا دەکردەوە کە داخستنەوەی ئەستەم بوو.

بەڵام ئەم پاساوە لەبەر دوو هۆکار وەرناگیرێت.

یەکەم: بینیمان عەلی هیچ کەسێکی لەبەر هێز و بازوو لەلای خۆی نەهێشتەوە لە سەردەمی خۆیدا، تەنانەت هیچ گرنگییەکیشی بە دەمارگیریی خێڵایەتی نەدەدا. ئەمەیش یەکێک بوو لە هەرە گرنگترین هۆکارەکانی لاواز دەرکەوتنی لە بەرانبەر مەعاویەوە. چونکە ئەم زۆر عەدالەت پارێز بوو، ئەمبەر و ئەوبەری نەبوو. ئەوە کەسەی کە خەلیفایەتی لەدەست بدات لەبەر بەرپاکردنی عەدالەت، بە هیچ شێوەیەک سڵ لە قیساس -خوێن وەرگرتنەوەی لەبر- ناکاتەوە ئەگەر بزانێت واجبە.

دووەم: نەک هەر عەلی بێدەنگ نەبوو لە بکوژانی عوسمان، بەڵکوو پاراستنی و کاری مەزن مەزنی پێ سپاردن و لە زۆرێک لە بارودۆخەکاندا پشتی پێ دەبەستن. مالیکی ئەشتەر سوپاسالاری عەلی بوو لە هەردوو جەنگی سەفین و بەسرەدا، کە خۆی یەکێک بوو لە سەردەستەی سەبەئییەکان. وەک ئاشکرایە دواتر عەلی ویلایەتی بەسرەی پێ دەسپێرێت. هێندە کاریگەری لەسەر عەلی دەبێت، عەلی لە پەسنیدا دەڵێت: "ئەشتەر بۆ من، وەک من بۆ پێغەمبەری خودایە". بە چ شێوەیەک جایزە بۆ عەلی، لە کاتێکدا دەزانێت ئەشتەر، خۆشکەری ئاگری فیتنە و هەڵایسێنەری شۆڕشەکەیە، ئا بەم شێوەیە پشتی پێ ببەستێت؟

گرفتەکە لەمە وردتر و دەقیقترە.

نامۆتر لەمە، عەلی لە کوژرانی هورموزاندا هەڵوێستێکی زۆر توندی هەبوو، داوای لە عوسمان کرد تۆڵەی خوێنەکەی لە عوبەیدوولڵای کوڕی عومەر(بکوژەکەی) بکاتەوە. تا کۆتاییش عەلی هەر دەیویست ئەو تۆڵەیە بکاتەوە. خۆ ئەگەر بەردەستی بکەوتایە، دەیکوشتنەوە. عەلی دیسانەوە هەڵوێستێکی زۆر توندی لە بارەی کوژرانی کابرایەکی مەوالییەوە هەبوو، لە کاتێکدا دەبینین هیچ خۆی تێک نادات

لە بەرانبەر بکوژانی خەلیفەوە. بەڕاستی ئەم کارە زۆر توێکڵدارە. لەوانەیە لە ناوەوەی ناو دەروونی عەلیدا، ڕاستی لای شۆڕشگێڕەکان بووبێت، حەقی دابێت بەوان. بینیبێتی وا ئەوانەی داوای دیەی عوسمان دەکەن، لە پشتی ئەمەوە مەرامێکی دیکەیان هەیە.

عەلی بەرسڤی نامەکەی مەعاویەدا، کە داوای ڕادەستکردنی بکوژانی عوسمانی دەکرد، ئا بەم شێوەیەی نووسیبوو: ((... ئەوەی کە تۆ داوای ڕاپێچکردنی بکوژانی عوسمانت کردووە، هەرچەندی من تەماشای بارودۆخەکەم کردووە، هیچ شتێک پاڵم پێوە نانێت، تا ئەمانە ڕادەستی تۆ، یان بێجگە تۆ بکەم. بە گیانی خۆم، ئەگەر لە کەللەی شەیتان نەیەیتە خوارەوە، ئەوا هێندی پێ ناچێت بەردەبنە گیانی تۆیش، ئیدی پەیدات دەکەن، چی لە ئاو بیت یان لە وشکانی، چی لە شاخ بیت یان لە باخ. ئەمە هیچ نییە بێجگە لە داخوازییەکی ناپەسەندی دەروونت، سەلامیش لە کەسی شایەن بەسەلام بێت.))

لە وەڵامی نامەیەکی دیکەدا کە ئاراستە مەعاویەی دەکات، بە شێوەیەکی ئاشکرا تۆمەتباری دەکات، کە ئەوە ئەو بووە عوسمانی تەواو کردووە. عەلی دەڵێت: ((... پاشان باسی من و عوسمانت کردووە، تۆ خۆت وەڵام بدەرەوە، کاممان دوژمنی بووین و ڕێگەی کوشتنیمان ئاودێرا، ئەوە کێ بوو لە جێگەی خۆی چەقیبوو، نەدەهات بە دەمیەوە؟ ئەی ئەوە کێ بوو بە دەمیەوە بوو؟ ئەوە کێ بوو وازی لێهێنا تا ئەجەل ڕێگەی پێگرت؟ نەخێر سوێند بە خودا... خودا خۆی دەیزانی ئەوانە کێن کە خۆیان بە زەویدا چەسپاندبوو، بە هاوڕێکانیشیان دەگوت، ئێوەیش وەرن، ئەمانە زۆر بەکەمی نەبێت تووشی ئازار نابن-لەبەر خۆدزینەوەیان-.

لەم دوو نامەیەوە دەردەکەوێت: عەلی مەعاویەی بە تێوەگلاو لە کوشتنی عوسمان لەقەڵەم دەدات. لەمەیش زیاتر، هەڕەشە لە مەعاویە

دەکــات، ئەگەر لەکەلــی شــەیتان نەیەتە خــوارەوە، ئەوا بکــوژانی عوسمانی کوڕە مامی بۆ ڕەوانە دەکات، چییان لەو کرد، ئاوەهایش لەم بکەن. هەرچۆنێک بێت، ئێمە ڕاستی و دروستی ئەم دوو نامەیە نــازانین، کە ئایــا ڕاســتن یــان بە درۆوە دراونەتە پــاڵ عەلــی. بەڵام هەردووکیان لە "نەهجول بەلاغە"دا هەن، ئەم کتێبەیش ناتوانرێت دان بەڕاستێتی هەموویدا بنرێت، چونکە دوای دەورانێکی زۆر لە فەوتی عەلی نووسـراوەتەوە، ڕەنگە قسـەگەلێکی زۆر زۆری تێدا بێت کە بە دوولێوەی عەلیدا نەهاتوون و ڕۆحیشی ئاگاداریان نییە. حاڵ و باڵەکە هەرچۆنێـک بێـت، زۆریـش بەدوور نابینرێـت ئەم نامــانە لە عەلیـیەوە نێردرابن، چونکە بارودۆخەکە و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارە ڕێگە بە شتی لەم بابەتەیش دەدەن.

تەبەری دەگێڕێتەوە، عەلی لە بارەی کوژرانی عوسمانەوە گوتوویەتی: ((... ئەم ڕووداوە کە ڕوویدا بەسەر ئەم ئوممەتەدا، هەمـووی بەهـۆی کەســانێکەوە بــوو کە هەڵــپەی دونیایــان بــوو، لە حەســوودییان نەیاندەزانی چی بکەن، کە خودا ئەم هەموو نیعمەت و فەزڵەی بەسەر ئەم میللەتەدا باراندووە، دەیانەوێت بیخەنەوە سـەر قەوانە کۆنەکەی جاران و تەخت و تاراجی دەربهێنن.))

ئوسـتاز خەتیـب ڕاڤەی ئەم قســەیە دەکـات، کە گـوایە عەلـی لـۆمەی شۆڕشــگێڕەکان دەکــات. بەڵام بە خــودا ئەم قســەیە لە ســەیری و سەمەرەیدا سەری داویتی لە هەور. ئەگەر عەلی ویستبێتی بەم قسـانە لۆمەی شۆڕشـگێڕەکان بکات کە دەیانەوێت شتەکان بـخەنەوە سـەر قەوانە کۆنەکەی جاران، چۆنچۆنی ڕێگەیان پێ دەدات هاوکاری بن لە خەبات دژی مەعاویە و پلە و پۆستی بەرزیان بداتێ؟ من زۆر مێشکم بەلای ئەوەدا دەچێت، عەلی دەیەوێت زەمی قورەیش بکات بەو قسانە. ئەو وا دەبینێت ئەمـان بەخیلن، دەیانەوێت شـتەکان بگەڕێننەوە سـەر

دەورانی زەمانی جاهیلی. ئەم گومانەیش کە من بۆی دەچم، زۆرێک لە بەڵگە مێژووییەکان پشتی دەگرن.

عەلی نامەیەکی بۆ عەقیلی برای نووسی و تێیدا نووسیبووی: ((قورەیش لە خۆت دوورخەرەوە، ئەوان لە تاریکاییدا هەنگاو هەڵدەنێن و بەرەو گومڕایی دەڕۆن، قورەیش گەلەکۆمەیان لە براکەت کردووە، هەروەک ئەوەی دوێنێ لە پێغەمبەری خودایان کردبوو...)). ڕۆژێکیان عەلی بەڕاشکاوی گوتی: ((ململانێی من و قورەیش؟ بەو خودایە بەکافری لێم لارکردوونەتەوە، بە فیتنەیش دەیانکوژم، سوێند بە خودا لە کۆڵی باتڵ نابمەوە تا ڕاستی ڕۆشن نەکەمەوە، بڵێ بە قورەیش بەقەد بەرەی خۆیان پێ ڕاکێشن.))

مازنی دەڵێت: عەلی بێجگە لەم دوو بەیتە هیچ شیعرێکی دیکەی لە بارەی قورەیشەوە نەوتووە:

تِلْكُمْ قُرَيْشٌ تَمنَّاني لتَقْتُلَني

فلا وَرَبِّك ما بَرُّوا وما ظَفِرُوا

فإن هلَكتُ فرهنٌ ذِمَّتي لهُمُ

بذات رَوْقَيْنِ لا يعفو لها أثَرُ"

ئەوە قورێشن لە خودایانە بمکوژن، سوێند بە خودا هیچ سوودێکیان دەست ناکەوێت لەو کارەیاندا، ئەگەر من بفەوتێم (بمێنم- لە شێوەیەکی تری شیعرەکەدا لە باتی "هلکت"، "بقیت" بەکار هاتووە) ئەوا لە ئەستۆی ئەوانم.

"شەریف ئەلڕەزی"یش دەڵێت: جارێکیان عەلی وتاری دەدا، گوتی: ((خودایە: قورەیش و ئەوانەیشی هاوکاریی قورەیش دەکەن دەدەمە دەست تۆ، ئەوان سیلەی ڕەحمی منیان پچڕاند. ئارامیان لەبەر بڕیوم، هەموو کۆبوونەوەتەوە لە لێسەندنەوەی شتێک لێم، کە لەوانی دیکە لە

پێشترم بۆ وەرگرتنی)). ئەم ئاماژانە هەموو ئەوە نیشان دەدەن، کە ڕقێکی دووسەرە لە نێوان عەلی و قورەیشدا هەبوو. ئەوان هەر لەسەر هەمان بنەما دژی عەلی دەجەنگان، کە پێشتریش دژی پێغەمبەر (دخ) جەنگابوون.

*** *** ***

ئوستاز خەتیب وای دەبینێت، کە ئەو ناکۆکییەی نێوان عەلی و مەعاویە، هەروا شتێکی ڕاگوزەر بووە و بەهۆی سەبەئییەکانەوە کەوتووەتە نێوانیانەوە. لە دیدگای خەتیبەوە، سەبەئییەکان ئۆباڵی ئەم هەموو ڕقەبەرایەتییە کوشندەیەیان لە گەردەندایە. ئەو عەلی و مەعاویە لە یەک تۆپی قوماش دەزانێت و هەردووکیان چاک و باش بوون و لەبەر خاتری خودا ئەم کارەیان کردووە، چونکە بنەما و عەقیدەیان هەر یەکێکە. مامۆستا خەتیب دەڵێتەوە: ((ئەهلی سوننەت پێیان وایە، هەریەک لە عەلی و مەعاویە لەسەر حەق بوون، هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەری خودا بوون، هەردووکیشیان دڵسۆز بوون. ئەوەیشی کە جیاوازیی لە نێوانیاندا دروست بووە، ئەوە لەسەر کۆمەڵێک بابەتی "ئیجتیهاد"ـی بووە، هەروەک ئەوەی موجتەهیدەکان لە شتانێکدا لەگەڵ یەک کۆنابنەوە. ئەوان لەهەر دۆخێکدا، چی بپێکن یان بە هەڵەدا بڕۆن، مادامەکی دڵسۆزن، هەر دەکەون بەسەر "پاداشت"دا. پاداشتی پێکەر دووبەرانبەری نەپێکە. مزگێنی مەعسوومیش بە هیچ کەسێک لە پاش پێغەمبەرەوە نەدراوە....)). نامانەوێت موناقەشەی دیدگای مامۆستا بکەین، چونکە دوور نییە هەریەک لەو دوانە مەبەستیان گوێڕایەڵی خودا بووبێت، بەڵام گرفت

ئەمجارە لە شوێنێکی دیکەوە سەر هەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە کامەیە داخوازی و ویستی ڕاستەقینەی خودا. لە کۆن و نوێ، هەر کەس دەگریت، هەر دەڵێت من لەبەر خاتری خودا ئەو کارانەم ئەنجام داوە. لە ئێستایشدا بالۆرەیەکی دیکە داهاتووە، هەرکەس لافی ئەوە لێدەدات، کە دەیەوێت لەپێناوی نیشتیماندا گیانی ببەخشێت.

خۆی گرفتەکە لە گوێڕایەڵی پەروەردگاردا نییە، بەڵکوو لەوەی چۆن و بە چی میکانیزمێک ئەم گوێڕایەڵی لەبەر خواییە بەجێ دەگەیەنیت؟ لە پشتی عەلییەوە مەوالی و خێڵەکییەکان هەبوون، ئەمان فەرمانی خودایان لەوەدا دەبینییەوە، کە عەدالەت و یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا جێبەجێ بکرێت. مەعاویەیش قورەیشی لە پشتەوە بوو، ئەویش ئەمری خودای لە گوێڕایەڵی وەلی ئەمردا دەبینییەوە. لە دیدگای ئەویشەوە وەلی ئەمر بەتەنها گرووپێکی کەمی ناو خەڵکی بوون.

حەکیمان گوتوویانە: "گرنگ نییە ئێمە لەگەڵ خودا بین، بەڵکوو گرنگ ئەوەیە خودا لەگەڵ ئێمە بێت". بۆیە دەبینیت هەریەک لە ئێمە لافی ئەوە لێ دەدات کە لەگەڵ "خودا"دایە، بەڵام ئایا خودا ڕەزامەندە کە تۆی لەگەڵ بیت؟ لە کاتی وەرگرتنی خەلافەت، عەلی وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ((هۆ گەلۆ... ئەوە باش بزانن: منیش یەکێکم لە ئێوە، بۆ ئێوە چی هەیە و چیتان لەسەرە، بۆ منیشە و لەسەر منیشە. من لەسەر پێڕەوی پێغەمبەرەکەتان بەڕێوەتان دەبەم، ئەوەیشی فەرمانم پێدراوە لەسەرتان بەجێی دەگەیەنم. ئینجا هەر پشکێک کە عوسمان لە ماڵی خودا داویەتی بە ئەم و ئەو، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خودا -بەیتومال-، بەڵام ئەوەی بە مافی خۆی پێی درابێت هیچ شتێک ناتوانێت ڕاستی هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام ئەوەی دابێتی بە کەنیزەک و ژن و لە شاراندا تەخشان و پەخشانی پێ کردبێت، ئەوا عەدل چوارچێوە و فراوانیی خۆی هەیە، ئەوەی چوارچێوەکەی

تەنگەلان بکاتەوە، ئەوا سزای لەسەر توند تر دەبێت.))

مەدائینی دەڵێت: "عەلی فەزڵی کەسی بەسەر کەسی دیکەدا نەدەدا، عەرەب و عەجەم لەلای هەر بە یەک چاو تەماشا دەکران. ئەو لە بەردەم سەرۆک هۆز و میرەکاندا ملی نەوی نەدەکرد. ئەمەیش یەکێک بوو لە هۆکارە ماکەکان، کە عەرەب لێی تەکانەوە". دەگێڕنەوە: ((کۆمەڵێک لە هاوەڵانی عەلی چوونە لای و گوتیان: ئەی سالاری موسوڵمانان، ئەو ماڵ و موڵکە بدە ئەشراف و گەورەی هۆزەکان و قورەیش، ئینجا فەزڵی ئەمان بدە بەسەر مەوالی و عەجەمدا، ئیدی لێرەوە هەموو ئەو کەسانەی جێگەی مەترسین، وەک ئاو بۆت کەوی دەبن. ئەمان بۆیە وایان وت، چونکە مەعاویە وای دەکرد، ئەویش گوتی: ئایا دەتانەوێت من بە ستەم خۆم سەربخەم؟!)) بۆیە گرفتەکە لەوە گەورەترە کە مامۆستا خەتیب و هاومەشرەبەکانی لە واعیزەکانی سولتان بۆی دەڕوانن، کێشەکە ئەوە نییە کێ لەگەڵ خودایە، بەڵکوو ئەی خودا لەگەڵ کێیە؟

دەگێڕنەوە کابرایەک گوتوویەتی: "نوێژ لە پشتی عەلییەوە دروستترە و نانیش لای مەعاویە خۆشترە و دوورکەوتنەوە بۆ کێوان باشترە لەوەی لەم ئاشووبەدا پشکت هەبێت". لە ڕاستیشدا دانیشتن و خۆ عەزلکردن بۆ سەر کێو و ئەشکەوتان لە وەها ڕۆژگارێکی شوومدا باشترین شتە. بۆیە هێندێک هاوەڵ، کە یەکێکیشیان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بوو، ئەم کارەیان کرد. ئەوان گوتیان ئەمە فیتنەیە و خودایش فەرمانی کردووە لە فیتنە دوور کەونەوە. هەر بە کردەییش سەعد باشی کرد خۆی دوورگرت. جەنگ و هەرا ئێخەی ئەو خەڵکەی گرتبوو، ئەویش لە کۆشکەکەی خۆیدا دانیشتبوو، بیری دەکردەوە.

ئەم سیاسەتی خۆپاریزییە، کەمترین کەس توانایان بەسەریدا دەشکێت. خەڵکی لەم جۆرە بارودۆخانەدا دووکەرت دەبن. کەرتێکی

موترەف و خۆشرابوێر، کە دەیەوێت بارودۆخ نەگۆڕێت، سا نەبادا بەرژەوەندی و عەیش و نۆشی پەکی بکەوێت، لەتی دووەم ئەوەیە: هیچی نییە لە ئاگری شەردا بسووتێت و دوایی خەفەتی بۆ بخوات، بۆیە بە هەموو هێز و توانایەوە فوو لە پشکۆی ئاگر دەکات تا بگەشێتەوە. ئێ باشە کێ دەتوانێت ئەم دوو کەرتە بلکێنێتەوە بە یەکدا و لە یەک مەنجەڵدا دانوویان بکوڵێنێت؟ هیچ کەسێک ناتوانێت بچێتە سەر کێوان و خۆی بە دوور بگرێت، بێجگە کەسانێکی دڵ-ئۆقرەگرتوو، کە هیچ بەرژەوەندییان ناکەوێتە مەترسییەوە، بۆیە بۆ خۆیان هیچ دڵەتەپەیەکیان نییە. دەوڵەتی چاک و پاک ئەوەیە، دڵی دانیشتوانەکەی ئۆقرە پێ بگرێت و لە خوتەخوتە ڕزگاریان بکات. لە تەماح و لالانەوە بیانپارێزێت. ئیدی بەم کارە، هەموویان دەکات بە شاخ نشین.

***بەشی شەشەمیش کۆتایی هات***

# بەشی حەوتەم

# قوڕەیش و شیعر

قوڕەیش لە دەورانی پێش ئیسلامدا، نازکێشی هۆزە عەرەبییەکان بوو، لەو ڕێگەی نازکێشان و شتانەیشەوە دەیوست خۆی بکاتە براگەورە و سەروەریان. لەم بوارەیشدا دوو کارای یاریدەدەر هەبوون، یەکەمیان: قوڕەیش خۆیان کردبوویە خزمەتکار و مجێوری کەعبە. دووەمیشیان: کلیلی قوفڵی بازاڕە وێژەییەکانیان بە دەست بوو. قوڕەیش لە لایەکەوە ڕێز و نەوازشی ئەو وەفدانەیان دەکرد کە لە وەرزی حەجدا دەهاتن، لەلایەکی دیکەیشەوە خەڵات و نوقڵانەیان دەدایە شاعیران. ئیدی بەم بۆنەیەوە هۆزەکان بە چاوی قەدر و ڕێزەوە تەماشای قوڕەیشیان دەکرد.

بەغدادی لە بارەی عەرەبی ئەو چەرخەوە دەڵێت: ((کابرا لەوسەری دنیاوە شیعرێکی دەنووسی، کەس هەر لایشی لێ نەدەکردەوە. ڕادەوێستا تا وەرزی حەج پێڕادەگەیشت، ئیدی دەهاتە بازاڕی وێژە و شیعری خۆی دەخستە بازاڕ، خۆ ئەگەر قوڕەیش پەسەندیان کردبا، ئەوا بۆ شاعیر دەبوویە شۆرەت و ناوبانگ، بەلایەکی دیواری کەعبەوە هەڵدەواسرا تا خەڵکی چاوی لێکەن. ئەگەریش بەدڵیان نەبوایە ئیتر هیچ.

لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەی یەکەم و دووەمی ئیسلام شیعر گلۆڵەی لە لێژیی کەتبوو. پێغەمبەر کەیفی بە شیعر نەدەهات، بە میراتی جاهیلییەت هەژماری دەکرد، بەهیچ کلۆجێک ڕێگەی نەدەدا مەگەر بۆ بەرگری لە ئاین نەبێت. پرۆفیسۆر نیکلسۆن، مامۆستای وێژەی عەرەبی لە زانکۆی کامبریج دەڵێت: "گرۆی شاعیران لە سەرسەختترین نەیارانی پێغەمبەر بوون لە سەرەتای بانگەوازەوە، ئەوان بە ئاینەکەیان ڕادەبوارد... ئیدی لە دەرکەوتنی ئیسلامدا چرای شیعر نووتەک بوو، لەبەر ئەوەی ئیسلام سیستەمێکی ئاینی و سیاسی دامەزراند کە هەموو ئەو میراتە کۆنانەی بیابانی ڕەش کردەوە"[١٧٠].

لە دەورانی نەفامیدا، شاعیران دیوانی عەرەب بوون، یەکێک بوون لە دوو ئامرازە مەزنەکەی شانازیی پێوەکردن[١٧١]. هیچ نەتەوەیەک هێندەی عەرەب بەتەنگ شیعر و شانامەوە نەبوون. شیعر دووەم ئامرازی دەستی هۆزەکان بوو لە دوای شمشێر، بۆ مانەوەیان لەو سارایەدا. لەوانەیە عەرەب لە هەندێک کاتدا فەزڵی شاعیرێکیان دابێت بەسەر سوارچاکێکدا، لەبەرەوەی لە هەندێک باردا شیعر لە بەرچاویان بەهێزتربووە لە سوارچاکی. بەڵام لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا، دەوڵەتی شیعر دەستەپاچە و دەوڵەتی وتارخوێنی شوێنی گرتەوە[١٧٢]. ئەمەیش بەهۆی جێگۆڕکێی سیستەمی خێڵایەتی بۆ سیستەمی ئاینی. ئیدی لێرەیشەوە دەوڵەت واجۆی وتارخوێن بوو، نەک شاعیر، کە شاعیر و شیعر دەبنە هۆی دووبەرکی نێوان هۆزەکان.

---

[١٧٠]- Nicholson، A Literary History of the Arabs، p.٢٣٥ .

[١٧١]- Hitli، History of the Arabs، p.٨٨ .

[١٧٢]- جرجی زیدان، التمدن الاسلامی، ج٣، ص٢٧.

لەوانەیە مەعاویە هەستی بەمە کردبێت و ویستبێتی هۆزەکان بکاتە پەروانەی خۆی، ئەویش بە زیندووکردنەوەی شکۆی لەمێژینەی شیعر و شانامە. ئیدی گیانیان کردەوە بە بەری لەشی نیوەمردووی شیعردا و بەرزەپێ هەڵیانساندەوە. مەعاویە گوتی: "شیعر بکەنە گەورەترین مەراق و ڕێورەسمتان، ئەو میراتی باپیرانتان و مەشخەڵی ڕێگای خەڵاسیتانە". بۆیە زیادەڕەوی لە نوقڵانەپێدانی شاعیراندا کرد و هەموو والییەکانیشی بەم کارە ڕاسپارد. پێشتریش بینیمان کە چۆن عومەر لە خالید تووڕەبوو، لە کاریشی لادا لەسەر خەڵاتکردنی شاعیران کە بە پێچەوانەی ئیسلامی دەزانی.

مەعاویە گوێی بەم پێچەوانەییە نەدەدا، ئەو خەڵاتی شاعیرانی دەکرد، وەک چۆن جاری جاران لە بازاڕە ویژەییەکانی مەککەدا ئەنجام دەدرا. ڕەنگە بەم کارەی توانیبێتی شکۆکەی جارانی قوڕەیش بداتەوە بە گوێی ئەو خەڵکەدا. لە پاش مەعاویەش، کوڕە گەورەکەی بوویە جێنشینی باوکی. ئەو زۆر زیاتر لە بابی خۆ، بەشان و باڵی شاعیرانیدا هەڵدەدا. دکتۆر تەها حوسین دەڵێت: ((بەڵام یەزید، هەر ڕێک کۆپی باپیری خۆی (ئەبوسوفیان) بوو. پیاوێکی دەمارگیری بەهێزی شەڕانی و ڕقێکی خراپی بەرانبەر ئیسلام هەبوو. جارێکیان یەزید ویستی دەمی کەعبی کوڕی جوعەیل چەور بکات، تا کەمێک هەجوو(جنێو)ی پشتیوانەکان(الانصار) بکات، بەڵام ئەو نەڕێی کرد و وتی: دەتەوێت کافر ببمەوە پاش ئەوەی مسوڵمان بووم؟ دواتر هەر بۆ هەمان مەبەست بە شاعیرێکی مەسیحی وت، بە ناوی "ئەختەل"، بۆ خۆی ئەو ڕەزامەندیی دەربڕی و هەجوویەکی باش باشی ئەنساری کرد کە هەجووەکەی لە مێژوودا بەناوبانگە."[١٧٣]

---

[١٧٣]- تەها حوسەین، فی أدب الجاهلی، ص١٣٥.

یەزید لە باوکی زیاتر مەیلی بەلای بەها خێڵەکییە تراديشناڵەکاندا هەبوو، کە لە ڕۆحی ئیسلامەوە حەوت شیو و حەوت دۆڵ دوور بوون. ئەو خۆی هەر لە بیاباندا گەورە بووبوو، دایکیشی بیابانئشین بوو، تەنانەت لە دایکییەوە بیستراوە، ئەو دڵی زیاتر بە چادرێکی بیابان کراوەتەوە تا کۆشک و تەلاری بەرز و بلوورین. لە بارەی شیعرەوە، یەزید خۆی یەکێک بوو لە کەڵەشاعیرەکان. هەروا بێتەوە، دڵی بە شکار و بادەنۆشین و غەزەل دەکرایەوە هەر بەشێوەی سەحرانشینانی کۆن. دەورانی ئەو، نەکسەیەکی کوشندەبوو بۆ مێژووی ئیسلام.

یەزید زۆری قین لە ئەنسار و بەنی هاشم بوو، قینێکی قوول. وا دەردەکەوێت مەعاویەیش هەستی بەو قین لە دڵییەی کردبوو، بەڵام بە جۆرێک بۆی پەردەپۆش دەکرد. یەزید گەنجێکی خوێن تەڕ بوو، ئاگای لە دڵڕاگرتن و خاترگرتن نەبوو، هەر بۆیە ڕقەکەی زۆر بە ڕوونی پێوە دیاربوو. ئەمەیش شتێکی زۆر سروشتییە، هیچ لازم بە سەرسووڕمان ناکات. ئەو هەموو گەورە و سەردارەکانی بنەماڵەکەی لە جەنگی بەدردا تیاچووبوون. نەنکی، خاتوو هیند، هەتا ماوەیەکی زۆریش دوای ئەوە هەر ڕەشپۆش و دڵخەمین بوو. گوایە ئەو خۆی بەسەر خەنسادا هەڵناوە لە بازاڕی 'عوکاز'دا، بە گەورەیی کۆستەکەی و زۆری خەفەتەکەی لەوەی لە بەدردا بەسەریدا هاتووە. هەر ئەو ژنەبوو، وەحشیی هاندا تا حەمزەی مامی پێغەمبەری کوشت و دواییش سکی هەڵدڕیی و لە تۆڵەدا جەرگی خوارد.

ئیدی یەزید ناتوانێت کۆستەکانی سەر بنەماڵەکەی لە یاد بکات. کۆست و نەگبەتییەکان لای خەڵکی سارا، زۆر لە ئاین و بیروبڕوا بەهێزترن. ئەوەی لێکۆڵینەوەی بۆ سروشتی خەڵکی سارای ئەو سەردەمە کردبێت، بە ڕوونی ڕاستی ئەم قسانەی بۆ دەردەکەوێت.

یەزید نەیدەتوانی ئەو مەبەستەی ناو دەروونی تەڵکێش بکات، ئەوەی لە جەنگەکانی دژ بە موحەممەدا مام و خاڵەکانی کوژرابوون. لەوانەیە ڕووداوەکەی "کەربەلا" کە بەنوهاشمی تێدا قڕکرا، ڕووداوی "حوڕڕە" کە ئەنساری تێدا تەفروتوونا کرا، ئاماژەیەک بووبێتن بۆ ئەو تۆڵەیەی لەناو دەروونی یەزیددا هەڵکۆڵرابوو.

دکتۆر تەها حوسەین دەڵێت: ((وەک وتم یەزید بەتەواوی کۆپی ئەبوسوفیانی باپیرەی بوو، دەمارگیر بوو لە هەموو شتێکدا. کەسیش ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات، ئەوە یەزید بوو ڕووداوەکەی "حەڕڕە"ی هینا بەسەر ئەنساردا، ئەتکی ئەنساری کرد لەناو مەدینەدا، تۆڵەی بەدری لێ کردنەوە، ئیدی ئەنسار دوای ئەوە هەڵنەستانەوە. وەک ئەوەی دەگێڕنەوە لە بارەی "حەڕڕە"وە، دەگێڕنەوە کە هەشتا پیاوی لێ خستن، لەوانەی کە بەشداری بەدر بووبوون، واتە ئەوانەی کە پێشتر قورەیشیان زەلیل کرد.))

*** *** ***

قورەیش کاتێک دەسەڵاتیان کەوتەوە دەست، خەریکی بنیاتنانەوەی ئەو شکۆیە بوون کە بەر لە ئیسلام هەیان بوو. بۆیە دەستیان کردە تۆڵەسەندنەوەی هەموو ئەوانەی یارمەتی موحەممەدیان کردبوو (درودی خوای لەسەر بێت) لە بانگەوازەکەیدا. بە شمشێر و شیعر تۆڵەیان سەندەوە. شیعر و شمشێر ئەو دوو چەکەی سارانشینان بوون کە سێیەمی نەبوو. کاتێکیش عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان هات، هێندەی پەرگیری لە بایەخدان بە شیعر دا، ئەوسەری دیار نەبوو. سەعلبی لەم بارەیەوە دەڵێت: "هیچ خەلیفەیەک هێندەی ئەم ڕەغبەتی

لە شیعر نەبوو، لە دەورانی ئەمدا، خەڵکی کۆدەبوونەوە و شیعریان دەگوت و لە ژیانی شاعیرانیان دەکۆڵییەوە"[174]. وەک دکتۆر تەها حوسەین دەڵێت: لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا، خراپتر لە دەورانی جاهیلی گەڕانەوە بۆ بەها خێڵەکییەکانی وەک مونافەسە و خۆهەڵنان بە "ڕەچەڵەک" و باوباپیرانەوە.[175]

هێدی هێدی شیعر گەڕایەوە پێگەکەی جارانی بازاڕی عوکاز. خەڵکی زۆربەی کاتەکانیان سەرفی گەنگەشەی شیعریی و باسی ئەموئەو و بەراورد و فەزڵدانی شاعیران بوو بەسەر یەکتردا. هێندێک جار دەبوویە چەلەحانێ و دەنگبەرزکردنەوە بەسەر یەکتریدا[176]، خەلیفەیش یان سوڵتان کەیفی بەم بەزموبالۆرەیە دەهات و شیعرەکانی دەدایە کەسانی پسپۆر تا نرخاندنی بۆ بکەن و دیدگای خۆیانی لەبارەوە بڵێن. پرۆفیسۆر نیکڵسۆن باسێکی جوانی لەم بارەیەوە هەیە، ئەو کاتێک باسی مێژووی وێژەی عەرەبی دەکات، پەیوەندیشی لەگەڵ پەرەسەندنی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا باس دەکات، کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا چۆن توانییان شیعر بگەڕێننەوە بۆ پێگە کۆنەکەی جارانی خۆی. نیکڵسۆن دەست دەکات بە تەوەرەکەی و دەڵێت: ((... هەڵسوکەوتی نادینی ئەمەوییەکان پرسێکی وروژاند لە

[174]- جرجی زیدان، المصدر السابق، ج٣، ص١٠٢.

[175]- تەها حوسەین، سەرچاوەی پێشوو، ص١٣٥.

[176]- ئەو مەشغەڵەتەی ئەمەوییەکان لە بارەی شیعرەوە لەناو عەرەبدا ڕۆیان چاند، تا ئێستایش جێکەوتی لەسەر عارەبان ماوەتەوە، بۆتە دەردی بێدەرمانیان. ڕۆشنبیرەکانی ناویان هێندەی گرنگی بە شیعرە ناسکەکانی فەرزدەق و جەریر دەدەن، هێندە بەڵا و موسیبەتەکانی ڕۆژگاریان بەلاوە گرنگ نییە. نیشانەکانی ڕۆشنبیری لە لایان بۆتە ئەوەی: کامە شیعر لەسەر پشتی ئاروان وتراوە و کامە لەسەر کامە خڕەبەرد. ئەم دەردە لە کتێبی داهاتوومانددا بە جوانی باس دەکەین (العراق و قيم البداوه). نووسەر.

بارەی ئیمانهێنانی سەعات پانزەیانەوە، کە ڕەنگبێت هێشتایش لە قووڵایی ناو دەروونیاندا بتپەرستی جیلوەی دەکات؟[177])) نیکلسۆن بە بەڵێ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، وای دەبینێت: ئەو شاعیرانەی لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا سەریان هەڵدا، دەقاودەق پەیڕەوی لە نەریتی شاعیرە پێشینەکانی خۆیان دەکەنەوە، وەک ئەوەی ئاینێکی نوێ هەر نەهاتبێت بە ناوی ئیسلامەوە.

نیکلسۆن دەڵێتەوە: ((... لە جێی ئەوەی لە شیعرەکانیاندا پەسنی ئەو سەرکەوتنانە بکەن کە لەسەر دەستی مسوڵمانە تێکۆشەرەکان بەدەست هاتبوو، شاعیرەکان خەریکی بەرزڕاگرتنی خێمە و چادرەکانی سارا بوون، بە شان و باڵی وشترەکاندا هەڵیان دەدا، کە هیچ شتێک لە بیاباندا ناتوانێت پێشی بداتەوە. هەروەها بە چەشنێک لەگەڵ خەلیفە دەدوان، یەکێک نەزانێت سەرۆکهۆزە[178])). ئەم لێکدانەوەیەی پرۆفیسۆر نیکلسۆنم زۆر لەسەر دڵ نیشت، ڕێک بارودۆخی شاعیرەکانی ئێستای هێنامەوە بەر دیدە، لە گرنگیدان بە شیعر لەسەر ڕێچکەی جاهیلیەت، ئەوان ئێستا خەریکە بە شکۆی بابوباپیراندا هەڵدەدەن، پەنا بە خودا.

من گومانم لەوە نییە کە ئەمەوییەکان شیعریان بۆ سەرگەرمکردنی عارەبان، هێنانەوە یادی شکۆی بابوباپیرانیان دەکرد، ئەوەی کە ئیسلام خەریک بوو بە تەواوەتی لە بیری دەبردنەوە. ئەمان هەر بەوەوە نەوەستان، بەڵکوو دایان لە کۆتا وەتەری دڵی ئەو عارەبانە، ئەوەیش وەتەری خۆهەڵنان بە هۆز و دەمارگیریی خێڵەکییەوە. ئەمەوییەکان ئەو ململانێ کۆنەیان گەرم کردەوە، ئەوەی نێوان قەحتان و عەدنان، وەهایش پشکۆکەیان گەش کردەوە، تا ماوە نەبێتە

---

[177] - جرجی زیدان، تأریخ یداب اللغە العربیە، ج۱، ص۲۲۳.

[178] - nicholson ، op cit p.۱۹۰.

زووخاڵ. لەمەیشدا سوودیان لە شیعرە بەکەفوکوڵەکان وەرگرت. ئیدی لە هەموو نەوەیەکدا ململانێی نێوان عەدنانییەکان و قەحتانییەکان دەبینین، یان هەندێک جاریش ناویان لێ دەنا یەمان و موزەڕ، ئیدی هەر ماوە و بە جۆرێکی نوێ سەر هەڵ دەداتەوە[179]. بەم هۆکارانەیش ئەمەوییەکان توانییان هاوسەنگی لە نێوان عارەباندا بکەن، وایان لێ بکەن بەبێ فەرمانی ئەمان پەنجە بە "ئاوی سارد"دا نەکەن.

ئەمەوییەکان کاریشیان لەسەر چاندنی تۆوی ڕقەبەرەیاتی لە دڵی عارەبەکاندا بەرانبەر نەتەوەکانی دیکە چاند. بەمەیش دەوڵەتی ئەمەوی بووە دەوڵەتێکی عەرەبی شیعری، کە هیچێک لە ئیسلامیان هەڵنەکڕاند مەگەر لەسەر بنەمایەکی نەتەوەیی و سارانشینی. عارەب لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا وەها گوزارشتیان لە ئیسلام دەکرد، کە ئاینێکە بە تەنها بۆ عارەبان هاتووە، تا پێگەی لە نێوان نەتەوەکانی تردا بڵند بکاتەوە. موحەمەدیش لە دیدگای ئەواندا پاڵەوانیکە لە چەشنی جەنگیزخان.

*** *** ***

عەجەمەکان کە درەنگ ئیسلام بووبوون، لە چاوی عەرەبەکانەوە سووک تەماشا دەکران. چەندین ناوناتۆرەی ناشیرینیان لێ نرا، وەک "نەبیت"، "سوور" و "مەوالی". لەناو خەڵکیشدا وا دەنگوباس بوو کە سێ شت نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە: کەر، سەگ و مەوالی[180]. خۆ

[179]- الجاحظ البیان والتبین، ج٣ ص٢١٧.

[180]- جرجی زیدان، التمدن الاسلامی، ج٤، ص ٦١.

ئەگەریش یەکێک یەکێکی بە "نەبتی" یان "ئیبن حیجام" یان "ئیبن خەیات" بانگ کردبا، ئەوا لە دیدگای فەقیهەکانەوە شایەنی سزا بوو[181]. مەعاویە ڕۆژێکیان بە هاوەڵەکانی گوتووە: ((من وای دەبینم ئەم سوورانە وەک چۆن لە پێشینی خۆمانیان دابڕین، ڕۆژێکیش ئەم بەرەیە لەژێر پێی عارەبان دەردێنن، بۆیە بە باشی دەزانم نیوەیان لێ بخەم و نیوەکەی تریان بهێڵمەوە بۆ خزمەتکاری و ڕێگاپاککردنەوە و بینا درووستکردن. ئێوە دەڵێن چی؟)). کەچی هاوەڵەکانی ڕێگرییان لێ کرد لە جێبەجێکردنی ئەم پڕۆژە گرنگە.

عەرەب لە سووکایەتیکردن بە مەوالییەکان گەیشتنە ئەو ڕادەیەی نەیاندەهێشت لەبەر چاویاندا سواری وڵاخ ببن. ئەسفەهانی دەڵێت: ((ئەگەر عارەبێک لە بازاڕ شتومەکێکی بەدەستەوە بوایە و لەو ناوەیشدا مەوالییەک هەبوایە، ئەوا کۆڵەکەی خۆی دەدا بەو تا بۆی هەڵگرێت و هیچ بە لایشییەوە شتێکی نائاسایی نەبوو. سوڵتانیش هیچ لۆمەیەکی نەدەکردن. خۆ ئەگەر ناعەرەبێکی ببینیایە وا بەسەر وڵاخێکەوە، بەبێ سێ و دوو دایدەبەزاند و کەسیش نەیدەگوت کابرا ئەوە بۆ ستەم لەو مەوالییە داماوە دەکەیت؟))[182]

وای لێهات دەوڵەتی ئەمەوی بووە دەوڵەتێکی عەرەبیی ڕووت. هۆزە عەرەبییەکانیش بە شمشێرەکانیان دەیانپاراستن، لێرەیشەوە ئیسلام چوویە قۆناغێکی "نوێ"ـوە، ئەویش قۆناغی غروروری نەتەوەیی و داگیرکاریی وڵاتانە. ئیسلام خۆی هاتبوو تا کیسرا و قەیسەرەکات بخات، کەچی کارێکیان بەسەر خۆی هێنا، بووە میراتگری کیسرا و قەیسەر، تەنها جیاوازیش ئەوە بوو، ئەوان بە ناوی "هورموز"ـە وە، ئەمانیش بە ناوی خودای واحید و قەهار.

---

[181]- مالك بن انس، المونه، ج٤، ص٣٩٢.

[182]- أحمد أمين، ضحى الاسلام، ج١، ص٢٦.

*** *** ***

خەلیفەی زاهید و ڕاساڵ، عومەری کوڕی عەبدول عەزیز، ویستی بارودۆخەکە بهێنێتەوە سەر ڕێچکەی سەردەمی باپیرە گەورەی (عومەری کوڕی خەتاب)، بەڵام ئەجەل نەیهێشت و خودایش بە تەنها دەزانێت ئەم ئەجەلە پڕتاوە لە کوێوە و چۆن گەیشتە گیانی ئەم پیاوە کە دەیویست چاکسازیی بکات. ئەگەر لێکۆڵینەوە لە ژیانی ئەم پیاوە ڕاساڵەدا بکەین، ئەوا چەندین جیاوازیی لە نێوان کارەکانی ئەم و خەلیفەکانی دیکەی ئەمەویدا دەبینین، ئەمانەیش گرنگەکانیانن:

1 - هەر لە سەرەتاوە ڕێگری لە شاعیر و شتەکان کرد کە لە دەرباریدا ڕاوەستن. بە ئاشکرا ڕقلێبوونەوەی خۆی بۆ شیعر دەربڕی. ئەو بەخشش و دیارییانەیش کە دەدران بە شاعیران، وەک دزی لە بەیتولماڵ لەقەڵەمی دەدا.

2 - زاهید و فەقیهەکانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، شەقوەشێن و ئەوانەی کە خودایشیان دەپەرست و بەندەکانی خودایان ئازار دەدا، دوور خستەوە، هەر بنیادەمێک دەستی سوور بووبێت بە خوێنی مسوڵمانان دووری خستەوە. فەرمانی دەرکرد بە لادانی هەر ستەمکارێک ئەگەرچی لە خزم و کەسی نزیکیشی بێت.

ئەمەوییەکان شانازییان بە حەجاجەوە دەکرد و بە یەکەم پاڵەوانی خۆیانیان دەزانی، کەچی عومەر لە بارەی حەجاجەوە دەیگوت: ((ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا هەموو میللەتان بیکەنە پێشبرکێی چەپەڵی و هەر میللەتێک چەپەڵترینی خۆی بهێنێت، ئێمەیش حەجاج بەرین، ئەوا ئەوە ئێمە دەبینە براوەی یەکەم))[١٨٣].

[١٨٣] - سید الاهل، المصدر السابق، ص١٩٨ – ١٩٩.

3 - عومەر هەموو سوپاکەی کێش کردەوە سەر سنوورەکان و فتوحاتی ڕاوەستاند، کە خەریک بوو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دەگەیشتنە ئەورووپا. لەمەیشدا سیاسەتی پێچەوانەی پێشینانی خۆی لە بەنی ئومەییە بەکار هێنا. لەبەر ئەوەی ئەم بڕوای وابوو ئیدی فتوحات لەپێناو ئایندا بەکار نایەت، بەڵکوو ڕێک وای لێهاتووە کە تەنها بۆ دەسکەوت و کەنیزەک و غولام ئەنجامیان دەدا، دەبووە جێگەی سوود بۆ سوڵتان و والییەکان.

عومەر دەیگوت: دادپەروەری نێوخۆی لە فراوانبوونی دەرەکیی پێویستترە.

4 - قەدەغەی جنێودانی بە عەلی کرد لەسەر مینبەری مزگەوتەکان لە دەمی وتاردا. ئەمە لە کاتێکدا پێشینە ئەمەوییەکانی ئەم کارەیان کردبووە دابونەریتێکی پێویست. دەڵێن خەڵکی "حەڕان" ئەم قەدەغەکردنەیان پێ نارەحەت بوو، دەیانوت: "ئێمە نازانین نوێژ بکەین و دوو نەفرین لە عەلی نەکەین، نوێژ بەبێ نەفرین لە ئەبو توراب کەی دروستە؟" ڕۆژێک یەکێک لە هەوادارانی عەلی وەک سەردان هاتبوو بۆ لای، بەڵام لە حەیبەتان نەیدەوێرا شوناسی خۆی دەربخات، عومەریش بە توندی هاواری کرد: ((منیش هەواداری "عەلی"م، ئایا تۆ هەوادارێتی "عەلی"م لێ دەشاریتەوە؟! من لە سەعیدی کوڕی موسەیبم بیستووە کە پێغەمبەر وتوویەتی: من گەورەی هەر کەس بم، ئەوا عەلیش گەورەی ئەو کەسەیە)).

5 - کاتێک تەماشای مزگەوتی مەدینە و دیمەشقی کرد، هێندەی زێڕ تێدا مەسرەف کرابوو هەر مەپرسن، ئەمە بێجگە لە زەخرەفە و گومەزی گەورە گەورە و بەردی مەڕمەڕ. کەمێک ڕاما و گوتی: "دەبینم ئەم ماڵە لە جێگەی خۆیدا خەرج نەکراوە، من هەموو ئەمانە دەرەتێنمەوە و دەیانگەڕێنمەوە بۆ بەیتولماڵ، هەموو ئەم زێرانە

دەفرۆشـمەوە و پـارەكەی دەخەمەوە خەزێنەی مسـوڵمانان، هەرچـی سـیرامیک و زەخـرەفە و گـومەزیش هەیە، وەک ئاڵتوونەكـانی لـێ دەكەم، گشـتیان دەكەمەوە بە پـارە و دەیانفرۆشـمەوە و دەیـخەمەوە خەزێنە تا بزانم كێ پێویستی بە شتێک دەبێت بیدەمێ)).

لای عـومەری كـوڕی عەبـدولعەزیز، دادپەروەری و دڵخۆشـكردنی خەڵكی، لە بەزێڕكردن و ڕازاندنەوەی مزگەوتان پێویستتر بوو. دەڵێت مجێوری كەعبە پەیامی بۆ نارد، كە گوایە وەک نەریتی هەمیشەیی خەلیفەكانی دیكە، دەیانەوێت بەرگی كەعبە بگۆڕن. ئەویش وەڵامی دایەوە: ((من وا هەست دەكەم ئەو پارەیە بە هەژاران بدەم، ئەوانم لە لا لەپێشترن تا بەرگی نوێی بەیت)).[١٨٤]

6 - بەر لە عومەر، ئەمەوییەكان حەزیان نەدەكرد كەس لە ئەهلی زیمە بێتە نـاو ئیسـلامەوە، لەبەر ئەوەی بڕی سـەرانە (جزیە) كەمـی دەكـرد. ئیـدی لە كۆتاییشـدا دەهـاتن و سـەرانەیان لەو كەسـانەیش دەسـتاند كە ئیسـلام دەبـوون (خـۆی نەدەبـوو بیسـتێنن لە ڕووی شەرعەوە). ئیدی كە عومەر هات، قەدەغەی ئەم كارەی كرد و گوتی: "خودا موحەمەدی ناردووە وەک داعی، نەک وەک جابی "باجگر").

7 - لە بەخشـیندا عەرەب و مەوالـی (عەجەم)ـی یەكسـان كـرد. ڕۆژێكیشیان دزێكیان هێنا و دزەیش گوتی لە هەژاریدا دەستم داوەتە دزی، عومەر كە زانی ڕاست دەكات، بەخشیی و فەرمانی دەركرد ١٠ درهەمی بدەنێ.

وەفـدێک لە خەڵكـی حەمـس هـاتن بـۆ گازەنـدەكردن لە یەكێـک لە كوڕەكـانی وەلیـد بە نـاوی "ڕۆح"، لەبەر ئەوەی دوكانەكـانی لـێ داخسـتبوون، عـومەر فەرمـانی دەركـرد لە گەردەنـی ڕۆح بـدرێت،

[١٨٤] - الدمیری، حیاە الحیوان، ج١، ص٦٦.

ئەویش هەر کە شمشێری بینی بەسەر سەریەوە، خێرا بە سەرشۆری و ڕسواییەوە وتی: باشە، دوکانەکانیان بۆ دەگێڕمەوە.

عومەر بێجگە لەم حەوت دەسکەوتە سەرەکییە، شتانێکی زۆری دیکەیشی تەنها لە دووساڵدا دەست خست و مرد. دەڵێن گوایە دەرمانخوارد کراوە. خوایە دەبێت کێ ئەم کارەی کردبێت؟ لەوانەیە بڵێیت سەبەئییەکان بوون دەرمانیان بۆ تێکردبێت! خودا عەلیمە بەم کارە.

*** *** ***

ئەحمەد شەوقی شاعیر بەم شێوەیە پەسنی پێغەمبەری ئیسلام دەکات

فرسمت بعدك للعباد حكومة

لا سوقة فيها ولا أمراء

الله فوق الخلق فيها وحده

والناس تحت لوائها أكفاء

والدين يسر، والخلافة بيعة

والأمر شورى والحقوق قضاء

الاشتراكيون أنت إمامهم

لولا دعاوى القوم والغلـــواء

حکومەتێکت بۆ بەندەکان پێکهێناوە

نە لاتی تێدایە نە ئەمیر

تەنها خودایە لەو سەرەوە ڕاوەستاوە

باقی خەڵکەکە یەکسان و پێبوون

تۆیت گەورەی ئیشتراکییەکان

ئەگەر کڵەکڵ و دەمی خەڵک بگیرێت

موحەمەد (دخ) بەم چەشنە بوو کە شەوقی دەڵێت. موحەمەد (د.خ) بە ئاینی یەکسانی و دادپەروەری هات، بە دلۆڤانی دڵنەرمی بۆ هەرچی خەڵکە. بەڵام بەداخەوە دەبینین ئەم ئاینە یەکسانخوازە لەسەر دەستی قورەیش، کرایە ئاینی خۆفەرزکردن و خەڵک کردنە بەردە و کۆیلە. ئەو ئاینی دادپەروەرییەی کە موحەمەد درودی خوای لەسەر بێت هێنای، لەو ڕۆژەدا کە عەلی خرایە نێو قەبرەوە، ئاینەکەیشیان لە قەبرەکەی تەنیشتی عەلیدا ناشت.

# بەشی هەشتەم

## عەماری کوڕی یاسر

که دێین و لێکۆڵینەوە بۆ ئەو ململانێی کۆمەڵایەتییەی نێوان قورەیش و ڕەشەخەڵک دەکەین، له سەردەمی عوسمان و پاش عوسماندا، دەبینین عەماری کوڕی یاسر، لەم نێوەندەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە. لەوانەیە ئەو ڕۆڵەی که عەمار بینیویەتی، له هەندێک لایەنەوە له ڕۆڵی هەر بنیادەمێکی دیکە زیاتر بووبێت. لەوانەیە ڕاست بێت ئەگەر بڵێین: ئەم له ئەبوزەڕ توندتر بوو له شۆڕکەی دژی عوسمان، زیاتریش قسەلەڕوو و بەرەجیاواز بوو له ئەبوزەر. هەر بۆیە زەحمەتی زیاتری بینی به بەراورد به ئەبوزەڕ.

کەسایەتی عەمار له چەند ڕوویەکەوە جیاواز بوو له ئەبوزەڕ. ئەبوزەڕ کەسێکی دەوارنشین و خێڵەکی بوو. ئەو له خێڵی "غەفار" بوو، که به تەواوی له ژیانی "سارا"دا ڕۆچووبوون. بەڵام عەمار کۆیلەیەکی شاریی بوو، له مەککه لەدایک بووبوو، ساڵانێکی تووڵانی به "بەردەیی" گوزەراندبوو. عەمار "گەنمڕەنگ" بوو، یان کەمێکیش به لای ڕەشدا بایدابوویەوە. ئەم ڕەنگەیشی به میرات له دایکه حەبەشییەکەیەوە پێ گەیشتبوویەوە. ئەوەی که شایەنی باسە، عارەبان لەو دەمەدا بیزیان له گەنمڕەنگ و ڕەشەکان دەبوویەوە، له نیشانەکانی خانەدانیی ئەوە بوو "سپی"بێت. ئەگەریش بیان ویستبا

پەسنی یەکێک بکەن، دەیان گوت: "بەو سپێتییەی ڕەنگی بە هەور بەخشیوە"، یان ئەگەر وەسفی کۆمەڵێکیان کردبا، دەیان گوت: "ئەوە کۆمەڵێکی سپین."

لەوانەیە ئەمە بەهۆی ئەوەوە بوو، عارەب بە هەموو شێوەیەک بێزیان لە کۆیلایەتی دەهاتەوە، ئینجا ڕەنگی ڕەشیش بە شێوەیەکی گشتی ڕەنگی "بەردە"کان بوو. تا ئێستایشی بە دەمەوە بێت، عەشایەرەکانی عێراق سووکایەتی بەو کەسانە دەکەن، کە لە نەسەبی باوانیاندا یەکێکیان عەبد (کۆیلە) بووبێت، خۆ ئەگەر یەکێک بە یەکێکی تری وت: "هەی کۆیلەی واو وا لێکراو" ئەوا لەسەر وشەی کۆیلەکە شایەنی سزایە لە لایان، دەبێت لە تۆڵەی ئەوەدا شتێکی لێ بسەنرێت کە خۆیان پێی دەڵێن حەشەم"[185]. وا دەردەکەوێت عەمار بە دەست ئەم دەردەوە زۆری ناڵاندبێت. قورەیشییەکان ماندوو نەدەبوون لە تانەلێدانی بەردەوامی، هەمیشە بە "کۆیلە ڕەشەکە" بانگیان دەکرد. ئەو دەمەیشی کە گەلەکۆمەکە کرابوو لە خەلیفەی سێیەم، مەروان بە خەلیفەی گوت: "ئەم بەندە ڕەشتاڵە،[186] عەشاماتەکەی لێ هەڵناوێت، ئاخ ئەگەر کوشتبات، دەبوویە وانەی ئەوانی دیکە و تەمبێ دەبوون"، ئیدی هێندەیان تێسرەواند تا لەهۆش چوو. جارێکیشیان خالیدی کوڕی وەلید سکاڵای لە عەمار کرد لە لای پێغەمبەر (دخ) بە دەربڕینی "عەبدە ڕەشەکە".[187] مەعاویەیش لە جەنگی "سەفین"دا، لە بارەیەوە گوتی: "عەرەب دەپووکێتەوە ئەگەر بە شوێن ئەم عەبدە ڕەشەدا بڕوات". عەماریش تەحەدای قورەیشی دەکرد و دەیوت: "کەریم و بەڕێز ئەوەیە خودا ڕێزی وەسەرنێت، من نەوی بووم، خودا بڵندی کردمەوە، بەردە بووم، خودا لە کۆتی دەرهاویم، سستۆک

---

[185]- - فريق المزهر، يلفرعون، القضاو العشائرى، ص ١٠٥ ـ ١٠٧.

[186]- - عباس العقاد، عبقريه الإمام، ص٦٦ .

[187]- -عبدالله السبيتى، عمار بن ياسر، ص١٠٦

بووم، هێز و بازووی دامێ. عەمار ئەم قسانەی ئەو دەمە کرد، کاتێک عەمری کوڕی عاس سووکایەتی پێ کرد کە ئەو لە دایکێکی ڕەشتاڵەی حەبەشەیە. عەمار بە شێوەیەکی سروشتی پلەی کۆمەڵایەتی بەرزبوویەوە، وەک هەموو کەسە سادەکانی ناو کۆمەڵگە، کە بەهۆی ماندووبوونی خۆیانەوە بەرز دەبنەوە و شۆرەت پەیدا دەکەن. ئەم جۆرە لە پێگە بەرزبوونەوە هەموو کەس لێی تێ ناگات، بە تایبەتی کوڕە خانەدان، ئەوان وا دەزانن سومعە و پلە و پایە شتێکی زاتییە و کەس ناتوانێت بە ماندووبوون بە دەستی بخات. ئەم شتەیش ئێستا لەناو ڕۆڵەکانی نیشتماندا وەک مانگی چواردە دەیبینین. تەنها لێرەیش وانییە، ئەم شتە لە هەر کوێ و هەر کاتدا بیگریت، هەر وابووە و وایش دەمێنێتەوە، بێجگە لەوەی خودا ڕەحمی پێ بکات.

"عوسامی" شاعیر، یەکێک بووە لەو کەسانەی کە کوڕە هەژار و بیلانە بووە، گەورەیی کەسایەتی ئەو بەهۆی شیعرەکانییەوە بووە، ئەها شیعری "ها أنا ضا..."، بەڵام ئەم قسانە لای خانەدانەکان وەک گوێز ژماردن وایە، ئەوان هەرچی شتێکە لایان "لافی بێ قەواڵەیە" بێجگە لە نەسەب و حەسەب - شۆرەتی بابوباپیر.-

عەمار لە ناواخنی ناو دەروونییدا هەستی بە ڕقێکی سەرداپۆشراو دەکرد لە هەمبەر قوڕەیشەوە، بەهۆی ئەو سزادانانەوە کە دابوویان و هەمیشەیش پێتکیان پێوە دەنا کە ئەو لە ژنێکی ڕەشتاڵەیە. بەڵام ئەو تەماشای دەکرد کە دایکی یەکەم شەهیدی ئیسلامە، ئەوەی کردبوویە شانازی مەدالیای فەخرلەملیدا. ئەوان پێتکیان پێوە دەنا و پێیان دەگوت: "هۆ کوڕی ژنە ڕەشتاڵەکە"، ئەویش بە خۆیی دەگوت "کوڕی ژنە شەهیدەکە". گرفتی بنیادەم لەوێوە دەست پێ دەکات، کە شتەکان بە پێوەری جیاواز جیاواز دەپێون. هەر کەس بە گەزی خۆی پێوانەی

دەکات. هەموو لەو دیوەوە تەماشای دەکەن کە بەرژەوەندییان لەوێیە و چاویش لەوە دەقوچێنن کە بۆیان زیانە.

لە نێوان عەمـار و ئیـبن ئەبـی سـەرحدا دەمەدەمەیەک ڕووی دا لە هەنگامی بەیعەتدانەکەی عوسماندا، ئیبن سەرح بە لای عوسماندا دای دەتاشـی و عەمـاریش لێـی هـاتە وەڵام و پێـی وت: "تـۆ لە کەیەوە بـوویتەتە نەسـیحەتخوانی مسـوڵمانان؟"، یەکێکـی بەنـی ئـومەیەیش لەولاوە هەڵیدایە و گوتی: "هۆ کوڕەکەی سومەیە، سنووری خۆتت بەزاند، تۆ کارت نەبێت، قوڕەیش خۆیان دەیانپەرژێتە سەر کاری خۆیان". ئەوان لە کەسایەتی دایکی عەماریان دەدا، لای عەرەب، هەرە ناشیرینترین ڕەوشت ئەوەیە کەسێک بە ناوی دایکییەوە بانگ بکرێت. ئەوان ئەمیان بە "کوڕەکەی سومەیە بانگ دەکرد"، وایان گوزارشت دەکـرد، ئەو سـنووری خـۆیی بەزانـدووە ئەگەر قسـە لە قسـەی سـەردارەکانی خۆیدا بکات (قوڕەیشییەکان). بەڵام ئەو خـۆیی لەوان زۆر بەشـەرەفتر دەزانـی، کاتێـک ئیسـلام شـەرەفی لێنـاوە و فەزڵـی بەسـەردا باراندووە، ئیدی لەم ڕوانگەوە ئەو لەپێشـترە بە کاروبـاری مسـوڵمانان و خەلافەت تـا کەسـانی دیـکە. نە ئەوە بـوو ئەم لەوان تێبگـات، نە ئەوانـیش لەم تێدەگەیشـتن، هەر کەس بە هەوای خـۆی شـەنی دەکـرد، هەر کەس پێـوەری لەوەی تـر جیـاواز بـوو، ئەمـان یەکێکیـان ڕووی لە تورکسـتانە و ئەوی دی لە کەعـبە، هەرگیـز یەک ناگرنەوە و لێک ناگەن.

*** *** ***

ژیاننـامەی عەمـار زۆر تـایبەت و پـڕ لە پەنـدە بـۆ کەسـێک پەنـد

وەرگرێت. گوزارشتێکی دروستە ئەگەر بڵێین: نموونەی پیاوێکی بێدەرەتان و سووک لەبەر چاوان، نەرمە نەرمە و بە هێواشی بە پلەکانەی ڕێز و سەربەرزیدا سەر کەوت و چەند قات لەوانە بەرزتر بوویەوە کە جاران سووکایەتییان پێ دەکرد. ئەوەی کە شایەنی باسە: ئەم عەمارە، لەبەر مسوڵمان بوونی، جۆرێک سزا درا، کە کەم کەس سزای لەم جۆرە درابوو لەسەر دەستی قورەیش. سزادرانی عەمار لە لایەن قورەیشەوە چۆتە ناو پەرتووکەوە، چیرۆکی سزادانی نموونەیەکی بەرجەستەی قورەیش بوو، کە بۆ ڕێگری لە چوونە ناو ئاینی نوێ بەکاریان دەهێنا. ئەو هاوکات لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆیدا پێکەوە سزا دەدران، تا کار گەیشتە ئەوەی دایکی و باوکی لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان دەرچوو. برایەکیشی هەر لەسەر ئەم ئاینە نوێیە لەسەر دیوارەوە فڕێ درایە خوارەوە، نیشانە و شوێنی سزادانەکانی قورەیش تا کۆتاییەکانی تەمەنیشی هەر لەسەر جەستەی دیار بوون.

موحەمەدی کوڕی کەعبی قەرەزی بۆمانی دەگێڕێتەوە: "ڕۆژێکیان عەماری بینیوە تەنها شەرواڵێکی لەپێدا بووە و پشتی ڕووت بووە، لەسەر تەختایی پشتی جێکەوتی برین و وەرەم و زام هەبوون، لێم پرسی و وەڵامی دامەوە: "ئەمە هیی ئەو کاتەیە کە قورەیش لەسەر بەردی گەرم گەرمی مەککە ئەشکەنجەیان دەدام". لەوانەیە ئەمانە هەموو پاڵنەری بەهێزی شاراوە بووبن لە دەروونیدا دژی قورەیشییەکان، ئەمەیش شتێکی چاوەڕواننەکراو نییە، چونکە هیچ کەسێک هێندەی عەمار زووخاو نەکراوە بە دڵیدا. مەگەر کەر، ئەینا بنیادەم کوژرانی دایک وباوکی خۆی هەرگیز بیرناچێتەوە بەو شێوەیە و لەژێر ئەشکەنجەدا. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی گرێی دەروونی ئەوەیە، لە لۆژیک و ئەم شتانە تێناگات. ئەو پاڵهێزێکی نەستی -لاشعوریی- شاراوەیە، بە پێدزکێ و بە بێخشپە، پاڵ بە

خاوەنەکەیەوە دەنێت ڕووەو ئامانجێکی دیاریکراو، خاوەنەکەی ئاگای لەوە نییە ئەم سات بە سات بەرەو ئەو ئامانجە دەڕوات. ئەگەری زۆری هەیە لە ناوەوەی ناو دەروونی عەماریشدا شتێکی لەم چەشنە قووڵ و پەنهان هەبووبێت بەرانبەر قورەیش. هێدی هێدی لەگەڵ نەشەکردنی ئەم گرێ دەروونییەدا، عەماریش دەمارگیرتر دەبێت، بە تایبەتی ئەو دەمەی دەبینێت لە دەورانی خەلیفەی سێیەمدا ئەو دەموچاوانە پلە و پۆست پەیدا دەکەن کە پێشتر ئەشکەنجەی ئەمیان دەدا. ئەو لەوانەیە لەو دەمەدا دایک و باوک و براکەی بیرکەوتبێتەوە کە چۆن لەژێر چەپۆکی ئەمانەدا مردن لەسەر بەردە گەرمەکانی سارای مەککەدا، لەو دەمەیشدا شادەمارەکانی تووڕەیی هەستاون.

عەمار هەرکە خانەدانێکی قورەیشی دەبینی، خێرا و بەبێ سێ و دوو، دەیدایە بەر جنێو و تانە، ئەوانیش لەبەر پێگەی لای "پێغەمبەر (د.خ) و دواتریش ئەبوبەکر و عومەر"، هیچ وەڵامێکیان نەدەدایەوە. وای لێهاتبوو عەمار لەسەر شتی سانایش دەیدانە بەر دژوان و ئەوانیش سەریان دادەخست و بێ وەڵام دەڕۆیشتن. دەڵێن جارێکیان دەست دەکاتە جنێودان بە خالید، خالیدیش سکاڵای خۆی دێنێتە لای پێغەمبەر و دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ڕێگە دەدەیت ئەو عەبدە جنێوم پێ بدات؟ قەستەم بە خودا ئەگەر تۆ نەبوویتایە جنێوی نەدەدامێ". بۆ ڕۆژی دواتر عەمری کوڕی عاسی دایە بەر جنێوان، عەمریش بە بەرچاوی خەڵکەکەوە زۆر لێزانانە دەڵێت: "کە من جنێوم بە تۆ نەداوە، تۆ بۆ جنێوم پێ دەدەیت؟"[188] لە شوێنێکی دیکەیشدا جنێو بە عەباسی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب دەدات[189].

[188]- ابن العربي، العواصم من القواصم، ص٦٤.

[189]- عبدالحميد السحار، المصدر السابق، ص (غير مكتوب في الكتاب).

بەرهەڵستى عەمار لە كاتى بەيعەتدان بە عوسمان، بەرهەڵستييەكى زۆر توند بوو، عەمار ڕقى لە عوسمان بوو، دەيويست بەيعەت بە عەلى بدرێت، وەك ئەوەى عوسمانى بە عەلەمدارى قورەيش زانيبێت. ئيدى كە بينيى دۆخەكە بە لاى عوسماندا شكايەوە، خەفەتێكى زۆرى خوارد، چووە مزگەوت و دەستى كردە خۆگيڤكردنەوە، ئەو تا كۆتا هەناسەى هەر لە دژايەتى عوسماندا بەسەر برد.

*** *** ***

وتمان كەسايەتى عەمار لە هيى ئەبوزەڕ جياواز بوو لە چەندين ڕووەوە. ئەبوزەڕ سەحرانشين بوو، خێڵەكى بوو، بەلام عەمار چەوساوەيەكى بە بەردە بڕاوەى خەڵكى مەككە بوو. بێگومان بوونيادى كەسايەتى "سارانشين"، لەگەڵ عەبديكى "شارنشين"دا زۆر دوورن لە يەكەوە. بونيادى كەسايەتى پشت دەبەستێت بەو ژينگەيەى كە تێيدا گەورە دەبێت لە پێوەر و بەهاگەليكى لاشعورى، بۆيە لە پێكهاتنەكەيدا تاڕادەيەك وێنەيەك پێك دەهێنێت نزيك لەو كولتوورەى كە تێيدا گەورە بووە.

ئەگەر بێين و لە ژيانى ئەبوزەڕ بكۆڵينەوە، ئەوا زۆر بە ڕوونى نيشانەكانى خێڵى تێدا بەدى دەكەين. ئەو لە ژيانيدا لەسەر يەكسانى تاكەكانى ناو خێڵەكەى و دابەشكردنى دەسكەوت بە شێوەيەكى دادپەروەرانە ڕاهاتبوو، هەر ئەمەيشە، دواتر ئەبوزەڕ دەبينين بانگەوازى ئيشتراكييەت (سۆشياليزم) دەكات لە دابەشكردنى ماڵ و سامان و دەسكەوتەكاندا. بەلام عەمار بانگەواز بۆ شتێكى ديكە دەكات، ئەويش وەك ئەبوزەڕ شۆڕشگێڕ بوو، لەوانەيشە

شۆڕشگێڕتر لە ئەبوزەڕ دژی خۆشڕابوێرانی قورەیش. بەڵام ئەم هێندەی بانگەوازی بۆ ئیمانێکی تەندروست دەکرد، هێندەی بۆ دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان و دەسکەوت نەدەکرد.

ئەو بڕوای وابوو: قورەیش کافرن و بەرگی ئیمانیان داوە بە خۆیاندا، ئەو زۆر بە ڕاشکاوی تۆمەتی کوفری دەخستە گەردنیان. جارێکیان زۆر بە ڕاشکاوی گوتی: 'عوسمان کافرە'. جارێکی تریش کەسێک لە عانی جەنگی سەفیندا لێی پرسی: 'ئەی ئەبا یەقزان، ئایا پێغەمبەری خودا نەیوتووە: لە دژی خەڵکی بجەنگن تا ئیسلام دەبن، ئەگەریش ئیسلام بوون، خوێن وماڵیان پارێزراوە'، پرسجۆکە مەبەستی لە هاوەڵانی مەعاویە بوو، بۆیە عەمار وەڵامی دایەوە: 'ئەوان ئیسلام نەبوون، بەڵکو خۆیانیان بە دەستەوە داوە -خۆیانیان ئیسلاماندووە- و لەسەر ئەم کارەیشیان سوورن تا پاڵپشتیان بۆی دەستکەوتووە.

عەمار بڕوای وابوو قورەیش ئیمانیان نەهێناوە، بەڵکوو ملکەچی واقیعەکە بوون و وەک هەلێک بەکاری دەهێنن. ئەو دەمەی عەمار ڕووبەڕووی عەمری کوڕی عاس بووەوە لە سەفیندا، بەبێ سێ و دوو تۆمەتباری کرد بە کوفر. ئەوەبوو عەمر لە بەردەم عەماردا شایەتوومانی هێنا، بەڵام عەمار پێی گوت: 'وسکوت، تۆ هێشتا پێغەمبەر لە ژیاندا بوو وازت هێنا، چ جای ئێستا کە مردووە.'

دەڵێن عەمار لە ڕۆژی سەفیندا وتارێکی دا، پڕ لە جوامێری و ئازایەتی، ئەو بە هاوەڵەکانی گوت: 'گەلۆ هەستنەوە لەگەڵمدا لە دژی ئەو قەومەی کە دەیەوێت لە ڕێگەی داواکردنی خوێنی کەسێکەوە دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت، بەبێ ئەوەی خودا پێی ڕەوا بینیبێت. ئەمانە گوێیان لە هیچ شتێکی دیکە نییە بێجگە لە ماڵی دنیا، ئەمان دەخۆن و دەبەن ئەگەر ئەو دنیایەیشیان بەسەردا بڕوخێت گوێیان لێ نییە. ئەم جەماعەتە پێشینەیان لە ئیسلام نییە تا خەڵکی بەیعەتیان

بداتێ و پشتگیری بکرێن، ئەمانە دەڵێن: ئیمامەکەمان بە ستەم کوژرا، سا بەم بۆنەیەوە زیمامی بارودۆخیان بکەوێتە دەست، ئەمە فێڵێکە و تێیدا سەرکەوتووبوون، ئەگەر ئەم فێڵە نەبوایە تەنانەت دوو پیاویش بەیعەتی نەدەدانێ. خودایە بەردەوامبە لە سەرخستنمان، ئەگەریش بارودۆخەکە بۆ ئەوان دەبێت، ئەوە هێندەی بەندەکانی تۆیان خستووەتە نارەحەتییەوە، ئەوەندە نزم و نەوییان بکەرەوە"[190].

ئێمە نازانین ئەم هەواڵە لە بارەی عەمارەوە ڕاستە و ئەمانە قسەی ئەون؟ بەڵام هەرچۆنێک تەماشاکەی، ئەگەر پیاوێک بە شمشێر لە هەمبەر کەسێکەوە بجەنگێت ئیدی زمان چییە؟ ئەوەی کە نامۆیە ئەوەیە: عەمار بەم قسانەی لەمەڕ هاوەڵانی مەعاویەوە ئاوا بەتوندی و بەبێ پێچوپەنا خوێنیان حەڵاڵ دەکات. ئەوەیش زۆر ئاشکرایە کە عەمار دەیگوت: ڕقی قورەیش لە عەلی، ڕێک هەمان ڕقە کە پێشتر لە ئامۆزاکەی هەیانبوو -پێغەمبەری خودا- بەبێ هیچ جیاوازییەک. یەک شت جێگەی نیگەرانییە، ئەویش: عەمار جیاوازی لە نێوان عوسمان و ئەشرافەکانی دیکەی قورەیشدا نەدەکرد. وەک دەریشدەکەوێت عەلی لەم کارەیدا هاوڕای نەبووە. ئەو دەمەی عەلی بیستییەوە کە عەمار هەستاوە بەکافرکردنی عوسمان، زۆر بە خەستی سەرزەنشتی ئەو کارەیی کرد. عەلی دەیزانی عوسمان موئمینێکی قەدر گرانە، بەڵام ئەوە کە وای لە عوسمان کردووە ئاوا ڕەفتار بکات قەومەکەیەتی -قورەیش-. لە دیدگای عەلیدا، عوسمان کەسێکی ئیجبار کراو بووە، ئیختیاری لەدەست نەماوە. بەڵام عەمار هیچ جیاوازییەکی لە نێوان عوسمان و بێجگە عوسمان لە سەرانی قورەیش نەدەکرد، ئەمەیش هەڵەیەکی پینەنەکراوی عەمارە -بەداخەوە-.

[190]- عبداللە السبیتی، المصدر السابق، ص ١٥٠ – ١٥١.

وەک دەبینرێت عەمار لەم مەسەلەیەدا زۆر ڕۆچووە. ئەو ڕقێکی وەها لە دەروونیدا ڕوواوە، شاردنەوە و خۆ لێ دزینەوەی نییە، ئەو لەم کارەیدا چەند کەسێکی کەمی وەک ئەبوبەکر و عومەری چەند کەسێکی بەنی هاشم نەبێت، هیچ کەسێکی تری هەڵاوێرد نەکردبوو. ئەو بڕوای وابوو، هەروەک چۆن بەر لەمیش ئەبوزەڕ بڕوای وابوو، کە عوسمان لە ڕێچکەی دوو پێشینی خۆی، ئەبوبەکر و عومەر لایداوە.[191]

*** *** ***

ئەم شۆڕشەی عەمار لە دژی قورەیش چەندین شتی سەیر و نامۆی تێدایە. ئەو هیچ گرنگییەک نادات بە ئیمان هێنانیان، ئەوەی کە نیشانی دەدەن لە ڕواڵەتدا و ئەو تقوسە ئاینییانەی کە ئەنجامی دەدەن هیچ گرنگ نییە بەلایەوە. ئەو ئاین بە "مامەڵەی جوان" پێناسە دەکات، هەرچی نوێژ و ڕێوڕەسمە ئاینییەکانی دیکەیە، بە شتگەلێکی ڕواڵەتییان لەقەڵەم دەدات و هیچ شتێک لە جەوهەری حەقیقەت ناگۆڕێت. "ئەبوزەڕ"یش گوزارشتی لە ئاین دەکرد بە "یەکسانی لە نێوان هەژاران و دەوڵەمەندان" لە ماڵ و دەستکەوتەکاندا. بەڵام عەمار داوای ئەو یەکسانییەی لە نێوان بەندە و ئاغادا دەکرد. لە ڕاستیدا هەردووکیان لە یەک حیزب بوون، ئەویش حیزبی عەدالەتی کۆمەڵایەتی. بەڵام لە گۆشەنیگای جیاوازەوە. ئەمیان خێڵەکییە و بە چاوی خێڵەوە تەماشای هاوبەشیی کۆمەڵایەتی دەکات و ئەویشیان شارنشینە و بێزی لە خۆبەگەورەزانەکان دێتەوە و بە کافر ناویان

---

[191]- صادق عرجون، عثمان بن عفان، ص١٤٩.

دەبات، سەرەڕای ئەوەیشی خۆیان بە مسوڵمان لەقەڵەم داوە و لە ڕواڵەتدا ڕێوڕەسمە ئاینییەکان جێبەجێ دەکەن.

دەگێڕنەوە کە یەکێک لە هاوەڵانی عەلی لە جەنگی سەفیندا هات و شەکوای حاڵی خۆی لای عەلی کرد ئا بەم شێوەیە: ((من کە لە ماڵەوە دەرچووم، بەرچاوم ڕۆشن بوو، دەمزانی کە خۆمان لەسەر ڕاستی و ئەوان لەسەر 'چەوتی'ن، تا ئەمشەوی ڕابردوویش هەر لەسەر ئەو بڕوایە بووم تا گوێم لێبوو، بانگبێژەکەی ئێمە بانگی دا، شایەتی دا کە یەک خوا هەیە و موحەمەدیش پێغەمبەری ئەوە، لەوبەریشەوە بانگبێژەکەی ئەوان هەمان شتی وتەوە. دواتر ئێمە و ئەوان نوێژمان کرد، هەمان نوێژ، هەردوولامان دوعامان کرد، هەمان دوعا. لە یەک کتێبمان خوێندەوە -قورئان-. پێغەمبەرمان هەر یەکێکە، ئیدی لەو ساتەوە گومان خەریکە ناوسکم دادەماڵێت، مەگەر هەر خودا بزانێت ئەمشەو چۆن ڕۆژم کردەوە...)). ئەم کابرایە لە نارەحەتییەکی دەروونیدا بوو، خۆیشی نەیدەزانی چی بکات، ئەو هەردوو لای دەبینی لەسەر یەک ئاین، یەک شایەتوومان و یەک نوێژ، ئیدی لە خۆی پرسیبوو: باشە ئەمانە لەسەر چی ئاوا لێک ئاڵاون، ئیدی خۆی پێ نەگیرا و هاتە لای عەلی و پرسیاری لێ کرد، عەلیش پێی گوت: بڕۆ بۆ لای عەمار تا بۆت ڕوون بکاتەوە. کابرایش لێیدا و چوو لەناو ڕیزی جەنگاوەراندا گەڕا تا عەماری پەیدا کرد و لە بارەی سەرەگێژەکەیەوە پێی ڕاگەیاند، عەماریش وەڵامێکی دایەوە دڵ-داسەکنێن و بڕاوە، هیچ بوارێکی بۆ گومان جێنەهێشت. عەمار گوتی: ((... ئەو ئاڵایانەی کە ئێستا هەڵکراون، هەمان ئەو ئاڵایانەن کە لە جەنگی بەدر و ئوحوددا ڕووبەڕووی یەک دەبوونەوە، پاشان عەمار دەنگی بەرز کردەوە: سوێند بە خودا ئەگەر بە هەموو توانایان بە شمشێرەکانیان لێمان بدەن، من هەر دڵنیام کە ڕێگام دروستە و هیی

ئەوان چەوتە. ئەم ئاگرەیش دانامرکێتەوە تا یەکێک لەم دوو بەرەیە دان بە کوفری خۆی و ڕاستی بەرانبەردا نەهێنێت.))

لەمەوە ئەوە دەردەکەوێت کە عەمار سووربوو لەسەر بەردەوامی جەنگ تا قورەیش دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن. ئەمەیش شتێکی ئەستەمە، چونکە هەرگیز خاوەن بەرژەوەندی دان بە هەڵەی خۆیدا نانێت هەرچەندەیش لەسەر ناڕەوایی بێت. عەمار لەگەڵ پێغەمبەردا ساڵانێکی تووڵانیی شۆڕشیان لەسەر بنەماکانی خۆیان کرد، تا ملیان بە قورەیش کەچ کرد. قورەیش جارێک ملی کەچ کرد و نایکاتەوە بە دوو، کەسی عاقڵ دووجار لە کونێکەوە ناگەزرێت، ئیدی ئەو عاقڵە چی ئیماندار بێت یان زەندیق.

ئەمە خۆشی و سەروەتە، هەرگیز کەسی خۆشڕابوێر بە ئاسانی واز لە خۆشییەکەی ناهێنێت بۆ کەسێک کە دەیەوێت لێی داماڵێت.

*** *** ***

هەرچۆنێک تەماشا بکەین، عەمار سەبەئی عەیارە بیستوچوار بووە. مێژوونووسانیش ئاماژەیان بەوە داوە، کە چەندین جار سەبەئییەکان هەوڵیان داوە پەیوەندی بە عەمارەوە بکەن و مەیلی بەلای خۆیاندا ڕاکێشن، هەرچەندە مێژوونووسان نەیان گوتووە کە ئەم یەکێک بووە لەوان، وەک بڵێیت جورئەتی ئەوەیان نەکردبێت ئەم کاڵایە بە باڵایدا بدوورن، لەبەر پێگەی بەرزی و ئەو هەموو ئازارەی لەپێناو ئیسلامدا چەشتوویەتی و ئەو وەسفانەی پێغەمبەری خودا کە لە بارەیەوە گوتوویەتی. لە ڕاستیدا ئەو تاقانەی ناو سەبەئییەکان بوو کە دانی نابوو بە کوشتنی عوسماندا و هیچ خۆی لێ نەدەبوارد. ئەمە لەکاتێکدا

بـوو، زۆرێـک لەوانەی هاوبەشـی کوشـتنەکەی بـوون، دواتـر داوای خوێنەکەیان دەکرد- ئەمە شتێکی شاراوە نییە لای خەڵکی.

لەوانەیە دەمارگیری و توورەیی و دڵسافی عەمار، وای کردبێت زۆر بێباکـانە دانـی پێدا بنێـت، عەلـیش ئاگـاداری ئەم کـارەی ئەو بـوو، هیچیشـی نەدەگـوت، وابـزانم ئەم دوو پیـاوە هەردووکیـان لە ڕێگـا و ڕێچکەکەی خۆیان دڵنیابوون، ئیدی هیچ گوێیان بە خەڵکی نەدەدا چی دەڵێن و چی دەکەن، مادەم خۆیان لەسـەر ڕێگەی دروسـتن. ئەمەیـش بیروباوەڕی هەموو ئیمانداریکی ڕاستەقینەیە، وا دەزانن هەمـوو کەس وەک خۆیـان خـاوێنە، ئەمـانە نـازانن تووشـی چ گرفتێـک دەبـن و سنووری ئەو زیانەی تووشی دەبن چەندەیە، لەو کاتانەی دانپێدانانێک ئەنجام دەدەن و شتێک بە ئاشکرایی دەڵێن.

هەر لە زەمانی پێغەمبەرەوە دەنگوباس وا بڵاوبووەوە کە کۆمەڵێکی لادەر، لە عەمـار دەدەن و دەیکـوژن. وا گومـان دەبەم عەمـار زۆر بە تونـدی پشـتی بەم فەرمـوودەیە بەسـتبێت. لەوانەیشـە هەر ئەم پشـت ئەسـتوورییە بووبێت، کە دانـی نـابوو بە کوشـتنی عوسـماندا و هـیچ باکێکیشی نەبوو، ئەو وای گومان دەبرد هـیچ کەس جورئەتی ئەوەی نەبێت دەستی لێ بەرز بکاتەوە، نەبادا ببێتە ئەو گرووپە لادەرەی کە پێغەمبەر باسی کردووە. عەمار ئەوەی بیرچووبوو کە مرۆڤ توانای ڕاڤە و تەئـویلکردنی قسـەی هەیە. بنیـادەم دەتوانێـت پێغەمـبەران بکوژێت و دواتریش پاساوێک بۆ کارەکەی بدۆزێتەوە تـا لێی خـۆش بن، یان تەنانەت بەڵگەی دەسخۆشکەرانەیش بدۆزێتەوە و چاوەڕێی ئافەرین بکات.

هەر بەڕاسـتیش ئەم شـتە ڕووی دا، ئەو کـاتەی عەمـار کـوژرا لە سەفیندا، خەڵکی شام شپرزە بوون کە بینییان عەمار بە دەستی ئەمان کـوژراوە، بەڵام مەعـاویە پێـی گـوتن: ((کـێ وتـی ئـێمە کوشـتوومانە؟

ئەوانە کوشتیان کە هێنایان بۆ ئێرە))[١٩٢]. ئیدی خەڵکی شام هاتنەوە ماڵەوە و لە قەلەقی خەڵاسییان هات. پاشان هەندێک نیشانە هەن، باس لە خۆخستنە ناو جەنگی عەمار دەکەن بە شێوەیەک تا بە دەستی خەڵکی شام بکوژرێت، ئەوان تۆمەتبار و عەلیش بە سەرفراز ناوی دەرچێت. وایش دەردەکەوێت عەمار بینیبووی کە بە کوژرانی عوسمان، مەعاویە چ سوودێکی دەست کەوتبوو، بۆیە دەیویست کارێک بکات کە بە کوشتنەکەی، عەلیش سوودێک ببات. ئەو بیری چووبوو کە عەلی وەک مەعاوییە نییە، ئەو دڵسۆزی هەلپەرست نییە، تا بیەوێت سوود لە ڕووداوەکان وەرگرێت و بیان قۆزێتەوە بۆ خۆی.

ئەوەی کە جێگەی سەرسووڕمانە، هەریەکە لە عەمار و عوسمان تەمەنیان گەیشتبووە هەشتا و بووبوونە پیرەپیاوێکی ڕەقهەڵاتوو، هیچ دڵخۆشییەکیان بۆ مانەوە لە ژیاندا نەبوو. بەڵام هەردووکیان لای زۆرێک لە خەڵکی موقەدەس بوون.

عوسمان کورا و حیزبی قورەیش سوودێکی گەورەیان دەستکەوت، بەڵام عەمار کوژرا و حیزبی زەحمەتکێشەکان هیچ سوودێکیان لێ نەبینی. عەمار ڕۆیشتەوە بۆ لای خودای خۆی و هیچ میراتگرێکی نەبوو بێجگە لە عەلی و چەند کەسێکی کەمی دیکە.

دەگێڕنەوە لە گەرمەی سەروبەندی "سەفین"دا، عەمری کوڕی عاص دەنێرێت بە شوێن عەماردا و داوای بینینی دەکات، پاش چەندین مفاوەزە و شت، عەمار ڕازی دەبێت و دێت. لە هەردوولا پیاو هاتبوون و ئامادەی گفتوگۆکەیان بوون، پاش هەندێک قسەوباس لە نێوان هەردوو سەرکردەکەدا، عەمری کوڕی عاص پرسیارێکی ئیحراجکەرانەی لە عەمار کرد: "بۆچی ئێوە عوسمانتان کوشت؟". لەوانەیە کوڕی عاص ویستبێتی بەم پرسیارە دەمارگیری و سادەیی

---

[١٩٢]- طه حسین، الفتنه الکبری، ج٢، ص٨٤.

عەمار ئاڕاستە بکات و قسەی لێ دەربهێنێت. عەمار وەڵامی دایەوە: ((من لەگەڵ ئەوانە بووم کە کوشتیان، وا ئەمڕۆیش لەگەڵیانم... ئەو دەیویست ئاینەکەمان بشێوێنێت، بۆیە کوشتمان!)). کوڕی عاص بە لێزانینێکەوە سەیرێکی خەڵکەکەی دەوروبەری کرد، کە خەڵکی شام بوون و وتی: ((مەگەر نەتانبیست؟... ئەوتا دانی نا بە کوشتنی ئیمامەکەتاندا)).

ئەوەی کە ئەو لێزانییەی عەمری کوڕی عاسی لێک دابێتەوە، دەزانێت کە تەنها ڕیکلامێک بووە دژی عەمار. لەوانەیشە زانیبێتی کە عەمار بە دەستی خەڵکی شام دەکوژرێت، بۆیە پێشوەختە جوان قوڕەکەی بۆ بیشێلێت. ئەگینا هەر مەعقول نییە، تۆ لە گەرمەی شەڕدا، داوای بینینی عەمار بکەیت و ئەو پرسیارە ئیحراجکەرە پڕوپووچەی لێ بکەیت. بەهێزترین گومان لەم کارەدا ئەوەیە: عەمر ویستوویەتی سوود لەو ڕق و سادەییەی عەمار وەرگرێت و لەبەر چاوی خەڵکی شامدا بیبێزرێنێت و ئەو پیرۆزییەی نەمێنێت کە پێغەمبەر باسی لێوە کردبوو.

لە کۆتاییدا عەمار کوژرا و هیچ کەسیش بۆی دڵبەژان نەبوو، ئەو وەک هەموو کوژراوەکانی دیکە بەبێ شینبۆکردن خرایە ژێر خۆڵ.

*** *** ***

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە: باشە ئەی ئیبن سەبەئ چی لێهات لەم مەعمەعە گەورەیەدا؟ لە هەموو شتێک سەیرتر، ئەم ئیبنو سەبەئە، لە هەرچی فیتنە و جەنگەهەڵگیرسانی دژی عوسمان و کوشتنی عوسماندا ڕۆڵی بەرچاوی هەیە، بەڵام لە سەفیندا هیچ ڕۆڵێکی نییە ، تەنانەت

ناویشی نییە لەو ڕۆژەی کە عەماری کوڕی یاسری تێدا دەکوژرێت. باشــە ئەم کـابرا زۆرزانە لەم جەنـگە مەزنەدا بـۆ کـوێ چـوو، چـی لێهـات؟ لەکـوێ خـۆی قـایم کـرد؟ بێگومـان ئەو لە کـاتی جەنـگەکەدا زیندوو بوو، چونکە مێژوونووسان چەندین کاری دیکەی دەدەنە پاڵ لەدوای جەنــگەکە، بــێجگە لە گەلەکــۆمەکەی ســەر عوســـمان و ڕووداوەکـانی بەسـرە، بەڵام ئەم پیـاوە لەم ڕۆژەدا چـی لێهـات؟ تـۆ بڵێیت نەخۆش بووبێت؟ یان سەفەرێکی بەپەلەی بۆ هاتبێتە پێش؟ یان جندۆکە بردبێتیان بۆ نیوەدوورگەی واق واق؟

مێژوونووسان نزیک و دووریش وەڵامی ئەم پرسیارە نادەنەوە.

خۆی لە ڕاستیدا ئەو لە کاتی جەنگەکەدا خۆی نەشاردبووەوە، بەڵکو هەر بـوونێکی ڕاسـتەقینەی نەبـووە تـا بتوانێت خـۆی بشـارێتەوە. ئەو تەنهـا وەهمێکـی دروسـتکراو بـوو، وەهمـیش دێـت و دەڕوات بە پێـی داخـوازی کەشـوهەوای دروسـتکەرانی وەهـمەکە. گومـانی زۆرم بـۆ ئەوە دەچێـــت، هەر لەو دەمەی کە قـــوڕەیش ئەم کەســـایەتییە وەهمییەیـان دروسـت کـرد، مەبەسـتیان پێـی عەمـاری کـوڕی یاسـر بووبێـت، ئیـدی کە لە سـەفیندا عەمـار کـوژرا، ئیـدی قـوڕەیش هـیچ سـوودێکیان لە باسـکردنی نەبینـیەوە و وردە وردە لێـی تەکـانەوە، مێژوونووسانیش بەدوای ئەماندا تەکینەوە دواوە.

قوڕەیش دەیزانی بۆچی عەمار لێیان بێزارە و دوژمنایەتییان دەکات. لە سەرەتاوە لێی بێدەنگ بوون چونکە لەناو خەڵکیدا پێگەیەکی ئاینی بەرزی هەبـوو، ڕەنـگە لەوەیش ترسـابن، ئەگەر بە ئاشـکرا ململانێـی لەگەڵ بـکەن، شۆڕشـەکەیان مانـایەکی بەرزتـر و گرنگتـر وەرگرێـت. بەڵام قوڕەیش ئەو دەمـامکەی هەڵدایەوە لە ڕۆژی سـەفیندا، ئەمەیش کاتێک بوو، هەڵوێستی عەمار تەواو ڕوون بووبووەوە لە دژیان، ئیدی کاریان لەکار ترازاند.

*** *** ***

وا خەیاڵ دەکەم ئەم چیرۆکی ئیبن سەبەئە، چیرۆکێکی بە بەرنامە بووە، سەرەتا و کۆتایی زانراوە، لێرەیشەوە دەردەکەوێت قورەیش تەنها لە مەیدانی سیاسەتدا دەستی باڵایان نەبووە، بەڵکوو لە دارشتنی چیرۆکیشدا کارزان بوون. لەوانەیشە قورەیش لە کۆبوونەوەکانی سەردەمی عوسمانیاندا، ناوی عەماریان بردبێت و قسەی ناشیرینیان بە پەنهانی پێ دابێت، بەڵام بە باشیان نەزانیبێت ئەم جنێوپێدانەیان ئاشکرا بکەن لە بەردەم خەڵکیدا. لەوانەیشە یەکێک لە گێڕەرەوەکانی چیرۆکەکە لە کاتی بیستنی "ئیبن سەودا"دا وایزانیبێت باسی کەسێکی دیکە دەکەن، نەک عەماری کوڕی یاسر. خودا دەزانێت، لەوانەیە چیرۆکی ئیبن سەبەئـ هەر لە سەرەتاوە بەم هەڵە تێگەیشتنەدا ڕۆیشتبێت و ئیدی دواتریش لەملاولاوە شتی پێوە لکێنراوە، ئەفسانە لەسەر ئەفسانە کەڵەکە بووە تا ئەمەی لێ پێک هات کە پێک هات.

لە سەیروسەمەرەیی مێژوو، زۆرێک لەو شتانەی لە بارەی ئیبن سەبەئەوە باس دەکرێت، لە ژیاننامەی عەماردا هەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان. بەڕاستی ئەم شتە مرۆڤ بەرەو بیرلێکردنەوە ڕادەکێشێت. ئەوەی لێکۆڵینەوە بۆ قسە و ڕەفتارەکانی عەمار بکات، لەیەکچوونێکی زۆر زۆر دەبینێت لەگەڵ قسەو ڕەفتارەکانی ئیبن سەبەئدا. ئایا ئەمە بە تەنها سوتفەیەکە؟ یان نیشانەیە بۆ نهێنییەکی شاراوە؟

هەندێک شت دەخەمە بەردەم خوێنەرەوە لەمەڕ هەردوو کەسایەتییەکە، تا خوێنەریش بۆچوون و دیدگای خۆی نیشان بدات. من دڵنیام خوێنەریش تووشی سەرسوورمان دەبێت لەو شتانەی کە دراونەتە پاڵ عەمار و پاڵ ئیبن سەبەئـ.

1 - ئیبن سەبەئیش بە "ئیبن سەودا" ناسرابوو، هەر وەک چۆن عەماریش هەمان ناوی لێ نرابوو. عەرەب ڕاهاتبوون لەوەی ناوناتۆرە لە کەسێک بنێن بە ناوی باوک یان دایکە نزمەکەیەوە. عەرەب گرنگییەکی زۆر دەدەن بە ڕەچەڵەک، ئیدی ئەگەر بیتوو ڕقیان لە کەسێک بێتەوە، ئەوا دەیخەنە ڕیزی سووک و ڕسواکانەوە. شایەنی باسە، قوڕەیش لە سەرەتای بانگەوازەوە بە موحەمەددا دەگوت "ئیبن ئەبی کەبشە"،وەک سووکایەتیپێکردن، هەروەک چۆن بە عومەریان دەگوت "ئیبن حەنتەمە"، عەماریش بێبەش نەکرابوو لەم سووکایەتییە، چەندین ناوناتۆرەیان پێوە نابوو، وەک "ئیبن سومەیە"، "ئیبن موتکائ" و "ئیبن سەودا."

2 - عەمار لە باوکێکی یەمەنی. مانای ئەمەیش ئەوەیە ئەو خەڵکی سەبەئە. هەر کەسێکی خەڵکی یەمەن دەتوانرێت پێی بگوترێت سەبەئی. خەڵکی یەمەن هەموویان دەچنەوە سەر ڕەچەڵەکی "سەبەئی کوڕی یەشجووبی کوڕی یەعروبی کوڕی قەحتان". لە قوئانیشدا کە باسی پەپوسلێمانە دەکات کە لە سەبەئەوە هەواڵی بۆ هێناوە، مەبەستی بەو سەبەئە، مەملەکەتی یەمەنە.

3 - عەمار زۆر زۆری عەلی خۆش دەویست، خەڵکی هان دەدا بەیعەتی بدەنێ و دوعای بۆ دەکرد. ئالوسی دەگێڕێتەوە: کابرایەک هات بۆ لای عەمار و پرسیاری ڕاڤەی ئەم ئایەتەی لێ کرد

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿۞وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾﴾ النمل: ٨٢

عەماریش ئەو جوقەوەرەی دێتە دەرەوە و قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات مەبەست پێی عەلییە. ئەم قسەیەی کە دراوەتە پاڵ عەمارەوە، ڕێک لەولاوە هەمان وتە دەبینینەوە کە ئیبن سەبەئ وتوویەتی لە

بارەی گەڕانەوەی پاش مەرگی عەلی بۆ دنیا.

4 - لە دەورانی عوسماندا، عەمار چوو بۆ میسر، لەوێ دەستی کردە خەڵک هاندان دژی عوسمان، ئیدی والی بە دەستییەوە سەغڵەت بووبوو، خەریک بوو تێی بسرەوێنێت. ئەم هەواڵەیش بە تەواوی لەوە دەچێت کە دراوەتە پاڵ ئیبن سەبەئ کە لە میسر جێگیر بووە و ناوچەی "فوستات"ـی کردووە بە چەقی بانگەوازەکەی و شوێنکەوتەکانی لێرەوە ڕەوانەی ناوچەکان کردووە[193].

5 - ئەو قسەیەیش دراوەتە پاڵ ئیبن سەبەئ کە گوایە گوتوویەتی بە زۆر خەلافەتی وەدەست خستووە، ئەگینا لە بنەڕەتدا مافی عەلی بووە. لە ڕاستیشدا ئەم قسەیە بە تەواوەتی هی عەماری کوڕی یاسرە. ڕۆژێکیان لە مزگەوت بە دەنگی بەرز هاواری کردووە، لە دەمی بەیعەتدانەکەی عوسماندا: ((... ئەی هۆزی قورەیش، ئەگەر ئەم شتە لە بنەماڵەی پێغەمبەرەکەتان دەربهێنن، ئەوا دڵنیا بن خودایش لەژێر چنگی ئێوەی دەردەهێنێت و دەیداتەوە بە کەسی شیاوی خۆی، وەک چۆن ئێوە لەوتان دابڕی داتانە دەست ناشی و نەزانان)).

6 - دەڵێن گوایە ئیبن سەبەئ نەیهێشتووە سوڵحی شەڕەکەی جەمەل سەربگرێت لە نێوان عەلی و عایشەدا، ئەگەر ئەو نەبوایە، هەر زوو ئاشتەوایی دەکەوتە نێوانیانەوە وەک ئەوەی ڕاوییەکان باسی دەکەن. خۆ ئەگەر یەکێک بە وردی بەدواداچوون بۆ ڕووداوەکانی بەسرە بکات، دەبینێت عەمار چ ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە. هەر ئەو بوو لەگەڵ حەسەن و مالیکی ئەشتەردا چوونە کوفە و خەڵکەکەیان هێنا بۆ پشتیوانی لە عەلی. هەبوونی عەمار لە بەری عەلیدا ـ یەکێک بوو لە هۆکارە هەرە گەورەکانی پاشەکشەی زوبەیری کوڕی عەوام و

[193]- شهاب الدين الالوسي، روح المعاني، ج٦، ص ٣١٢.

دەرچـــوون و ســـەرهەڵگرتنی خـــۆی- بەهـــۆی فەرمـــوودەکەی پێغەمبەرەوە.-

7 - دەڵێن ئەوە ئیبن سەبەئ بوو ئەبوزەڕی هان دا بۆ بانگەوازە ئیشتراکییەکەی، خۆ ئەگەر پەیوەندی عەمار و ئەبوزەر بخوێنینەوە، دەبینین هەردووکیان سەر بە یەک قوتابخانەن، قوتابخانەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب. ئەم سیانە پێکەوە کۆدەبوونەوە و ڕاوێژیان دەکرد.

تەبەری دەگێڕێتەوە: ((... ئیبن سەبەئـ هات بۆ لای ئەبوزەڕ و پێی وت: ئەوە تۆ سەیرت لەو قسەیەی مەعاویە نایەت کە دەڵێت: "سامان سامانی خودایە، هەموو شتێکیش هەر هیی ئەوە، وەک ئەوەی بیەوێت هەموو ماڵەکە بەرێت بۆ خۆی و بەشی مسوڵمانانی لێ نەدات"، ئیدی ئەبوزەڕ چوو بۆ لای مەعاویە و خۆی لێ تووڕە کرد و هەڕەشەی لێ کرد)). من وا گومان دەبەم قسەکەرەکە عەمار بووە نەک ئیبن سەبەئـ لە کوێ جوولەکەیەک لەو سەردەمەدا بە بیرۆکەیەکی ئاوا دانسقەوە دێت، لە کاتێکدا شتی لەم جۆرە بەر لە ئیسلام وا دەردەکەوێت باس نەکرابێت. هەرچۆنێک بێت ئەم قسەیە، یان لە قسەی عەمار یان مامۆستاکەی دەچێت.

عوسمان ڕۆژێکیان وتاری دەدا و دەیوت: ((... ئێمە پشکی خۆمان لەم دەسکەوتانە دەبەین بەکوێرایی چاوی هەندێک)). عەمار بە ڕەخنەوە هەستایە سەرپێ و وتی: ((خودا شایەتە یەکەم کەسم کە بە کوێرایی چاوم ئەو پشکە دەبەن...)). عەلیش لەولاوە ناڕەزایی دەربڕی و گوتی: ((کەواتە ئەم کارە ڕێگەی پێ نادرێت و خۆتان لە نێوانتاندا چارەی بکەن.))

ئەبوزەڕ هیچ واجۆی کەسێکی وەک ئیبن سەبەئـ نییە تا بێت و دەرسی عەدالەتی لە دەستکەوتی جەنگدا پێ بڵێتەوە کە گوایە هیی

هەموو مسوڵمانانە و ناکرێت ناوی خودای لێ بنرێت، چونکە ئەو دوو هاوڕێی هەیە لەپێشترن فێری بکەن لە حاڵەتێکدا ئەگەر پێشتر ئەو شتانەی نەزانیبێت.

***

گوشراوی قسان ئەوەیە، ئەو ئیبن سەبەئەی ناوی دە ناوان کەوتووە، هیچ کەس نییە بێجگە لە عەمار. قوڕەیش عەماریان بە سەردەستەی شۆڕشگێڕانی دژی عوسمان ناوزەد کرد، بەڵام لە سەرەتای کارەوە نەیادەویست ئاشکرا ئاماژە بە ناوەکەی بکەن و هاتن بە ئیشارەت و هێما ناویان کردە "یبن سەدا یان ئیبنو سەبەئ". لێرەیشەوە ڕاوییەکان -حەقایەتخوانەکان- ئەم ڕەمزەیان دەگێڕایەوە بەبێ ئەوەی بزانن ناواخنی ئەم قسانە لە کوێوە سەر دەردێنێتەوە. ئەمە گومانە کە من دەیکەم، قورئانیش دەڵێت هەندێک گومان خاوەنەکەی تووشی گوناهباری دەکات، بەڵام چارم ناچارە بە گوتنی بەهۆی زەبەندەیی ئاماژەکانیەوە.

شتێکیش کە پێویستی بە وتنە، عوسمان دوور و نزیک خەبەرداری ئەم حەقایەتانەی ئیبن سەبەئ نەبووە. باشە ئەم ئیبن سەبەئە دنیای لە دژی عوسمان کۆکردبوویەوە و عەشاماتێکی ئاڵۆزکاندبوو، باشە ئەوە خێرە عوسمان ئاگای لە دنیا نییە؟ یان یەکێک لە والییەکانی هەواڵێکی بۆ نانێرن، خەبەرداری ناکەنەوە لە دۆخەکە! عوسمان جارێکیان گازەندە لە عەلی و عەمار و عەبدوڵای کوڕی عەباس دەکات کە خەڵکی لە دژ هان دەدەن، باشە ئەی بۆچی ناوی ئەم ئیبن سەبەئە نابات کەوا خەریکە زەمین و ئاسمان پێکەوە گرێ دەدات.

ڕۆژێکیان عوسمان چوویە لای عەباس و شەکوای لە عەلی کرد، گوتی: ((خاڵۆ... عەلی سیلەی ڕەحمی لەگەڵ پچڕاندووم. کوڕەکەیشت خەڵکم لێ پڕ دەکات، سوێند بە خودا ئەگەر ئێوە دۆخەکەتان خستۆتە دەستی بەنی تەیم -ئەبوبەکر لە بەنی تیم بوو- و بەنی عەدی- عومەریش لە بەنی عەدی بوو- ئەوا بەنی عەبدولمەناف لەپێشترن کە ململانێی لەسەر بکەن و لەچەرییان لێبێت کە دراوە بە کەسێکی دیکە))[١٩٤].

ئەمە زۆر جێگەی سەرسوورمانە کە هەواڵی پشێوییەکانی ئیبنسەبەئـ زەمین و ئاسمانی پڕ کردووە، کەچی عوسمان یەک شت لەم بارەیەوە باس ناکات و ناوی ناهێنێت. مەسعودی دەگێڕێتەوە: ((ڕۆژێکیان عوسمان گلەیی دەکرد لە عەلی و دەیگوت: "ئەو تانەم لێ دەدات و پشتی هەر کەسێکیش دەگرێت کە تانەم لێ بدات")). مەبەستی ئەبوزەر و عەمار بوو. ئەمەیش بە تەواوەتی ئاماژەیە بۆ ئەوەی عوسمان ئاگاداری ئەو کەتنە نییە کە قوڕەیش بەدەستیانەوەیە بۆی. ئەو پیاوێکی دڵپاک و خاوێنە، کاتێک دەبینێت خەڵکی لە دژی هەڵساون، سەری سووڕدەمێنێت و دەپرسێت و ئەم و ئەو تۆمەتبار دەکات بە هەڵایرساندنی ئاگری فیتنە دژی، بێئاگا لەوەی قوڕەیش بە زیندوویی و بە مردوویيش دەیانەوێت بۆ سوودی خۆیانی بەکار بهێنن.

ڕەحمەتی خودا لە عوسمان... ئەو بوویە قوربانی دەستی سیاسییە تەماحبازەکان.

---

[١٩٤]- المسعودی، مروج الذهب (نقلا عن عبدالسبیتی، عمار بن یاسر، ص٩٧).

# بەشی نۆیەم

## عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لە هیچ ئومەتێکی سەرزەویدا کەسێک نەبووە هێندەی عەلی لە ئوممەتی ئیسلامدا بووبێتە جێگای مشتومڕ و باسکردن. دەبێت هۆکاری ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە چی بێت؟

ئەوەی نامۆیە: زۆرینەی گرووپە ئیسلامییەکان خۆیان دەدەنە پاڵ عەلییەوە. شیعە هەر خۆیان شیعە -پاڵپشتی- عەلین[195]. ئەهلی سوننە دەڵێن: تاقە شیعە و پشتیوانی عەلی ئێمەین نەک سۆفییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن: سەردار و مامۆستای یەکەمی سۆفیگەری و دامەزرێنەر بریتییە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب[196].

ئەهلی فەتوە دەڵێن: یەکەم جاحێل لە ئیسلامدا عەلی بووە، لەم قسەیەشیاندا پشت بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (د.خ) دەبەستن کە فەرموویەتی: ((لا فتى الا علي، ولا سيف الا ذوالفقار))[197] واتە "لاو هەبێت عەلییە و شمشێریش هەبێت زولفەققارە". هەوادارانی وەرزشی

---

[195]- عباس العقاد، عبقريه الامام، ص٤٣.

[196]- Hitti، op. Cit، p.١٨٣.

[197] ئەم فەرموودەیە لای ئەهلی سوننە لاوازە و ئەم سێ پیاوە لە سێ کتێبی بەناوبانگی خۆیاندا بە حەدیسێکی درۆی دەزانن "ابن حجر في لسان الميزان"، "ابن العجمي في الكشف الحديث"، "السيوطي في اللالى المصنوعه" وەرگێڕ.

کلاسیک -زۆرخانە ناوە مۆدێرنەکەیەتی- دەڵێت: ئەوە عەلی بوو ئەم شتەی بنیات نا، هەر بۆیە لە کاتی دەستپێکردنی تەمرینە ناسراوەکانیاندا ناوی عەلی دەهێنن.

ئیبن ئەبی حەدید دەڵێت: "عەلی باوکی زانستی کەلامی ئیسلامییە". هەروەها فیقهی ئەبی حەنیفە و مالیکیش دەداتە پاڵ عەلی. هەروەها دەنگوباس وەهایە عەلی دامەزرێنەری ڕێزمانی عەرەبییە.

هەروەها دەگوترێت عەلی ڕەوانبێژترین وتارخوێنی ناو ئیسلامە، ئێستایشی بە دەمەوە بێت هەندێک لە واترەکانی لە دووتوێی پەرتووکێکدا بە ناوی "نهج البلاغە" کۆکراونەتەوە و لە بەردەستی مسوڵمانانندایە، لای هەندێک بە قورئانی دووەم گوزارشتی لێ دەکرێت، دەڵێن: ئەمە لە خوار قسەی خودا و سەری قسەی مرۆیە. "لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر بیرگ ئاماژە بەوە دەکەن کە سوپای کۆنی عوسمانی -کە ناو دەبرا بە سوپای ئینکیشاری- لەسەر مەزهەبی "بەکتاشی" بووە. بەکتاشیش ڕێچکەیەکی سۆفیگەرییە کە زۆر ڕۆچوون لە خۆشەویستی عەلیدا، لەوانەیشە لە هەندێک ڕووەوە بەرگی خودایەتییان بە بەریدا کردبێت. پرۆفیسۆر نیکڵسۆن دەڵێت: حیکمەت و قسەکانی عەلی بەناو هەموو ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا دەماودەم بڵاو بووەتەوە. پرۆفیسۆر فلیپیش دەڵێت: عەلی لەناو کولتووری عەرەبیدا جێگەی سولەیمانی حەکیمی گرتووەتەوە... وەک دەبینرێت ژمارەیەکی بێپایان لە قسەی جوان و حیکمەتی دراوەتە پاڵ. ناوی ئەو لەسەر زۆرێک لە شمشێرەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی عەرەبستان بە گشتی هەبووە، عەلی بووبووە پێشەنگی زۆرێک لە گرووپەکانی لاوان و دەروێشان. ئەوەی کە جێگەی سەرسوورمانە، عەلی ئەو کەسەیە کە زۆرترین کەس بە خودایان زانیوە. دکتۆر ئەحمەد ئەمین دەڵێت: ((... ئەوەی کە تەماشای ئەم بابەتە بکات،

سەری سوور دەمێنێت، دەڵێت: باشە هۆکاری ئەم "بەخوداکردنە"ی عەلی چی بێت؟ ئەمە سەرباری ئەوەی یەک کەس باسی خوایەتی موحەمەدی نەکردووە (درودی خوای لەسەر بێت)، تەنانەت عەلی خۆیشی بە ئاشکرا دەڵێت: من مسوڵمانم و شوێن ئاینی موحەمەد کەوتووم))[198].

بەڕاستی دیاردەیەکی کۆمەلایەتی سەیرە، پێویستی بە شرۆڤە هەیە.

ئەوەی جێگەی نیگەرانییە، توێژەرانی پێشین هیچ گرنگییەکیان بەم دیاردەیە نەداوە، وەک بڵێیت بە شتێکی ئاسایی و نۆرماڵ تەماشایان کردبێت، لە کاتێکدا ئەمە یەکێکە لە هەرە مەتەڵە ئاڵۆسکاوەکانی مێژوو، کە پێویستییەکی زۆری بە شرۆڤە و شیتەڵ هەیە. ئیبن خەلدون هەروا سەرەداوێکی لێ هەڵداوەتەوە، بە تایبەتی لەو شوێنەی کە باسی سۆفییەکان دەکات، ئەو لە بارەیانەوە دەڵێت: ((ئەوان بۆ برەودان بە خیرقەپۆشینی خۆیان، هەستاون کارەکەیان داوەتە پاڵ عەلی...)). ئیبن خەلدون سەری لەم کارە سور دەمێنێت و نەرێی دەکات، ئەو وای دەبینێت عەلی هیچ جیاوازییەکی نەبووە لە هاوەڵانی دیکە لە ڕووی جلڵەبەرکردنەوە یان حاڵ و ئەحواڵی کەسێتییەوە. تەنانەت بڕوای وایە ئەبوبەکر و عومەر لە عەلی زاهیدتر بوون، ئیدی بۆچی عەلی لەوان جیا دەکرێتەوە؟ سەرسووڕمانی ئیبن خەلدون لە جێگەی خۆیدایە، بێجگە ئەمیش، هەر توێژەرێکی کۆمەلایەتی - کۆمەڵناسێک- کە دێتە ناو ئەم بازنەیەوە تووشی هەمان دەهشە و گومان دەبێت. ئەوەتا ئەحمەد ئەمینیش شتەکە بە نامۆ دەبینێت کاتێک دەبیستێت وا هەرچی زانستی ئیسلامییە هەمووی دەدرێتە پاڵ عەلی، ئەو دەڵێت: ((ئەوە چییە دەڵێیت هەرچی عەقڵ و هۆشە هەمووی نەزۆک و نەکڵۆکە، بێجگە لە عەقڵ و هۆشی عەلی کوڕی ئەبو تالیب

---

[198]- - احمد أمين، المصدر السابق، ص ٢٧٠.

و نەوەکـانی)). لێـرەوە هەنـدێک لە تـوێژەران هەوڵیـان داوە شـتەکە بـخەنە گەردەنـی ئیـبن سەبەئـ، ئەم لەئەستۆهاویشـتنەیش لە خـودی دیاردەکە سەیرترە، چونکە ئیبن سەبەئ هەرچەند بلیمەت بوو بێت، یان لە سروشت بەدەر بێت، هەر ناتوانێت شتێک لە هیچەوە بێنێتە بوون. دەبێت لە کەسایەتی عەلیدا شتێکی نامۆ هەبووبێت تا بـووبێتە جێگەی سەرنج و گرنگیپێدان[199].

***

فیقهزانی بەناوبانگ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: "لە بـارەی هـیچ کەسـێکەوە، هێنـدەی عەلـی فەزائیـل -باسـی چـاکە- بـاس نەکـراوە". ئیسماعیلی قـازی و نەسـائی و ئەبوداود و نیسـابووریش دەڵـێن: ((لە بارەی هیچ هاوەڵێکەوە هێندەی عەلی، سـەنەدی حەسـەن -چـاک-مـان پێ نەگەیشتووە)). ئەم قسەیەی کە ئەحمەد و گەورە فەرموودەناسانی دیکە دەیکەن، کلیلی دەرگایەکمان دەدەنێ کە بتواین چارەسـەری ئەم گرفتەی پێ بکەین. ئێمە هێندەی ڕیوایەت لە بـارەی پەسـنی عەلییەوە دەبینین، لە بـارەی هـیچ هـاوەڵێکی دیـکەوە نـابینین. لە ڕاستیشدا ئەم مەدحانەی پێغەمبەر لە سـەرەتاوە وەک هەوێن وابوون، دواتـر وردە وردە، نەوە لە دوای نەوە ڕیـوایەتی دیـکە لە دەوری ئەم هەوێنـانە کۆبـوونەوە و ژمارەیـان تەواو زیـادی کـرد. ئەمەیـش دەتوانرێـت ناوبنرێت بە "کەڵەکەبوونی فیکری". خەڵکی کاتێک کەسێکیان خـۆش ویسـت، ئیـدی لەبەر هەر هۆکارێـک بێـت، ئەوا دەگەڕێـنەوە بـۆ فەزیلەتەکانی و هەر جارەی شتێکی لە بارەوە زیاد دەکەن تا خـودا

[199] - احمد أمين، المصدر السابق، ص٢٧٦.

حەقی بسێنێت هەر بۆی زیاد دەکەن. لە زانستی ئەتۆمی هاوچەرخدا، کاتێک گەردیلەی یەکەم دەبێت بە دوو کەرتەوە، دەبێتە هۆی لەتبوونی گەردیلەکانی دیکەیش بە دوایدا، هەر لەتبوونێکیش، لەتبوونی دیکە بە دوای خۆیدا دەهێنێت، لێرەوە وزەیەکی هەرە بەهێز دروست دەبێت کە ئەمڕۆ ئەم وزەیە ناو نراوە بە "کارلێکی زنجیرەیی "Chain Reaction". لە ڕاستیشدا بیری مرۆڤیش لەسەر هەمان سیستەم کار دەکات، هەر ئایدیایەکی نوێ، ئایدیاگەلێکی دیکەی نوێ بە دەوری خۆیدا دروست دەکات ئەگەر لە کۆمەڵگەدا باری لەبار بوو، واتە کەشوهەوای بۆ ڕەخسا.

***

لە سەرەتاوە، ژیانی کۆمەڵایەتی "عەلی"ش بە هەندێک فەرموودەی پێغەمبەر دەورە درابوو، قەدەریش ڕێگەی دا لە کۆتاییدا عەلی هەستێت بە شۆرش دژی قوڕەیش بۆ لەناوبردنی چینایەتی لە ئیسلامدا. ئیدی لێرەوە عەلی بووە پەناگەی هەر کەسێک کە دەیویست گازەندە لە ستەم و کۆیلایەتی بکات، پاشانیش بووە هۆی زیادەڕۆیی لە خۆشویستنی عەلیدا زیاتر باسکردنی فەزیلەتەکانی تا دەوران گەیشتە سەردەمی کۆکردنەوەی فەرموودە، کاتێک کە فەرموودە کۆکرایەوە دیترا پشکی عەلی لە هیی هەموو کەس زیاترە. فەرموودەکانی پێغەمبەریش بە شێوەیەکی گشتی تێکەڵ کرابوو لە درۆ و دەمهەڵبەست. لە بارەی عەلیشەوە، چونکە هەوێنێک لە سەرەتادا هەبوو، پێغەمبەر کاتی خۆی پەسنی عەلی دابوو، لە بارەی فەزیلەتەکانیەوە هەندێک شتی وتبوو، ئیدی ئەمە بوویە هۆی

کـۆکردنەوەی یەک دنیـا قسەوباسـی دیکەیـش نەوە لە دوای نەوە. ئەمەیش دەرگایەکی هەمیشە کراوەی بەسـەر خەڵکیدا بەجێ هێشت. لەوانەیە زیادەڕەوییمـان نەکردبێت، ئەگەر ئەفسـانەی عەلـی کـوڕی ئەبوتالیبمان بە بۆمبی ئەتۆمی وێنا کردبێت، گەردیلەی یەکەم لە لایەن خودی موحەمەد (د.خ) تەقێنراوەتەوە و ئەوانی دیکەی واز لێ هێناوە بـۆ تەقیـنەوە زنجیـرەییەکە، بە تـایبەتیش دوای ئەو شۆڕشـەی کە هەڵیگرساند بۆ بەرقەرارکردنی عەدالەتی کۆمەلایەتی.

لێرەدا پرسێکی گرنگ سەر هەڵ دەدات ئەویش: هۆکار چییە وا عەلی لە هاوەڵانی دیکە زیاتر مەدح کراوە؟

گومـانی تێدا نییە، عەلـی یەکێک بـووە لە قارەمانەکـانی مەیدانی ئەو جەنگـانەی کە لەگەڵ پێغەمـبەردا کردوویـانە. عەلـی یەکێـک بـوو لە پاڵەوانەکـانی جەنگـی بەدر، ئوحـود، خەنـدەق، خەیـبەر و حـونەین. ئەوەی ئەم جەنگانە بخوێنێتەوە، لە قارەمانی عەلی هیچ دڵتەنگییەکی تووش نابێت، عەلی هەموو زۆرانبازەکانی بەرانبەری کوشتووە، ئیدی هەر کەسـێک بـووبن، کەس لە جەنگـی دوو نەفەریـدا (مبـارزە) نەیتوانیـوە بیـدات بە زەمینـدا، تـا لەنـاو خەڵکیـدا وا بڵاوبووبـووەوە: "عەلـی شـەڕ لەگەڵ کەسـدا ناکـات مەگەر دەیکوژێـت". وایـش دەردەکەوێت ئەم ئازایەتییەی عەلی لە خزمەت پێغەمبەر و ئاینەکەیدا، بـوو بێتە جێگـای سـەرنجی پێغەمـبەریش، ئیـدی لە هەر بۆنەیەکـدا وەسفوسـەنای کردبێـت. ئەم وەسـفکردنە دووبـارانەیش لە لایەن خەڵـکەوە ئەزبەر کـراون و دەمـاودەم گێـڕدراونەتەوە، لەوانەیشـە خۆیان کەم تا زۆر شتیان پێوە لکاندبێت.

پاشـان هۆکـارێکی دیکەیـش هەیە کە وای لە مـوحەمەد کـردووە، بە باڵای عەلیدا هەڵبدات، ئەویش پاڵنەری کەسێتییە. موحەمەدیش مرۆڤە، مەیل و خۆشەویستی و عـاتیفەی هەیە، لێکۆڵەری بێلایەن ناتوانێت

خۆی لەم پاڵنەرە بکاتە کەرەی شەربەت و حسابی بۆ نەکات لە لێکۆڵینەوە لە ژیانی پێغەمبەردا. ئێمە هەڵەمان نەکردووە ئەگەر بڵێین: پێغەمبەر بە چاوی باوکایەتییەوە تەماشای عەلی کردووە بە شێوەیەک لە شێوەکان. موحەمەد بێبەش بوو لە هەبوونی کوڕ، ئەم شتەیشی بە لاوە ناخۆش بوو، بە شێوەیەکی گشتیش عەرەب گرنگی زیادتر بە کوڕ دەدەن. من ناتوانم بڵێم مەحەمەد لەم شتەدا جیاواز بووە لە هەموو خەڵکی، لەوانەیە ئەمە بووبێتە هۆی ئەوەی عەلی وەک کوڕی خۆی تەماشا کردبێت پاش ئەوەی لە سەرەتای هاوسەرگیرییەکەیەوە قاسمی کوڕی لەدەست دا.

دەگێڕنەوە کە یەکێک لە قورەیشییەکان سووکایەتی بە موحەمەد کرد و پێی وت "هەی ئۆجاغ کوێر"، ئۆجاغ کوێریش -أبتر- لە عەرەبیدا بە کەسێک دەگوترێت کە کوڕی نەبێت، ئیتر بۆ خۆی سورەتێک لە قورئان هاتەخوارەوە:

قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾ الكوثر: ١ - ٣

هەندێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن ((الكوثر))[٢٠٠] لەم سورەتەدا بە مانای نەوەی زۆر دێت. ئەمەیش ئاماژەیە بۆ ئەوەی نەبوونی کوڕ لەسەر دڵی موحەمەد گران بووە، بۆیە خودا مزگێنی نەوەی زۆری دەداتێ ڕۆژێک لە ڕۆژان. هەر لە بنەڕۆژەوە موحەمەد عەلی کردبوو بە کوڕی خۆی و لە ماڵەکەی خۆیدا گەورەی کردووە، هەر کە عەلی پێگەیشت، پێغەمبەر، فاتمەی کچی خۆی لێ مارە کرد، لەوانەیە پێغەمبەر لەم ڕێگەیەوە ویستبێتی نەوەی هەبێت. ئیبن حەجەر دەگێڕێتەوە: جارێکیان عەلی چووە سەردانی پێغەمبەر، بینی وا

---

[٢٠٠]- کوثر: لەسەر وەزنی "فوعل"ـە کە وەزنێکی سیغەی موبالەغەیە، "کثیر"ـە، کە دەبێتە کوثر، واتە زۆر زۆر. الكثرە = کوثر.

عەباسی مامی لەوێیە، پێغەمبەر هەستایەوە و نێوچەوانی عەلی ماچ کرد و لە لای ڕاستی خۆی دایینیشاند. عەباس لێی پرسی: خۆشت دەوێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: ((مامە... سوێندت بۆ دەخۆم، خودا زیاتری خۆش دەوێت، وەک لەوەی من خۆشم دەوێت... خودای گەورە نەوەی پێغەمبەرانی لە پشتی خۆیان داونەتێ و نەوەکانی منی لە پشتی ئەم)). ئەگەر ئەم ڕیوایەتە ڕاست بێت، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان عەلی و پێغەمبەر، پەیوەندییەکی ئاسایی نییە کە یەکێک پێغەمبەر بێت و ئەویش شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکە بێت.

جارێکیان هێندێک لە هاوەڵان گازەندەی "عەلی"یان هێنایە لای پێغەمبەر، ئیدی نارەحەتی لە نێوچەوانی پێغەمبەر بەدی کرا و وتی: ((ئێوە چیتان دەوێت لە عەلی؟ ئێوە چیتانە بەسەر عەلییەوە؟ عەلی لە منە و منیش لە ئەوم، ئەو وەلی گشت مسوڵمانانە لە پاش من.))[٢٠١]

---

[٢٠١]- هەرچەندە ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەو بەشەی دەمهەڵبەست و درۆیە بە دەم پێغەمبەرەوە کە دەڵێت: عەلی لە پاش من وەلی هەموو ئیماندارانە، بەڵام لای ئەم زانایانەی دیکەی ئەهلی سوننەت کۆی فەرموودەکە دروستە و ئەوە لای شیعە هەر دروستی دروستە، بۆ زانیاری زیاتر ئەمەیش دیدگای زانایانی سوننە مەزهەبن لەسەر ئەم فەرموودە گرفتەنگێزەی کە یەکێکە لە بنیادی بیری شیعە و ئیمامەتی عەلی کوڕی ئەبوتالیب لە لای ئەوان وەك ئیمامی ئەوەڵ، فەرموون: - ومن الادله الصریحه فی إمامه الإمام علی علیه السلام وخلافته لرسول الله صلی الله علیه ویله علی الامه حدیث (الولایه) (١) وهو قول النبی صلی الله علیه ویله عن علی علیه السلام: (وهو ولی کل مؤمن بعدی) أو (وهو ولی کل مؤمن من بعدی) وقد رواه بهذا اللفظ ابن حبان فی صحیحه (٢) والترمذی فی جامعه الصحیح وحسنه (٣) والنسائی فی السنن الکبری (٤) وأحمد بن حنبل فی مسنده (٥) وأبو یعلی فی مسنده (٦) وقال محقق الکتاب الشیخ حسین أسد (رجاله رجال الصحیح).

(١) هذا الحدیث أحد الادله التی یستند إلیها الشیعه فی مقام احتجاجهم علی أهل السنه فی إثبات أن الولایه والإمامه من بعد النبی

لە ڕواڵەتدا دەردەکەوێت کە عەلی، هەم لە دڵ و هەمیش لە عەقڵی پێغەمبەرەوە نزیک بووە. ئەو لە لایەکەوە "دەستپەروەردە"ی خۆیەتی و هاوسەری کچەکەی، لە لایەکی تریشەوە پاڵەوانی جەنگ و زۆرانبازییەکان بوو لەپێناو سەرخستنی ئایندا، هەر بۆیە لەناو هاوەڵاندا کەم بوون ئەوانەی ئاوا قۆناغی باشیان بڕی بوو. مامۆستا

---

صلى الله عليه ويله على الامه هى لعلى بن أبيطالب عليه السلام، وقد تجاهل الشيخ عثمان الخميس هذا الدليل ولم يذكره مع مجموع الادله التى أوردها ووضع شبهاته حولها، وهناك أدله أخرى كثيره غير هذا الحديث كان نصيبها التجاهل منه أيضا. (٢) صحيح ابن حبان ٣٧٣/١٥ برقم: ٦٩٢٩. (٣) سنن الترمذى ٦٣٢/٥.

(٤) سنن النسائى ٤٥/٥ برقم: ٨١٤٦ و ١٣٢/٥ برقم: ٨٤٧٤. (٥) مسند أحمد ٤٣٧/٤ برقم: ١٩٩٤٢. (٦) مسند أبى يعلى ٢٩٣/١ برقم: ٣٥٥.

والطيالسى فى مسنده (١)، والطبرانى فى المعجم الكبير (٢) وهو فى فضائل الصحابه لابن حنبل (٣).

ورواه بلفظ (أنت ولى كل مؤمن بعدى) الحاكم النيسابورى فى المستدرك على الصحيحين (٤) وقال: (هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه) وقال الذهبى فى تلخيص المستدرك: (صحيح)، وأبو داود الطيالسى فى مسنده (٥)، والطبرانى فى المعجم الكبير (٦) وهو فى فضائل الصحابه لابن حنبل(٧).

ورواه بلفظ (وعلى ولى كل مؤمن بعدى) ابن أبى شيبه فى مصنفه (٨) وهو فى فضائل الصحابه لابن حنبل (٩).

ورواه بلفظ (وهو وليكم بعدى) أحمد بن حنبل فى مسنده (١٠) وهو أيضا فى فضائل الصحابه (١١). (١) مسند الطيالسى ١١١/١ برقم: ٨٢٩.

(٢) المعجم الكبير ١٢٨/١٨ (٣) فضائل الصحابه ٦٠٥/٢ برقم: ١٠٣٥ و ٦٤٩/٢ برقم: ١١٠٤.(٤) المستدرك على الصحيحين ١٤٣/٣ برقم: ٤٦٥٢. (٥) مسند الطيالسى ٣٦٠/١ برقم: ٢٧٥٢. (٦) المعجم الكبير ٩٧/١٢. (٧) فضائل لصحابه ٦٨٢/٢. (٨) مصنف ابن أبى شيبه ٣٧٢/٦ برقم: ٣٢١٢١. (٩) فضائل الصحابه ٦٢٠/٢ برقم: ١٠٦٠.(١٠) مسند أحمد ٣٥٦/٥ برقم: ٢٣٠٦٢.(١١) فضائل الصحابه ٦٨٨/٢ برقم: ١١٧٥.

- المصدر السابق، ص١٠٦.

عەقاد پێی وایە: پێغەمبەر خۆی عەلی خۆش دەویست و لە لای خەڵکیش شیرینی دەکرد بۆ ئەوەی ڕێخۆشکەری بکات بۆ بوونەخەلیفە لە دوای خۆی. لە دیدگای "عەقاد"ەوە: پێغەمبەر نەیدەویست حەزی خۆی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێت، بەڵکو دەیویست خەڵک لە خۆشویستنەوە بیکەنە خەلیفەی خۆیان. لێرەد عەقاد دەیەوێت نێوەندگیرییەک لە نێوان عەقیدەی شیعە و سوننەدا بکات لەمەڕ بابەتی جێنشینایەتی. لە ڕاستیشدا ئەم دیدگایە خاڵی نییە لە جوانی و ڕاستی.

شیعە بڕوایان وایە پێغەمبەر وەسیەتی کردووە کە عەلی ببێتە جێنشنی خۆی بە شێوەیەکی هێند ڕۆشن، کە بواری گەنگەشە و قسەتێداکردنی نەبێت. ئەوەیش کە ئەهلی سوننە دەڵێن پێغەمبەر ئەم بابەتەی بۆ دەستەی ڕاوێژکاریی -شورا- بەجێهێشتبوو تا خۆیان لەسەر کەسی شیاو کۆدەنگ بن. ئیدی "عەقاد"یش دەیەوێت گونجاندنێک لە نێوان ئەم دوو عەقیدە پێچەوانەیەدا بکات بەم شێوەیە: ((موحەمەد لە قووڵایی ناو دەروونییەوە حەزی دەکرد کە عەلی ببێتە جێنشینی خۆی، بەڵام ئەمەی بە ئاشکرا نەدرکاند، بەڵکو ئەو هەوڵی دا بارودۆخەکە بە شێوەیەک لەبار بڕەخسێنێت کە خەڵکەکە بە دڵ و ویستی خۆیان پەنجە بخەنە سەر عەلی و بیکەنە سالاری خۆیان)). ڕوون و ڕەوان دیارە کە هیچکام لەم دوو تاقمە بەم لێکدانەوەیە دڵیان دانامەزرێت. شایەنی باسیشە خاڵی هەرە لێک دوور و ناتەبایان، ئەم بابەتی "عەلی"یە بە شێوەیەک، لە هیچ پرسێکی دیکەدا هێندەی ئەم بابەتە، جیا ڕایی و دووقسەیی لە نێوانیاندا نییە.

شیعە بە هەزارویەک بەڵگە لەسەر دەستیشانکرانی عەلی لە لایەن پەیامبەرەوە خۆیان سوور کردووەتەوە، سوننەیش بە هەزارویەک بەڵگەی پێچەوانە دێنن و خۆیان شین کردووەتەوە کە گوایا پێغەمبەر

هیچ کەسی دەستیشان نەکردووە. بە هەڵەیشدا نەچووبم هەردوو لا خەریکن گێسکەنێر دەدۆشن. بەڵام توێژەری بێلایەن بێلایەنانە و بە دیدگای گومانەوە تەماشای ئەم مقۆمقۆ نەبڕاوەیە دەکات. من باوەڕم وایە هەردوو شەپۆلەکە دەیانەوێت لاشعوورییانە قسەکانی عەقاد بکەنەوە -واتە خۆیان بە خۆیانیان نەزانیوە کە دەیانەوێت وا بکەن.-

شیعە بۆ سەلماندنی تێزەکەی خۆیان، پشتیان بە حەدیسی "غەدیر" بەستووە، ئەمە لە کاتێکدایە سوننە بە حەدیسی "خەمیس" نەرێی هەر جۆرە دەستیشانکردنێک دەکەنەوە. خۆ ئەگەر بنواڕینە هەردوو حەدیسەکە، دەبینین ڕاڤەکەی عەقاد زۆر پڕ پێکە. گێڕدراوەتەوە پێغەمبەر لە پاش حەجی مالاوایی، لەناو "خوردەمێک"دا وتی: ((من كنت مولاه، فهذا علي مولاه، اللهم والِ من والاه وعاد من عاداه... من گەورەی هەر کەسێک بم، عەلیش گەورەی ئەو کەسەیە، خوایە پشتی ئەوە بگرە کە پشتیوانی عەلییە و دوژمنایەتی هەر کەسێکیش بکە کە دەبێتە نەیاری ئەو))[202]، ئینجا ئەم فەرمودەیە بە فەرموودەی "ڕۆژی غەدیر" ناوبانگی دەرکردووە، لای شیعە و سوننە بە سەحیحی هەیە. گومانەکە ئەوەیە: پێغەمبەر ویستوویەتی بەم جۆرە ئاخاوتنانە پێگە بۆ عەلی قایمتر بکات و لەناو مەردوومدا خۆشەویستی بکات، تا دوای وەفاتی پێغەمبەر بیکەنە جێنشین. ئەم جۆرەیش لە ئاخافتن وەک کاندیدکردن وەهایە، نەک دانان و دامەزراندن، وەک ئاشکرایشە

[202]- حافزی ئیبنو حەجەر دەڵێت: فەرموودەی ڕۆژی غەدیر سەحیحە و هیچ پێتکێك هەڵناگرێت، زۆرێك لە فەرموودەوانان بە سەحیحی گێڕاویانەتەوە، وەك: تورمزی، نەسائی و ئەحمەد، پاشان ئەم فەرموودەیە لە لایەن شانزە هاوەڵەوە پێکەوە گێڕدراوەتەوە، کە ئەحمەد دەگێڕێتەوە: لە ٣٠ هاوەڵەوە ئەم فەرموودەیە بیستراوە ڕۆژی بەیعەتەکەی. بڕوانە الصواعق المحرقه، ص٢٥.

جیـــاوازییەکی هەرە فـــراوان لە نێـــوان "کاندیـــدکردن -ترشـــیح" و "دامەزراندن -تعیین"دا هەیە لەناو خەڵکیدا.

هەرچی لە بارەی حەدیسی "خەمیس"ەوە، ئەمیش دیسانەوە هەردوو لا بە هەمـوو وردەکارییەکـانەوە هـاودەنگن لەسـەری. لە کتێـبەکەی ئیسـماعیلی بوخاریـدا -سـەحیحی بوخـاری- هـاتووە: ((ئەو دەمەی پێغەمـبەری خـودا لە گیـانەڵادا بـوو، کۆمەڵێـک لە هـاوەڵانیش لەوێ ئامادە بوون، پێغەمبەر فەرمووی: "ئادەی با شتێکتان بۆ بنووسم، تا دواتر گومڕا نەبن"، عومەر وتی: پێغەمبەر ئازار تەنگی پێ هەڵچنیوە، ئێـوە قورئانتـان هەیە هەر ئەویـش بەسـە". جیـاوازی کەوتە نێـوان ئامادەبووانەوە و بوویە هەرا، هەندێکیان دەیان گوت:" بڕۆنە پێشـەوە تـا پێغەمـبەر ئەو شـتەتان بـۆ بنووسـێت کە هەرگیـز گـومڕا نـابین"، هەندێکیشیان هەر ئەوەیان دەگوتەوە کە عـومەر وتـوویەتی. ئیدی کە مشـتومڕ تـاوی سـەند، پێغەمـبەر فەرمـووی: "لاچـن بـڕۆن"، ئیـبن عەبباسـیش وتـی: "ئـاخ دەسـتی شـکاوم، چـۆن لەبەر مشـتومڕ و هەراوهووریا، نەیان هێشت پێغەمبەر ئەو شتەما پێ بڵێت)).

ئیبن خەلدون ئەمە دەکاتە بەڵگەی ئەوەی کەس لە لایەن پێغەمبەرەوە دیاری -تەعین- نەکراوە. هێندێکیش لە مێژوونووسان باوەڕیان وایە، پێغەمبەر دەیویست لەو کاتەدا عەلی بکاتە جێنشین تا لە دوای خۆی تووشـی ڕا جیـایی نەبـن لەسـەر بـابەتی جێنشـینایەتی، هەر بـۆیە پێغەمبەر فەرموویەتی: "سادەی زووبن، با شتێکتان بۆ بنووسم، تا دواتـر گـومڕا نەبـن". بـارودۆخەکە هەر چۆنێـک بێـت، پێغەمـبەر ویستوویەتی لە پاش خۆی، سیستەمێکی جێنشینایەتییان بۆ دابنێت کە هەرگیـز لە بـارەیەوە تووشـی مقۆمقـۆ نەبـن و جێنشـینایەتی نەبێـتە سـەرچاوەی مشـتومڕ و دووبەرەکـی، هێنـدێکیش لە تـوێژەران گلەیـی لەو دوودڵیـــیەی مـــوحەمەد دەکەن، لە کاتێکـــدا ئەو هەســـتی بە

دروستبوونی دووبەرەكی دەكرد و شتەكەیشی نەنووسی.

"ویلز" موحەمەد بە بێئاگا و جاهیل ناوزەد دەكات و دەڵێت: ((... موحەمەد نەتەوەكەی هەروا بەبێ سیستەم و نیزامێك وێڵ كرد، كە بتوانن حكومەتێكی هەمەگیر پێك بهێنن، هەر وەك چۆن هەڵنەستا بە دانانی ڕێورەسمێكی تەندرووست بۆ بەرقەراركردنی سیستەمێكی دیموكراتی...)).[٢٠٣] بەڕاستی ویڵز بەم قسانەی ستەمی لە موحەمەد كردووە، موحەمەد لە كوێ دەتوانێت ویستی خۆی بەسەر شوێنكەوتەكانیدا بسەپێنێت كە ئەوان خۆیان حەز نەكەن. ویڵز وا دەزانێت موحەمەد قەڕاڵێكی ستەمكاری دیكتاتۆرە وەك هەموو قەڕاڵ و پادشا دیكتاتۆرەكان كە یەكیان نابێت بە دوو، یان لەوانەیە بە پێوەری خەلیفەكانی دواتر ئەمیشی پێوابێت -قیاس كردبێت- كە چۆن دەسەڵاتیان بۆ كوڕ و نەوەكانی خۆیان بە میرات جێهێشتووە.

گرفتی مێژوونووسەكان ئەوەیە، هەندێك جار، ڕووداوی دوو سەردەمی جیاواز بە یەك پێوەر و چاو تەماشا دەكەن، ئەو جیاوازییە گەورەیەی گەشەسەندنی شارستانییەت لەبەرچاو ناگرن، كە ئەمەیش تووشی ستەم یان هەڵە شرۆڤەكردن دەبن. موحەمەد وەك پادشاكان نەبوو لەناو شوێنكەوتووەكانیدا، بێت و فەرمان دەركات، شوێنكەوتووەكانیشی جێبەجێكردنیان لەسەر بێت. ئەو بۆچوونێكی هەبوو، دەیخستە بەر دیدەی هاوەڵەكانی، ئەوانیش گەنگەشە و گفتوگۆیان لە بارەوە دەكرد، زۆرێك لەو دیدگایانەی كە نیشانی هاوەڵەكانی دەدا، كە ئەوان بە دڵیان نەبوایە، ئەویش وازی لێ دەهێنا. ئەوەی ژیاننامەی موحەمەد لە سەرچاوە تەندروستەكانەوە بخوێنێتەوە، زۆر بە ئاشكرایی ئەم دیاردەیە تێبینی دەكات.

---

٢٠٣- - wells ،Outline of History ،p.٦٢٢ .

موحەمەد هەر بەڕاستی پیاوێکی دانا بوو، دیدگای خۆی بەسەر هاوەڵەکانیدا نەدەسەپاند، ئەگەر خۆیان پێی ڕازی نەبوونایە. ئەو بەم کارەی، ڕووی ئەو پەندەی سپی دەکرد کە دەڵێت: ((ئەگەر ویستت گوێڕایەڵی نەکرێیت، ئەوا داوای ئەو شتە بکە کە ناتوانرێت ئەنجام بدرێت)). (وەرگێڕ: لەوانەیە ئەگەر پەندەکە بە شێوەیەکی دیکە مانا بکەین، لای خوێنەر ڕوونتر ببێتەوە کە چۆن چۆنی پێغەمبەر شوێن ئەم پەندە کەوتووە، ئەمەیش لێکدانەوەی دووەمێتی: ئەگەر دەتەوێت گوێڕایەڵت بن، ئەوا داوای شتێکیان لێ بکە کە دەتوانن بیکەن.)). ئیدی پێغەمبەر بەم کارەی توانیبووی زۆرکەس بکاتە پەروانەی خۆی، خۆ ئەگەر وای نەکردایە، ئەوا یەکێک دەبوو لە فاشیلەکان.

ئەو لە باوکییەوە دەسەلاتی بۆ نەمابوویەوە، یان قامچیبەدەست و سەربازی شەقوەشێنی نەبوو، تا ویستی خۆی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێت، بەڵکوو ئەو پێغەمبەرێک بوو کە بە ئاینێکی نوێوە هاتبوو، هەروەک قورئانیش باسی لێوە دەکات کە: [بە دڵنیاییەوە تۆ یادخەرەوەیەک یت، نەک دەسەلاتدار بەسەریاندا]. ئەو سەرکردیەکی لێبووردە بوو، ڕاوێژی لەگەڵ هاوەلاکانیدا دەکرد، پێگەی بۆ بیرۆکەکانیان دەکرد، لەو کارانەیشی کە بێگوێییان دەکرد، ئەو بێدەنگ دەبوو، داوای لێخۆشبوونیشی لە لای خودا بۆ دەکردن. هێندێک وا دەزانن، موحەمەد فریشتە بووە، کە بازنەیەکی نوورینی بە دەوردا درووست بووە کە وا لە خەڵک دەکات خۆشیان بوێت و گوێڕایەڵی بن، هەر وەک چۆن پەروانە لە شەمع کۆدەبنەوە، ئەمەیش دیدگایەکی هەڵەیە کە هەر لە دێر زەمانەوە لەناو خەڵکیدا بەربلاو بووە. مسوڵمانانی ئێستا زۆر بە پیرۆزی تەماشای پێغەمبەر دەکەن و لە باس و یادیدا دەتوێنەوە، وایش دەزانن هەموو مسوڵمانانی پێشوو ئاوەها بوون لە ژیانی پێغەمبەردا. نکوڵی لەوە ناکرێت هەندێک لە

هـاوەڵان بەو شـێوەیە بە پیـرۆز تەماشـایان کـردووە، بەڵام ئەوانە کەمینەیەک بوون، بەڵکوو زۆرینەی مسـوڵمانان ئەو خێڵەکییانە بوون کە لە سـەرەتای بـانگەوازەوە ئـازاری پێغەمبەریـان دەدا و پێـی پێـدەکەنین و تـوانجی ناشـیرینیان تێـدەگرت. ئـێمە سـتەممان لە مـوحەمەد کـردووە، ئەگەر وامـان زانیبێـت ئەو ویسـتوویەتی ویسـتی خۆی بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێت، ئەو بانگەوازکەر بوو نەک دیکتاتۆر.

***

فەرموودەکەی "خەمیس" ناواخنێکی کۆمەڵایەتی بەتینی هەیە، لەملاوە دەبینین پێغەمبەر دەیەوێت شتێک بنووسێت، تا شوێنکەوتەکانی یەک دڵ و یەک دەست لە پاش خۆیشی بمێننەوە، بەڵام پاشگەز دەبێتەوە لەو کارە، لەوانەیە هۆکاری پاشگەزبوونەوەکەیشی هەر ئەوە بووبێت: ئەو دەیویست ڕاجیایی و دووبەرەکی نەکەوێتە نێوانیانەوە، بەڵام کە دیتی وا دووبەرەکی خۆی هەیە، ئیدی بیری کردەوە دەبێت نووسراو تازە سوودی چی بێت کە خودی دووبەرەکییەکە تازە نۆ مانگانی تێپەراندووە و وا خەریکە سەری بە دنیا هەڵێنێت.

ئیبن ئەبی حەدید دەگێڕێتەوە کە عومەر لە بارەی "خەمیس"ەوە بە ئیبن عەباسی وتووە: ((پێغەمبەر لە کاتی نەخۆشییەکەیدا ویستوویەتی نـاوی عەلـی بهێنێـت، بەڵام مـن ڕێگـریم لێکـرد، ئەمەیشـم لە پێنـاو ئیسلامدا ئەنجام دا)). ئێمە ناتوانین دڵنیابین لە ڕاستێتی ئەم چیرۆکە، ئیـبن و ئەبـی حەدیـد، کە گێـڕەرەوەی ئەم چیـرۆکەیە، یەکـێکە لە موعتەزیلە، لەوانەیشە ئەم چیرۆکە لەبار بێت بۆ سـەلماندنی دیدگای ئەوان لەمەڕ بابەتی خەلافەتەوە، چونکە موعتەزیلە بڕوایان وایە عەلی

لەپێشتر بووە بۆ جێنشینایەتی تا ئەبوبەکر، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا ڕێگەیشیان داوە بە بوونە خەلیفەی کەسێکی "باش"، لە کاتی هەبوونی "باشتر"دا، بەو مەرجەی بەرژەوەندی مسوڵمانی تێدا بێت. هەر خۆیشیان بەڵگە بۆ قسەکەی خۆیان دێننەوە بە دەسپێکە وتەی ئەبوبەکر لە کاتی بوونە جێنشین: ((بەڵام ئەوەتا من کراومەتە سەرگەورەتان، بەڵام باشترینی ناوتان نیم)).



لە ڕواڵەتدا عومەر لە بەرژەوەندی مسوڵمانان ڕێگری لە نووسینەکەی پێغەمبەر کرد، بەڵگەنامە مێژووییەکانیش هەموو بڕوایان وایە عومەر لەو کارەیدا پێکاویێتی، ڕاست بۆی چووە. لە ڕاغیبی ئەسفەهانییەوە، دەگێڕێتەوە: ((عومەر جارێکیان بە ئیبن عەباسی وتووە: "جا ئەی عەباس، با من سوێندت بۆ بخۆم، عەلی لە من و ئەبوبەکریش لەپێشتر بوو بۆ ئەم کارە، هەر بۆیە ترساین لەوەی عەرەب و قورەیش لەسەری پێک نەیەن)). ئەم ڕیوایەتەیش دیار نییە چەندەی ڕاستە چەندی گاڵتە، بەڵام هەر دووری بۆ ناچین کە دروست بێت، چونکە بینیمان عومەر لە کاتی خەلافەتەکەیدا چەندە بە تەنگ بەرژەوەندی مسوڵمانانەوە بوو، ئەو لەبەر بەرژەوەندی گشتی، پێچەوانەی دەقێکی ڕاشکاوی قورئان کاری دەکرد یان شتێک کە پێغەمبەر گوتبێتی.

ئەمەیش دەرس و وانەی بۆ ئیمەی مسوڵمانانی هاوچەرخ تێدایە، بەمەیش لە ڕوانگەی بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە بێین و ببینە موجتەهید، نەک بێین و پابەندبوونێکی حەرفی لە قورئان یان

فەرموودەی پێغەمبەر بکەین کە پێچەوانەی ئەم بارودۆخەی ئێستا بێت. عەلی کوڕی ئەبوتالیب خۆی بە شایەنتر دەزانی بۆ جێنشینایەتی، بەڵام کە خەڵکی بینی وا دەست لەناو دەستی ئەبوبەکر دەنێن، ئەویش دەستی نایە دەستییەوە. کاتێکیش ئەبوسوفیان و خالید هاتن و خوتوخوتەیان دەخستە دڵیەوە، هەردووکیانی وەدەر نا. ئەو لەبەر بەرژەوەندی گشتی، وازی لە بەرژەوەندی تاکەکەسی هێنا. ئەو ئەو هەڵنانەی ئەوانی بە پاڵنەرێکی تاکەکەسی بینی و خۆی لێ بوارد، بەم کارەیشی نموونەیەکی نایابی نیازپاکی و پابەندبوون بە بنەماکانی خۆیەوەی نیشان دا[204]. دەڵێت فاتیمە سەرزەنشتی عەلی کرد لەسەر بێدەنگییەکەی -لەو کاتەدا بانگی دەدا- عەلیش وەڵامی دایەوە و وتی: ئەگەر شمشێرم هەڵکێشابا، ئیدی ناوی باوکتت لە مزگەوتانەوە گوێ لێ نەدەبوو.

دواتریش بینیمان عەلی چەندە دڵسۆزی ئەبوبەکر و عومەر بوو. عەلی لە سەردەمی ئەم دوانەدا دڵخەمین نەبوو کە خەلافەتی نەبووە بە نسیب، بەڵکوو لە دوای عومەرەوە پێی ناخۆش بوو، لەمەیشدا لەسەر هەق بوو. عەلی لە سەردەمی عوسماندا هەستی بە خەمێکی دوو بەرابەر دەکرد، کاتێک دەیبینی چۆنچۆنی قورەیش سوود لە دۆخەکە وەردەگرن و هەموو شتەکان دەبەنەوە بەرەوپاش. لەم ماوەیەدا سێ کەس دەستگیرۆیی عەلییان دەکرد، ئەوانیش: ئەبوزەڕ، عەممار و سەلمانی فارسی. ئەم سێ کەسایەتییە، تەشکیلەیەکی -پێکهاتەیەکی- سەیریان پێک دەهێنا و هەر سێکیشیان قینیان لە قورەیش بوو، بەڵام "ڕەشەقین"، نەک قینێکی ئاسایی. شتێکی دیکەی سەمەرە لەم بابەتەدا ئەوەیە: هەریەک لەم سێ کەسایەتییە سەر بە ئاینێکی دیکەبوون بەر لەوەی موحەمەد ببینن و بناسن. دواتریش لە سەردەمی عوسماندا بە

[204]- عبدالرحمن البدوی، شخصیات قلقه فی الاسلام، ص٤٥.

دەوری عەلیدا خنەیان دێت و ئالای جەنگ دژی قورەیش هەڵ دەکەن. لەو حەدیسانەی کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەر: ((بەهەشت موشتاقی چوار کەسە، عەلی، عەمار، ئەبوزەر و سەلمان)). ئایا پێغەمبەر قسەی وای کردووە یان ئەمە داتاشراوی فەرموودەوانان بێت، دوای ئەوەی بینیویانن ئەم چوارە خەریکی شۆڕشن دژی قورەیش و خەریکی پیلانگێرین لە دژی. من وای بۆ دەچم ئەم سێ کەسە، دەستی بالآیان هەبووبێت لە بڵاوکردنەوەی فەرموودەکان لە بارەی پەسنی عەلییەوە. پێشتریش بینیمان چۆن ئەبوزەڕ وەک سیمبولی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەعراب دژی عوسمان دەرکەوت، عەمار و سەلمانیش وەک نوێنەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی مەوالی و چەوساوەکان خۆیان نیشان دا.

ئەوەی کە شایەنی باسە، ئەو سێ ناوچەیەی کە دواتر ئەم سێ کەسایەتییەی تێدا سەقامگیر بوون، بوونە ناوچەی جێ نفوزی شیعەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب. ئەوەتا عەمار لە کوفە والی عومەر بوو سەردەمانێک، ئیدی دواتر کوفە بوویە پایتەختی تەشەیوعی هەموو دنیا. سەلمانیش بووبووە والی مەدائین، وەک زانراوە دواتر مەدائین بووبووە لانکەی تەشەیوعی عەلی، وەک ئەوەی پرۆفیسۆر ماسنیۆن ئاماژەی پێ دەکات. لەوانەیشە لەم ڕێگەیەوە تەشەیوع بۆ ئێران -زەمین- گواسترابێتەوە. هەرچی لە بارەی ئەبوزەڕیشەوە، جارێکیان مەعاویە شاربەدەری کرد بۆ ناوچەی "چیای عامیل"، ئەو ناوچەیە تا ئێستایشی بە دەمەوە بێت لانکەی "موتاویلەکان"ـە، واتە ئەوانەی پشتیان بە عەلی بەستووە[٢٠٥].

*** *** ***

[٢٠٥]- عبدالرحمن البدوی، المصدر السابق، ص٢٣ – ٢٤.

له دەورانی عەلیدا گرفتێک سەری هەڵدا بە ناوی ((تنازع الاحادیث))، ئەم گرفتەیش لە زۆری فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی گرت کە تێیدا پەسنی هاوەڵان کرابوو. ئەگەر بێتوو پێغەمبەر وەسفی هاوەڵێکی کردبوایە، ئەوا ئەم وەسفە وەک لەقەب یان مەدالیای ڕێز دەکرایە ملی مەعنەوی ئەو هاوەڵەوە، دەبوویە جێگای فەخر و شانازی. لە سەردەمی پێغەمبەردا پلەی سەربازی و ڕوتبە و ئەم شتانە نەبوو تا پلەی سەربازەکانی پێ بەرز بکرێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر دەیویست بە وتەیەکی کورت، پەسنی ئەوانە بکات و پاداشتیان بداتێ و ناوبانگیان دەماودەم بڵاو ببێتەوە، ئەمەیش وەک ڕوتبە و مەدالیای هاوچەرخ کە سەرکردەکان هەڵی دەگرن.

ئەوەیش دروستە کە پێغەمبەر ئەم شەرەفەی بە زۆرێک لە هاوەڵان بەخشی بوو. هەر کەس کارێکی جوانی لێ وەشابێتەوە لەپێناو ئیسلامدا، ئەوا لە بەرانبەردا پێغەمبەر مەدالیایەکی لە مل کردووە، کە بووەتە جێگای شانازیی خۆی و نەوەکانی دوای خۆیشی. لە پاش مردنی پێغەمبەر، خەڵکی دەستیان دایە جەمکردنەوەی ئەم فەرموودانە و پیرۆزکردنیان. ئیدی بە پێی تێپەڕبوونی کات، بەهای ئەم فەرموودانە بەرز بوویەوە و بوونە شتانێکی بانمشتوومڕ، واتە وەک شتی بنچیینەییان لێ هات، کە موناقەشە یان گومان هەڵنەگرن. ئەوە دڵتەنگیی تێدا نییە، کە پێغەمبەر بەم پیاهەڵدانانە، زۆرینەی کات ویستوویەتی هەڵیان بنێت و ورەیان بەرز بکاتەوە، بەڵام مسوڵمانان بێئاگایانە لەو بارودۆخەی کە بوونەتە زایەنگەی ئەم فەرموودانە، هاتوون و وەک 'داهاتووبینی' تەماشای فەرموودەکانیان کردووە، سا بەڵکوو ببێتە مایەی ڕێنوێنی ئوممەت لە پاش مەرگی پێغەمبەر.

ئیدی لێرەوە گرفتی کۆمەڵایەتی سەری هەڵدا، لە پاش مردنی پێغەمبەر و نیزاعی نێوان هەندێک لە هاوەڵان، دەهاتن و سوودیان

لەم مەدالیایانە وەردەگرت، وایان گوزارشت لێ دەکرد کە بە تەنیا ئەوانن لە نێوان هەمووداا کە لەسەر هەقن. مسولمانان تووشی سەرسووڕمان بوون، وا دەیانبینی خاوەن مەدالیاکان کەوتوونەتە دووبەرکی و ڕکابەرایەتی. بە دۆشداماوییەوە دەیان پرسی: چۆن دەکرێت هاوەڵانی موحەمەد ئاوا تێک بئاڵێن، لە کاتێکدا ئەوان وەک ئەستێرە وەهان و جیاوازی لە نێوان نووری هیدایەتی هیچکامێکیاندا نییە؟

لەو ڕووداوە بێزراوەی بەسرەدا، ئەوەی لە جەمەل لە نێوان هاوەڵانی "عایشە" و هاوەڵانی "عەلی"دا ڕووی دا، بە تەواوی دووبەرەکییەکەی زەق کردەوە. ئەوەبوو، عەلی و عەمار و حەسەن و حوسەین لە لایەک، عائیشە و تەلحە و زووبەریش لە لایەکەی دی. ئەوەیش لای خوێنەر شاراوە نییە کە، هەردوو لا هەڵگری ملوانکەی ڕێز و شەرەفی پێغەمبەر بوون، ئەمەیش ململانێیەکی دەروونی لای مسولمان دروست دەکات و پرسیار دەورووژێنێت. ئەوەتا عائیشە، بە دایکی ئیمانداران وەسف کراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە کە زۆری خۆش ویستووە، تەنانەت هەڵاوێردی نێو خێزانەکانی بووە. هەر لەم بەرەیەدا "تەلحە" هەیە، کە پێغەمبەر ناوی لێنابوو "تەلحەی خێر" و لە تەنیشت ئەم دوو کەسەوە، زوبەیری حەواریی پێغەمبەری خودا، کە پێغەمبەر بکوژی زوبێری بە دانیشتووی دۆزەخ هەژمار کردبوو. کە دێیت و تەماشای بەرەی نەیار دەکەیت، عەلی بەدی دەکرێت کە لەسەر سینەی، زۆرترین مەدالیای پێغەمبەری پیدا هەڵواسراوە، عەمار لە دەستە ڕاستی، کە ئەوانەی ئەم دەکوژن، گرووپێکی لادەرن. لە تەنیشت ئەمانەوە، دوو دانە گەنجەکەی بەهەشت ڕاوەستاون، ئەوانەی کە باپیریان مزگێنی پێدان کە ئەوان دوو "تازەلاو"ی بەهەشتن. وتبوویشی ئەم دوانە ئیمامن، چ بە ڕاچەنیوی، یان

دانیشتوویی.

ئێ بەڕاستی ئەمە گرێکوێرەیە...

کابرایەک لە گەرمەی جەنگی جەمەلدا هاتە لای عەلی و بەم دەردەوە دەینالآند. پیاوە پرسی: تۆ بڵێیت عایشە و تەلحە و زوبێر لەسەر ناحەق بن؟ -پرسیارێکی ئیحراجکەرانەیە-. وا دەردەکەوێت عەلی لە کارەکەیدا لەسەر بینابیەکی ڕۆشن و زولاڵ بووە، بۆیە هێندەی گرنگی داوە بە ئامانجە کۆمەلایەتییەکەی کە پێغەمبەر مەبەستی بووە، ئەوەندە گرنگی نەداوە بەو فەرموودانە، بۆیە بەم شێوەیە وەلامی پرسیارکەر دەداتەوە: "تۆ ئەمەت لێ ئالۆسکاوە، حەق و باتیل بە کەسەکان دیاری ناکرێت، بەڵکوو: حەق بزانە، "حەقخوازیش دەناسیت، باتیلیش بزانە، داروودەستەکەیشی دەناسیتەوە)).

بابەتەکە لای عەلی، مشتومڕی نێوان حەق و باتیلە، نەک مشتومڕی فەرموودە. دکتۆر تەها حوسەین لە قسەیەکدا دەڵێت: "هیچ وەلامێکم پێ شک نایەت لەمە باشتر، پلەوپایەی ئەم دوو بەرەیە هەرچەندەیش بڵند بێت، هێشتایش لە هەڵە بەدوورنین، حەق بۆ لایەکیان قۆرخ ناکرێت با پێگەیشی هەرچەندە بڵند بێت لە پاش ئەوەی کە حەواڵەی ئاسمان کران و دەرگای وەحی داخرا". گرفتی ڕای گشتی -خەڵکی بەگشتی- ئەوەیە، لەم قسانەی عەلی یان تەها حوسەین تێناگەن. مرۆ ناتوانێت پاک و پیسی حەق و باتیل بکات بەتەواوی، تا تێکەڵیان نەکات. ئەوەتا هەر بەرەیە و بە بەڵگەی عەقلی و نەقلییەوە هاتووە بۆ سەلماندنی حەقێتی خۆی و ناحەقێتی بەرانبەر.

عەلی دەڵێت: "حەق ڕۆشنە و باتیلیش هەروا، ئەو وەک ئەوەی چاوی خۆی بیانبینێت، بەلام خەڵکی لایەنگیریان تێدا -مەیل بە لایەکدا- بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن. هەموو کەسێک بە دەوری

ئاوەزیدا چوارچێوەیەک هەیە کە سنووورداری دەکات، بۆیە بنیادەم ناتوانێت شتێک ببینێت مەگەر ئەو شتە لە چوارچێوەی ئاوەزی خۆیدا هەبێت. بۆیە لە ڕووداوی جەمەلدا هەندێک خەڵکی تەماشای عائیشەی دایکی ئیماندارانیان دەکرد، وا لەمەدینەوە چەندین فەرسەخی بڕیوە و هاتووە بۆ داوای خوێنی خەلیفەی کوژراو بە ناهەق دەکات. ئەمە بێگومان حەقە، چونکە ئەوان کە سەروزێری چوارچێوە فیکرییەکەی خۆیان دەکەن، هیچ شتێکی دیکەی بێجگە لەمە، تێدا نابینن. ئەوەتا یەکێک لە بێژەرەکانیان بە دەنگی بەرز لەو دەمەدا دەڵێت:

یا أمنا عائش لاتراعي

کل بنیك بطل المصاع[٢٠٦]

ئەی دایکمان عائیشە، مەپرینگێرەوە

کوڕەکانت هەموو کوڕی تێکشکێنەرن.

***

بەڵام بەرەی بەرانبەر، ڕێک بە پێچەوانەوە ڕاستی دەبینن، دەبینن عەلی بووتە جێنشین و عائیشەش هاتووە داوای خوێنی خەلیفەی کوژراوی لێ دەکات و شەری پێ دەفرۆشێت بەر لەوەی ئەو دەستی بشکێت بەسەر بارودۆخەکەدا بەتەواوی پێگەی خۆی قایم بکات.

یەکێک لە بێژەرەکانیان بە خرۆشەوە دەیوت:

یا أمَنــا أعق أم نعلم

والأم تغذو ولدها وترحمُ

أمَا ترین کَم شُجاع یُکلم

---

[٢٠٦]- المصاع: هەموو هارپینێك، تێکشکانێك لەجەنگدا بە شمشێر.

وتتختلي منه يد ومعصم[٢٠٧]

هۆ دایە، ئێمە دەزانین دایکیش بێگوێیی دەکات

دایک خۆراک بە بێچووەکەی دەدات و ڕەحمی پێ دەکات

بەڵام دەبینیت چەندە پاڵەوان زامار دەکرێن

وا لە مەیداندا دەستیان لە مەچەکیاندا جیادەبێتەوە.

ئەمانە لە گۆشەنیگایەکەوە تەماشای حەق دەکەن، ئەوانیش لە گۆشەیەکی دیکەوە. هیچ کام لەم دوانەیش توانای تێگەیشتنی لۆجیکی ئەوی تریانی نییە. جارێکیان پرسیار لە عەلی کرا لە بارەی کوژراوەکانی سووپای عایشە، لە وەڵامدا: "ئەوەی بە نییەتێکی خاوێنەوە، لەپێناو سەرخستنی حەق و ڕەزامەندی خودادا کوژرابێت، ئەوا چارەنووسی بریتییە لە چارەنووسی شەهیدان". عەلی بەم شێوەیە خەڵکی بۆ دوو پۆل، پۆلێن دەکات، یەکێکیان دڵسۆزانە دەجەنگێت و لە کارەکەی خۆیشی دڵنیایە و دڵتەنگ نییە لەبارەی ئەو شتەی بۆی دەجەنگێت، چارەنووسی ئەم پۆلە لە خەڵکی وەک چارەنووسی شەهیدانە. گرووپەکەی دیکە لەپێناو غەرەزێکی تایبەت، بەرژەوەندییەکی دیاریکراودا دەجەنگێت و بەرگی حەقی لەبەر دەکات، چارەنووسی ئەمانە، عەینی چارەنووسی پاوانخوازەکانە.

وام بە دڵدا دێت، عەلی خەریکە بەراوردی نێوان هاوەڵانی عایشە و مەعاویە دەکات. هاوەڵانی عایشە بە کۆششکار لەقەڵەم دەدات، هەرچەندە ڕێگاکەیان هەڵەیە، بە ڕێگایەکی هەڵەیە داوای حەق دەکەن. بەڵام هاوەڵانی مەعاویە، لە دیدگای ئەمدا "بەرژەوەندیخواز" و "دەسەڵات پەرست"ن، ئەمان دەیانەوێت خوێنەکەی عوسمان بکەنە

[٢٠٧]- تەها حسین، المصدر السابق، ج٢، ص ٥٢ – ٥٣

دەسکەلایەک بۆ گەیشتن بە مەبەستە شاراوەکانیان. عەلی نامەیەکی بۆ مەعاویە نووسیبوو لە بارەی بکوژانی خەلیفەی سێیەمەوە: ((... هەرچی لەبارەی بکوژانی عوسمانەوە داوای ڕادەستکردنیانت کردبوو، بەڵام من ئەو کارە ناکەم، چونکە دەزانم تۆ بۆ گەیشتن بە مەرام و مەبەستی خۆت، ئەمەت کردووە بە بەهانە)). مامۆستا زەکەریا نصولی، تێچەنێکی هەیە لە بارەی ئەم نامەیەوە، دەڵێت: ((قسەگەلێکی تەماوی و بێ چوارچێوەن، دڵنیایی نابەخشن بە دڵ و دەروون، لەبەر ئەوەی –عەلی- ئەستۆپاکی خۆی نەکردووە لەو تۆمەتانەی کە مەعاویە داویەتییە پاڵی، ئەمەیش یەکێک بوو لە هەرە زەقترین هۆکاری داتەپینی بانگەوازەکەی))[208]. من وای نابینم عەلی لە نووسراوەکەیدا نارۆشن بووبێت، ئەو زۆر بە ڕاشکاوانە لەم نامەیەدا و لە نامەکانی دیکەیشدا دەدوێت. ئەوەی کە وادەزانێت عەلی لە نووسینەکانیدا تەماوییە، ئەوە لە چاویلکەی دوژمنانی عەلییەوە تەماشای شتەکانی کردووە.

هەموو پێشبینییەکانی عەلی لەمەڕ سایکۆلۆجیای مەعاویەوە بە ڕاست وەرگەڕان، هەروەک ئەوەی پێشتریش لە بارەی کەسایەتی عایشەوە ڕاستی وتبوو. عائیشە زۆر بە خراپی پەشیمان بووەوە لەو کارەی کە دژ بە عەلی پێی هەستا، جاری وا هەبوو هێندەی فرمێسک دەڕژاند، تا ڕووبەندەکەی بە تەواوی تەڕ دەبوو. بەڵام مەعاویە لە پێناو خوێنی عوسماندا، دژ بە عەلی جەنگا، تا ئەو کاتەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بارودۆخەکەی بەلای خۆیدا شکاندەوە، ئیدی دواتر ئەوەی باسیشی لێ نەدەکرد، خوێنی عوسمان و تۆڵەی عوسمان بوو، وەک بینیمان. مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە عایشە لە ڕۆژی جەمەلدا وتوویەتی: "خۆزێ بەر لە بیست ساڵ لەم ڕۆژە مردبام"، پاش

[208]- أنیس زکریا النصولي، معاویە بن أبو سفیان، ص ٢١.

گەڕانەوەیشی لە بەسرە وتوویەتی: "بەو خوایە دانیشتنم لە ماڵەوە بەلاوە باشتربوو لە ڕۆژی جەمەلدا وەک ئەوەی دە منداڵم لە پێغەمبەر بووبا))).

***

موبەڕەد دەگێڕێتەوە: "ڕۆژێکیان مەعاویە بە عایشەی وتووە: "حەزم دەکرد لە ڕۆژی جەمەلدا کوژرابای"، ئەویش وتبووی بۆچی هەی باوک مردوو؟ مەعاویە وتبووی: ئێ تۆ دەمردیت و دەچوویتە بەهەشتەوە، ئێمەیش کوژرانەکەتمان دەکردە پەڵە بە نێوچەوانی عەلییەوە". جاحیز دەگێڕێتەوە کە: ڕۆژێکیان مەعاویە بە ڕاشکاویی وتبووی، یەکێک لەو شتانەی یارمەتیداوە کە بتوانێت بەرانبەر عەلی ڕاوەستێت، ڕووداوی جەمەل بووە، ئینجا وتوویەتی: "خۆ ئەگەر عەلی فرسەتی لەوان هێنابا و لێی دابان، ئەوا گومانم دەخستە سەر ئیمانەکەی، کە چۆن دەتوانێت لە هاوەڵان بکوژێت، خۆ ئەگەر ئەوانیش لە عەلییان دابا و ژمارەیەکی باشیان لێ خستبان، ئیدی کاری من لە باشیدا دەبوو، سەر ڕێگاکەیشم درکی تێدا نەدەما"[٢٠٩].

لەمەیشەوە ڕوون دەبێتەوە کە مەعاویە وەک عایشە ئیجتیهادی نەکردووە لە ڕاچەنینەکەیدا دژی عەلی، بەڵکوو ئەو ئامانجی ئەو شتەبوو کە دواتر بەدەستی هێنا، تەنانەت ئەگەر لە دەستی بهاتایە، دەچوو عایشەی دەرمانخوارد دەکرد بەس بۆ لەکەدارکردنی عەلی، هیچ دڵتەنگییەکی تووش نەدەبوو.

---

٢٠٩- - الجاحظ البيان والتبين، ج٢، ص٩٤.

ئەو دەمەیشی دەسەڵات کەوتە دەستی مەعاویە، کونبەکون بەدوای هەواداری "عەلی"دا دەگەڕا. لەسەر مینبەر و نوێژە قنوتەکاندا، ڕێوڕەسمی جنێودانی بە عەلی داهێنا و کردیە نەریت. ئیبن ئەبی حەدید دەڵێت: ((مەعاویە نووسراوێکی بۆ والییەکان نووسی: خوێنی ئەو کەسە لە گەردەنی خۆی، ئەگەر بیتوو شتێک لە فەزائیلی ئەبو توراب و بنەماڵەکەی بەسەر زاردا بهێنێت))، ئیدی وتارخوێنەکان، لەسەر هەر بستە زەمینێکەوە، لەژێر هەر گەزە ئاسمانێکەوە، هەر هێندەی بواری دەم دڕینەوەیان هەبووبێت، دەستیان کردووە بە جنێودان بە عەلی و ئالوبەیتەکەی.[210]

دەڵێن پیرێک پیاو هاتنە لای مەعاویە و سەرزەنشتی ئەم کردەوەیەیان لێ کرد و وتیان: (("تۆ ئەوەی کە ویستت، دەستت کەوت، سا خۆزێ دەستت هەڵگرتبا لە نەفرین ناردن بۆ ئەو پیاوە"، ئەویش وتی: "نا بە خوا، بە خودا واز ناهێنم تا منداڵی لەسەر گەورە نەبێت و گەورەیشی لەسەر ئەختیار نەبێت و تا یەک فەزیلەتی لەناو مەردوومدا نامێنێت و باس ناکرێت"))[211]. نازانم بۆچی مەعاویە لێرەدا بەردەوامی نەداوە بە سیاسەتە فێڵبازانەکەی خۆی، پێم سەیرە ئەوەی لە یاد چووە کە خەڵکی دڵ بە شتێک خۆش دەکەن و بەرەو لای شتێک دەچن کە لێیان مەنع دەکرێت. لەوانەیە خەڵکی بە پەنهانی هەر سووربووبن لەسەر باسکردنی چاکەکانی عەلی، ڕەنگ بێت زیادەڕۆییشیان تێدا کردبێت، کاتێک بینیویانە وا دەسەڵاتدارەکان ڕێگرییان لێ دەکەن. فەرمانڕەوا ئەگەر بیەوێت کەسێک بەناوبانگ بکات، ئەوا دەبێت لە ڕواڵەتدا سانسۆر بخاتە سەر بڵاوکردنەوەی شتەکانی ئەو، ڕێگری جموجووڵی لێ بکات، بەمەیش خەڵکی لە ژێرەوە شتەکانی پەخش دەکەنەوە و هەر زووبەزوو کەسەکە ناودار

[210]- ابن أبی الحدید، شرح النهج، ج٣، ص١٥.

[211]- المصدر السابق، ج١، ص٣٥٦.

دەبێت و كەس نامێنێت ناوی نەبیستێت، من تووشی حیرەت بووم، كە معاوییە دەبینم تووشی ئەم هەڵە زەقە بووە كە هیچ لەگەڵ زۆرزانی و دووربینییەكەیدا یەك ناگرێتەوە. شەعبی بە كوڕەكەی خۆی دەڵێت: ((... بنوارە بۆ عەلی و منداڵەكانی، هێشتایش بەنی ئومەییە خەریكی شاردنەوەی گەورەیی و جوامێرییەكانیانن، ئەم كارەیان ڕێك وەك ئەوە وایە بڵندیان بكەنەوە بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمان. لەو لایشەوە دەیانەوێت ناوبانگی باپیرانی خۆیان -بەنی ئومەییە- زیندوو بكەنەوە، كە ئەمەیش وەك بڵاوكردنەوەی بۆنی كەلاكێك وەهایە)).

عەبدوڵڵای كوڕی عورروەیش بە كوڕەكەی خۆی دەڵێت: ((نابینیت وتارخوێنەكانی بەنی ئومەییە چی بە ناوناتۆرە و غەیبەتێكی عەلی كوڕی ئەبوتالیب دەكەن؟ سوێندت بۆ دەخۆم، بەم كارەیان هێندەی تر بەرزی دەكەنەوە بۆ ئاسمان. خۆ دەیشبینیت چۆن بە باڵای مردووەكانی خۆیان و شاعیرەكانیاندا هەڵدەدەن؟ بەو خوایە ئەم كارەیشیان وەك ئەوەیە كەلاكی گوێدرێژ بە كۆڵانانىدا بگێڕن)). ئەم نەریتەی ئەمەوییەكان گرتبوویانە بەر، ڕێك خەڵكی پێچەوانەكەیان وەرگرت و ڕۆچوون لە وەسف و خۆشەویستی عەلیدا. بە قسەی هەندێك لە مێژوونووسان: ئەوە ئیبن سەبەئ بوو، وای لە خەڵكی كرد كە ڕۆچن لە خۆشەویستی عەلیدا، بەڵام لە واقیعدا خودی ئەمەوییەكان هەستان بەم كارە. ئەمەوییەكان لە هەمان ساتی كە سووكایەتییان بە عەلی دەكرد، سووكایەتیشیان بە مەوالییەكان -ناعەرەبەكان- دەكرد، ئیدی لەم ڕێگەیەوە عەلی بووە "بەیداغ"ی مەوالییەكان. ئیدی بەم شێوەیە باسوخواسی چاكەكانی عەلی هەر لە زیادبووندا بوون، بۆیە تا ئەمەوییەكان زەمی زیاتری عەلییان كردبا، مەوالییەكانیش زیاتریان پەسن دەكرد تا خەریك بوو بیبەنە ڕیزی خواوەندەوە. ئەوەیشی كە قورەكەی خەستتر كردبووەوە ئەوەبوو:

زۆریــنەوەی فەرمووودەوانــان لە مەوالــی بــوون، واتە عەرەبزمــان نەبوون.

***

کەمێک لەمەوبەر باسـی یەکێک لە گرفتەکانی سـەردەمی "عەلی"مـان باس کرد. ئێستایش نۆرەی گرفتی دووهەمە کە بریتی بوو لە "تفریق جمـاعە المسـلمین"، واتە پـارچە پـارچەبوونی مسـوڵمانان. ئەمەیـش گرفتێکی سەغڵەتکەر بوو. خۆی لە ڕاستیشدا ئەمە لە هەرە زەلامترین کێشـەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە -بەرە بەرە بوون- جیاکردنەوەی مەزهەب. زانایانی کۆمەڵناسی ناویان لێ ناوە "المشکلە ذو الحدین- گرفتی دووسـەرە". لە هەموو کۆمەڵگەیەکی چالاکدا، کۆمەڵێک بەدی دەکرێن، کە بانگەشـەی ڕیفۆرم -تـازەگەریی- دەکەن. بەم کـارەیش یەکپارچەیی کۆمەڵگە دەکەوێتە ژێر مەترسییەوە. ئیدی لە سـەرتادا ئەم ڕیفۆرمخوازانە لە دەرگا و پەنجەرەوە تۆمەتیان پێ دەگاتەوە، بە خـائین لە قەڵەم دەدرێن. ئەمـانە دەبنە هـۆی کەرتکردنـی کـۆمەڵگە و وردکردنـی دارعەسـای گـوێڕایەڵی -طـاعە-، بەڵام لە هەمـان کاتـدا ڕۆحێکی تازەگەریی و نوێبوونەوە دەخاتە ناو کۆمەڵگەوە، ئەگەر وا نەبێت کۆمەڵگە دەبێتە "مەنگاو" و ڕۆژێ بۆ ڕۆژێ هەر دەگەنێت و لەناو دەچێت.

***

به توولی مێژوو کەسێک نەبووە هێندەی عەلی کۆمەڵێک پەرتەوازە بکات. ئەم تەنها بە خۆیەوە نەوەستا، بەڵکوو بۆ نەوەکانیشی بە میرات بەجێهێشت. هەر کەس مێژووی "عەلەوییەکان" بخوێنێتەوە، دەیانبینێت چ جۆرە شۆڕشگێڕێکی سەمەرە بوون. هیچ نەوەیەک - جیلێک- لەناو ئیسلامدا لەناو نەچوون، مەگەر یان بینیویانە یان بیستوویانە کە یەکێک لەم عەلەوییانە، یان کەسێکی هاوئاوازی ئەمان، شۆڕشێکی ئەنجام داوە و لە دژی دەسەڵات ڕاپەڕیوە. لێمان شاراوە نییە، کە یەکەم جەنگی نێوخۆیی لە ئیسلامدا، لە سەردەمی عەلیدا ڕووی دا. چەندین جار عەلی بە ڕژاندنی خوێنی مسوڵمانان تۆمەتبار کراوە. تەنانەت کوڕە مامی خۆی، عەبدوڵلای کوڕی عەباس جارێکیان بەم شتە ناشیرینە تۆمەتباری کرد[٢١٢].

دەڵێن ئەو دەمەی ئیبن عەباس والی عەلی بوو لە بەسرە، شتێکی لە بەیتولماڵ هەڵگرتبوو بۆ خۆی و پاشتریش هەڵاتبوو. عەلیش کە ئەمەی بیستبوو، پەیامێکی بۆ ناردبوو، ترساندبووی بە سزای خودا و لۆمەی کردبوو کە ناترسێت بمرێت و لە گەردەنیدا ماڵی مسوڵمانان هەبێت؟ ئەویش وەڵامی دابوویەوە کە پێی خۆشە بمرێت و ماڵی مسوڵمانانی لە گەردندا بێت وەک لەوەی ئەو هەموو خۆینەی جەمەل و سەفین و نەهرەوانی لە ملدا بێت. ئیدی کە عەلی ئەم وەڵامەی خوێندەوە، زۆر بە دڵنیگەرانییەوە وتی: "وەک بڵێیت ئیبن عەباسمان لەگەڵ نەبووبێت لەم خوێنڕشتنانەدا".

دەڵێن ڕۆژێکی دیکەیش کابرایەک خەریکی دەستنوێژ شوشتن بوو، ئاوێکی زۆری بە دەستوپلیدا پرژاند، عەلیش بینیی و سەرزەنشتی زیادەڕۆیی ئاوپرژاندنەکەی کرد. کابرایش وەڵامی دایەوە و گوتی: زیادڕۆیی لە ئاوپرژاندندا باشترە لە زیادەڕۆیی لە ڕشتنی خوێنی

---

[٢١٢]- تەها حسین، المصدر السابق، ج٢، ص١٣٧ -١٣٨.

مسوڵمانانندا. بەڵام عەلی گوێی بۆ ئەم جۆرە قسانە شل نەدەکرد، ئەو دڵەرخەیان بوو، کە هەموو جەنگەکانی لەپێناو خودادا کردبوو، ئەو ئەمرۆ لە دژی مەعاویە شمشێر لە کێلان دەردەهاوێت، وەک ئەوەی دوێنێ بۆ باوکی -ئەبوسووفیان-ی دەردەهێنا، هیچ جیاوازییەکی لە نێوان ئەم دوو جەنگەدا بەدی نەدەکرد. موحەمەد یەکڕیزی قورەیشی شێواند و خوێنیشی ڕشتن. دواتریش عەلی هات و یەکڕیزی مسوڵمانانی شێواند و خوێنی ڕشتن. ئایا جیاوازییەک لە نێوان ئەم دوو جۆرە لە "خوێنڕشتن"دا هەیە؟ عەلی خۆی وەڵامی نەرێیە، هیچ جیاوازییەک نابینێت لە نێوان ئەم دوانەدا. نەیارەکانیشی جیاوازییەکی بەرین بەدی دەکەن لەنێوان ئەم دووجۆرە خوێنڕێژییەدا، موحەمەد لەبەر ئیمانهێنانی خەڵکی ئەم کارەی کرد، بەڵام کە ئیمانیان هێنا، عەلی داوای شتێکی دیکەی لێ دەکردن.

***

هاوەڵانی عەلی لە "صەفین"دا، بە هوتافەوە دەیانگوت:

نحن صربناكم على تنزيله

واليوم نصربكم على تأويله[213]

پێشتر لێمان دان، لەبەر دابەزینەکەی

ئەمڕۆیش لێتان دەدەین، لەبەر تەئویلکردنەکەی.

ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت، گوایە عەلی لە دەورانی پێغەمبەردا، لەبەر دابەزینی قورئان دژی قورەیش جەنگاوە، ئەمڕۆیش لەبەر ڕاڤە و

[213]- المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص١٦

شرۆڤەکەی دژیان دەجەنگێت. عەلی خۆی بڕوای وابوو قورئان "چەند دیو"ە. هەر گرووپە و دەتوانێت بۆ پشتگیریی خۆی، شت لە قورئانەوە هەڵگوزێت. هەر بۆیە بە بڕوای عەلی قورئان بە تەنیا بەس نییە بۆ ڕێنوێنی خەڵک، بەڵکوو وا جۆی ڕاڤەیەکی گونجاوە کە لەگەڵ ئامانجە کۆمەڵایەتییەکەدا بگونجێت کە بۆی دابەزێنراوە. مەعاویە قورئانی دەخوێندەوە و نوێژی دەکرد و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجی ماڵەکەی خودایشی دەکرد. ئەو لەم شتانەدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ عەلیدا. لەوانەیە عەلی هێندەی بە تەنگ دادوەریی کۆمەڵایەتییەوە بووە، هێندە بە تەنگ تقووسە ئاینییەکانەوە نەبوو‌بێت، ئەها هەر لەوەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ((ئای چەندە ڕۆژووەوان هەیە، هیچی بۆ نامێنێتەوە بێجگە برسێتییەکە. چەندەیش شەوبێدار هەن، بێجگە لە شەوبێداریی و خەوزڕانەکەیان، هیچیان بۆ نامێنێتەوە. حبذا نوم الاکیاس و افطارهم)).

ئەو گرفتەی کە عەلی لە ژیانی خۆیدا ڕووبەڕووی بوویەوە، ئێمە ئێستا لە ناشیرینترین شێوازیدا ڕووبەڕووی دەبینەوە. ئێمە لە نێوان دوو لێکدانەوەی دژبەیەک بۆ ئاین مۆڵەق ماوین. هێندێک بە تەنیا گرنگی بە تقووسە ئاینییەکان دەدەن و هەرچێکی تر بە هیچ دەزانن. هێندێکی دیکە، چاویان بڕیوەتە دادپەروەری و یەکسانی و باشکردنی باری دارایی خەڵکی و ئەمەیش بە ئامانجی هەرە گەورەی ئاین مەزەندە دەکەن. عەلی دەڵێت: ((خودا لە ماڵی زەنگینان، بەشی هەژارانی واجب کردووە، سبەی خودا لێپرسینەوەی ئەوەیان لێ دەکات))[214]. ئەمەیش ئەو لێکدانەوەیەیە کە پێشتر ئەبوزەڕ بۆ

---

[214]- المصدر السابق، ج٣، ص٢٣٢. قاسمی کوڕی سەلام بە شێوەیەکی دیکەیش ئەم قسەیەی عەلی دەگێڕێتەوە: ((خودا بەشی هەژارانی لە ماڵی زەنگینان جودا کردووەتەوە، ئەگەر برسییان بێت یان پەتی و

ئایەتەکانی قورئان هەیبوو. بەڵام قورەیش بە شێوەیەکی دیکەیان ڕاڤە دەکرد، ئاسمان و ڕێسمانیش لە نێوانی ئەم دوو ڕاڤەیەدان. لە پاش عەلی، قورەیش دەسکی دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت، دەوڵەتێکی ئازادکەری پێکهێنا کە ئاڵاکەی لە چین و پیدەشتەکانی فەرەنسادا دەشەکایەوە. بەم هۆیەیشەوە خۆشڕابوێری و کەنیزەک و هوشەیان دەکرد لەو ناوەدا. مزگەوتان دەڕازێنرانەوە و کۆشک و تەلاری هەرە ڕاقی و ڕەنگاوڕەنگ دەسلەملانێیان لەگەڵ هەور دەکرد. بانگ بوویە جێگرەوەیەی جەرەس و شاخەگای -کەڕەنا- دەگرتەوە. مزگەوتیش لەبری دەیر و کنیشتان بڵند دەکرانەوە و بنیات دەنران. قورئان لە جێگەی ئینجیل و تەوات دەخوێنرایەوە، ناوی "الله" لەسەر منارەکانی شەرق و غەرب زایەڵەی دەهات.

هەموو ئەمانە لە سایەی فتوحاتی ئەمەوییانەوە دەستەبەر کرا، ئیتر لەمە زیاتر چیتان گەرەکە؟ بەڵام وەک دەردەکەوت، عەلی شتێکی دیکەی دەویست، ئەو لە جێگەی ڕووکار و دیمەنی دەرەوە، کاری لەسەر مەبدەئ -بنەما- دەکرد. ئەوەتا خورپەدەم خورپەدەم خەڵک دێنە ناو ئاینەکەوە، بەڵام هیچ شتێک نەگۆڕاوە، باری کۆمەڵایەتی خەڵکی هەر وەک دەورانی کیسرا و هەرقلە. بۆیە مێشکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چەخماخەیەکی دا، هەموو ئازادکردنەکانی ڕاگرت و سوپاکانی هێنایەوە سەر سنوور و دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی ناومال و بەرقەرارکردنی دادپەروەری، ئەم کارەی زۆر بە گرنگتر زانی، وەک ئەوەی ئیمپراتۆریێتییەک دامەزرێنێت، کە بێجگە لە داگیرکاری و خۆسەپاندن بەسەر خەڵکیدا، هیچی دیکەی بە دیاری پێ نەبێت[٢١٥].

---

بێبەرگ بن بەهۆی یارمەتی نەدانی دەوڵەمەندانەوە، ئەوا لێپرسینەوە هەیە و دواتریش تێهەڵدان). نووسەر خۆی ئەم پەراوێزەی نووسیوە.

[٢١٥]- Welhausen ، ٢٦٨ – ٢٦٩.Arab kingdom.p .

مەگەر هەر خودا بزانێت ئەم دوو دیدگایە چەندە لێک دوورن، یەكیان چاكسازیی ناوخۆیی بە پێویست دەزانێت و ئەوی دیش هەموو برەوی بە ڕۆوكەش و دەرەوەیە. بەڕاستی منیش نازانم كام لەم دوو دیدگایە پەسەندترە بۆ دەسەلاتی "دوورمەودا" و دەتوانێت زیاتر لە خزمەتی دانیشتوواندا بێت. هەرچۆنێک بێت ئەمانە دوو شتی جیاوازن، بۆ توێژەر پەسەند نییە تێكەڵ بە یەكتریان بكات و یەكێكیان بەوی دیكەیان بپێوێت. هێندێک لە ئامارە ئیمڕۆژییەكان ئاماژە بە زۆری داهاتی تاک لەو وڵاتانەدا دەكەن كە ڕووبەری زەوی داگیركراویان كەمە، بە بەراورد بە وڵاتە ڕووبەر فراوانەكان، ئەوانەی شوێنی زیاتریان داگیركردووە. ئەم قسەیەش گرنگییەكی كۆمەڵایەتی هەیە و گاڵتەی پێ ناكرێت. ئەو "ئامار"انە ئاماژە بە بڕی تێچوونی هەر بستە زەوییەک دەكات، كە پێویستی بە پاسەوان و خەرجی هەیە تا پارێزگاریی لێ بكرێت. ئەمەیش دەبێت لە دەمی دانیشتوان بگیرێتەوە تا پارێزگاری لە خاكەكە بكرێت.

هیچ كەس لە داگیركاری سوود نابینێت بێجگە لە كەمینەیەک، ئەوانیش پادشا و شەقوەشێن و وەزیر و خاوەن كارگە و بازرگانەكانن، ئیدی ڕەشەخەڵک و مسكێن، تا ماون هەر باریان چڵ مەنە. لەوانەیە ئەم قسەیە بۆ ئیمپراتۆریەتەكەی قورەیشییش ڕاست بێت، لەبەر ئەوەی كەسی ئاسایی هیچ بەهرەیەكی لەم فراوانبوونی قەڵەمڕەوە نەدەبینی.[٢١٦] هەرچی خێروبێر و كەنیزەكی كەمەر باریكە دەكەوتە دەستی ئاغا و ئاغاواتەكان. دەڵێن: موسای كوڕی نەصیر لە غەزاكانی ئەفریقایدا، ٣٠٠ هەزاری بە دیل گرتبوو. "پێنج یەک"ی دیلەكانی ناردبوو بۆ خەلیفە، وەک جێبەجێكردن و گوێڕایەڵی قورئان كە دەڵێت: "باش بزانن، ئەوەی كە دەستتان دەكەوێت، دەبێت "پێنج یەک"ی هیی

[٢١٦]- - جرجي زيدان، المصدر السابق، ج٥، ص٢٣.

خودا و پێغەمبەرەکەی و کەسانی نزیک و هەتیوان و بێدەرەتانان و ڕێبوارانە.*

دەڵێن کاتێک موسا لە ئەندەلوس گەڕایەوە، ٣٠ هەزار کیژۆڵەی دەستلێنەدراوی لەگەڵ خۆی هێنابووەوە.[٢١٧] ئێ خۆ بێگومان نێردراون بۆ کۆشکی ئەمیرەکان پاڵەوانەکانی ئیسلام، ئەوانەی لە مەیدانی پیرۆزی جیهاددا ناوی پیرۆزی خودایان بەرز کردووەتەوە. دەڵێت جارێکیان لە ئەندەلووس هێندەیان بە دیل گرتووە، بە کەمترین نرخیشبوایە دەیانفرۆشتن تا لەکۆڵ ببنەوە، نرخی حوشترێک ٥ درهەم و هی دیلێک یەک درهەم بووە. بەڕاستی ئەمە شکۆیەکی مەزنە وا ئێستا هێندێک لە ڕۆڵەکانی عەرەب دەیانەوێت بیگێڕنەوە و وا خەریکن گۆرانی بەسەر باڵایدا دەچڕن سا بەڵکوو ڕۆژگار وەک ئەو کاتەی لێ بێتەوە. ئەوان بیریان چووەتەوە کە هەموو کۆیلە و کەنیزەک و وشترەکانی کە باپیرانیان دەستیان خستووە، هەمووی دابەش کراوە بەسەر ئاغا و ئاغاواتەکانی *حەل و عەقد*دا و فەقیریش هەر خاکڕاخەری و ئاویش پێخۆری بووە. هەر خودا خۆی دەزانێت، لەوانەیە ئەو بڕادەرانەی کە هەوڵی گەڕاندنەوەی ئەو شکۆی باوباپیرانە دەدەن، خۆیان بە دیلی بگیرێن و بکرینە غولامی ئەم و ئەو.

ئەمان وا خەیاڵ دەکەن کە سەرکەوتن بۆ خۆیان دەبێت، بەڵام لەوانەیە پێچەوانەکەی ڕوو بدات و خۆیان ببنە کەنیزەک و کۆیلە. ئەوەی دەیەوێت خۆی بە گەورەتر لە خەڵکی بزانێت، ڕۆژێک دێت خەڵکی بەسەریدا پۆز لێدەدەن، زەمانە لە دەوراندایە، ئەوەی ئەمڕۆ لە سەرێیە، سبەی لە ژێرە. ئەوەتا کۆمەڵێک خەریکی بێئاگا خەریکن بە

---

٢١٧- - ابن الاثیر، الکامل، ج٤، ص٢٧٢.

شانوباڵی فتوحاتەکانی باوباپیرانیاندا هەڵدەدەن، ئەگەر ئینسافیان هەبا، سەری خۆیان شۆڕ دەکر و دەمیان نەدەدڕییەوە.

ڕۆمانێک چاپکراوە و لە بازاڕ دەفرۆشرێت کە نووسەرەکەی بە ناوی "وا موعتەسەما"وە ناوی لێناوە، ئەو لەم چیرۆکەدا باسی ئەو ژنە مسوڵمانە دەکات کە لە ولاتی ڕۆمەوە هاواری دەمی دەکاتە موعتەسەم تا بە هانایەوە بێت و ئازادی بکات لە دەست زوڵم و زۆری ڕۆمەکان. موعتەسەمیش بە خۆی و سەربازەکانییەوە ڕۆیشتە هاواری ئەو ژنەوە، تۆڵەی سەندەوە و هێنایەوە بۆ هەوارگەکەی خۆی و لە پاداشتیشدا چەندین کۆیلە و کەنیزەکی لە کەلەپچەی ئاسن هاویشت و هێنانیەوە بۆ نیشتیمانەکەی خۆی.

ئەوەی کە هەرە سەیروسەمەرەیە، ئەو سەربازانەی کە لەگەڵی ڕۆیشتن بۆ ئازادکردنی ئەو خاتوونە دووروڵاتە، هەر خۆیان لە بەغدا دەستدرێژییان دەکردە سەر ژن و منداڵی بەغداد و سنوورە کەسێتییەکانیان دەبەزاندن. هێندە بەدڕەوشت بوون، بەو لاڕێیانەدا کە دەڕۆیشتیت، لەوانەیە تەرم لە دوای تەرمت دیتبا. دەڵێن جارێکیان لە کاتی پیاسەی موعتەسەمدا، پیرەپیاوێک ڕایوەستاند و وتی: ((خودا پاداشتی هاوسێیەتیت نەداتەوە، بوویتە هاوسێمان و ئەو غوڵامە تورکانەت هێناوەتە سەرمان و لە نێوانماندا نیشتەجێت کردوون. بەوان منداڵەکانمانت هەتیو و ژنەکانمان بێوەژن کرد)).

موعتەسەم سەربازەکانی خۆی بەرداوەتە نێزەی ژنانی بەغدا و هەر بە بای خەیاڵیشیدا نایەت، کەچی بە هانای ژنێکەوە دەچێت کە لەوپەڕی دنیاوە هاواری تێ دەکات و هەر ئەو سەربازە خراپەکارانەیش دەبات. مەگەر هەر خودا بۆ خۆی بزانێت ئەم غەشیمانە لەو ڕێگایەدا کە ڕۆیشتوون و فتوحاتیان ئەنجام داوە، چ ستەمکارییەکیان هەڵایرساندبێت. کاتی ئەوە هاتووە، عەرەب چاو

بدرێنەوە و سەرلەنوێ و بە دیدگایەکی تازەوە مێژووی خۆیان بخوێننەوە. کات و ساتی سوڵتانان بەسەرچوو، ئێستا سەردەمی چاوکرانەوە و ڕابوونە، سەردەمی دەرسوەرگرتنی مرۆیە لە مێژوو.

لە بەشی بۆریدا گوتمان، عەرەب لە دەوری عەلیدا خڕبووبوونەوە، ئەویان وەک ڕابەری بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکەیان لەقەڵەم دابوو. قورەیشیش لە سەردەمی عوسمانەوە شوڵی ستەمیان لێ ڕاکێشابوو، خەڵکە ئۆمییەکەیش داوای دادپەروەری و عەدالەتیان دەکرد، تا هێدی هێدی قورەیش هەستیان بە ترسناکی دۆخەکە کرد. تا بیریان کردەوە و بە چەندین ئامراز عەرەبیان کردەوە خۆیان و لە 'عەلی'یان داتەکاندن. ئەوان لە سەرەتاوە عەلییان لەبەر دڵان شیرین بوو، لەبەر شۆڕشەکەی دژی قورەیش و ناعەدالەتی، بەڵام کاتێک دیتیان وا عەلی بە چاوێکی یەکسان تەماشای ئەمان و مەوالییەکانیش دەکات، ئیدی پشتیان تێ کرد و لێی تەرەبوون.

گرفتەکە ئەوەبوو، عەلی دەیویست یەکسانی لە نێوان هەموو کەسێکدا جێبەجێ بکات، عەرەب و مەوالی، ئاغا و بەردە، بەڵام کاتێک ئەمەی بەسەر عارەباندا جێبەجێ کرد، پێیان ناخۆش بوو. ئەمە سروشتی هەموو مرۆیەکە، لە هەموو کات و شوێنێکدا. ئەو کاتێک لە عەدالەت بێبەش کراوە، داوای دەکات، بەڵام هەر کە دەوران کەوتە دەستی خۆیەوە، ئەو عەدالەتە بۆ خەڵکی دیکە بە ڕەوا نابینێت کە پێشتر خۆی داوای دەکرد. عەلی ڕێوڕەسمی شۆڕشی بەسەر ستەمکاراندا بۆ عارەبان جێهێشت، بەڵام داوای ئەوەی لێ نەکردن کە خۆیان ببنە ستەمکار.

دوو دانە ژنی دەسکورت هاتنە لای عەلی تا خێرێکیان پێ بکات، ئەویش سەرو شتێکی دانێ. بەڵام دانەیەکیان وتی: من عەرەبم و ئەو مەوالی، زیاتر بە من بدە. عەلیش چنگێک خۆڵی لە زەوییەکە

هەلگرتەوە و کەمێکی تێ راما، گوتی: ((ئەوەندەی من بزانم، خودا فەزڵی کەس نادات بەسەر کەسدا، مەگەر بە چاکە و تەقوا)).

"مەدائینی"ش دەگێڕێتەوە، هێندێک لە هاوەڵانی عەلی هاتنە لای و گوتیان: (("هەی گەورەی مسولمانان، لە ماڵ بەخشیندا فەزڵی سەردارەکانی قورەیش و عەرەب بدە بەسەر مەوالی و عەجەمدا، ئەو کەسەیشی خۆفت لێی هەیە، بە ماڵ و سامان بیکەرە خۆت." ئەوان ئەمەیان دەگوت، لەبەر ئەوەی مەعاویە وای دەکرد. عەلیش پێی وتن: "ئێوە دەتانەوێت من بە ستەم خۆم سەرخەم؟")) مەدائینی دیسانەوە دەڵێتەوە: "لە هەرە سەرەکیترین خاڵی تەکینەوەی عارەب، لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب، بریتی بوو لە جێبەجێکردنی بنەمای یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا لە لایەن عەلییەوە، بە جۆرێک: ئەو جیاوازی لە نێوان ئاغازادە و کوڕە هەژاردا نەدەکرد، عەرەب و عەجەم لەلای یەکسان بوو، سەرۆکهۆز و تەنەکەچییەک یەک پشکیان هەبوو."

هەر بۆیە لە ئاخیروئۆخری ژیانی عەلیدا، هەستمان بە نیگەرانییەک دەکرد، ئەمان نیگەرانی. بە جۆرێک: ئەم داوای شتێکی لە خەڵکی دەکرد و خەڵکیش شتێکی تر. لە بیسمیلای شۆڕشدا هەموو بە دەوریدا خنەیان دەهات و لە کۆتاییشدا ئاشبەتاڵیان لێ کرد، تەنانەت کەوتنە بۆسەبۆدانان. "نەوفی بەکالی" دەگێڕێتەوە: عەلی لە کۆتاییەکانی ژیانیدا، ڕۆژێکیان لەناو هاوەڵانیدا، هەستایەوە و وتارێکی توولانیی خوێندەوە، وتارەکە ئەم شتانەی تێدابوو: ((ئەوەتا دەبینن دنیا پشتی لەو کەسانە کردووە کە پێشتر ڕووی لێیان بوو. کەسە باشەکانی ناومان هێدی هێدی ئێرەیان چۆڵ کرد، کوان ئەو برایانەمان کە بە ڕێگای ڕاستدا ڕۆیشتن؟ کوا عەمار؟ کوا ئیبن تەیهان؟ کوا زولشەهادەتەین؟ ئەوی کوان ئەوانەی لە بەڵێنی خۆیان پەژیوان بوونەوە))، دواتر عەلی دەستی گرت بە ڕدێنیەوە و گریا،

ئەمان گریا.

هێندەی بەسەر ئەم قسانەدا ڕانەبوورد و پاش چەندۆکە ڕۆژێک عەلی غافڵکوژ کرا لە مزگەت.

دەڵێن ئەو دەمە کە شمشێرەکەیان داهاژووە سەری، هاواری کرد: ((فزت ورب الکعبە))، "بە پەروەرێنی کەعبە، بردمەوە". ئەمەیش ئاماژەیە بۆ ئەو ئازارە دەروونییانەی کە لە کۆتا ڕۆژەکانی ژینیدا دەیچەشت.

کۆتا ئاخاوتنی بنیادەم، ئاماژەیە بۆ ئەو بابەتانەی کە عەقڵی ناوەوەی ئەو کەسەی سەرقاڵ کردووە. عەلی لە خەڵک و خەڵکیش لە ئەو بێزار بووبوون. وەک خۆی دەیوت: دڵیان پڕ برین کردووم. ئیدی لێدانەکەی ئیبن مەلجەم بوویە هۆی نەجاتبوون لەو ئازارانە.

عەلی مرد، بەڵام یادی ئەوە لە دوای ئەوە زیندوو مایەوە، خەڵکی هانی شۆڕش دەدا و بانگی دەکردن بۆ یەکسانی.

عەلی لە مەیدانی سیاسەتدا سەرنەکەوت، بەڵام لە مەیدانی شۆڕشی کۆمەڵایەتیدا سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا کە بڕانەوەی بۆ نەبێت. ئەگەر عەلی نەبایە، ئیسلامیش وەک ئەو ئاینانەی لێ دەهات کە هەر خەریکی فەتح و داگیرکاری بوون، ئەو سیفەتی ڕەحمەتەیشی پێوە نەدەما کە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای لەپێناودا نێردرابوو.

***

جێگەی داخە، ئەمڕۆ عارەبان دەبینین بە شانوباڵی ئەمەوییاندا هەڵدەدەن و عەلییان خستووەتە پشتی کەندووەوە. ئەویش لەبەر

ئەوەی ئەمەوییان ئیمپراتۆریان بۆ دامەزراندوون وەک ئەوەی کیسرا، بەسەر زۆرێک لە نەژادەکانی دیکەدا بڵندیان کردبوونەوە. ئەوەی سەمەرەیە ئەوەیە: هەر خۆیان لە هەمان کاتدا داگیرکەران لە وڵاتانی خۆیان وەدەر دەنێن و لە دژیان دەجەنگن. ئەمان دژی ئیستیعمارن ئەگەر لە زیانی خۆیان بێت، گۆرانی بە باڵادا دەڵێن کە لە سوودیان بوو.

حەسەن بەننای ڕەحمەتی دەڵێت: "داگیرکەر لە دڵتان وەدەرنێن، لە خاکیشتان دەردەچێت"، بە گیانی خۆم، ئەم قسەیە تا سەر ئێسقان ڕاستە. دەبێت ئەمە بکەینە گوارەی گوێ. ئێمە بە دڵ، پشتی داگیرکەر دەگرین و بە شمشێر لە دژی ڕادەوەستین. ئەمەیش تابێت کارەکە ئاڵۆزتر دەکات و هەوایشمان ناهێڵێت. ئەوەی کە لە هەمووی ناشیرینترە، ئێمە تانە لە غەزاکانی تەیموری لەنگ دەدەین و بە خراپترینی دروستکراوی خودای لە قەڵەم دەدەین، بەڵام غەزاکانی بەنی ئومەییە شکۆدار دەکەین و بەرزیان ڕادەگرین کە هەموو عالەمیان داگیر کرد و تەعەدایان لە دنیایەک خەڵک کرد.

گۆڕەکەی تەیموری لەنگ لە سەمەرقەند گومەزدارە و سەوز داگیرساوە، بە دەورانـدەوری گومەزەکەدا ئایەتی قورئان نووسراوەتەوە، ئەو شوێنە لای زۆرێک لە خەڵکی بەفەڕ و بەرەکەتە، خەڵکی نەزری بۆ دەکەن. ئەو بێئاگایانە نازانن ئاغاکەیان لێرە چی قەتڵوعامێکی کردووە. خەڵکی سەمەرقەند لە دەورانی "تەیمور"دا، خۆشیان ڕادەبوارد، لە هەموو لایەکەوە بەردە و کەنیزەک و غەنیمەتیان بۆ دەهاتەوە، وڵاتەکەی ئەوان لەو سەردەمەدا بووبووە پایتەختی هەموو دنیا. بازار جمەی دەهات لە مامەڵە بە غیلمان و کەنیزەک و شتگەلی دیکەوە. ئەوان وایان دەزانی تەیموری لەنگ شای شاهانە و پادشایەکی میهرەبانە. من هەر لەوە دەترسێم: عەرەبیش

وەک ئەو تەتــارانەی ســـەمەرقەند بـــووبن، بە تەنهــا تەماشـــای بەرژەوەنـــدی خۆیانیـــان کردبێـــت و گـــوزەرانی تەڵخـــی ئەو قوربەسەرانەیان بیر لێ نەکردبێتەوە کە بە دیلی هێنراونەتەوە.

یەکێک دەڵێت: ئاخر فتوحاتەکانی بەنی ئومەیە فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوەی تەیمـــوردا، ئەوەی یەکەم فەتحێکـــی دادپەروەرانە و لە پێنـــاو خودا بووە و ئەوی تر لەپێناو شەیتان بووە.

من قسەی هێندە قۆڕم لە ژیانمدا نەبیستووە...

ئێمە فەتحی ئەمەوییەکان بە دادپەروەرانە ناو دەبەین، لەبەر ئەوەی خۆمان سوودمان لێ بینیوە. خەڵکی سەمەرقەندیش هەمان دیدگایان هەیە بۆ فەتحەکانی تەیمور، چونکە خۆیان لێی بەهرەدار بوون. هەر کەســـە و لە چـــاویلکەی بەرژەوەنـــدییەکانی خـــۆیەوە تەماشـــای بارودۆخەکە دەکات و بەرانبەری لە بیر دەچێت کە چ حاڵێکی هەیە. خۆ ئەگەر بە چاوێکی هەمەگیر و مرۆڤانە بنۆڕینە کۆی فتوحاتەکان، ئەوا بە کارێکی ستەمکارانە لە قەڵەم دەدرێت لە دیدگای ئەو کەسەی نەکسەکەی بەسەردا هاتووە و ماڵی براوە و خۆیشی بەدیل گیراوە.

***

من بیرم دێتەوە، ئەو ڕۆژانەی ئیخوان دەیانویست غەزووی عێراق بکەن. ئەو دەم من منداڵێک بووم لە کۆلانان یاری "تیلە و بەگوم" دەکرد، هەواڵێک هات و هەموو زراومان چوو، ئێمەیش دەبینە قوربانی دەستی ئیخوان. هەر لەو ساتەیشدا خەڵک بیریان لەوە دەکردەوە کە ئیخوان چی بەسەر خەڵکی تائیف هێنابوو، لە حەیبەتان

ڕەنگیان زەرد و چاویان ئەبڵەق بووبوو، دەیانگوت: بە خودا هەمان چارەنووسی خەڵکی تائیف دەبێتە نسیبی ئێمەیش.

لە دیدگای هەوادارەکانییەوە، ئیخوان پاڵەوان و موجاهید بوون، چونکێکم ولاتی فەتح کردبوو، هۆزەکانیشی دەستەپاچە کردبوو، بەڵام ئێمە وەک مێگەلێک چۆن تەماشای گورگێکی دڕندە دەکات، ئاوەهامان لێ دەڕوانین. من وا دەزانم ئەو ناوچانەیشی لەژێر هەڕەشەی فتوحاتەکانی ئەمەویدا بوون، هەمان هەستی ئێمەیان هەبووە ئەو دەمەی بڕیار وابوو ئیخوان بێن و فەتحمان بکەن.

***

مێژوونووسان دەگێڕنەوە: ئەو کاتەی سوپای ئەمەوی لە پاش ڕووداوی "حەڕڕە" چوونە ناو شاری مەدینەی پێغەمبەرەوە، سێ ڕۆژ مۆڵەتیان درایە، چی دەکەن بیکەن. خەڵکی مەدینە دەگوران، وەک چۆن لە قەسابخانەدا مالات دەگورێن، تا خوێنی ڕۆڵەکانی موهاجیر و ئەنسار دەگەیشتە قولەپێ.[٢١٨] دەڵێن یەکێک لە سەربازەکانی سووپای ئەمەوی چووە ماڵی ژنێکی تازە منداڵبووی ئەنسارییەوە، داوای ماڵی لە ژنەکە کرد، ژنەکەیش وتی: "بە خودا هیچیان بۆ نەهێشتووینەتەوە"، ئیدی سەربازەکە تووڕە دەبێت و قۆڵی منداڵەکە ڕادەکێشێت کە خەریکی شیرخواردنە، دەیماڵێت بە دیوارەکەدا و مێشکی دەپرژێنێت[٢١٩].

---

[٢١٨]- - عباس العقاد، أبو الشهدا، ص٢١٢.

[٢١٩]- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، هەمان ڕووپەڕ.

هیچ سەرسووڕمانێک لەم کارەدا نییە، فەتح هەر فەتحە، لە هەر کات و شوێنێکدا. هەواڵی چۆنیەتی فەتحی مەدینەمان زانی، ئەی دەبێت لەو وڵاتە دوورەدەستانە چییان خولقاندبێت؟ خەڵکی چییان لە دەست کێشابێتن؟ ئەو سەربازەی لە شارەکەی پێغەمبەری خودادا نەپرینگابێتەوە و هەرچێکی ویستبێت کردبێتی، دەبێت لە وڵاتی عەجەم یان کافران چی کردبێت؟ ئیدی سیر نەبێت ئەگەر بینیمان مسای کوڕی نەسیر، لە ئەندەلووسەوە بە ٣٠ هەزار کیژۆڵەی دەستلێنەدراوەوە دێتەوە. من باوەڕناکەم ئەم ٣٠ هەزار کیژۆڵەیە، بە ویستی خۆیان لە حەپس هاوێژرابن. موجاهیدەکان بە بلەتە لە ماڵیان دەرهێناون پاش ئەوەی هەموو نێرینەکانی ئەو بازێڕەیان قەتلوعام کردووە و ماڵ و سامانەکانیشیان بە غەنیمەت هێناوەتەوە. بە هیچ شێوەیەک ڕێگەی تێ ناچێت، موجاهیدەکان چووبێتنە بەردەم ماڵەکانەوە، "تەقولباب"یان کردبێت وتبێتیان: "تخوا بێزەحمەت ئەو کیژۆڵەیەمان لەبەر خودا بدەنێ". چیرۆکی هەر "دۆت"ێک پڕە لە یادەوەری تاڵ و سوێر. موجاهیدەکان بێگومان ئەم کارەیان لەبەر خاتری خودا کردووە. ئەوان لەم ڕێگەیەوە دەیان ویست دینی ڕەحمەت و عەدالەت و مرۆڤدۆستی بڵاو بکەنەوە!

***

عەرەب دڵخۆش بوون بە سەرکەوتنەکانیان لەسەر دەستی بەنی ئومەییە، خۆیانیان لە ئۆمەتانی دی پێ بڵند کرد، ڕۆڵەی نەژادەکانی دیکەیان دەکردە بەردە و کارەکەری خۆیان. لای خۆی، ئەم ئۆمەتانە ویستبوویان بێنە ناو ئیسلامەوە، تا کەمێک وەحەسێنەوە، بەڵام هەی

هوو، زوو زانیان هەڵەیەكی كوشندەیان كردووە. ئەوەتا وەك مرۆڤی پلە دوو تەماشا دەكرێن و سەرانەیشیان لێ دەسەنرێت.

پرۆفیسۆر نیكڵسۆن دەڵێت: ((میللەتە ژێردەستەكان وایانزانیبوو ئیسلام ئاینی دادپەروەری و یەكسانییە، بۆیە هەر زوو هاتنە ناویەوە، بەڵام هەر هێندەی داخڵی بوون، هەستیان بە تێكەوتنەكەیان كرد، ئینجا چی تێكەوتنێك. بە هیچ شێوەیەك چینی دەسەلاتدار - ئەرستۆقرات- وەك عەرەب تەماشای ئەمانی نەدەكرد، بەڵكوو بە چاوێكی سووك، ئەمە سەرەڕای لێستاندنی سەرانە و ناولێنانیان بە "مەوالی"، واتە كۆیلەی گەردن بەندكراو...))[٢٢٠]. بێگومان سەرەنجامی ئەم جۆرە كارانە خێر نییە، لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا ئەم مەوالییانە نەزان و هێڕ نین، خەڵكی ناوچەی شارستانین، ئەوانیش خەڵكی شارن، كولتوور و شارستانیەتێكی ئاڵۆزیان هەیە. ئەم ناشیرین رەفتاركردنە لەگەڵیان، بوویە هۆی ئەوەی خۆیان بە زانستە ئاینییەكانەوە مەشغوڵ بكەن و بەرەوپێشیشی بەرن. ئەمەیش شتێكی نامۆ نییە، ئەو كەسەی كە كەبت دەكرێت، ناچارە پەنا بۆ دەرچەیەك بەرێت و خۆی تێدا خاڵی بكاتەوە و كەمێك دەروونی ئاسوودە بكات. ئەم دیاردەیە لە زانستی نوێی دەروونناسیدا بە Sublimation ناو دەبرێت، واتە بەرزبوونەوە.

عارەب بەهۆی فتوحاتەوە لەخۆگۆڕاو و بێئاگابوون لەوەی چی پاڵەپەستۆیەكی بەهێزی دەروونی لە ناواخنی كۆمەڵگەدا دەگوزەرێت. مەوالی خەریكی كۆكردنەوەی فەرموودەكان و زیادەڕۆییكردن بوون تێیدا، كردبوویانە چەكێكی مەعنەوی و لە دژی دەسەلاتدارە ستەمكارەكان بەكاریان دەهێنا. لە پرۆسەی كۆكردنەوەی فەرموودەدا، پشكی شێر بەر عەلی كوڕی ئەبوتالیب كەوت. لە دیدگای

---

[٢٢٠] - nicholson ،op،٢٤٨.cit.p .

مەوالییەکانەوە، عەلی بووبووە پاڵەوانێکی ئاینی. بە شەو و بە ڕۆژ، هەر ئەو فەرموودانەیان دەگوتەوە کە لە بارەی چاکەی عەلییەوە بیستبوویان.

هەتا ئەمەوییەکان زیادەڕۆییان بکردایە لە جنێو و تانەدان لە عەلی، ئەمانیش زیاتر فەرموودەیان لە بارەی فەزڵ و چاکەی عەلییەوە کۆ دەکردەوە، ئیدی چی فەرموودەی ڕاست بن یان درۆ. ئەمە بارودۆخێکی نوێ نەبوو کە مێژوو هەرگیز بە خۆیەوەی نەبینی بێت، بەڵکوو ئەمە ئیشی هەموو قۆناغێکی مێژووە. ئەمە لەناو پشتیوانە هەوەڵینەکانی مەسیحیشدا ڕووی دا، ئەو دەمەی دەسەڵاتی ڕۆمان، شکەنجەی دەدان و بە زیندووی دەیخستنە بەردەم ئاژەڵە دڕندەکانەوە.

فەرموودەوانان دەگێڕنەوە: ((جارێکیان پێغەمبەر بە عەلی دەڵێت: "ئەگەر ترسی ئەوەم نەبا، خەڵکی وەک ئەو گرۆهەی میللەتی عیسایان لێبێت، ئەوا شتێکم لە بارەتەوە دەگوت، خەڵکی خاکی ژێر پێت و ئاوی دەستنوێژتیان وەک تەبەرک و دەرمان بەکار هێنابا"))[221]. وای بۆ دەچم ئەم فەرموودەیە لەم دوای دواییەوە لە لایەن فەرموودەسازانەوە درووست کرابێت، دوای ئەوەی ئەو هاوبەشییەیان بینی لە نێوان شوێنکەوتوانی مەسیح و شوێنکەوتوانی عەلی لە زیادەڕۆیی و پیرۆزکردن.

لە ڕاستیدا ئەو چەرمەسەرییەی شیعەی عەلی بینییان لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا، هیچی کەمتر نەبوو لەوەی مەسیحییە هەوەڵینەکانی پاش عیسا بە دەست ڕۆمانەوە دیتیان. کونبەکون بە دوای شیعەیەکی عەلیدا دەگەڕان، چەپ و ڕاست پەلبڕیان دەکردن و بە پەلکی دارخورماوە لە قەنارەیان دەدان. مەعاویە ئەم کارەی بە "زیاد"

---

[221]- هاشم البحرانی، علی والسنه، ص٧ – ٨.

سپارد، "زیاد" خۆی لە سەرەتادا لە شیعەی عەلی بوو، بۆیە باشی دەناسین و یەک یەک لە کونی ماری دەهێنانە دەرێ. ئیدی لەو ساتەوە گوزەرانیان یەکپارچە تەڵخ بوو.

کارێک بەسەر مسوڵماناندا هات، باشتر ئەوەبوو بڵێن کافرین یان زندیقین، تا بیانگوتبا شیعەی عەلی کوڕی ئەبوتالیبین[٢٢٢]. ئەم چەوساندنەوانە، بوونە هۆی بەربڵاوبوونی بیری شیعەگەریی و زیادەڕۆیش تێیدا. هیچ شتێک هێندەی ڕێگریی، برەو بە بیرۆکەیەک نادات.

***

ڕۆژهەڵاتناسیی بەناوبانگ "فلهاوزن" دەڵێت: تۆوی بزووتنەوەی شیعەگەری، لەناو عەرەبە ڕەسەنەکاندا چەکەرەی کرد، ئەم بزووتنەوەیە تەشەنەی نەکردە ناو فارسەوە، تا سەردەمی موختاری سەقەفی. لەم بیرۆکەیەدا، هەردوو ڕۆژهەڵاتناس -ئادەم منتز و گولدزیهر- پشتگیری فلهاوزن دەکەن[٢٢٣]. لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە. عەرەب لە سەرتاوە بووبوونە پەروانەی عەلی، بەڵام دواتر خول خول چوونە ناو حیزبی ئەمەوییەوە. ئیتر حیزبی شیعە کەم کەم لە ژینگەی عەرەبان تەکییەوە و ڕووی کردە ناوچەی فارس و مەوالی.

یەکەمین شۆڕش کە مەوالییەکانی تێدا بەشدار بوو، شۆڕشەکەی فوختاری سەقەفی بوو. عەرەب ڕقیان لەم شۆڕشە بوو، چونکە

[٢٢٢]- ابن ابی الحدید، المصدر السابق، ج٣، ص١٥.

[٢٢٣]- أدم متز، الحضاره الاسلامیه فی القرن الرابع الهجری، ج١، ص١٢٠.

ئەوانی تێدا یەکسان کرابوو لەگەڵ مەوالییەکاندا. مەوالییەکان پاش موختاریش بەردەوام بوون لە شۆڕش، تا شۆڕشەکەیان خەریک بوو بە تەواوی ڕیشکی دەوڵەتی عەرەبی لەبن بێنێت.

***

عەلی ڕێورەسمێکی هێندە جوانی لە بارەی یەکسانییەوە بۆ عەرەب دارشت، ئەگەر بێتوو لە سەری ڕۆیشتبان، شکۆی عەرەبیش وەک شکۆی ئیسلام بڵند دەبوو. بەڵام قورەیش کارەکەی لە عەرەبیش تێکدا و بە ڕێگەیەکیدا بردن، کەس سەلاواتیان لەسەر نەدات. عەرەب زیانێکی مەزنیان تووش بوو بە دەست تێکەڵکردن لەگەڵ قورەیشدا. ئەوانیش هەر وەک قورەیش بە چاوی حیزەوە تەماشای مەوالییان دەکرد و دەیانچەوساندنەوە. ئەمەیش بوویە هۆی تۆڵەلێستاندنەوە، بەڵام چی تۆڵەیەک. هەر کارێکیان پێ کردبوون، چەندقات باجەکەیان لێ ئەستاندنەوە. ئەمەیش ڕووی ئەو پەندەی سپی کرد کە دەیگوت: "کوفر بەدەوام دەبێت، بەڵام ستەم نا."

***

ئەو ڕابوونەی عەباسییەکان، گوزارشت بوو لە ڕابوونی مەوالییەکان بۆ تۆڵەلێسەندنەوەی عەرەب و هەپرووونکردنی دەوڵەتەکەیان. زۆرێک لە ئاماژە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن، کە دەوڵەتی عەباسی لەسەر بنەمای "ڕق" لە عارەبان دامەزرا. لە دەورانی ئەم دەوڵەتەدا، کاردانەوەی سەخت لە دژی عارەب نیشان درا. بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی بە شێوەیەکی زەق دەرکەوت. کار گەیشتە ئەوەی لە سەردەمی بەنی عەباسدا، عەرەب چوونەوە سارا و

دەستیان کردەوە بە وشترەوانی سەرلەنوێ.

سەرگەورەی عەباسییەکان، ئیبراهیمی ئیمام، نامەیەکی ئاراستەی نوێنەرەکەی خۆی - ئەبو موسلیم- کرد، کە تێیدا هاتبوو: ((هەتا دەتوانیت نەهێڵیت یەک بەشەر لە خۆراسان بە عەرەبی بئاخڤێت، وەگەرنا ساردی بکەرەوە. هەر "مێرمنداڵێک" لە پێنج بست بەرزتر بوویەوە، خێرا تۆمەتی بۆ هەڵدەبەستیت و بەو بۆنەیەوە ئەویش سارد دەکەیتەوە، توبیو عەشیرەتی موزەڕ، ئەوان هاوسێی و دوژمنمانن، سەوزاییان لەناو بەرە و لەمەملەکەتی خۆیان شاربەدەریان بکە)) [224]. ئەبو موسلیم پیتبەپیتی نامەکەی جێبەجێ کرد. لە ماوەی دووساڵ دا، ٦٠٠ هەزار نێرەبەشەری لێ قەتڵوعام کردن.

یەکێک لە دەستوپێوەندەکەی ئەبو موسلیم لە خۆراسان، بە ناوی "قەحتەبە"وە، ڕۆژێکیان وتارێکی پێشکەش کرد، تێیدا هاتبوو: ((هۆ ئێلی خۆراسان... ئەم خاکە لە بنەڕەتدا هیی بابوباپیری خۆتان بوو، ئەوان تێیدا بەسەر نەیاراندا سەردەکەوتن، بەهۆی دادپەروەری و جوانی ڕێوڕەسمیانەوە، تا ئەوەی لە ڕێوڕەسمی خۆیان لایاندا، سەریان کردە ستەمکاریی. ئیدی خودایان لێ ڕەنجا و خاکیان لەدەست دا. ڕسواترین گەلی سەرزەوییان بەسەردا زاڵ بوو، دەست گیرا بەسەر وڵاتەکەیاندا... منداڵیان لێ ئاستاندن. ئەوان گوایە بەم کارەیان عەدالەت بەرقەرار دەکەن و پەیمانپارێزی دەکەن و پشتی ستەملێکراوان دەگرن، بەڵام نەیان کرد، ئەوان لە خەڵکی عادل و دادپەروەری نەوەی پێغەمبەری خودا دەسڵەمینەوە، تا خودا ئێوەی بەسەریاندا زاڵ کرد تا بە ئێوە تۆڵە لەوان بکاتەوە... چی تۆڵەیەکیش، پیسترین تۆڵە... خۆ ئێوە خۆیشتان داوای تۆڵەتان دەکرد)) [225].

---

[224] - أحمد أمين: ضحى الاسلام، ج١، ص٣٣.

[225] - أحمد أمين، المصدر السابق، ج١، ص٣٥.

دوای ئەمیش، مەنسوور هات، هەمان دەستووری براکەی -ئیبراهیمی ئیمـام-ی زۆر بە تونـدی جێبەجـێ دەکـرد لە هەمـبەر عارەبـان. مەنسوور بەوە ناسرابوو کە زۆری ڕق لە عارەبە. نەیدەهێشت بچنە سەر کاروبار. تەبەری دەگێڕێتەوە: ((مەنسوور خزمەتکارێکی عارەبی هەبـوو، پێشـتر نەیزانیبـوو کە ئەم خـوڵامەی عـارەب زمـانە، هەر کە زانی، لەسەر کاری دوورخستەوە و گوتی: "دەزانم تۆ خوڵامێکی باش بوویت، بەڵام عەرەب نایەتە قەسرم و خزمەتی حەرەمم. خـودا لێت خۆش بێت، بڕۆ بۆ هەرکوێیەک خۆت دڵت پێی خۆشـە))[٢٢٦].

سیوطی دەڵێت: ((مەنسوور یەکەم کەس بوو مەوالی خستە سـەر کـار -بێگومان لە خوراسـان-، پاشان پلەی لە عارەب بەرزتر کردنەوە، ئەم کـارەیش لە پـاش ئەو زیـاتر پەرەی ئاسـتاند، تـا عـارەب هـیچ جومگەیەکی دەستەڵاتیان بەدەستەوە نەما))[٢٢٧].

مەسعودیش دەگێڕێتەوە: ((مەنسوور یەکەم خەلیفە بوو، مەوالییەکان و غیلمانەکـانی لەسـەر کـار دامەزرانـد. لە کاروبـاردا پێشـی عـارەبی خسـتن. ئەم کارەیشـی بـووە سـوننەتێک بـۆ خەلیفەکانی پاش خـۆی. دەوڵەتی عارەبان بە باد چوو، بەردیان بەسەر داریانەوە نەما))[٢٢٨].

***

بە سـەرکەوتنی بەنـی عەبـاس، هەم مەوالـی و هەمـیش شـیعە سەرکەوتن. جێگەی داخە ناوی عەلی وەک ئامرازی تۆڵەسەندنەوە لە

---

[٢٢٦]- -إبن الاثیر، الکامل، ج٥، ص٢٢٧.

[٢٢٧]- -ٰ السیوطی، تاریخ الخلفاو، ص١٠٥.

[٢٢٨]- - المسعودی، مروج الذهب، ج٥ ص٤٠١.

عەرەب بەکار دەهات لەم سەردەمەدا، لە کاتێکدا ئەو خۆی خەباتی بۆ یەکسانکردنی عەرەب لەگەڵ قورەیشدا دەکرد. ئەم پیاوە یەکەم سەرکردەیان بوو کە بانگەوازی یەکسانی دەکردن لەگەڵ قورەیش، لە کاتێکدا ئەوان بە پلە دوو تەماشای ئەمانیان دەکرد. عەلی چاکەی عارەبی دەویست، بەڵام پاش مەرگی، ناوەکەی بۆ تۆڵەسەندنەوە لە عارەبان وەگەڕ خرابوو.

***

پێشتر گوتمان هەر شۆڕشێک کە سەرکەوت، ئیدی دەست دەکات بە گەندەڵی. بە هەمان شێوە شیعەگەریش گەندەڵی تێکەوت کاتێک لەسەر دەستی عەباسییەکان سەرخرا. ڕێچکەی مێژوو شەرمی لە هیچ کەسێک نییە، ئەو لە هەڵچوون و داچوونی خۆی ناکەوێت. هەر کەسێکی بەرەو سەر برد، بە نووکەشەقێکی دەهاوێتەوە خوارێ.

شیعەگەری شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بوو لەپێناو بەرقەرارکردنی دادپەروەری و یەکسانی، بەڵام هەر هێندەی سەرکەوت، ئیدی خۆی بە ڕووکەش و شتی منداڵانەوە سەرقاڵ کرد و ئەو بنەمایانەی بیرچووەوە کە شۆڕشی لە پێناودا کردبوون. دوای ئەوەی شیعە یەکپارچەبوو لە شۆڕش و شکاندنی دەوڵەتی ئەمەویدا، کەچی هەر هێندەی نەبرد بوونە دوو بەرەی دژبەیەک، یەکیان بانگەشەی "ئالی عەباس"ی دەکرد، ئەویتریشیان "ئالی عەلی"، وەک ئەوەی شۆڕشیان بۆ "ناو" ئەنجام دابێت.

لەو سەردەمەدا مسوڵمانان سەرقاڵی مشتومڕکردن بوون لە بارەی بابەتی "خزمایەتی"یەوە، ئایا مام نزیکترە یان کچ.

مسوڵمانان، ئامانجی شۆڕشەکەیان لەبیر چووبووەوە، وەک دەبینرا حیزبی شیعەی عەلی، سەرقاڵی حەسەب و نەسەب بوون. بابەتی جێنشینایەتییان لە لا بووبووە شتێکی میراتی. دەهاتن و دەیانگوت: کام لەم دوانە بۆ جێنشینایەتی لە ڕووی میراتەوە نزیکترن لە پێغەمبەر؟ ئایا کوڕی کچەکەی؟ یان کوڕی مامەکەی؟ بەمەیش هەوڵ و تێکۆشانی کوڕەکەی ئەبوتالیب بوویە بڵقی سەرئاو، وەک چۆن پێشتر ئەوەی موحەمەد بووبوو.

یەکێک لە شاعیرەکان هاتبوو بۆ لای ڕەشید و ئەم هۆنراوەیەی بە دیاری هانیبوو:

أعم رسول الله أقرب زلفه

لديه أم إبن العم فى رتبه النسب

وأيهما أولى به وبعهـــده

ومن ذا له حق الوراثه قد وجب؟

ئایا مامی پێغەمبەر نزیکترە لێیەوە

یا کوڕە مام لە ڕووی نەسەبەوە

کامیان لە پێشترن بۆی و بۆ جێگرەوەی

ئەی کامیان لە پێشترن بۆ میراتەکەی؟

هاروون بە بیستنی ئەمە، فەرمانی دەرکرد ٢٠ هەزار درهەمی نوقڵانە بدەنێ. شاعیرێکی دیکەیش هات و لە هەمان بەزمی بۆ چڕی ((ئایا کچان میراتی مام دەبەن؟)). ڕەشید بە دڵی بوو، نوقڵانەیەکی باشی پێشکەشی ئەویش کرد.

لێرەوە شتێک ڕوون دەبێتەوە، ئەویش دەمەقاڵێی خێزانێکە لەسەر

میراتی بابیان. هەر کەسە و بانگەشەی نزیکتر بوون لە مردووەکەوە دەکات، بۆ ئەوەی خۆی میراتەکە بەرێت. ئەوەی هەروا بە ڕووکەش تەماشای باروردۆخەکە بکات، وا دەزانێت موحەمەد بۆ بە میراتهێشتنەوەی موڵک و پاشایەتی بۆ منداڵەکانی، ئەو هەموو خەباتەی کردووە. بۆیە ئێستا خانەوادەکەی خەریکی مشتومڕی میراتی ئەو ڕەحمەتییەن.

***

لە کۆتاییدا فاتیمییەکان توانییان بەشێکی باش لە میراتی جێنشینایەتی بۆ خۆیان بپچڕن. ئەفریقا و میسریان گرت، پەنجەی هەڕەشەیان لە بەغداد بەرز کردبووەوە. عەباسییەکان ئەم شتەیان لەسەر دڵ گران بوو، بۆیە هەموو هەوڵ و کۆششی خۆیانیان خستبووە گەڕ، تا تانە لە ڕەچەڵەکی فاتیمیەکان بدەن، کە گوایە ئەوان لە نەوەی عەلی و فاتیمە نین. کاروبار هەموو بووبووە گەنگەشەی ڕەچەڵەک و هیچی تر.

موقریزی دەڵێت:[٢٢٩] ((خەلیفەی ئالی عەباس "قادر"، کۆربەندێکی لە بەغداد ساز کرد، هەموو ئاغا و قازی و فەقیهانی لە دەوری یەک جەم کردبوو. لێی داواکردن یاداشتێکی بۆ بنووسن، تێیدا تانە بدەن لە ڕەچەڵەکی خەلیفەکانی فاتیمی و پەیوەندییان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبوتالیب بپچڕێنن. کۆپی ئەم یاداشتەیشی بە شار و گونددا بڵاو کردەوە. خەلیفەکانی فاتیمیش هیچ ئیشێکیان نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت: بە شانوباڵی عەلیدا هەڵبدەن و شایی و خۆشی بگێڕن بۆ

[٢٢٩]- - المقریزی، المصدر السابق، ج٤، ص١٥٥ ـ ١٥٦.

بەرزڕاگرتنی ناوی ئەو. خەلیفە "موعیز"ی فاتیمی، فەرمانی دا بە هەموو دار و پەردووی ولاتی نیلەوە بنووسن: "باشترین بەشەر لەپاش پێغەمبەر (د.خ) عەلی کوڕی ئەبوتالیب بووە سەلامی خوای لێبێت". ئەم کارەیش بووە هۆی پەرچەکردار لە لایەن جەماوەری میسرەوە. بێگومان خەڵکی نیل عەلییان زۆر خۆش دەویست، بەڵام کاتێک بینییان دەسەڵاتدارەکانیان زیادەڕۆیی لە کارەکەدا دەکەن، بایان دایەوە بەملادا و دەستیان کرد بە پیاهەڵدان بەسەر نەیارەکەیدا -مەعاویە-. ئاستی جەماوەریی مەعاویە لە برەودا بوو، کاتێک دەیانبینی دەسەڵات هەر خەریکە بە شانوباڵی عەلیدا دەیهێنێت و دەیبات. ئەمە ڕێک هاوشێوەی ڕۆژانی دەسەڵاتی ئەمەوی بوو، کاتێک دەسەڵاتدارەکان بە هەموو جۆرێک سانسۆریان خستبووە سەر ناوی عەلییەوە، کەچی ناوەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ لە بڵاوبوونەوەدا بوو.

دانیشتوانی میسر لە دەورانی فاتیمییەکاندا مارشێکیان داهێنابوو، ئەویش: "مەعاویە خاڵی مسوڵمانانە"، لەبەر ئەوەی خوشکێکی خێزانی پێغەمبەر بوو. ئەوان دەستیان کرد بە خۆپیشاندان لە شەقامەکاندا و لە ڕاگوزەرانیان دەپرسی: کێ خاڵتە؟ خوانەکا و نەیوتایە مەعاویە، ئەگینا فەلاقەیەکی باشی دەبووە نسیب. خۆپیشاندەران هاواریان دەکرد: "مەعاویە خاڵی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە". ئیدی حکومەت بانگبێژێکی هەنارد تا بڵێت: ((هۆ خەڵکینە، بەسیکەن و ڕاوەڕاو مەکەن. هەرکەس ئەو قسەیە دووبارە بکاتەوە سزا دەدرێت ئەمان سزا)).

کاکی خوێنەر، هۆ براکەم... وردبەرەوە لەم قسە قۆڕانەی کە مسوڵمانان پێوەی مەشغوڵ بوون. بنەما مەزنە کۆمەڵایەتییەکانی کە موحەمەد و عەلی کۆششیان بۆ دەکرد، هەموو خرانە پشتی کەندوو، شۆڕش بووە شۆڕشی ناو و کەس.

***

شایەنی باسە، خەلیفەی فاتمییەکان، هیچ کەمایەسییان نەبوو لەمەڕ خۆشڕابوێری و کۆشک و کەنیزەک، بگرە لە هەندێک ڕووەوە ئەوانی دیکەیان نابووە بن باڵەوە و جێیان هێشتبوون[٢٣٠]. ئەگەر موتەوەکیلی عەباسی ٤ هەزار کەنیزەی هەبوون، ئەوا حاکمی فاتمی ١٠ هەزار خولام و کەنیزەی هەبوون. خوشکەکەیشی "ست الملک" هەشت هەزار کەنیزەی هەبوون کە ١٥٠٠ دانەیان، کیژۆڵەی دەستلێنەدراو بوون. ئەو کاتەیشی سەلاحەددین دەستی بەسەر کۆشکەکانی فاتیمیدا گرت، لە کۆشکێکی گەورەیاندا ١٢ هەزار مێینەی بینیبوو، نیریان تێدا نەبوو، بێجگە خەلیفە و کوڕەکانی. کاتێک سەلاحەدین دەستی بە فرۆشتنیان کرد، ١٠ساڵی ڕەبەق ئینجا لە فرۆشتنیان بووەوە.

دەڵێن موعیزی فاتیمی، فەرمانی دەرکرد، لە ئاوریشمی پوختی لە زێڕ هاوێژراو، وێنەی مەککە و مەدینەی بۆ بکێشن و لە دامێنیدا بنووسن: ((ئەمە بە فەرمانی موعیزولدینی فاتیمی لە ساڵی ٣٥٣ی هیجریدا نەخشێنراوە، لە شەوقی بۆ حەرەمی خودا و مەشخەڵەکانی پێغەمبەری خودا)).

ئەم ستەمکارە لە خودا نەترسە، لە قوڕگی خەڵکی دەگرتەوە و بە پارەکەی، وێنەی مەککە و مەدینەی دەکێشا، لە شەوقی بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی. بەم کارەیش، موحەمەدی کوڕی عەبدوولای کردە ڕەمزی خۆشڕابوێری و ستەمکاریی. دینەکەی موحەمەد بویە ماڵەقۆڵێ بە دەستی سوڵتانەکانەوە، ئەوەیشیان لە بیری خەڵکی

---

[٢٣٠]- جرجی زیدان، المصدر السابق، ج٥، ص ١١٥.

بردەوە کە هەرە سەرسەختترین نەیارەکانی موحەمەد بریتی بوون لە سوڵتانەکان.

# بەشی دەهەم

# سروشتی شەهید (طبیعە الشهید)

هێندێک لە توێژەران بەراوردی نێوان عەلی و مەعاویە دەکەن، فەزڵی مەعـاویە دەدەن بەســەر عەلیـدا. ئەمەیـش لەبەر ئەوەی هەردووکیـان پێشـبرکێی جێنشـینایەتییان کـردووە، یەکێکیـان بەســەر ئەوی دیـدا سەرکەوتووە. براوە لە دۆڕاو لە پێشترە، لە نەریتی ئەم توێژەرانەدا. بێگومـان مەعـاویە لە عەلی باشـترە، ئەگەر "باشبوون"مان بە پێوەری دۆڕان و بـردنەوە پێوا لە مەیدانی ڕامیاریـدا. بەڵام پێـوەری بـاش و خراپـی لە نێـوان دوو کەسـدا، تەنهـا یەک پێـوەر نیـیە. لەوانەیە سەرکەوتووەکە بە پێوەرێکی دیکە ژێرکەوتوو بێت. گرفتی هێندێک لە تـوێژەران ئەوەیە هێشـتایش لەژێـر لـۆجیکی کەونارانـدا شـتەکان دەپێوێت، ڕاستی لای ئەو جێگیـرە و نەگۆڕ. هەر بۆیە کاتێک لەمەڕ چاکە و خـراپەی کەسـایەتییەکی مێژوویی دەئـاخڤن، هەر دەڕۆن بـێ ئەوەی بگەنە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە.

خۆ ئەگەر هاتبا و سەرەتا لەسەر پێوەرەکە ڕێککەوتبان، کە بە چ پێوەرێک خەڵکی دەپێون، ئیدی لە کۆتایدا بۆیان ڕوون دەبووەوە کە، کێ "فەزڵدارە" و لە چی ڕوویەکەوە، کێیش "بێفەزڵە" و لە کامە گۆشەنیگاوە. ڕاست دەکەین، ئەگەر بڵێین: چەلەحانێی لێکۆڵەران، چەلەحانێیەکە زیاتر لەسەر پێوەر و بەهاکان بنیات نراوە، وەک لەسەر ڕاستی و فەزیلەتەکان.

ئێمە ستەممان لە عەلی کردووە، کاتێک هاتووین بە پێودانگەکانی مەعاویە پێواومانە. مەعاویە پیاوێکی بە مانای وشە ڕامیاری و دووربین. بۆیە لەم گوشەنیگایەوە فەزڵی بەسەر بێجگە لە خۆیدا هەیە. بەڵام عەلیش پێوەر و پێودانگێکی خۆیی هەیە، کە بە تەواوی لەوەی مەعاویە جودایە. عەلی دەڵێت: ((ئەوەی بە خراپەکاری سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت، ژێرکەوتووە))[231]. لە ڕێگەی ئەم وتەیەوە، عەلی پێوەرێکی نوێی خستووەتە مەیدانەوە کە لە ڕێیەوە: سەرکەوتوو بە ژێرکەوتوو، دۆڕاویش بە براوە لەقەڵەم دەدرێت.

هەر بەڕاستی عەلی لە مەیدانی سیاسەتدا سەرنەکەوت. ئەو دۆڕاوە لە دیدگای ئەو کەسانەی تەنها سیاسەت دەبینن و هیچی دیکە. بەڵام بۆ ئەو کەسانەی مێژوو وەک مەیدانی مەبدەئەکان دەبینن، ئەوا: عەلی شێری مەیدانە، پاڵەوانی پاڵەوانانە. مێژوونووسان هەر وەک هەر خەلیفەیەکی تر، عەلییان خستووەتە ڕیزبەندی خەلیفەکانەوە، هەر بۆیە، هەمان پێوەر و هەژمار بۆ خۆی و کارەکانیشی دادەنێن. بەڵام لە واقیعدا عەلی خەلیفە نەبوو، بەڵکوو شۆڕشگێڕێک بوو، هەر وایش مایەوە تا دوا نەفەس. ئیدی ئەوان کۆمەڵێک پێوەریان داناوە لای خۆیانەوە، عەلیشیان پەلکێشی ئەو پێواندنانە کردووە. خۆی ئەگەر ڕاستیت دەوێت، لێکۆڵەر دەبێت لەسەر ئەو بنەمایانە کەسێک دادگایی

---

[231] - محمد عبده، نهج البلاغە، ج٣ ص ٢٣١.

بکات کە کەسەکە خۆی ئیمانی پێیانە. هەڵەی کوشندە ئەوەیە: توێژەکان دادگایی کەسانی جاران بە پێوەر و بەها ئیمڕۆژییەکان دەکەن. ئەگەر لێکۆڵینەوەی بابەتییانە بۆ خەلافەتەکەی عەلی بکەین، ئەوا، شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەبینین، سروشتی سوڵتانێتی بەدی ناکەین مەگەر زۆر کەم نەبێت.

لە بەشی پێشوودا گوتمان: لە دەورانی عوسماندا، خەلیفەی کردەیی – فعلی- مەعاویە بوو. شامیش پێگەی خۆی و جێگەی سەربازەکانی بوو. مەعاویە بەم شێوەیەیش مایەوە تا عەمری خوای کرد. هەرچێک لە بارەی ئەو ماوەیەی کە بەیعەتی تێدا بە عەلی درا، دەتوانرێت بە برگەیەک لە درێژەی شۆڕشگێریی و پشێوییەکانی ناوچەکە لە قەڵەم بدرێت. شایەنی باسیشە کە قورەیش دەستیان نەخستە دەستی عەلییەوە. ئەوەی بەیعەتی دایە، شۆڕشگێڕە بکوژەکانی عوسمان بوون. ئەم بەیعەتەیش وەک کۆدەنگییەک بوو، تا بەیداغ و سەرکردایەتی شۆڕش بدەنە دەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیب. بەڵام جێگەی داغە مێژوونووسان ئەم لایەنە بە هەند وەرناگرن، یان هەر دانی پێدا نانێن. ئەوان عەلیان کردووە بە ژمارە چواری خەلیفەکانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی و هیچی تر. ئەوەیان بیرچووە کە عەلی بواری فەرمانڕەوایەتی بۆ نەڕەخساوە. لەو ماوەیەی کە شۆڕشگێڕەکان بەیعەتیان دابوویە، هەر لە جەنگ و هۆمەرەمزەدا بوو تا مرد، ئیدی خەلیفایەتی چی و شتی چی؟

هێندێک لە مێژوونووسان لۆمەی عەلی دەکەن کە مودارای بارودۆخە سیاسییەکەی نەکردووە، خەڵکە خانەدانەکەی نەکردووەتە خۆی و دڵی والی و سەرۆک هۆزەکانی کەمەندکێش نەکردووە. ئەوان بە ناونیشانی خەلیفە لۆمەی دەکەن و نازانن ئەو شۆڕشگێڕ بووە. شۆڕشگێڕیش بە چاوی والی و سیاسەتوان تەماشای بارودۆخ ناکات.

هەموو ئەو کارانەی عەلی لە کاتی بەناو خەلیفایەتییەکەیدا ئەنجامی داون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، نە ئەم لە سیاسەت تێگەیشتووە و نە سیاسەتیش لەم. ئەوانەی لەم ڕووداوانە ورد دەبنەوە، عەلی بە گێل و کورتبین ناوزەد دەکەن. ئەگەر ویژدانیان هەبا، بە پێوەرەکانی شۆڕش دادگاییان دەکرد، لێرەیشەوە ڕاستی و ئامانجەکانی عەلییان بۆ ڕوون دەبوویەوە.

***

هەوەڵین کارێک عەلی ئەنجامی دا، هات و دەستلەکارترازانی بە هەموو والییەکان نووسی، بۆ دەرمانیش والییەکی نەهێشتەوە کە لە سەردەمی عوسمانیشدا والی بووبێت. هەڤاڵەکانی هاتن و ئامۆژگارییان کرد کە ئەم کارە نەکات، بەڵام ئەو گوێی بۆ نەگرتن. هیچ کەس نییە ئەم کارە نەبیستێت و بکەرەکەی بە کورتبین لەقەڵەم نەدات لە بواری ڕامیاریدا. چۆن دەکرێت حاکمی نوێ هەموو "دەستکار"ی حاکمی پێش خۆی برمێنێت. قۆناغبەندی لەم جۆرە کاتانەدا هەرە لازمە، بەڵام عەلی ئەم پێویستییە نازانێت، دەڵێت سازش و دڵڕازیکردن بە یەک و دوان تەواو نابێت و زنجیرەیەکە بێ برانەوە.

موغەیرەی کوڕی شوعبە یەکێک بوو لە دوهاتەکانی عەرەب، جارێکیان ئامۆژگاریی عەلی کرد: ((... والییەکان لە پێگەی خۆیاندا بهێڵەرەوە تا سەربازەکانیان بەیعەتت دەدەنێ، کە بەیعەتت بەدەست هێنا، ئیدی کەیفی خۆتە چی لە والییەکان دەکەیت))، عەلیش لە وەڵامدا: ((گرەویان لەسەر ئاینی خۆم پێ ناکەم، کەسی سووکیش ناکەمە شەریکە کارم)). هێندێک لە هەڤاڵانی خۆی هاتن و پێیان گوت: ماڵ و سامان بە پێی حەسەب و نەسەب دابەش بکە و پێگەی کۆمەڵایەتی خەڵکی بەهەند وەر بگرە تا دڵیان کەمەندکێش بکەیت

بەلای خۆتـــدا، بەلام ئەو وەلامەکەی بریتـــی بـــوو لە: ((ئەرە ئێـــوە دەتانەوێت  بە ستەم سەرکەوتن بەدەست بێنم؟)).

عەقیلی برای هات و شکاتی بێشێوی خۆیی هێنایە لای عەلی، وتی شـتێکم بـدەری لە خەزێـنەی مسـوڵمانان تـا پێویسـتی خـۆمی پـێ دەربکەم. عەلیش بە کابرایەکی تەنیشتی خۆی وت، "ئا دەستی بگرە و بیبە بۆ لای دوکانەکانی بازاڕ و قوڵفەکانیان بشکێنە و چی تێدا بیبە بۆ خۆت"[232]. عەقیل وتی: دەتەوێت دزیم پێ بکەیت؟ عەلیش وتی ئەی تۆ دەتەوێت منیش دزی بکەم؟ لە بەیتولماڵ بدەم بە تۆ و نەیدەم بە خەڵکی؟ کاتێک عەقیل چوو بۆ لای مەعاویە لە شام، دەیوت: "براکەم باشتر بوو بۆ ئاینم، مەعاویەیش باشترە بۆ دنیام"[233].

مەعاویە لە دەسپێکی جەنگی صەفیندا سانسۆری خستە سەر ئاوی فورات، نەیهێشت ئاو بگاتە جەماعەتی عەلی. دواتر جەنگاوەرانی عەلی هێرشیان کردە سەریان و شوێنەکەیان گرتن و ویستیان ئەمانیش ڕێگری لە گەیشتنی ئاو بکەن لە مەعاویە، عەلی وتی: ((با ئاوەکە لە نێواندا بێت، خودا ئێوەی بەهۆی ستەمکاری خراپەکاریی ئەوانەوە سەرخستووە)). یەکێک لە گەورەکانی بەنی ئومەییە پاش بەیعەت هاتە لای و وتـی: ((ئەی ئەبـو حەسـەن... ئـێمە بەیعەتـت دەدەینـێ، بەو شـەرتەی چیمـان لە ڕۆژانی عوسمان بەردەکەوت، ئێسـتایش بەرمـان بکەوێتەوە)).

عەلی لە دەسـتپێکی خەلافەتەکەیدا گوتی: ((هەر پشـکێک کە عوسمان بڕیویەتییەوە، هەر ماڵێکی بە هەر کەس داوە لە خەزێنەی مسوڵمانان، هەمـووی دەگەڕێندرێتەوە بـۆ خەزێنەکە. هـیچ شـتێک ڕاسـتی پـووچ ناکـاتەوە، ئیـدی ئەو پـارەیەی دابێـت بە ژنهێنـان، یـان کەنیـزەی پـێ

[232] - ابن الحجر، الصواعق المحرقه، ص٧٩.

[233] - عباس العقاد، المصدر السابق، ص٥٠.

کرپبێت، یان شارەوشار چووبێت بۆ پیاسەکردن پێی، هەمووی دەگەڕێندرێتەوە، ئەوەی ڕاستی لەسەر دڵ بەلاوە گران بێت، ئەوا سزای لەسەر توندتر دەبێت...)).[٢٣٤] کەسێک بەتەمای سوودوەرگرتن لە خەڵکی و فەرمانڕەوایی بێت، کاری لەم جۆرە ناکات، ئەمانە کاری کەسێکن کە دەیەوێت خۆی بمرێت تا نموونەکەی ئەوە لەدوای ئەوە چاوی لێ بکرێت و شوێنپێی هەڵگیرێت.

ئەوەی بیەوێت سەرکەوتووبێت لەم دنیایەدا، دەبێت مودارای ئاغا و سەرۆک و قەڵەمبەدەست و زماندرێژان بکات. ڕەشەخەڵک هەرچەند بێت هەر ڕادەبوورن، ئەمان ناتوانن زمانپاراوی بە خەرج بدەن و داوای مافی خۆیان بکەن، وەک ئەوەی شاعیرێکی بڕشت قەڵەم دەتوانێت بیخوڵقێنێت. کەسێک کە بتوانێت بە تەنگی ئەم کەسەوە بێت ئەوە دەسەڵاتدار و ئاغاکانن، بۆیە دڵیان دەبێت ڕاگیر بکرێت. خۆ ئەگەر وێژە عەرەبیمان خوێندەوە، دەبینین تا بینەقاقای شیعرە بەسەر کەسانی بێڕێز و خوێنڕێژ و ستەمکاردا. ئەمەیش بەهۆی ئەوەوەیە کە دەسەڵاتدارەکان پشکی هەرە گەورەی دەسکەوتەکانیان بەسەر دەمڕووت و کەسانی مەترسیداردا دابەش دەکرد. ئیدی هەژار و بێدەست و زمانان، نە زیان نە سوودیان بۆ کەس نییە، بۆخۆی دنیایش و ئاخیرەتیشیان سفر و هیچ بە دەستەوە.

* * *

عەلی، گوێی بە خانەدان و شاعیران نەدەدا. خەمی سەرەکی ئەو ڕەشەخەڵک بوو، ئاگاداریی لێ دەکردن، دڵی ڕاگیر دەکردن. جارێکیان

[٢٣٤]- - سید قطب، العداله الاجتماعیه فی الاسلام، ص١٩٦.

پەیغامێکی بۆ یەکێک لە والییەکانی نووسی: ((باش بزانە: کۆڵەکەی ئاین، دەسکەلای بەگژداداانی دووژمن و زۆرینەی موسوڵمانان هەر ئەم ڕەشەخەڵکەن، با دڵت بە لایانەوە بێت...)). لە ڕواڵەتیشدا عەلی لەم سیاسەتەدا شکستی هێنا، کاتێک سەرکردەکانی لێ تەرەبوون، بە دوایاندا ڕەشەخەڵکیش تەکینەوە. عەوام چوزانن چی فێڵ و تەڵەکەیەک لە ژووورە تاریکەکاندا دەگوزەرێت. ئەوان گوێ لە مشتی گەورە و ساداتی خۆیانن و یەکیان ناکەن بە دوو. ئەمەبوو عەلی لەناو خەڵکیدا هاواری دەکرد و کەس گوێی بۆ شل نەدەکرد، تا وای لێهات ڕۆژێکیان وتی: ((من ئێوەم لەبەر خودا دەوێت و ئێوەیش منتان لەبەر خۆتان)).

عەلی لە دوا دواییەکانی تەمەنیدا وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: ((ئەوە بەلای ئێوەوە سەیر نییە کە مەعاویە خراپەکار و ستەمکارەکان بانگ دەکات بەبێ بەخشش و پاڵپشتی و ئەوانیش بەبێ سێودوو شوێنی دەکەون، ساڵی دوو یان سێ جار دەچنە سەردانی. کەچی ئێوەی پاشماوەی خەڵکی و خاوەن فام، لەسەر بەخشش بەردەبنە یەکتری لە پێش چاوی خۆمدا))[٢٣٥]. لەم کارە، عەلی سەری دەسوورمێت، کە ڕاستتر ئەوەیە سەری نەسوورمێت، چونکە ئەمە سروشتی بنیادەمە لە زۆربەی کاتەکاندا.

مەعاویە سەرکردەکانی کردە پەروانەی خۆی و ڕەشەخەڵکەکەیش بە دوویاندا هوتافیان دەکێشا بەبێ ئەوەی بزانن چی باسە. عەلی ڕەشەخەڵکی لە خۆی ڕازی کرد، بەڵام قەدریان نەزانی تا مرد، کە مرد ئەوسا زانییان چییان لەکیس چووە. دەڵێن: جارێکیان مەعاویە بە هەر سەرکردەیە و ١٠٠ هەزار درهەمی بەخشی تەنها یەک دانەیان نەبێت، ٧٠ هەزاری بەو بەخشی، دانەکە هاتە گۆ و وتی: بۆچی لەنێو

---

[٢٣٥] - أنيس النصولي، معاويه بن ابى سفيان، ص ٦١.

هەمواندا تەنها من کەمتر وەردەگرم؟ مەعاویەش گوتی: "من ئاینم لەوان کڕییەوە و تۆم کردە وەکیلی ئاینەکەی خۆت، کابرایش نە هێنای و نە بردی، وتی ئاینەکە لە منیش بکڕەرەوە، ئیدی مەعاویە هاوشانی ئەوانی کردەوە و ئاینی لە هەموان ئاستاندەوە، وەلعیازو بیللا.

***

سەیروسەمەرەیی دنیا ئەوەیە شاعیرێکی گاور "ئەزحەل" دەبینین دێت و پەسنی مەعاویە دەکات و دەڵێت:

وصدت لنا دين النبي محمد

بحلمك إذ هرت سفاها كلابها

بە نەرمونیانی خۆت، خۆت ئاینی موحەمەدت چەسپاندووە.

پیرانم دەباتەوە لەم شیعرە سەیروسەمەرەیەی شاعیرێکی مەسیحی باس لەوە دەکات چۆن مەعاویە ئاینی موحەمەدی چەسپاندووە. من هیچ گومانێکم لەوە نییە لە پاداشتی ئەم شیعرەدا سامانێکی باشی پێ دراوە. ئەو چی باکێتی کام ئاین سەردەکەوێت؟ هیی موحەمەد یان عیسا، خوا پارە نەبڕێت. خەڵکی کاتێک گوێ بۆ ئەم بەیتانە ڕادەدێرن، سەریان لە پاراوییەکەی سوورڕ دەمێنێت. ئەوان چوزانن ئەم شیعرە بۆ چی مەرامێک وتراوە.

***

لە پارادۆکسەکانی ئیسلام، پەروەردەکردنی دوو کەسایەتی تا سەر ئێسقان جیاوازە. یەکێکیان دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتێکی مەزن و ئەویشیان بنیاتنەری شۆڕشێکی نەبڕاوە. لە پاش ئەمانیش مێژووی ئیسلام بوویە مێژووی ململانێی پادشا و شۆڕشگێڕ. یەکێک بنیات دەنێت و ئەوی دی تێکی دەڕمێنێت، خودا دەزانێت ئەم زنجیرەیە تاکەی درێژەی دەبێت.

بەیداغە شۆڕش کەوتە دەستی حوسەینی کوڕی عەلی، لە پاش مەرگی بابی. ئەمەیش بووە ڕێگای ئەو کەسەی دەیویست بمرێت، هەروەک چۆن باوکیشی لەم ڕێگەیەدا گیانی سپاردبوو. دەگێڕنەوە کە نوێنەری حوسەین لە کوفە -موسلیمی کوڕی عەقیل- ڕۆژێکیان دووبەدوو دەکەون لەماڵێکدا لەگەڵ عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاددا، هەر ئەو دەمە دەیتوانی لە جێگای خۆیدا ئیبن زیاد خەفە بکات و حوسەینیش لە کارەساتە شوومەکە ڕزگار بکات، بەڵام ئەنجامی نەدا. کابرایەک لێی پرسی بۆچی ئەو کارەت تەواو نەکرد؟ وەڵام ئەمەبوو: ((ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ڕێگری لێ کردم کە فەرمووبووی: "مسوڵمان بارمتەی ئیمانەکەیەتی، بۆیە کەس ناکوژێت...))، کابرایش بە بێئومێدییەکەوە پێی گوت: "ئاخ ئەگەر لە جێگای خۆیدا ساردت دەکردەوە، ئەوکات هێندە دەسەڵاتت بەدەست دەبوو، کەس نەیدەتوانی پێت بڵێت سەری چاوت برۆیە... پاشانیش تۆ ئەوت وەک ستەمکارێکی تاوانبار دەکوشت))، وەک ئەوەی ئەمانە لە قوڕی شەهیدی دروست کرابن، ئەمان لە شۆڕشەکانیاندا ڕێگای سەرکەوتنیان نەدەگرتە بەر، خۆیان خۆیانیان دەخستە نارەحەتییەوە، لە چارەی هەر ڕێگەیەک کە دەیانپێوا، هەر فەشەل نووسرابوو، تەنها ڕێگەی شەهیدبوون نەبێت.

***

حوسەین ملی ڕێی کوفەی گرت، هەرچەند دەست بە دامانی بوون کە مەردی خوابێت و نەچێت بۆ ئەوێ، بەڵام ئەم بە گوێی کەسی نەدەکرد. هەر یەک لە ئیبن عەباس، ئیبن جەعفەر، ئیبن حەنیفە و ئیبن عومەر هاتن بۆ لای و کۆڵێکیان تکا و ڕجا لێ کرد، نەسیحەتیان کرد کە نەڕوات، بەڵام سوودی پووشێکی نەبوو. دەڵێن: ئیبن عومەر پێی وتووە:[٢٣٦] ((لە خودا بترسە و ڕیزی مسوڵمانان مەشێوێنە))، حوسەینیش وتویەتی: ((ئەی ئیبن عومەر، ئەگەر بابت زیندووبا، پشتی دەگرتم)). فەرەزدەقی شاعیریش لە ڕێگەی کوفەدا سوتفەی دەکات و پێی دەڵێت: ((ئەی کوڕی پێغەمبەری خودا... خەڵکی کوفە دڵیان لەگەڵتە و شمشێریان لە دژت)). بەڵام حوسەین لە بڕیارەکەی پاشگەز نەبووەوە و هەر خەریکی تەیکردنی ڕێگای مردن بوو.

لە ڕواڵەتدا ئەم کارەی حوسەین ئینتیحارە، ئەو وەک مانگی چواردە لێی ڕوون بوو کە بەنی ئومەییە لەو بەهێزوپێزترن، بەهۆی ئەم دەرچوونەوە لە گەردەنی دەدەن. بەڵام ئەو هەر بەو ڕێگایەدا ڕۆیشت. لەوانەیە ویستبێتی بکوژرێت تا خوێنەکەی دەستی بەنی ئومەییە سوور بکات، ڕەنگی خوێنی هەر لە دەستیان نەبێتەوە، بەم شێوەیە بەسەریاندا سەرکەوێت. ڕۆژهەڵاتناسیی ئەڵمانی "ماربین" بڕوای وایە، ئامانجی حوسەین لەم دەرچوونە، سەرکەوتنی دوورمەودا بووە، ئەوەی لە پاش مەرگ دەست دەخرێت. حوسەین دەیزانی سەرکەوتنی بەپەلە گرانە، بۆیە بە گیانی خۆی سەرکەوتنی

---

[٢٣٦] - ابن العربي، العواصم من القواصم، ص ٢٣١.

پاش مەرگی وەدەست خست. هەرچۆنێک بێت، دیار نییە تا چەندە ئەم دیدگایە ڕاستە.

حاڵوبـاڵ هەرچۆنێـک بێـت، بە کوشـتنی حوسـەین، لە نـاوچەی ڕۆژهەڵاتـدا، ئـاو لە ئاشـی ئەمەوییـان بـرا. حوسـەین لەبەر دیـدەی خەڵکـی، ئـاوێنەی پێغەمـبەر بـوو، خۆشەویسـت بـوو لەبەر دڵان، بە یەکێک لە پایەکانی ئیمانی ناو دڵیان دەزانی. ئەو کاتەیشی کە کوژرا، هەواڵی مەرگیشی دەماودەم و بە زیادەڕەوییەوە دەگێڕدرایەوە، وەک چەکێکی مەعنەوی دژی دەسەڵاتدارە ستەمکارەکانیان دەیانگێڕایەوە.

*** ** ***

قـازی ئەندەلووسـی، ئەبـوبەکری ئیبنـول عەرەبـی دەڵێـت: ((ئەو بە شـەرعی بـاپیرەی کـوژرا)). ئەو ڕەخنەیەکـی بنجـی لە شۆڕشـەکەی حوسـەین دەگرێـت و دەڵێـت: ((ئەگەر دەربـارەی حوسـەین فـراوان دەبوو، لە دەرێیش چەندین ڕانە وشتری دەبوو، ئەو کاتە خەڵکیش تکای ئەو کارەیان لێ کردبا، هەر ئاوڕیشی لێ نەدەدانەوە...)). ئیبن خەلـدونیش کەمێک ئەم ڕایەی پەسـەندە و دەڵێت: ((حوسـەین هەڵەی کرد لە دەرچوونەکەیدا دژی دەسەڵاتی یەزید، کە دەسەڵاتەکەی پشت ئەستوور بە دەمارگیریی قورەیشییانە)).

ئیـبن خەلـدون هەمـوو ئەو شۆڕشـگێڕانەی کە لە شۆڕشـەکەیاندا سەرناکەون بە شێت یان دردۆنگ لە قەڵەم دەدات[227]، لەبەر ئەوەی لە بەرانـبەر دەوڵەتێکـی بەهێـزەوە ڕاپەڕیـون بەبـێ ئەوەی پشـتیوانێکی جەماوەرییان هەبێت. "ئەوان تەنها بە پرنسیپە ڕاستەکانیان وا دەزانن سـەردەکەون و بەسـن بـۆ سـەرکەوتن. بە کارەکەیـان نـازانن خۆیـان

[227] - ابن خلدون، المصدر السابق، ص٢١٦ – ٢١٧.

تووشــی چ دەردەســەرییەک کــردووە و بە زووتــرین کــات ســارد دەکرێنەوە و دوا دانەیان دەکوژرێت و شتێکیان لە کارەکەیان دەست ناکەوێت، ئـاو بێنە و دەسـت بشـۆ". ئەم دیـدگایەی ئیـبن خەلـدون پەسەندە. بیانووەکەیشی ڕوونە و پێویستی بە بەڵگەبۆپەیداکردن نییە، هەرچەنـدەیش کەمێک ڕۆچـوونی واقیعـی تێدایە کە خـاوەن "مەسـەلە عولیاکـان" پێیـان قەبـووڵ نیـیە. ئەوان شۆڕشـی خۆیـان هەر بەرپـا دەکەن، ئەگەر شمشێر لەسەر گەردنیان دانرابێت. بێگومـان ئەم کەسـە میسالییانە لە مێژوودا دانسقەن، بەڵام هەر هەیشن. ئەوان سـەرباری کەمـی ژمارەیـان، کارانێـک دەخـوڵقێنن، کە زۆربەی خەڵـک نـاتوانن بیخوڵقێنن.

ئەوە شتێکی ئاشکرایە، سوڵتانەکان هێزێکی داپڵۆسێنەریان بە دەستە، ئەوان شەقوەشێن و قامچی بە دەست دەوری داون، ئیدی شۆڕشگێڕ هەرچەندی بەهێزیش بێت، ناتوانێت دەرەقەتی ئەو هەموو جەلـلاد و خـوێنمژانە بێـت. ئەگەر پـاکی خەڵکـی شـوێن ئەم دیـدگایەی ئیـبن خەلدون کەوتبـا، ئەوا یەک "عەبابەشـەر" نەیدەتوانی شـۆڕش ئەنجـام بـدات، تەنـانەت نەیـدەتوانی ڕەخـنە ئاراسـتەی سـوڵتانیش بکـات، تاغوتەکانیش بۆ خۆیان گەز و پێوانەی دنیایان دەکرد.

ئاوێنەی بیروڕاکانی ئیبن خەلدون لەم ساڵانەی دواییدا، شێخ "محەمەد ئەلـخەزەری"، دانەری کتێبـی "تـاریخ الامـم الاسـلامیە"، کە هەمـوو شۆڕشەکانی ناو مێژووی ئیسلام بە چاوێکی جۆرێک تەماشا دەکات، بە دەرچوونیان لە دەوڵەت ناوزەد دەکات بەهۆی نەبوونی پاڵپشتێکی جەماوەریی ڕاستەقینە. مامۆستا عەباس عەقادیش خەزەری و هەموو هاومەشرەبەکانی بە بازرگانێک دەچوێنێت کە چۆن قازانج و سوودی شتێک لێک دەدەنەوە. بازرگان ژمارەکان دابەش و لێکدان دەکات لە دەفتەری حساباتدا، تا بۆی دەرکەوێت چی سوود کردووە و چیش

زیـان. خەزەریـش دەیەوێـت شۆڕشـگێڕ هەسـتێت، دابەش و لێکـدانی هێزی خۆی و هێزی بەرانبەر لە یەک بدات و بزانێت چی لێ دێت و دەبێت بە چی.

عەقاد دەڵێت: بێگومان ڕێگا و سوودی شـەهیدبوون وەک هیی زەڕب و تەقسـیمی دەفـتەری بازرگانێـک نیـیە. بانگەوازکـارانی ڕێـگەی شـەهیدی، ژیـانی خۆیـان و کەسـوکاریان دەفەوتێـنن، بەڵام بانگەوازەکەیـان لە پاش خۆیـان دەنـگ دەداتەوە. تەنـانەت ئەوان یەک شتی ڕواڵەتی و بەرژەوەندی زەمینی بۆ خۆیان هەڵناگرن. خـاوەن بەرژەوەندییە زەمینییەکان –بە بڕوای عەقاد- لە سەرەتادا وەک براوە دەردەکەون، بەڵام دواتـر دۆڕاو خۆیـانن و لە بەردەم بـانگەوازە شـەهیدییەکەدا ژیانی خۆیان و کەسوکاریشیان دەدۆڕێنن، ئیدی بە هەمـوو پێوەرێـک هەر بە دۆڕاو هەژمـار دەکـرێن، لە کۆتایشـدا مێژوونـووس هەر باشـە و فەزڵـی شـەهیدەکە دەدات بەسـەر بازرگانەکەدا –لە کۆتاییدا ژیاننامەی بازرگانەکەیش هەر لە لاپەڕەی شەهیدەکەدا دەخوێنرێتەوە[٢٣٨].-

عەقاد دەڵێت: ((حوسەین لە کەربەلادا شکستی خوارد، هەم خۆیشی و هەم کەسوکارەکەیشی، بەڵام بانگەوازێکی بەجێهێشت کە بوویە هۆی دامەزراندنی دەسـەڵاتی عەباسی و فاتیمی، دواتریش ئەیوبییەکان و عوسمانییەکانیان درێژەیان پێ دا. سێبەری بۆ پادشا و ئەمیرەکانی عەرەب و فـارس و هینـد درووسـکرد، بـووە نوورێـک لە نێـوچەوانی خەڵکیدا. شـانازییەکی بەرهەم هێنا، وەچەی مـرۆ شـانازی وایـان بە خۆیـانەوە نەبینـی بـوو. لە مێـژوودا خـانەوادە نیـیە هێنـدەی ئەوەی حوسـەین شـەهیددار بێـت، هێنـدەی ئەوەی حوسـەین نـاوی لە

[٢٣٨]- - عباس العقاد، المصدر السابق، ص٢٢٩.

ناواندابێت، ئەوە بەسە بۆ ئەو کە سەدان سەدان ساڵە" شەهیدی کوڕی شەهیدە)).

ئەگەر هەموو خەڵکی شوێن تیرییەکەی ئیبن خەلدون و خەزەری کەوتبان، ئەوا مێژوو ڕادەوێستا، ئەمڕۆ شتێکمان نەدەبینی بە نێوی دیموکراسی. ئەم دیموکراسییە لەسەر شان و خوێنی شەهیدان بنیات نراوە، ئەوان بە دەستی خۆیان خۆیانیان خستە گۆبەنگەوە. شۆڕشگێڕ ڕادەپەڕێت و دەمرێت... بە مردنی خۆی شۆڕشگێڕانی دیکە ڕادەپەڕێنێت... بەم شێوەیە قەتاری شۆڕش هەر بەردەوامە، نەوە لە دوای نەوە، ئەوان هەر جارە و شەوقێکی زیاتر دەبەخشنە جیهان.

سەیر نییە کەسێکی سەدەکانی ناوەند تانە لە شۆڕش بدات، هێندەی ئەوەی کەسێکی ئەم سەردەمە هەستێت و تانەبارانی شۆڕش بکات.

# بەشی یانزەهەم

## مەسەلەی شیعە و سوننە

ئەم مەسەلەیە تا ئەوپەڕی سنووری خۆی پڕ ئاریشـەیە، بە تایبەت لە عێراقـدا، ئەو وڵاتەی نـاونراوە بە "وڵاتـی شەقوەشـێنەکان". ئەم وڵاتە هەر لە سەرەتایشـەوە لانکەی ئەم بـابەتە بووە، بەڵام هێشـتایش بەم دەردەوە کەوناراییەوە دەناڵێنێت. باوەڕ نـاکەم هیچ وڵاتێکی ئیسـلامی بە هیچ مەسەلەیەکەوە هێندەی عێراق بەم مەسەلەیەوە سەرقاڵ بێت.

ئەوەیش بڵێم: من ئەم لاپەڕانە بۆ جیلی پێشوو نانووسم. ئەوان هیچی لـێ تێنـاگەن، چـونکە هەر لایەک، وادەزانێـت ڕاسـتی لای خـۆیەتی و ئەوەی کە لای بەرانـبەرەکەی هەیە، درۆ و ناڕاسـت نەبێـت، هـیچ شـتێکی دیـکە نیـیە. ئەمـان ئەم بیـروڕا یەقینییەیـان لە باوانیـانەوە بـۆ مـاوەتەوە. ئەوان هـیچ شـتێک تێنـاگەن جگە لەو شـتانەی لە بـاوک و دایکیانەوە لە تقوس و نەریتەکان فێری بوون. وێنەی ئەم گەلە، وێنەی ئەو کۆمەڵگە دۆگمایانەیە کە دەڵێن: [ئێمە بـاوانی خۆمانمـان لەسـەر ئەم کارە دیتووە، بۆیە ئێمەیش لەسەر جێپێی ئەوان هەنگاو دەنێین - إنا وجدنا ابائنا علی لک وإنا علی اثارهم مقتدون.

من ئەم دێڕانە بۆ هـیچ کەسێک نانووسـم، بێجگە لە نەوەی نـوێ، ئەو

ئەوەیەی کە هەستی بەوە کردووە، ئەم نەریتە کۆنانە مایەی سستی و سەرچاوەی نەگبەتییەکانن. زۆرێکم لەم نەوە نوێیە بینیوە، هۆشیار و بەئاگابوون، هەستیان بەم ململانێ تایفییە کردووە، کە چەندە بێمێشکی و ڕسوایی تێدایە، تەنانەت بێزیان لە خۆیان دێتەوە. لەملاوە کۆمەڵگا تا بینەقاقای لە گرفتدا چەقیوە، کەچی هاتوون و خۆیان مەشغوڵی چەقەچەقێکی نەزۆک کردووە.

لۆجیکی کۆمەڵایەتی گاڵتەی بەم جۆرە چەقەچەقانە دێت و بە بێژەرەکانی پێدەکەنێت و بە جەدەلێکی خێڵەکی گوزارشتی لێ دەکات، نەک موناقەشەیەکی بنچینەیی و مەبدەئی. لۆجیکی کۆن دابەشکاری لە نێوان حەق و باتڵدا وەک دوو جەمسەری پێچەوانە دەکات، بۆیە ئەگەر شتێک حەق بوایە، ئەوا بێگومان دەبوایە بەرانبەرەکەی باتیڵ بێت، ئەمەیش ناو دەبرێت بە "دوانەیی پۆلێنکردن -التصنیف الثنائی".
بەڵام لۆجیکی نوێ بە هیچ کلۆجێک ئەم دابەشکارییەی پەسەند نییە.

لە دیدگای لۆجیکی نوێوە: ڕاستی و پووچی دوو دەستەواژەی گوزارەیی -إعتباری-ن. موناقەشەیش لەسەریان لە بنەمادا، زیاتر لەسەر پێوەرەکان دەکرێت وەک ئەوەی لەسەر ڕاستییەکان بکرێت. لۆجیکی نوێ هەموو بیرۆکەکانی ئاوەژوو کردەوە. ئەوەیش جێی داغە هەندێک لە ڕۆشنبیرەکان دەبینین هێشتایش بە هەوای لۆجیکی کۆن شەن دەکەن.

***

لە ئەفسانەکاندا هاتووە، قەلەڕەشێک هاوڕێیەکی وەک خۆی دەبینێت. هەر کە هاوڕێکەی بینی بەو دەموچاوە ڕەشەوە، زۆر نیگەران و

سەرسام بوو، پێی وت مالمیرات ئەوە بۆ ئەوەندە ڕەش و دزێویت؟ ئەم قەلەڕەشە ئەگەر ڕۆیشتبا و تەماشایەکی ئاوێنەی کردبا، خۆیشی بە هەمان شێوە دەبینییەوە، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە: قەلەڕەش ئاوێنە بەکار ناهێنن. ئەمەیش گرفتی سەرەکی بنیادەمە. هەر تاقمە و عەیبوعاری ئەوی تری لەبەر چاوە، لە کاتێکدا بیری نییە کە خۆیشی بەدەست هەمان دەردەوە هەموو شەوێک ڕۆژ دەکاتەوە.

لە یەکێک لە کتێبەکانی خۆمدا گوتوومە: ((من بەم لێکۆڵینەوانە، نامەوێت بڕوا بە کەس بهێنم، مەگەر کەسێک خۆی بیەوێت، ئەوانەیشی نایانەوێت بڕوا بهێنن، هیچ دەسەلاتێکمان بەسەریاندا نییە)).[٢٣٩] ئەوەی کە لەوێدا وتوومە بۆ ئێرەیش دەگونجێت، بۆیە دووبارەم کردەوە. ئەوەی لە ژینگەیەکی دیاریکراودا گەورە دەبێت و دابونەریتەکەیشی لە ناخیدا دەچەسپێت، ئەستەمە دواتر شتێکی نوێ بخاتە شوێنی ئەوەی سالانێکە فێری بووە و بۆتە گوارەی گوێی. مرۆ خۆی بە بوونەوەرێکی ئازاد لە بیرکردنەوەدا دەزانێت لە کاتێکدا: ئەو پێوەرە فیکرییە تایبەتانەی لە کۆمەڵگەکەیدا چۆنەتە ناو عەقڵی باتینییەوە، ئەو عەقڵەیش هێزی ئاڕاستەکەرە، کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاراستەی دەکات لە ئیش و کارەکانیدا و ئەم خۆی بە خۆی نازانێت و تەنها خۆی بە ئازاد دەبینێت، لە کاتێکدا ئەمیش وەک ئەو عالەمە لە کۆتوبەندداییە. کێشەکە لەوەدایە، ئەو کۆت و بەندەکانی خەڵکی دەبینێت و ئەوانەی خۆی نابینێت، ئەو بە کەسانی بەرانبەری دەڵێت: ئەوە بۆ ئاوەها دەموچاوت ڕەش بووە، لە کاتێکدا ڕووخساری خۆیشی هیچ لەوان سپیتر نییە.

***

[٢٣٩]- - علی الوردی: خوارق اللاشعور، ج١، ص٨.

شتێک زۆرم بێزار دەكات، ئەویش هێندێک لە پیاوانی ئاینی، لە كاتی وتـاردا بە ئاشـكرا بە خەڵكـی دەڵـێن: ئـێمە بە شـوێن "حەقیقەتـی رەهـا"وەین. بەڵام ئەگەر راسـتیت دەوێـت، ئەوان بە شـوێن ئەو راستییەوەن كە حەزیان لێیەتی. مرۆ هیچێک لە راستی هەڵناكرێنێت، مەگەر بەو شـێوەیەی كە گونجـاوە لەگەڵ خۆشـی و بەرژەوەنـدی و گرێ دەروونییەكانیـدا، ئیدی هەرچی دیوی دیكەی هەیە، هەمـووی دەگۆڕێتەوە بە پـارووپەكی نـان و تەمـاتە، پاساویشـی بـۆ ئەم كـارە ئەوەیە: هەمـوو ئەو دیـوانەی تـر درۆ و بیروبـاوەری كـافران و زندیقانن، دەیانەوێت رۆڵەكانمان تووش بكەن. هەی نەفرەتی خودا.

هـیچ كەسـێک ناتوانێـت لە راسـتی رەهـا نزیـک بێـتەوە، مەگەر ئەو "گومـانكەر"ەی تەماشـای هەر ئایـدیایەک بە چـاوێكی بێلایەنـانەوە دەكـات. گومـانە رێچـكە و رێبـاز بـۆ لێكـۆڵینەوە زانسـتییەكان. بـۆیە زانایـانی نـوێ، هەرگیـز نـاتوانن زانایـانی پێشـین تێپەڕێنن، تەنهـا ئەو كاتە نەبێت كە بە چاوی بێلایەنی و گومانەوە تەماشا بكەن. ئیدی ئەو كەسـانەی بە چـاوی پیـرۆزییەوە تەماشـای كتێبەكـانی باوبـاپیرانی خۆیان دەكەن و دێن و دەڵێن: وەڵا ئێمە دەمانەوێت راستی رەهامـان دەسـت بكەوێـت، لە دیـدگای زانسـتی هـاوچەرخەوە، لە جێگـای دەستكەوتنی "راستی رەها"، شایەنی "تفی رەهان."

ئێمە لۆمەی پیاوانی ئاینی ناكەین لەسەر ئەو ئیمانەی كە دەستیان پێوەگرتووە، بەڵكوو لۆمەكارییەكە لەسـەر ئەو كارە منداڵانانەیانە كە لە لێكۆڵینەوەكاندا ئەنجامی دەدەن. "ئیمـان (مەبەسـت لە ئیمانی بەر لە ئەزمـوونە) و تـوێژینەوە" دوو جەمسـەری دژ بە یەكـن، ئیمانـدار ناتوانێت تـوێژەر بێـت، ئەوەیشـی بیهەوێت ئەم دوانە پـێكەوە تـێكەڵ بكات، ئەوا لە هەردوو نێچیر دەبێت.

***

پیاوانی ئاینی شیعە و سوننە، دانیشتوون و موناقەشە دەکەن، بەڵام چ جۆرە موناقەشەیەک؟ بە تەواوی دەتوانیت وێنای ژێر کوخێکی بیابان بێنیتە پێش چاوت. هەر تایەفە و تەنها عەیبوعاری ئەوی دی دەبینێت و خۆیشــی بێپەڵە، هەر گــرۆهە و دڵخۆشــە بەوەی لایەتــی. لەوانەیە خــوێنەر ســەری ســوور بمێنێت، کاتێــک زانــی هەردوو حیــزبەکە لە سەرەتادا هەر یەک حیزب بوون. ئەوەی کە کردنی بە دوو کەرتەوە، ئەوە ســوڵتان و واعیزەکــانی ســوڵتان بــوون. لە دەورانــی ئەمەویــدا، حیزبی ســوننە و حیزبی شــیعە، "حیزبــی شــۆڕش"یان پێک هێنــابوو. شــیعە لە دژی دەوڵەت بە شمشــێر و ســوننەیش بە فەرموودەکــانی پێغەمبەر خەریکی شۆڕش بوون. یەکێکیان بە شمشێر و ئەویتریشیان بە قەڵەم. پاشانیش ئەوەی شایەنی باسە، گوزارەی ((ئەهلی سوننە و جەماعە"لە مێژوودا نەبووە تا سەردەمی موتەوەکیل. ئەوان پێشتر بە "ئەهلــی حەدیــس" نــاودەبران، "حەدیــس و ســوننە"یش دوو واژەی لێکچوون لە چەند ڕوویەکەوە. ئەوەیشی مێژووی ئەهلی حەدیس لە ســەردەمی ئەمەوییەکانــدا بخــوێنێتەوە، بە جــوانی دەبینێت کە چەنــدە نەیاری ئەو دەسەڵاتە ستەمکارەی ئەمەوییان بوون.[240]

لە دەورانــی دوو ســاڵی ئەمەویــدا ئەهلی حەدیس، نزیکی دەســەڵات بــوونەوە، ئەویــش دوو ســاڵی فەرمــانڕەوایی عــومەری کــوڕی عەبدولعەزیز بوو. عومەر لە قووڵایی دڵیەوە ئەمەوی نەبوو، ئەو ڕاشیدی بوو، کاریگەری ژیاننامەی باپیرەی لەسەر بوو،[241] عومەری کوڕی خەتاب. جارێکیان پووری چووە سەردانی، تکای لێ کرد،

---

[240] - Welhausen. Arab Kingdom... p.٢٨٦ .

[241] - عومەری کوڕی خەتاب لە دیدێکەوە دەبێتە باپیرەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئەم ئەوەی کورەکەی عومەر و ئەو کچەیە کە وتی ئەگەر عومەر نامانبینێت، خودای عومەر دەمانبینێت.

ڕێـڕەوی بەنـی ئـومەییە بەرپـا بكـاتەوە، واز لە زینـدووكردنەوەی سوننەتی باپیرەی (كوڕی خەتاب) بهێنێت، بەلام ئەو گوێی بەم قسەیە نەدا. كاتێكیش پووری ڕۆیشتەوە لای بەنی ئومەییە، پێی وتن: ((ئێوە كە لە بنەماڵەی عومەری كوڕی خەتاب بۆ عەبدولعەزیزی كوڕتان دەهێنن، چاوەڕێی نەوەكەی نەچێتەوە سەر خۆی؟ دان بە خۆدا بگرن و پاداشتی كاری خۆتان وەرگرنەوە))[242].

ڕاستمان وتووە، ئەگەر بڵێین: ئەهلی حەدیس، هیچ كەمتر لە شیعە، دوژمنی ئەمەوییەكان نەبوون. ئەوان تەنها لە یەک شتدا لێیان جیاواز بوون، ئەویش ئەوەبوو: ئەوان ملیان دابووە ژێر باری نووسینەوەی فەرمـوودە، كە لەو سـەردەمەدا وەک چەكێک لە دژی ئەو دەسـتەڵاتە ستەمكارە دابڵۆسێنەرە بەكاریان دەهێنا، ئەوەیش نەریتێكی باو بوو لەو دەمەدا. بە شـێوەیەكی گشـتی، شـۆڕش پێویسـتی بە دوو جـۆر چەک هەیە، ئەوانـیش شمشـێر و پێنووسـن. هـیچ شۆڕشـێک بەبـێ قەڵەمی بەبڕشت یان زمانی پاراو، سـەركەوتنی بەدەست نەهێنـاوە. دەبێـتە هـۆی كـۆكردنەوەی خەڵكـی و بنەماكانیـان پـێ دەناسـێنێت. شمشێر بە تەنها كافی نییە بۆ هەڵایرسانی شۆڕشێكی بەبڵێسە. دەبێت بەها فكرییەكان لە مێشكدا گۆڕانكارییان بەسەردا بێت و سـەرەكان لە دۆگمـایی و سـەهۆڵبەندان قوتاریـان بێت بێت. شمشـێر لەم كـایەیەدا شكستی هێناوە.

عەلی كوڕی ئەبوتالیب ڕووحی شۆڕشی لەناو كۆمەڵگەی ئیسـلامیدا زینـدوو كـردەوە. لە پـاش مردنـی خۆیشـی دوو پـۆل لە خەڵكـی ئۆجاخیـان ڕۆشـن كـردەوە، یەكێكیـان تـایەفەی شـیعە و ئەویشـیان تـایەفەی ئەهلـی حەدیـس. ئەمـلا بە شمشـێر و ئەولایـش بە قەڵەم سەرگەرمی هەڵایساندنەوەی شـۆڕش بوون. ئەم دوو تـایەفەیەیش لە

[242]- - سید الاهل، الخلیفه الزاهد، ص١٠٣.

کۆتایدا توانییان هێز لە ئەژنۆی دەوڵەتی ئەمەویدا نەهێڵن. کاتێک شمشێر و قەڵەم یەک بگرن، هێزی بەرانبەر درەنگ یان زوو، دەستی دەسووێت و دەڕووخێت.

***

دەسەلاتی ئەمەوی زیاتر بە شمشێر بەرگرییان لە قەڵەمڕەوەکەیان دەکرد و لایەنی پێنووس و تێنووسیان فەرامۆش کردبوو. ئەمەیش یەکێک بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی لە پەلوپۆکەوتنی. ئەمەوییەکان مێشکێکی خێڵەکیی بەهێزیان هەبوو. هەر بۆیە لەسەر ڕێوڕەسمی خەڵکی سارا، کاروبارییان دادەمەزراند. ئەوان بڕوایان وابوو: ((حەق و ڕاستی بە لای شمشێرەوەیە)). بەلام ئەمان نەیاندەزانی چیان هەر لە بیاباندا نییە، شار تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

ئەمەوییەکان ئەهلی حەدیسیان پشتگوێ خست. گرنگییان دا بە شیعر وەک چۆن خەڵکی سارا -بیابان- گرنگی پێ دەدەن. بیریان چووبوو کە شاعیرانی شار جیاوازن لە شاعیرانی سارا. شاعیری هۆزێک، بەشێکی دانەبراوە لە هۆزەکەی، بەلام شاعیری شارنشین گوێی لێ نییە ئەمڕۆ بەسەر یەکێکیدا هەڵدا و سبەی بیداتە بەر نەفرین، ئەو بە تەنها نوقلانەی مەبەستە. ئەو بەو لایەدا شەن دەکات، کە بای دینار و درهەمی لێ دێت. هەر بۆیە کاتێک ئەمەوییەکان تێکومەکان چوون، لەگەڵیدا هەموو ستایشە شیعریی و پیاهەڵدانەکانیشیان ڕۆشت.

ئەهلی حەدیسیش هەموو سەرشۆڕی ئەمەوییەکان و سەربەرزی نەیارەکانیان تۆمار کرد. ئەم تۆمارکردنەیش نەوە لە دوای نەوە دەور دەکرێتەوە و خەڵک بڕوای پێ دەکەن. هەر شیعرێکیش لە پەسنی

ئەمەوییەکاندا نووسرابێت، دواتر خەڵک دەهاتن دەیانخوێندەوە وەک سەرچاوەی درۆودەلەسە، نەک ئەوەی باوەڕی پێ بکەن. ئەو هەموو پارە و پووڵەی بە نوقلانە درانە شاعیران هەموو بوونە "کا"ـی ناو قوڕاو. بەمەیش مێژووی ئیسلام لێوانلێو بوو لە زەمی ئەمەوی، بە شێوەیەک نە مێژوونووس، نە حەدیسگۆ، هیچیان دوولێوەیان لە وەسفیاندا نەدەکردەوە، مەگەر بە دەگمەن.

دواتر عەباسییەکان هاتن، ئەمان گرنگی زۆریان دا بە ئەهلی حەدیس، وەک بڵێیت هەستیان بەو مەترسییە کرد کە دووچاری ئەمەوییەکان بووبووەوە. بۆیە دەستیان کردە دەست ماچکردنیان، گوێگرتن لە وەعزەکانیان و ڕژاندنی سەروەت و سامان بە سەریاندا -بێگومان کەنیزەکیش-.

لە بەشی پێشوودا وتمان: عەباسییەکان هیچیان لە پێشینی ئەمەوی خۆیان کەمتر نەبوو لە ڕووی خۆشگوزەرانی و ڕابواردنەوە، یان لە ڕووی خوێنڕێژی و ستەمەوە. ئەوەی کە جیاوازییەک هەبووبێت، تەنها لە ڕواڵەتدا بووە. ئەوان ئەهلی حەدیسیان دەگرت و بەردبارانیان دەکرد، ئەمان ئەهلی حەدیسیان دەهێنا بۆ وەعز خوێندنەوە و گریان و فرمێسکڕژاندن. ئەوەی کە جێگەی ئاماژەیە، گەورە فەرمووودەوانان نەکەوتنە ئەم داوەوە و لەوە زیرەکتر بوون فریوێکی لەم جۆرە بخۆن. ئەوان هەر لەسەر شۆڕشگێڕییەکەی خۆیان بەردەوام بوون، فەزایلی عەلی و مەبدەئەکانی عەلییان بەناو مەردوومدا بڵاو دەکردەوە، ئەوەی کە خۆی و نەوەکانی لە پێناویدا شۆڕشیان ئەنجام دا.

ئەگەر بە سەربووردەی کەڵەپیاوەکانی ئاخیروئۆخری دەوڵەتی ئەمەوی و سەرتای دەوڵەتی عەباسیدا گەشتێک بکەین، دەبینین پاڵپشتی عەلی و بنەما شۆڕشگێڕییەکانی عەلی بوون بە شێوەیەکی

زۆر چڕوپڕ، سەرباری ئەو بارودۆخە نالەبارەی لە ئارادا بوو.

ئەبو حەنیفە کە ئیمامی گەورە ناسرابوو، هەوای عەلەویبوون لە کەللەی دابوو بە شێوەیەکی زۆر سەیر. زەمخشەری دەڵێت: ((ئەبو حەنیفە بە پەنهانی فتوای پاڵپشتی زەیدی کوڕی عەلی دەدا، ماڵ ئازووقەی بۆ گلێر دەکردەوە، تا لە دژی ئەو دز و قوڵبڕانەی بە ناوی خەلیفە و ئیمامەوە دەستیان خستبوویە بینەقاقای خەڵکەوە))[243]. ئیبن حەجەر دەڵێت: ((ئەبوحەنیفە بەڕەحمەت بێت، زۆری ڕێز لە ئالوبەیت دەگرت، بە پارە و بەخشین هەردەم دەستی پێیانەوە بوو، چی بە ئاشکرا، چی بە نهێنی. تەنانەت جاریکیان ١٢ هەزار درهەمی ناردبوو بۆ جەماعەتێکیان. لەملایشەوە هاوەڵەکانی خۆی بۆ هاریکاریکردنیان هان دەدا)).[244]

ئەو دەمەیشی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای حەسەنی لە دژی خەلیفە مەنسوور ڕاپەڕی، ئەبوحەنیفە بەیعەتی دابوویە. ئەو هەر لەسەر بەیعەتی خۆی مایەوە پاش کوژرانی محمدیش، چونکە ئەو بڕوای بە پشتگیری ئالوبەیت هەبوو. پاشان ئەبوحەنیفە نامەی بۆ ئیبراهیمی برای موحەمەد نووسی. تێیدا ئاماژەی بە هاتنی بۆ کوففە دابوو کە لێرە پشتیوانی شیعەی زۆر لێیە و دەتوانن مەنسوور سارد بکەنەوە. ئەوە بوو مەنسوور پەیی بە نامەکە برد و ئەبو حەنیفەی بانگ کردە لای خۆی و خوانێکی بۆ ڕازاندەوە و خواردنەوەیەکیشی پێ دا کە بووە هۆی مردنی.

---

[243] - الزمخشری، الکشاف، ج١ ص٦٤.

[244] - ابن الحجر، الصواعق المحرقه، ص١٠٨.

خەتیبی بەغدادیش ئەم هەواڵە پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێت: ((ئەبو حەنیفە فەتوانی دەرچوونی لەگەڵ ئیبراهیمدا دژی مەنسوور و ئەمەیش بوویە هۆی دەرمانخوارد کرانی))[٢٤٥].

ئەبوحەنیفە بە ئاشکرا دژی دەسەڵاتی مەنسوور خەڵکی دەناردە شۆڕشی عەلەوییەکانەوە، هاوەڵەکەی ڕفزی کوڕی هەزیل پێی وت: ((وەڵاهی تۆ کۆڵ نادەیت تا پەتی سێدارە لە گەردەنمان نەئاڵێنیت)). ئەبو حەنیفە بڕوای وابوو موحەمەدی حەسەنی بۆ جێنیشایەتی لە مەنسوور لە پێشترە.

***

ئەگەر بێینە سەر شافیعی، دەبینین زۆر لە پێشینی خۆی -ئەبو حەنیفە- زیاتر مەیلی بە لای تەشەیوع هەیە و زیاتریشی خۆش دەوێن. شیعرێکی لەم بارەیەوە هەیە کە دەڵێت:

قالوا ترفضت، قلت كلا

مالرفع ديني ولا إعتقادي

ولكن توليت غير الشك

خير إمام وخير هادي

إن كان حب الولي رفضا

فإنني أرفع العباد

وتیان بویتە ڕافیزە، وتم نەخێر

من بروا و باوەڕم لەگەڵیان نییە

[٢٤٥]- - الخطیب البغدادي، تاريخ بغداد، ج١٣ ص ٣٩٨.

بەڵام خۆشەویستیم بێگومان

بۆ باشترین ئیمام و هادییە

ئەگەر خۆشویستنی وەلی ڕەفزکردن بێت

بۆ ساغی ئیمانم، هەموو ڕەد دەکەمەوە

شـیعری زۆر لەم بـارەیەوە لە شـافیعی گێـڕدراونەتەوە، بەڵام کـوا بواری باسکردن هەیە لێرەدا.

***

پاشان مالیکی کوڕی ئەنەس (ئیمام مالیک) دێت، بە ئیمامی مەدینەی پێغەمبەری خودا ناسراوە، ئەو یەکێک بووە لە قوتابییەکانی ئیمامی عەلەوی، ئەبـو جەعـفەری صـادق[٢٤٦]. ئەو یـارمەتی مـحەمەد ئەلحەسـەنیی دا لە شۆڕشـەکەیدا دژی مەنسـوور، فتـوای دروسـتی بەیعەتی دەرکرد کە بدرێت بە موحەمەد، بۆیە مەنسوور لە بەندی هاوێشـت و بە قـامچی فەلاقەیەکـی باشـی کـرد. کاتێـک دێـنە سـەر ئیمـامی چـوارەم، ئەحـمەدی کـوڕی حەنـبەل، دەبینـین شـتێک هیچـی کەمتر نییە لە پێشینی خۆی، لە بارەی شیعەی عەلییەوە و باسکردنی فەزڵیـان. ئەوەی موسـنەدەکەی بخـوێنێتەوە، چەنـدان پەسـنی عەلـی تێـدایە. ئەو خـۆی دەڵێـت: ((هـیچ کەس لە هـاوەڵان، هێنـدەی عەلـی وەسف نەکراوە)).[٢٤٧]

***

[٢٤٦]- سعد محمد حسن، المهدیە فی الاسلام، ص٨٨.

[٢٤٧]- - ابن الحجر، المصدر السابق، ص٧٢.

هەرچۆنێکیان دەهێناو دەبرد، عەباسییان یەک شتی پیاوانی ئاینییان نەدەچووە بەردڵ، ئەویش خۆشەویستییەکەیان بوو بۆ ئالوبەیت و پشتگیری شۆڕشەکانیان. خۆ عەباسییەکان خۆیان لە شیعە بوون، ئەوە گومانی تێدا نییە، بەڵام تەشەیوعی ئەوان تایبەت بوو بە خۆیانەوە. ئەوان تەشەیوعیان بۆ ئالوبەیت دەویست، ئالوبەیتیش لای ئەوان بریتی بوو لە عەباس و نەوەکانی. عەباس لە دیدەی ئەواندا، لە عەلی و فاتیمە لە پێشتر بوو بۆ میراتگیری پێغەمبەر - ئاماژەمان بەو شتە دا-. جارێکیان محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای حەسەنی نامەیەکی بۆ مەنسوور نووسیبوو، لە نامەکەدا هاتبوو: ((ماف مافی ئێمەیە... ئێوە ئەم شتەتان بە بۆنەی لایەنگری و شیعەبوونی ئێمەوە دەسکەوتووە... باوکمان عەلی "وەسی"یە و "ئیمام"، ئیدی تا ئێمە زیندووبین، ئێوە لە کوێتان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە؟ تۆ زانیوتە کەس لە بنی هاشم وەک ئێمە بە فەزڵەوە نامرێت، کەسیش وەک ئێمە ناتوانێت شانازی بە پێشین و پاشینی خۆیەوە بکات)). مەنسووریش بەرسفێکی تولانی بۆ دەنووسێت. تێیدا هاتووە کە دەڵێت: ((کاروباری باپیرت -عەلی کوڕی ئەبوتالیب- درایە دەستی بابت -حەسەنی کوڕی عەلی- بەڵام حەسەن کاروبارەکەی بە مەعاویە فرۆشت بە زێڕوزیوێکی فراوان، ئینجا شیعەکەی خۆیی دایە دەستی ئەو ((ئەگەر شتێکتان هەبووبێت ئەوا خۆتان فرۆشتتان)). دیسانەوە مەنسوور دەڵێت: ((بەنی ئومەییە لێی کوشتن و سووتاندنی، چەپ و ڕاست بە پەلکی دارخورماوە هەڵی ئاژووتن، تا ئێمە هاتین و لە دژیان ڕاپەرین و بەیداغی ئێوەمان بەرزکردەوە و بووینە میراتگری شار و ولاتتان)).

دوای ئەوە مەنسوور دێتە سەر باسی "باپیرە عەباس"ی. تێیدا دەڵێت: ((تۆ زانیوتە کاتێک پێغەمبەر وەفاتی کرد، هیچ مامێکی لە بەنی عەبدولموتەلیب نەمابوویەوە تا ببێتە میراتگری بێجگە لە عەباس؟

ئیدی زۆرێک لە بەنی هاشم داوای خەلافەتیان کرد بەڵام نەیان درایە، تەنها کوڕەکەی عەباس نەبێت. لە عەباسدا چەند خاڵێک کۆبوونەتەوە: ئەو وەک باوکی دوایین پەیامبەرە، کوڕەکانی پێشەوای جێنشینانن، ئیدی ئەمان فەزڵی هەوەڵ و ئاخیریان بەدەست هێناوە)).

لە سەروبەندی ئەم نامە و نامەکارییانەدا، مەنسوور لە خۆراسان وتارێکی ئاگرینی پێشکەش کرد، تێیدا ڕەگوڕیشەی دوا دانەی عەلەوییەکانی تەڵکێشا، هەر لە عەلی گەورەوە دەستی پێکرد: ((هەر عەلی نەبوو لە ڕێزی مسوڵمانان دەرپەڕییە دەرەوە؟ -بە قسەی ئەو-ئەی هەر ئەو نەبوو قسەی پاش خۆی خست و پاشانیش بە "تەحکیم" ڕازی بوو؟ ئینجا حەسەنی کوڕی، مەعاویە ماڵ و سامانی خستە بەردەستی و ئەویش وەری گرت، مەعاویە فریوی دا و ئەویش فریوەکەی خوارد. دواتر دەستی دایە ژنهێنان و هەر شەوە ژنێکی دەهێنا و بەیانی سێبەردەی دەخستە مشتی. "حوسەین"یش لە لایەن خەڵکی کوفەوە فێڵی لێ کرا و سەرشۆڕیان کرد و دواتریش دایان بە داری گۆڵدا. زەیدی کوڕی عەلیش بە هەمان شێوە خەڵکی کوفە خەڵەتاندیانەوە، وتیان تۆ وەرە ئێمەیش لەگەڵت دێین، بەڵام نەهاتن و دایان بەدەستەوە.

لە پاش تانەدان لەوان، دەستی کردە وەسفوسەنای خەڵکی خۆراسان کە چۆن ڕەحمەتی خودا فریایان کەوت و بەنی عەباسی پێراگەیاندن، تا شەرەف و شکۆیان بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی، باتڵ و ستەمکارانی پێ لەناو بردن و کردنیە جێنشینی پێغەمبەرکەی. دیسانەوە دەست دەکاتەوە بە سەروگوێلاک شکاندنی عەلەوییەکان و دەڵێت: ((ئەوەتا ئێستایش باروذۆخ سەقامگیر بووە، عەدالەتی پەروەرێن بەرقەرار بووە، بەڵام ئەوان دوو چاوی سەریان هەیە و ئەم فەزڵ و بەخششەی خودا کە بە ئێمەی داوە لە بوونەجێنشینی پێغەمبەرەکەی،

لەتاو حەسوودی ستەمکاریی خۆیاندا نابینن.

ئەم جەدەلە وشـــکەی نێـــوان مەنســـوور و مـــحەمەد ئەلحەســـەنی، گوزارشتی لەبەریەکهەڵوەشانی بنەماڵەی هاشم بوو -ئالی عەلی و ئالی عەباس-. ئەوە بوو دواتر کار تەنها بە نامەگۆڕینەوەوە نەوەستا، بـــووە شمشـــێر لێکـــدان. ڕۆژ بە ڕۆژ بـــۆنی هەوای جەنـــگ بڵاوتـــر دەبـــووەوە. ئینجـــا مـــایەی نیگەرانـــی ئەوەیە، ئەم مقۆمقـــۆ خێـــزانییە بووبـــووە پـــایەی ئیمـــان و دەچـــووە چەقـــی بـــاوەڕی مەزهەبـــی ئەو خەڵکەوە. بۆیە لێکۆڵەر ناتوانێت لە بنجی تێکبەربوونی شـەڕی نێوان سوننە و شیعە تێبگات، تا ئەم هەوای مونافەسە خێزانییە تێنەپەڕێنێت، لە هۆکارە کۆمەڵایەتی و فکرییەکان بکۆڵێتەوە.

***

ئەم دوژمنـــایەتییە لە دەورانـــی ڕەشـــیددا گەیشـــتە لـــوتکە. ئەم پیـــاوە ڕقێکی ئەستوری لە عەلەوییەکان بوو، بەمەیش ناسرابوو تەنانەت بەر لەوەی بشبێتە خەلیفە. دەڵێن یەکێک لە شاعیرەکان هـات و لالایەوە لە بەرامیکەکان، تا کەمێکی نزیک بکەنەوە لە ڕەشید، سا بەڵکوو نـوقڵانە بەمـــیش بـــدات، وەک ئەوەی بە هاوپیشـــەکانی دەدات[٢٤٨]. ئەوانـــیش نەسیحەتیان کرد کە لە شیعرەکانیدا تانە لە عەلی و ئالی عەلی بدات - هەجوویان بکات-. ئیدی بەگوێی ئەوانی کرد، ئەوەیشـی کە دڵـی بۆی قرچەی دەهات دەستی کەوت.

دەڵێن مەئمون ویستبووی ئاشتەوایی بخاتەوە نێوان هەردوو بنەماڵە، دەیویست جێنشینایەتی ڕادەستی یەکێک لەوان بکـات - عەلـی کـوڕی

---

[٢٤٨]- جرجي زيدان، المصدر السابق، ج٤ ص١٥١ .

موسـای کـازم-. بەڵام عەباسـییەکان لە دژی بڕیـارەکەی ڕاپەڕیـن و ئیدی ئەویش ناچار دەیویست عەلی لەکۆڵ خۆ بکاتەوە. دەڵێن عەلی ژەهرخوارد کردووە و ئەجێندای ئاشتەواییەکەیش لە تەنیشت عەلیدا گـۆڕێکی بـۆ هەڵکەنـرا. لە ڕواڵەتـدا وا دەردەکەوێـت، سـەرباری خۆشەویسـتی مەئمـون بـۆ عەلەوییەکـان، بەڵام لە نـاوەوەی نـاو دەروونی خۆیدا هەر بڕوای بە لەبەری عەباس بەسەر عەلیدا هەبووە، چونکە عەلی کوڕی موسا موناقەشـەی لەگەڵ کردبوو، تێدا مەئمون گوتبووی: ((ئەگەر ئێوە دەڵێن ئەم شتە بۆ به نزیکایەتی فاتیمەیە لە پێغەمبەرەوە، کەواتە لە دوای فاتیمە بۆ حەسـەن و حوسـەینە تـا ئەم دوانە زینـدوو بـن، نەک عەلـی. ئەگەر نـا ئەوا عەلـی مـافی ئەو دوانەی خـواردووە کە هێشـتا ئەوان زیندوو بـوون و شـتێکی وەرگرتـووە کە مافی ئەو نەبووە)).[٢٤٩]

لە دەورانـی موتەوەکیلـدا ئیـدی کـار خەریـک بـوو لە کـار دەتـرازا. موتەوەکیل هەر زۆری ڕقـی لە عەلـی کـوڕی ئەبوتالیب دەبـوویەوە. دەڵـێن یەکێـک لە دۆسـتەکانی موتەوەکیـل بە نـاوی "عوبـادەی مـوخەننەس"، لە دیوەخـانی موتەوەکیلـدا سـەمای دەکـرد و شـتی لە ورگـی دەبەسـت و سـەرە کەچەڵەکەی لـێ بەرەڵا دەکـرد و ئەم نیوەبەیتەی هەر لە پەسا دەگوتەوە: "قد أقبل الاصلع البطين – خليفه المسلمين"، "وا هـات ورگنـی نـاو سەرتاسـان -خەلـیفەی مسـوڵمانان". مەبەستی لەمە عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو. ئیدی مـوتەوەکیلیش بەم دیمەنە، کەیفی ساز دەبوو، دەم نا دەمێکیش بادەی دەنۆشی.

موتەوەکیل فەرمـانی دەرکـرد بە ڕووخانـدنی گۆڕەکەی حوسـەین و هەرچـی مـاڵیش لە دەوروبەریـدان. سانسـۆری خسـتە سـەر زیـارەتکردنی. زمـانی "ئیـبن سکیت"ـی بـڕی بـوو، کە زمـانزانێکی

[٢٤٩]- محمد حسين الزين، الشيعة في التاريخ، ص١٩٣ .

بەناوبانگ بوو کاتێک بیستبووی وەسفی حەسەن و حوسەینی کردبوو . ئێمە ڕاستمان گوتووە ئەگەر بڵێین: ئەم بەربەرەکانێیەی ناو ئەم دوو خێزانە لای فەقیهەکان مایەی نیگەرانی بوو، هەرچەند ئەوان لە دڵدا لایەنگری عەلەوییەکان بوون. پاشانیش ئەو دانداکردنەی بەنی عەباس، بۆ لەخۆنزیککردنەوەی فەقیهەکان کارێکی دەم لە پووش بوو. پیاوانی ئاینی بە شێوەیەکی گشتی بەنی عەلییان فەزڵ دەدا بەسەر بەنی عەباسدا. ئینجا ئەو فەزڵدانەیشیان دەمارگیری تایفی و خێڵیەتی نەبوو، بەڵکوو لەبەر ئەوەبوو: دەیانبینی عەباسییەکان لەگەڵ ئەمەوییەکاندا، تەنها لە ڕواڵەت و شیعاردا جیاوازییان هەیە، ئەگینا مەعدەن هەر یەکێکە و کارخانەیش لە هەمان دەستوور. بەڵام عەلەوییەکان شۆڕشین سروشت، ئاگرین سیفەت بوون بەرانبەر ستەمکار، کە کەسی شۆڕشگێڕیش نزیکترە لە ڕۆحی ئیسلامەوە وەک کەسی سەر شۆڕ.

عەبدولڕەحمانی کوڕی زیاد دەڵێت: من دەرسم لای ئەبوجەعفەر دەخوێند -بەر لەوەی ببێتە خەلیفە- کاتێک بووە خەلیفە و پاش ماوەیەک بە شاندێک ڕۆیشتمە لای، لێی پرسیم: سوڵتانێتی من چۆنە لەچاو هی بەنی ئومەیە؟ وتم سوێند بە خوا ئەو ستەمەی لای ئەوان دینیم، لای تۆیشم بینییەوە. عەمری کوڕی عوبەیدوڵلایش هاتە لای مەنسور و پێی وت: ((هیچ شتێک بە پێی کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەر لەودیوی دەرگاکەتەوە -لەناو خەڵکیدا- بەڕێوە ناچێت)). مەنسوور گوتی: "باشە پێم بڵێ من چی بکەم؟ هانێ ئەوە ئەنگوستیلەم لە دەستی تۆبێت، خۆت و هاوەڵانت یاریدەم بدەن". عەمر وەڵامی دایەوە: "دەتەوێت عەیبدارمان بکەی بە دەستتێکەڵکردن

لەگەڵـت؟ لەبەر حەسـێرت هەزار شەقوەشـێن ڕاگیـراوە، شـتێک لەو ستەمە کەم بکەرەوە با بزانین کە ڕاست دەکەیت)) [250].

فەقیهێکـی دیـکە هـاتە لای مەنسـوور و گـوتی: ((خـودا تـۆی کـردۆتە چاوساغی مسوڵمانان و ماڵەکەیشیان، کەچی تۆ ئاگات لێیان نەماوە. لە نێوان خۆت و ئەواندا بەربەستێکت دروست کردووە کە دیوارەکەی لە قوڕ و خشتە و دەرگاکانیشی لە ئاسن. لوولەی تفەنگەکانت ڕووی لەوانە، دواییش خۆتت لێ دوور گرتوون، باجگرەکانت دەنێریتە سـەر خەڵـک و سـەرانەیان لـێ دەسـتێنێت، ئەوانیشـت پاسـەوانانیان بەهێـز کردووە تا کەس سێ و دوو لە قسەیاندا نەکات. فەرمانت داوە چەند کەسـێکی دیـاریکراو -فـڵان و فیسـار- نەبـێ کەس نەیـەتە دیـدارت، ناهێڵێت ستەمدیدە بێتە لات بۆ شکات، ناهێڵێت برسی بتبینێت، ناهێڵێت لێقەومـاو و بـێلانە و ئـانە چاویـان پێـت بکەوێـت و شـەکوای حـاڵی خۆیانت لا بکەن. هێندێک خەڵک بە تووە نان و پیواز دەخۆن، تۆ هەر ناویشـیان نازانیـت، ئەگەر سـتەملێکراوێک بیهەوێـت بێـتە شـارەکەت، ئەوان دەبنە بەربەست، ئەگەر کەسێک شکاتی خۆی بەو داردەستانەدا بنێـرێتە لات، ئەوا ئەوان هەر لە ڕێـگەدا لەبـاری دەبەن، بەر لەوەی پێتی بگەیەنن، خۆ ئەگەر توانی لە دەستی ئەوانە قوتـاری بێت و بە هەزار فەلاکەت خـۆیی گەیانـدە لات، چیرۆکـی خـۆی بـۆت گێـڕایەوە، ئەوا تـۆ بە جۆرێـک دەچیـت بە گژیـدا، تەمبـێ ببێـت بـۆ بـێجگە لە خۆیشـی، ئیتـر تـۆ پـێم بڵـێ: چـی لە ئیسـلام مـاوەتەوە؟)) [251]. وەک دەردەکەوێت لە سەرەتاوە پیاوانی ئاینی نەکەوتوونەتە داوی تقوس و ڕواڵەتکارییەکانی خەلیفە و سـوڵتانەوە. ئەوان مەبەسـتی سـەرەکییان عەدالەت بـووە، نەک خۆشەویسـتی و شـتی ڕووکەش و ئەم جـۆرە توورەهاتانە.

---

[250]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[251]- المصدر السابق، ج٢، ص٤٠ .

***

ڕەشید لە یەكێک لە فرسەتەكانی قەدەردا، توانی ئەبو یوسفی ڕەفیقی ئەبو حەنیفە بەلای خۆیدا ڕاكێشێت. كردبوویە قازی بەغدا. قازی بەغدادیش لەو دەورانەدا هاوشانی 'وەزیری داد'ی ئێستا بوو. ئیدی تێكەڵاوكردنی ئاین و سیاسەت كەوتە ئەستۆی ئەم پیاوە. خۆی پیاوێكی تا بڵێیت دانا و زیرەک بوو، لە هەرە گەورەترین زاناكانی دەورانی خۆی بوو. نییەتپاک بوو. ئێمە هیچ دردۆنگ نین كە لە نییەتپاكی خۆیەوە ئەم وەزیفەیەی وەرگرت. لە بنەڕەتیشدا دادگا سوودێكی باشی بینی بە هاتنە ناوی ئەم پیاوە، ئەم و ڕەشید پێكەوە كارێكیان كرد، لە مێژووی ئیسلامدا پێشینەی نەبووە. كاری دادگا و دادوەری پیشەیەكی بێزراوی كۆمەڵایەتی بوو، لای فەقیهەكانیش كارێكی مەكروە بوو، خەڵكی بە چاوێكی پەست تەماشایان دەكرد، بەڵام هەر كە ئەبو یوسف بویە قازی قوزات، ئیدی لە پێش چاوی خەڵكیش دیمەن گۆڕا، دادگا بووە جێگەی هەڵپەی خەڵكی.

ئەم كارە، گرنگییەكی كۆمەڵایەتی زۆری هەبوو، دەوڵەت پێی سەركەوت و ئاینیش دۆڕا. سەردەمی هاریكاری دەستی پێ كرد كە هێشتایش مسوڵمانان هەر بە دەست ئەم دەردەوە دەناڵێنن. زۆرێک لە فەرموودەوانان فەرموودەیان لەو كەسانەوە وەرنەدەگرت كە نزیكایەتییان هەبایە لەگەڵ سوڵتان، ئەوان وەهایان دەبینی ئەگەر كەسێک سوڵتان ڕازی بكات، ئەوا خودای تووڕە كردووە، ئەگەر سوڵتانیشی تووڕە كرد، ئەوا خودای ڕازی كردووە. لەبەر ئەم هۆیە، تانەیان لە ئەبو یوسف دەدا بە نزیک بوونەوەی لە دەستەڵات[٢٥٢].

---

٢٥٢- المصدر السابق، ج٢، ص١٨٤- ١٨٥ .

وەک ئاشكرایە، ئەبو حەنیفە كە مامۆستای ئەبو یوسف بووە، دوو جار تكای ئەو كارەیان لێ كردووە، بەڵام ئەو ملی نەداوە. جارێكیان لە سەردەمی "ئیبن هوبەیرە"، بەڵام ئەو ڕازی نەبووە، بۆیە شەللاقكارییان كردووە. جاری دووهەمیش لە سەردەمی مەنسوور، كە ئەویشی هەر نەرێ كردووە و لەسەری خراوەتە بەندینخانە، دەڵێن هەر لەوێیش گیان دەسپێرێت. دەگێڕنەوە: ((ئەبو حەنیفە بە مەنسووری گوتووە: "ئەگەر بژاردەی دەسەڵات یان فوراتم بخەیتە بەردەست، ئەوا خنكانی فورات هەڵدەبژێرم و نابمە قازی قوزات. خۆت دنیایەكت دەستوپێوەند هەیە كە خواخوای مەرحەبایەكی تۆیانە، من بە دەردی تۆ ناخۆم)). لەپاش ئەبو یوسف ڕوداوێكی دیكە ڕووی دا كە لە مێژوودا ناونرا بە ڕووداوی "میحنەت"، ئەم ڕووداوی میحنەتە لە ڕاستیدا یەكێك بوو لە ڕووداوە هەرە گرنگە كۆمەڵایەتییەكان كە فیكری ئیسلامی گەیاندووتە ئەم ڕۆژگارە. جێگەی كەسەریشە كە مێژوونووسان هیچ گرنگی بەم ڕووداوە نادەن، بە تەنها لە ڕووی سیاسەتەوە كەمێكیان دنە داوە، ئەمەیش كار و كاسپی هەمیشەییانە لە مەڕ بابەتە مێژووییەكان، هەموو ڕووداوەكان دەكەنەوە بە سیاسی و دیوە فیكری و كۆمەڵایەتییەكەیشی خۆیان خۆش. بەمەیش سەرلەبەری مێژوو، بوویە حەقایەتی شا و قەڕاڵان و ئەو ڕۆحە مەبدەئییەی كە ئیسلامی لەپێناودا نێردرابوو، پووچەڵ كرایەوە.

ڕووداوی "میحنەت" وەک ئازمایشتێک بوو كە مەئموونی پێ تاقیی بكرێتەوە، لە دوای ئەمیش موعتەسەم و واسیقیش. ئەویش مەسەلەی خەلقی قورئان بوو. خۆی لە بنەڕەتدا بابەتی خەڵقی قورئان گرنگییەكی سەبجێكتی -خودی- نییە، بەڵام لە سەردەمی ئەم سێ خەلیفەیەدا بووبووە پێوەری دروستی ئیمان، وەک بێژنگ پیس و

پاکی ئیمانیان پێ دەکرد. مەئموون کەسێکی فەلسەفاوی بوو لەسەر ڕێچکەی موعتەزیلە. موعتەزیلەیش ئەوانەن کە دەیانەوێت عەقیدە لەسەر بنەمای عەقڵ و بیرکردنەوەی لۆژیکی بنیات بنێن. ئیدی مەئمونیان وەک پەخشەرەوەی ئایدیاکانیان دانابوو. ئیدی لە خودایشم دەویست کەسێک قسەی لە قسەیاندا کردبا و پێی بگوتنایە بەری چاوی ئەو بیرۆکەیەتان بڕۆیە. لەم کارە ناهەموارەدا فەقیهەکان توانیان هەڵویستێکی تا سەر ئێسقان جوامێرانەیان هەبێت و بەرگەی هەموو جۆرە لێدان و سزایەک بگرن.

بەڵام هەر هێندەمان زانی دنیا بەراوەژوو بووەوە، موتەوەکیل هاتە سەر دەور، کوناوکون بە دوای موعتەزیلاندا دەگەڕا، لە کارەکانیانی دوور دەخستنەوە کە لە دەورانی سێ خەلیفەی پێشووتردا دەستیان کەوتبوو. فەرمانی بە والی میسر کرد، ڕدێنی قازیل قوزاتی مەملەکەت بتراشن لەبەر ئەوەی موعتەزیلی بوو، پاشانیش لەسەر بارگیر کوچە بە کوچەی شاری بگەڕێنن[٢٥٣].

موتەوەکیل فەقیهـ و فەرمووددەناسانی هێنایە پێشەوە، فەرمانی پێ کردن باسی فەرموودە مەئسورەکان بۆ خەڵکی بکەن. مەسعودی مێژوونووس دەگێڕێتەوە: ((هەر کە دەسەڵات کەوتە دەستی موتەوەکیل، فەرمانی دا خەڵکی واز لە بۆچوون و بیرۆکە و ئەو شتانە بێنن، واز لە گەنگەشەو چەلەحانێ بهێنن، توخنی ئەو شتانە نەکەونەوە کە لە دەورانی موعتەسەم و واسیقدا مەشغوڵی بوون. فەرمانی بە خەڵکی کرد تەسلیم ببن و تەقلید -چاولێکەری- بکەن لە ئایندا. فەرمانیشی بە واعیزەکان دا، تا دەتوانن حەدیس بگێڕنەوە، باسی ئەهلی سوننە و جەماعە بکەن[٢٥٤] ((شاعیرانیش دڵخۆش بوون

---

[٢٥٣]- أحمد أمین، المصدر السابق، ج٣، ص١٩٨ .

[٢٥٤]- المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص٢٨٨ .

بەم سەرکەوتنەی ئەهلی سوننە و بیدعەدا و جەماعەیش بەسەر فیرقەکاندا، دەستیان کردە سەناخوانی. ئیبن خەبازە لە بارەی موتەوەکیلەوە دەڵێت:

وبعد فإن السنه اليوم أصبحت

معززه حتى كأن لم تذلل

وولى أخو الابداع فى الدين هاربا

الى النار يهوى مدبرا غير مقبل

شفى الله فهم بالخليفه

جعفر خليفته ذى السنه المتوكل

سوننەت ئەمڕۆ بە جۆرێک

سەربەرزە وەک ئەوەی زەلیل نەبووبێت

بیدعەچی بە جۆرێک هەڵات بەرەو

ئاگر، بواری ئاوڕدانەوەی هەر نەبوو

خودا لێکی ترازاندن بە خەلیفەی

جەعفەری خاوەن سوننەتی موتەوەکیل

***

گومانی تێدا نییە موتەوەکیل یەکێک بوو لە هەرە خەلیفە وەحشییەکان، سەفاک و دڕندەی وەک خۆی بە دایکدا نەهاتبوو. تەنانەت هێندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان بە "نیرۆنی ڕۆژهەڵات"ی دەناسێنن. ئەو ئەم زیندووکردنەوەی سوننەتەی بۆ ئەوەیش کرد، تا

فەقیهەکان بکاتە پەروانەی دەوری چرای خۆی، تا بەرزی بنرخێنن، نزای لێخۆشبوون بۆ سەرپێچییەکان بکەن. کار گەیشتە هەندەی فەرمووودەناسان خەونیان دەدیت کە خودا لە هەموو تاوانەکانی موتەوەکیل بوراوە[٢٥٥].

***

خەلیفەکانی بەنی عەباس - ئەوانەی بەر لە موتەوەکیل- هەموو هەوڵ و تەقالایەکیان دا، تا فەقیە و پێشەواکانی ئاین کەمەندکێش بکەن بە لای خۆیاندا، بەلام ئێستایش و ئێستایش نەیانتوانی. بەلام کە موتەوەکیل هات، بە یەک هەنگاو، ئەو شتەی کە ساڵەهای ساڵە بلیمەتەکان نەیانتوانیبوو ئەنجامی بدەن، ئەو ئەنجامی دا. موتەوەکیل سیستەمێکی نوێی لە مێژووی ئیسلامدا داهێنا، ئەویش یەکپێگرتنی ئاین و دەوڵەت بوو. ئاینی وا لێکرد، کە بە قەڵەمەکەی پشتگیری دەوڵەت بێت، دەوڵەتیش بە شمشێر ئەوی دەپاراست. کار گەیشتە ئەوەی خەڵکی لە کاتی نزادا دەستیان بەرز دەکردەوە و دەیانوت:((اللهم انصر الدین والدوله)).

بەم کارە، ئاین نزم بووەوە و دەوڵەتیش بەرز.

لە پاش "میحنەت"، ڕووداوێکی تری کۆمەڵایەتی سەری هەڵدا، کە گرنگییەکی زۆری هەیە لە گەشەکردنی فیکری ئیسلامی و زیاتر بەرەو ئەو ئاراستەیەی کە ڕەشید و موتەوەکیل دەیانویست بیبەن. ئەو ڕووداوەیش هەر وەک هەمو ڕووداوەکانی دیکە، مێژوونووسان گرنگییان پێ نەداوە. بە شێوەیەکی زۆر بەرتەسکیش نەبێت، لێکۆڵینەوە و باس و خواسیان لە بارەوە نەکردووە.

---

[٢٥٥]- المصدر السابق، ج٣، ص١٩٩ .

خەلیفەکـانی ئەنـدەلووس هـاتنە سـەر مەزهەبـی "ئەهلـی سـوننە و جەمـاعە"، دەسـتیان دایە بەرپـاکردنی مونافەسـە لە نێـوان فەقیـە و نووسەرەکاندا. وەک دەردەکەوت ئەمەوییەکانی ئەندەلووس هەستیان بە هەڵەی پێشـینەکانی خۆیـان لە شـام کردبـوو، کە لایەنـی فەقیـە و فەرموودەناسـەکانیان پشتگوێ خستبوو، بۆیە ئەمجارە زۆر چڕوپڕ دەسـتیان کـردە ڕاکێشـانیان. ئەوان کتێبنـووس و فەقیهەکانیـان لە خۆیـانەوە ئالانـد، هەر کتێبێکیـان دەنووسـی، لێیـان دەکـڕینەوە بە نرخێکـی خەیـاڵی. ئەو کەسـانەیان داوەتـی ئەنـدەلووس دەکـرد، لە ڕۆژهەڵات ناوبانگیـان بڵاوبووبـوویەوە. وای لێهـات ئەو زانایـانەی لە ڕۆژهەڵات گوزەرانیان تەڵخ بوو، کۆچیان دەکرد بۆ ئەندەلووس، تا لەوێ لە پارە و پلە و پۆست بێبەش نەبێت. پرۆفیسـۆر نیکڵسـۆن لە مەقدیسـییەوە دەگێڕێتەوە: ((خەڵکی ئەندەلووس... تەنها متمانەیان بە قورئـان هەبوو، لەگەڵ "مـوەتتەئی مالیک"دا، ئەگەر کەسـێکی سـەر بە مەزهەبی حەنەفـی یـان شـافیعیان دیتبـا، شـاربەدەریان دەکـرد، خـۆ ئەگەر شیعەیەک یـان موعتەزیلەیەکیـان دیتبـا، هەر لە جێدا ساردیان دەکردەوە))[256].

لێکۆڵینەوەی ئاینیی لە ئەندەلووس ڕێتمێکی دیکەی وەرگرت، ئەویش شـکۆدارکردنەوەی بنەمـاڵەی ئەمەوی و بە تـایبەتیش باسـی فەزایلـی پێشـینە ئەمەوییەکـان. ئەوەیـش دەرەنجـامی بـارودۆخە سیاسـییەکانی ئەو ڕۆژە بوو، چونکە خەلیفەکان شەوق و دەمارگیرییەکی زۆریان بە لای بنەمـاڵەی ئەمەویـدا هەبـوو. وەکـو بینیمـان، زەمکردنـی خەلـیفە پێشـینەکانی ئەمەوی لە ڕۆژهەڵات بووبـووە سـوننەتێکی هەمەگیـرە، بەڵام لە ئەنـدەلووس بەهاکـان پـێچەوانە بووبـوونەوە، لەوێ: "باسـی چـاکەی ئەمەوییەکـان لەگەڵ هەور دەسـلەملان و هـی عەلەوییەکـان

[256] NICHOLSON, Aliterary History.....p٠٤٠٨ - ٤٠٩ -

گەرد و غوباری دنیای بەسەرەوە نیشتبوو. ئەگەر پەڕاوەکانی ئیبن حەزم و ئەبوبەکری ئیبن عەرەبی بخوێنینەوە - کە ئەم دوانە لە هەرە زانا پێشەنگەکانی ئەو دەورانەی ئەندەلووس بوون- ئەوا زۆر بە زوڵاڵی مەیلی ئەمەویبوون و ڕقلێبوونەوەی عەلی و بنەماڵەکەی تێدا نمایانە.

بۆ نموونە ئیبن حەزم: فەرموودەی "ڕۆژی غەدیر بە نادروست -غیر صحیح- دەزانێت و بە داهێنراوی ڕافیزەی دەزانێت، لە کاتێکدا ئیمامەکانی ڕۆژهەڵات بە فەرموودەی بێخەوش و خاڵی دەزانن، یەکێکیان ئیمام ئەحمەدە کە دەڵێت ۳۰ هاوەڵ ئەم شایەتییەیان لە بارەی عەلییەوە داوە لە کاتی خەلیفایەتییەکەیدا. لە دەنگوباسە -شایعە- باوەکانی ئەو ڕۆژانەی ئەندەلووس: ((قەڵەمەکەی ئیبن حەزم و شمشێرەکەی حەجاج، هەردووکیان تیژ و بەبڕشتن)). وەک ئاشکرایە ئیبن حەزم بە قەڵەمەکەی بەرگری باشی لە ئەمەوییەکان دەکرد، هەروەک چۆن پێشتر حەجاج بە شمشێرەکەی کردبووی، ئاشکرایشە کە مەیلی سیاسی -بێجگە لە قەڵەمەکەی- بەلای ئەمەوییەکاندا بووە، گوایە باپیرەیشی یەکێک بووە لە خەدەم و حەشەمی یەزیدی کوڕی ئەبوسووفیان.

*** *** ***

هەرچییەک لە بارەی ئەبوبەکری ئیبنولعەرەبیشەوە: ئیمامی دووەمی ئەندەلووس توندتر لە ئیبن حەزم، ئەمەوییەکانی خۆش دەویست و ڕقی لە عەلەوییەکان دەبوویەوە. ئەو سەردەمەی ئەبو حەنیفە خەلیفەکانی ئەمەوی بە دز و چەتە ناو دەبات، ئیبنولعەرەبی

سەناخوانی خەلیفەکانی شام دەکات و بەرگرییەکی گەرموگوڕ لە یەزیدی کوڕی مەعاوییە دەکات. ئەبوبەکری ئیبنولعەرەبی بڕوای وایە: یەزید لە هەرە زاهید و بۆ خوا سوڵحاوان بووە، شایەنی ئەوەیە ئیقتیدا بە قسەکانی بکرێت و لە کۆڕی زیکریدا ئامادەبیت، درێژەی دەداتێ و دەڵێت: ((مێژوونووسان نازانم باسی بادەنۆشی و تاوانەکانی دیکەیان لە کوێوە هێناوە؟ شەرم ناکەن؟ یان ئەوەیە خودا پەردەی حەیا و شەرمی لەسەر هەڵماڵیون و هەرچی بە دەمیاندا دێت نایگەڕێننەوە))[257]. ئیبنولعەرەبی ئەو تۆمەتچییانە بە مولحید و خراپەکار لە قەڵەم دەدات. ئیبنولعەرەبی وەهای دەبینێت کە: بیدعەکەی مەئموون لەمەر بابەتی خەلقی قورئان، زۆر لەو سەربوردانەی مێژوو زشتترە کە دەڵێن فلانە خەلیفە بادەنۆش بووە و فیسارە خەریکی سەما و زینا و بێئەخلاقی بووە[258].

وای بۆ دەچم، ئەم ڕێگایەی زانایانی ئەندەلووس گرتبوویانە بەر لە خۆشەویستی و وەسفی ئەمەوییان، وردە وردە و بە هێواشی دزەی کردە ناو نێوەندە زانستییەکانی ڕۆژهەلاتیشەوە. ئیدی ئەو موتەربەکردنەی لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا ڕوویدا، چی درەنگ یان زوو ئەنجامەکەی هەر ئەمە دەبێت. لەوانەیشە هەر ئەمە هۆکاری نەرمەنەرمە خۆشەویستبوونی مەعاویە بووبێت لەناو مسوڵمانانی ڕۆژهەلاتدا، کاتێک کە بارودۆخ گۆڕانی بەسەردا هات و مەعاویە بووە هاوەڵی پێغەمبەر و نووسەرەوەی وەحی و خاڵی مسوڵمانان.

پرۆفیسۆر لە بارەی خەڵکی ئەسفەهانەوە دەڵێت: "ئەوان زیادەڕۆییەکی لەڕادەبەدەریان لە خۆشەویستی مەعاویەدا دەکرد —لە سەدەی چوارەمدا—". مەقدیسی دەگێڕێتەوە: کابرایەکی ئەو بازێڕە،

---

[257]- ابن العربي، العواصم من القواصم، ق۲۳۳

[258]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

سەناخوانی مەعاویەی دەكرد كە دەیوت: پیاوێكی زاهید و خواپەرست بووە "مەعاویە نەبی و ڕەسول بووە"، مەقدیسیش نارەزایی لە قسەكەی دەردەبڕێت، بەڵام كابرا دەچێت بە گژیدا و خەڵكەكەش تۆمەتی شیعەبوونی دەدەنە پاڵ، خودا ڕەحمی كرد و كاروانێك هات و مەقدیسی لەگەڵیان شاری بەجێهێشت، وەگەر نا زامداریان دەكرد. هەر ئەم مەقدیسییە دەگێڕێتەوە: ((كابرایەكی بینی لە مزگەتەكەی واسیت، وا فەرموودەی پێغەمبەری دەگێڕایەوە: "خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا مەعاویە دێنێتە تەنیشتی خۆی، ئەمە لە كاتێكدا پەردەی بەسەردا داوە، پاشان پەردەی لەسەر لادەدات، هەروەك چۆن پەردە لەسەر بووك لادەدرێت، منیش وتم "لەبەر چی"، كابرایش وتی: "لەبەر بەگژاچوونی عەلی"، منیش وتم "هەی درۆزنی گومڕا"، كابرا هاواری كرد: "ئەو ڕافیزییە بگرن"، خەڵكی دابارینە سەری، باشی بەوە بوو، هەندێك نووسەر لەوێبوون و ناسییانەوە و نەیانهێشت زاماری بكەن[٢٥٩].

*** *** ***

ئەوەی كە جێگەی سەرنجە، زۆرینەی فارس لەو سەردەمەدا لەسەر ڕێچكەی ئەهلی سوننە و جەماعە بوون، لە ڕووكەشیشدا ئەسفەهان وەك پایتەخت وابوو. خەڵكی عێراقیش تەشەیوعیان لەبەر دڵ بووە، كوففەیش چەقەشوێنیان بوو. لە هەڵگەڕاوەیی مێژوو ئەوەیە، بەغدادی ئەو سەردەمە تێكەڵەیەك بوو لە شیعە و سوننە، بەم هۆیەیشەوە بووبووە گەورەترین لانكەی هەڵایرساندنی فیتنە، لەنێوان شیعە و

[٢٥٩]- إبن العربي، المصدر السابق، ص٣٣ .

سوننەدا. بە تێپەربوونی کات ئەم ئاژاوەیەیش پەرەی دەستاند، هیچ ساڵێک بەسەر بەغدادا تێنەدەپەڕی بەبێ ئاژاوە یان تەنگەژەیەک لەنێوان ئەم دوو تایەفەدا. بێگومان ئەم گلەوگاڵەیە لە لایەن هەردوو لاوە دەستپێشخەری بۆ دەکرا. ئەمەیش شتێکی ئاسایییە، چونکە کاتێک دوو لایەن لەسەر شتێک کێشەیان تێدەکەوێت، ئیدی هەردوو لا توندڕەوی و زیادەڕۆیی لە دژی یەکدی بەکار دێن.

دەتوانین بڵێین ئەم مشتومڕەی نێوان سوننە و شیعە کاری گەیاندە دەمارگیری لایەک بۆ ئالی ڕەسوول و لایەکەی تریش بۆ هاوەڵانی ڕەسوول. ئەهلی سوننە دەمارگیرییان بۆ هاوەڵان هەبوو، شیعەیش بۆ ئالی پێغەمبەر. هەر لایەکیش زیادەڕۆیی لە دەمارگیرییەکەیدا دەکرد. ئەهلی سوننە توند دەستیان بەم فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە گرتبوو کە دەیوت: ((أصحابی بمنزله النجوم فی السماو، فأیها أخذتم رحمه، وإختلاف أصحابی رحمه- هاوەڵەکانم چەشنی ئەستێرەی ئاسمانن، هەرکامیان بکەنە چرا، هەر ڕێنیشاندەرە، جیاڕایی هاوەڵەکانیشم ڕەحمەتە)). لەولایشەوە شیعە ئەم فەرموودەیەیان کردبووە مارش: ((إنما مثل أهل بیتی مثل سفینه نوح، من رکبها نجا، ومن تخلف عنها غرق- نموونەی ئالوبەیتی من وەک کەشتییەکەی نوحە، ئەوەی لێی سەرکەوێ سەرفرازە، ئەوەی لێی دواکەوێ نغرۆیە))[٢٦٠]. ئەمان هاوەڵان و ئەوان ئالوبەیتیان کردبووە پێوەری فەزیلەت، لێرەوە یەکێک لە پێوەرەکان ئاسۆیی و ئەوی تریان ستوونی بوو. ئیدی هەر کەسێک لە هێڵەکان نزیک ببوایەتەوە، ئەوا لە دیدگای لایەنگرەکانیدا خاوەن فەزڵ بوو -باوەڕ و جیهادیشی هەرچەندێک بووبا- لێرەوە پێوەری مەبدەئ گۆڕا بۆ پێوەری پیرۆزکردنی ئاسۆیی و ستوونی.

[٢٦٠]- محمد حسین الزین، المصدر السابق، ص٢٢ .

ئەهلی سوننە تانەی "ڕەوافیز"یان دەدا لە شیعە، شیعەیش تانەی "نەواسیب". ئەمیان بە گوزارشتی ڕەفزکردنەوەی هاوەڵان و ئەویشیان بە "نەسبکردنی -پشتگرتنی- دوژمنانی ئالوبەیت و دەستخستنە یەک ئاوەوە لەگەڵ دەسەڵاتی ئەمەوی دژی عەلی و کوڕانی عەلی. بۆ خۆی دەردەکە بوویە دەردی بێدەرمان و لە هەر لایەکەوە زیادەڕەوی تێدا دەکرا. لە سەرەتاوە نە شیعە ڕەوافیز بوون و نە سوننەیش نەواسیب. بەڵکوو هەمووی زیادەڕۆیی بوو، یان ئەو شتەی کە ناومان ناوە بە "کەڵەکەبوونی فکریی"، کە وای لێکردن بگەنە ئەم ئامانجە دڵناخۆشکەرە.

ئەگەر شیعە و سوننە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بیانهەوێت پێک بێنەوە، ئەوا دەبێت وەرگەڕێنەوە بۆ ئەو دروشمانەی کە زەیدی کوڕی عەلی و ئەبو حەنیفە هەڵیان دەدا، واتە دروشمی شۆڕش دژی ستەم لە هەموو ڕووەکانیەوە... لێرەیشدا جیاوازی لە نێوان ستەمکاری شیعی و سوننیدا نییە. ئامانجی ئاین بریتییە لە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، کەسانی مەیدانیش، تەنها ئامرازێکی ناو ئەو پرۆسە مەزنەن.

*** *** ***

بوەیهییەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا هاتنە بەغداد. ئەوانیش زیاتر لە جاران قوڕەکەیان خەست کردەوە. بوەیهییەکان شیعە بوون. بەڵام خەلیفەکانی بەنی عەباس سوننی بوون، لێرەیشەوە دوو بنەماڵەی دەسەڵاتدار لە بەغدا نیشتەجێ بوون. خەلیفەی سوننی و ئەمیری شیعە، بەلایان هەر وەک کولله داباراندە سەر مەملەکەت. خانەدانەکانی بەغدا لە دوو پێڕ بوون، پێڕی عەلەوی و پێڕی عەباسی.

هەر خانەدانێکیش دەمارگیر بوو بە لای ئەوەی خۆیدا. بۆیە لە بەغدا خـوێنێکی زۆر ڕژێنـرا، حـورمەتێکی زۆر دڕێنـرا، خەڵکـانێکی زۆر بێلانەویانە مانەوە.

ئەهلـی سـوننە بڕوایـان بە خەلافەت هەبـوو، بـۆیە پشـتیوانی عەباسـییەکان بـوون، بە سـێبەری خودایـان دەزانـین لەسـەر زەوی. شیعەیش ئیمانیان بە ئیمامەت هەبوو، ئەم ئیمامەتەیش تەنها لە ئالی عەلییەوە سەرچەشـمەی دەگـرت، خەلافەتـی عەباسـی و شـتیان بە خۆسـەپێن و باتـڵ دەزانـی. لێـرەوە ئاغاواتەکـانی بەغـدا هەسـتی جمهوریان دەهوروژاند و بۆ مەبەستی کەسی بەکاریان دەهێنان[٢٦١]. لە سـاڵی ٣٥٠دا دوانـی خومـار کە یەکێکیـان عەلەوی و ئەویشـیان عەباسـی دەبێـت، دەبێتە گاڵەیـان و عەلەویـیەکە دەکوژرێـت، شـار دەشـێوێت، دەبێتە خۆنیشـاندان و ئاغـاواتیش هەر کەسـە و چمکـی کەواکە بە لای خۆیدا دەکێشێت. بەڕێوەبەری پۆلیس دێت و هەموو خۆپیشـاندەران سـزا دەدات و فەرمـان دەدات، عەباسـییەکەیش بە عەلەوییەکانـەوە بئـاڵێنن و بیانهـاوێژنە دیجلـەوە... چـۆغ شـکور شـەڕ دامرکـایەوە. لەمەوە ڕوون دەبێتەوە گـرفتەکە تەنهـا لەسـەر بنەمـا و مەبدەئ نەبووە، بەڵکوو شەڕە کورسی بووە.

لە کۆتـایی سـەدەی چوارەمـدا پیـاوێکی خـانەدان دەرکەوت کە گـوایە مەهدییە. لەناو خەڵیکا بەبرەو بوو، داعییەکانی لەناو خەڵکیدا خەریکی کـۆکردنەوەی بەیـعەت بـوون بـۆی. ئەوەی کە مـایەی پێکەنـین بـوو، داعییەکـانی -ئەوانەی جـارچی ئەو بـوون- ئەگەر کەسـێکی سـوننییان ببینیایە، دەیانوت مەهدیی لە عەباسییەکانە، کە دەیشگەیشتنە کەسـێکی شیعە، دەیانوت مەهدییەکەمان عەلەوییە. ڕۆژێکیان سەردارێکی شیعە

[٢٦١]- آدم متز، المصدر السابق، ج١، ص٢٥٧ .

مەزەب هات بۆ بەیعەتدانی، کە بینیی وا سوننەیە و شیعە نییە، خێرا بە خێرا پشتی هەڵکرد و ببڕای ببڕ نەهاتەوە.

*** *** ***

ناکۆمی نێوان شیعە و سوننە شێوازێکی ترسێنەری وەگرت ئەو دەمەی ململانێ لە نێوان عوسمانی و سەفەوی لە عێراقدا هەڵایرسا. جێگەی سەرسامینە هەر ئەو عێراقەی کە خۆی لانکەی ئەم ناکۆکییە بوو، دوایی خۆیشی بووە پێتەختی بەربەرەکانێی دوو دەوڵەتی زەلامی شیعە و سوننی. قوڕ بەسەر گەلی عێراقیش لە نێوان ئەم دوو بەرداشەدا. سەفەوییەکان ڕۆڵێکی مەزنیان گێرا لە مێژووی تەشەیوعدا. دەتوانین بڵێن ئەوە سەفەوییەکان بوون کالای مەزهەبیان کرد بە بالای تەشەیوع دا، دواتریش فویان بۆ پێدا کرد. ئەو بەرگە شۆڕشگێڕانەیەیشیان لەبەری داکەند کە هەر لە سەدەکانی سەرەتاوە بەبەر خۆیدا کردبووی. ئیدی بووە مەزهەبێکی -ڕێچکەیەکی- هەر وەک هەموو ڕیچکەکانی دیکە، بەبێ تاڵێک جیاوازی.

هێدی هێدی تەشەیوع بە ئاشی سوڵتانەکان هاڕدرا، سروشتە شۆڕشگێڕییەکەی لێ داماڵرا کە عەلی و کوڕەکانی نەوە لە دوای نەوە خستبوویانە سەر یەک. عەلی مارشی شۆڕش بوو لە هەموو مێژووی ئیسلامدا، کەچی سەفەوییەکان کردیانە ماڵەقولێی سەر شانۆی خۆیان. بەر بە دەرکەوتنی سەفەوییەکان، فارسەکان لەسەر مەزەبی سوننە و جەماعە بوون. ڕابوونی عەباسی لەناو ئەواندا دەستی پێ کرد، هەر لەوێیش خونچەیان بووە گوڵ. کە لە زانا و فەرموودەوانە بەبرەوەکان زۆربەیان لە خەڵکی ئەو ناوە بوون.

زۆرێک لە پێشەنگەکانی وەک: "نەیسابوری، بوخاری، تورمزی، ڕازی، تەبەری، غەزالی، خوراسانی، شەهرستانی، گەیلانی، ئیستڕابادی، خوارزمی، جورجانی، ئامەدی، ئەسفەهانی و توستەری..." بێجگە لەمانەیش هەن کە سەر بەر بازێرە جیاوازەکانی ئێرانی کۆنن. فارس هەر لەسەر مەزەبی تەسەننون بوون، تا دەرکەوتنی دەسەڵاتی سەفەوی. ئەم دەسەڵاتە چەندین ئامرازی پەستانی بەکار هێنا بۆ بەشیعەکردنی خەڵکی: - تێسرەواندن- کوشتن و ئەو شتانە لەم پێناوەدا بەکار هات. زیکری سەرزاریشیان هەر "یاعەلی!" بوو. ڕێک ئەم زەبروزەنگەی سەفەوی، هاوشێوەی ئەوەی ئەیوبییەکانە کە لە میسر بەسەر فاتمییەکاندا هێنایان.

ئیدی لە دەورانی سەفەوییەکانەوە، مەزەبی شیعە بوویە مەزەبێکی نەتەوەیی لە ئێران. ڕەنگیش کرا بە ڕەنگێکی غرورەنگێزی سوڵتانییانە کە هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ عەقیدە سوڵتانییەکانی دیکەی سەرزەمین. سەفەوییەکان لە بانگەشەکانیاندا وەک دەروێشەکان بوون، بانگەشەکارەکانی خۆیانیان دەنارده ئەمسەر و ئەوسەری دنیا، لەوێیش بە تەپڵ و زوڕناوە قەسیدەی سەناخوانیی عەلییان دەخوێندەوە بە دەنگێک کە دەگەیشتە کەشکەشانی فەلەک. ئەوان لە شار و لادێ بڵاو دەبوونەوە و کەشکۆڵی خۆیانیان بە دەستەوە دەگرت، نەرم نەرمێ ڕێگەیان دەبڕی بە دەم "یا عەلی"وتنەوە. لێرەوە ناوی عەلی بۆ ئامرازی سیاسی بەدەست سوڵتانەکانەوە بەکار دەهێنرا، وەک چۆن پێشتریش ناوی "محەمەد" و "الله" بەکار هێنرابوو.

سوڵتانی سەفەوی جیاوازییەکی وای لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا نەبوو. هەموویان خودایان دەپەرست و بەندەکانی خودایان دادەپڵۆساند. جیاوازییان تەنها لە ڕووکەش بوو، هەموو مەراقێکیشیان هەر ئەوە بوو چۆن مزگەوتان بڕازێننەوە و ئاڵتوون و زەخرەفە و

تروتەشخەڵەی زیاتری تێ هاوێن.

*** *** ***

لەبەر ئەوەی مەرقەدی ئیمام ئەعزەم لە لایەکی دیجلە و ئیمام کازم لە لاکەی تری بوو، جیاکارییەکە کەوتبووە دەڤەرەکە. ئیدی لەمبەری دیجلەوە جنێو ڕەوانەی ئەوبەر دەکرا –لە کازمییەوە بۆ ئەعزەمییە– ئەم دەبەنگانە بیریان هەر لای ئەوە نەماوە کە ئەم دوو ئیمامە هەردووکیان شۆڕشیان دژی ستەم و ستەمکاران بووە و لە یەک حیزب بوون، ئەویش حیزبی "دژەسوڵتانان" بوو. ئەبو حەنیفە بە توندی بەرهەڵستی مەنسووری کرد، وەک چۆن موسای کازمیش هیی براکەی –ڕەشید–ی دەکرد. هەردووکیشیان لە بەندینخانەی ئەم دوو سوڵتانە ستەمکارەدا ساردبوونەوە، بەڵام سوڵتانەکان لە پاش مەزگیان لێکیان هەڵاوێردن، هەرچەند لە دەمی زیندویەتیدا نەیانتوانی ئەو کارە بکەن.

*** *** ***

ناسرەدین شای پێشووی ئێران لە ساڵی ١٨٧٠ زیارەتی مەزاری حوسەینی کرد. وەک "ودمانە" دەستی دەماسی بە گلکۆکەدا، ماچی دەکرد، ئەسرینی هەڵدەوەراند و دەلالایەوە. کەسێکی جێگەی متمانەی خۆم پێی ڕاگەیاندم کە یەکێک لە مجێورەکانی مزگەوتی حوسەین وتارێکی خوێندەوە لە بەردەم ناسرەدیندا کە ئەمە دەقەکەیەتی:

((سەلامت لێبێت ئەی ئەبو عەبدوڵلا... تۆ لە ڕۆژی کەربەلادا بانگت کرد: ناصرێک -سەرخەرێک- نییە بێت بە هانامەوە؟ بەڵام کەس نەهات بە دەمتەوە، ئەمڕۆ مزگێنیت دەدەمێ کە ئەو ناصرەکە هات)). شا کە ئەمەی بیست هێندە گریا تا لەهۆش خۆی چوو.

گریانی ئەم شایە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ گریانی هاروونە ڕەشیددا نییە. هەردووکیان سوکوسەلیم و خۆشڕابوێر و خوێنڕێژ بوون. هەردووکیشیان لە ترسی خودا لەهۆش خۆ دەچوون. ڕەحمەتی خودا لە بێژەری ئەم قسەیە: "سیاسەت ناچێتە ناو هیچ شتێکەوە، مەگەر بۆگەنی دەکات". ئەوەتا هەرکە هاتە ناو مەزەبی تەشەیوعەوە، وەک باقی هەموو دین و مەزەبەکانی لێکرد. ئێستا کاتی ئەوەیە، نەوەی نوێ پەند و ئەزموون لە ڕابردوو وەرگرن، ڕێچکەی پێشینە شۆڕشگێڕەکانیان بگرنە بەر دژی ستەم.

*** *** ***

پێشتر وتمان سەفەوییەکان مەزەبی تەشەیوعیان وەک کێوییەکی دڕندە بەخێو کردبوو. بەمەیش تەشەیوع وەک "شۆڕشێکی کوژاوە"ـی لێ هاتبوو. لەوانەیە ڕاست بێت ئەگەر بارودۆخی ئێستای تەشەیوع بە بورکانێکی داسەکناو وێنا بکەین، کە لە سەریەوە دووکەڵێک هێواش بەرز دەبێتەوە کە ئاماژەیە بۆ ڕابردوویەکی پڕ تین. ئینجا تا ئێستایش تەیەشوع هەرترووسکاییەکی ئەو شۆڕشە کۆنەی تێدا بەدی دەکرێت. ئەم وردە ترووسکاییەی کە وەک نەرمە دووکەڵ وەهان، کاتێک فەرمانەکەیان تەواو دەبێت، ئیدی لەباتی سوود، زیانیان دەبێت. هەندێ جاریش لەملاولا شۆڕشێکی لێ پەیدا دەبێتەوە.

ئەوەی توێژینەوە بۆ باری ئیمرۆژیی تەشەیوع بکات، ئەوا هێندێک نەریتــی کــۆمەڵایەتی تەمــاوی تێــدا دەبینێــتەوە کە شــایەنی سەرسووڕمان و بیرلێکردنەوەن. لێرەوە هێندێک کەس ئەم شتە لێڵانەیان پێ سەیر یان ناشیرینە کە زیاتر خۆیان لە خورافە و زیادەڕۆیدا دەبیننەوە. ئێمە ناتوانین ئەم نەریتانەی شیعە شرۆڤە بکەین مەگەر بەوەی: ئەمانە بریتین لە پاشماوەی سەدەکانی ڕابردوو، کە ئەوکات شیعە لانکەی شۆڕشە ئیسلامییەکان بوو.

**ئەو پاشماوانەیش دەتوانین لەم خاڵانەدا پوخت بکەینەوە:**

١- بریتییە لە دیدگای ئیمامەت. شیعەی ئەمڕۆ بە چاوی پیرۆزییەوە تەماشای ئیمامەکانیان دەکەن، ئەوان ئەم ئیمامانەیان بە مەعسووم لە هەڵە دادەنێن. پلەیشیان لە پلەی مرۆڤ بە بڵندتر دەزانن، دەچنە زیارەتیان و لێیان دەپاڕێنەوە لە هەر بەڵایەکدا کە تووشیان دەبێت. ئەم زیادەڕۆییە لە پیرۆزڕاگرتنی ئیمامەکاندا لە بنەڕەتدا بنەمایەکی شۆڕشگێڕیی هەبووە و دواتر بووتە سیفەتی شۆڕش و لە کۆتاییشدا بووەتە عەقیدەیەکی بێ ڕۆح. مەبدەئی عیسمەت گرنگییەکی کۆمەڵایەتیی هەیە، ئەویش لەو ڕووەوە کە هەموو ئەو کەسانەی کە دژی ئیمام شەڕ دەکەن تاوانبار دەکرێن، چونکە تۆ لەمسەرەوە کەسێکت هەیە کە هەڵە ناکات، ئێ ئەگەر کەسێک شەڕی لەگەڵدا بکات، کێ تاوانبار دەردەچێت؟

شیعە هەوەڵینەکان کاتێک دەیانگوت ئیمام مەعسوومە، ئەوان بەم کارەیان هەموو تاوانەکەیان دەملی سوڵتان دەهاویشت. ئەم کارەیان هاوشێوەی کارەکەی ئەفلاتوون و فارابییە کە سیستەمە توبابییەکەیان خستبوویە ڕوو بۆ چاکسازی لە کۆمەڵگەدا. لە بڕوای ئەماندا دنیا هەرگیز چاک نابێت تا ئەوکاتەی دەکەوێتە دەستی فەیلەسووفێکی دڵسۆزی بڵند ئەخلاقەوە. مامۆستا موسا جاروولڵا تانە لە بڕوای

شـیعەیان لەمەڕ عیسـمەتەوە بەم شـێوەیە دەدات: ((مـن بـڕوام وایە عەقیدەی شیعە لەمەڕ ئیمامانەوە بۆ هەموو مسـوڵمانان ڕاستە))، واتە هەمـوو مسـوڵمان مەعسـوومن، هەر کارێـک ئیجمـاعی- کـۆدەنگی- مسـوڵمانانی لەسـەر بێت بێگومـان دروسـت و پەسـەندە. لە ڕاسـتیدا شیعە لەم قسەیە حاڵی نابن. ئەوان ڕاپەڕیون لەو شتەی کە هەموو ئـومەت لەسـەری کـۆک بـوون، لەوانەیە ئەوان ئوممەتیـان بە گـومڕا زانیبێت کاتێک بینیویانە وا گوێ لە مشتی سوڵتانی زەوتکەرن.

پرۆفیسـۆر ئیـدواردس دەڵێـت: ((شۆڕشـگێڕان هەمیشـە پێیـان وایە، گەندەڵی کۆمەڵگە لە گەندەڵیی فەرمانڕەواکانەوە سەرچاوەی گرتووە، ئیدی لێرەوە بڕوایان وایە تەنها لە ڕێگەی بوونەفەرمانڕەوای کەسانی چاکەوە بارێزیش چاک دەبێت))[٢٦٢]. وا دیارە ئەم تیۆرییەی ئیدواردس لەسـەر بـڕوای شـیعەکانی هەوەڵ لە بـارەی عیسـمەتەوە ڕاسـت دەردەچێت، لەبەر ئەوەی ئەمان دەیانوت: هەموو ئەم گەندەڵکارییانە هۆکاری خراپەکاریی و ناشیتی فەرمانڕەوا و سوڵتانەکانە. شیعە لە یەکێک لە ئیمامەکـانی خۆیـانەوە دەگێـڕنەوە: ((هەمـوو گەلێـک سـزا دەدرێت لە ئیسلامدا، مادەم گەورەیەکی خراپەکاریان هەبێت و شوێنی بـکەون، بـا کاروبـاری ڕەعـیەتەکەیش باشـە و چاکەبێـت. خـۆ ئەگەر گەلێـک شـوێنی ئیمـامێکی چـاک کەوتـن، ئەوا سـەرکەوتوو دەبـن، هەرچەندەیش کاری گەلەکە خراپەکاریی و نـانەجیبیی بێت)). ئەمەیش مانـای ئەوەیە، تەشـەیوعیش وەک هەر بزووتنەوەیەکـی شۆڕشـگێڕی دیکە، هەموو تاوانی نیشتیمان دەخاتە ئەستۆی حکومەت، لە ئەستۆی خەڵکی لادەبات. ئەم بڕوایەیش کەمێک زیادەڕۆیی و پەرگیریی تێدایە. بەڵام ئیـدی ئەم دیـدگایە لەگەڵ شۆڕشـدا یەک دەگـرێتەوە و پێشـی دەخات.

[٢٦٢] - edwards, The Natural History of Revolution p ٤٤ – ٤٥ .

٢- بیروباوەڕی مەهدی: ئەم بیروباوەڕی مەهدییە بە مایەکی هەرە بەهێزی سەرهەڵدانی زۆرێک لە شۆڕشەکانی ناو مێژووی کۆن بووە. مەهدی لە مانا کۆمەڵایەتییەکەیدا واتە شۆڕشگێر، بۆیە زۆرێک لە ڕابەرانی شۆڕش ئەم نازناوەیان لە خۆیان ناوە سەرباری ئەوەی هەرگیز بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە ڕۆژێک لە ڕۆژان، کە ئەمان مەهدین. ئەو کاتەی زەیدی کوڕی عەلی بەسەر ئەمەوییەکاندا ڕاپەڕی، دواتر بە پەلکی دارخورماوە لەخاچیان دا، یەکێک لە شاعیرەکانیان دەڵێت:

صلبنا لكم زيدا

على جذع نخله

ولم نر مهديا

على الجذع يصلب[٢٦٣]

زەیدمان بۆ دان لە پەلکی دارخورما

مەهدی نەبینراوە بە پەلکەوە لە خاچ بدرێت

هەرگیز، تاقە ڕۆژێکیش زەید لە ژیانیدا نەیگوتبوو ئەمن مەهدیم، سەرباری ئەوەیش لە لایەن ئەمەوییەکانەوە ئەو نازناوەی لێ نرابوو. ئەمە ئاماژەی هاوواتایی "مەهدی و شۆڕش" ڕوون دەکاتەوە لای خەڵکی ئەو سەردەمە. مێژوونووسان سەریان ماساوە لەوەی، داخۆ دەبێت هەوەڵ کەس کە وشەی مەهدی لە مێژووی ئیسلامدا بەکار هێنابێت کێ و کەی بووبێت؟ من وانازانم ئەم شتە سەرسوڕمانی گەرەک بێت. واژەی "مەهدی" خۆی لە بنەڕەتدا بە عەرەبیکراوی واژەی "مەسیح"ی ناو تەوراتە. مەسیح واتە مەمسوح واتە خودا

[٢٦٣]- ابن الحجر، المصدر السابق، ص ١٢١

دەستی پێدا هێناوە. مەسحیش لە تەوراتدا بە واتای "ڕێنوێنی"، "ناردنی پەیام" و پشتگیری خودایی.

ئەشعیای نەبی دەبێژێت: ((ڕەب مەسحی کردووم تا مزگێنی بە هەژاران بدەم، سا دڵاوای دڵشکاوان بم و لەکۆتخراوان ڕزگار بکەم. ڕۆژی تۆڵەی خودایی وەبیری خەڵک بخەمەوە، هاوبەشی خەمی گریاوان بم)). تەورات درێژە بە باسی ئەم "مەسموح"ـە دەدات و دەڵێت: ((ڕۆحی خودای تێکەڵ دەبێت، ڕۆحی دانایی و تێگەیشتن، ڕۆحی ڕاوێژ و هێز، ڕۆحی زانایی و خۆف لە خودا. وای لێ دێت تەنها بڕیار بە چاوەکان و گوێیەکانی نەدات. بەڵکوو بەلای هەژاراندا دێت و بەشی ڕەجاڵ و نەبووەکان دەدات... ئەو مەڕ و گورگ پێکەوە دەلەوەڕێنێت، ئاسک و پڵگیش پێکەوە دەباتە سەر کانی و کارێز)).

ئەوەی سفری ئەشعیای تەورات بخوێنێتەوە، یەکسەر لێکچوونێکی سەیر دەبینێت لە نێوان ئەم و ئەوەی کە شیعە بڕوایان پێیەتی لەمەڕ ئیمام مەهدی. وا دەردەکەوێت هەژار و بێدەستەڵاتان لە هەر کوێیەکی کات و شوێندا بن، هەر یەک ئاوات و هیوایان هەیە. ستەملێکراو کە نەیتوانی بەدەست تۆڵەی خۆی لە ستەمکار بکاتەوە، دێت و پەنا دەباتە بەر نووسین و خەیاڵ. ئیدی لێرەوە کۆشک و تەلاری خەیاڵەکانی تۆقە لەگەڵ هەورا دەکەن. دکتۆر ئەحمەد ئەمین بڕوای وایە: ((عەقیدەی مەهدی خەڵکی تووشی وەهم و گومڕایی کردووە لەناو خەڵکیدا و لە لایەکی دیکەیشەوە بووەتە هۆی شۆڕشیش هەر لەناو ئەو کۆمەڵگەیانەدا)). ئەم بڕوایەش کەم تا زۆر ڕاستی تێدایە، هەر بیرۆکەیەکی کۆمەڵایەتی، بە دوو ئاڕاستەدا کار دەکات، باش و خراپ. ئەمەیش پشتگیری ئەو بۆچوونەی هیگڵی فەیلەسووف دەکات کە دەڵێت: هەر ئایدیایەک لە ناواخندا، هەڵگری خۆی و دژەکەی خۆیەتی.

زانایانی کۆمەڵناسی، ئەوانەیان لێکۆڵینەوەیان بۆ مێژووی شۆڕشەکان کردووە، دەڵێن: چینی چەوساوە هەمیشە هەوڵی داوە بە کۆمەڵێک خورافە بەرامبەر ستەمی ستەمکار ڕاوەستێتەوە. ئەم جۆرە لە ئەفسانەیشیان ناو ناوە بە ئەفسانەی کۆمەڵایەتی "Social Myths".
لێرەوە دەتوانین بڵێین تەشەیوعی ئیمڕۆژی، کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی لەدەست داوە لەمەڕ مەهدییەوە و ئەوەی لێی ماوەتەوە پاشماوەیەکی فیکرییە کە خاڵی نییە لە خورافە.

٣- دیاردەی "توقیە" یان "تەقیـیە". توقیە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، هاوڕێی شۆڕشە لە دەماودەمی دەستپێکردنیدا. شیعەکانی سەرەتا ئەم کارەیان دەکرد -بۆ نموونە خۆیان شیعەبوون، بەڵام بە شتێکی دیکە خۆیان نیشان دەدا- تا شاربەدەر نەکرێن. مامۆستا موسا جارووڵلا دەڵێت: توقیە بریتییە لە دووڕوویی لە ئایندا. ئەو ڕۆحی توقیەی شیعە بە دووڕوویی وەسف دەکات و بەرهەمەکەیشی ناو دەبات بە کفرێکی یەهودییانە. وادیارە مامۆستا جارووڵلا لە ژیانی خۆیدا تامی چەوسانەوەی سیاسیی نەکردووە کە بە توقیە دەڵێت نیفاق. خۆ ئەگەر وابێت عەماری کوڕی یاسر یەکەمێن موونافیقی ناو ئیسلامە.

موجاهید دەڵێت: لە سەرەتای ئیسلامەوە تەقیە ڕێگەپێدراو بووە، ئەو کاتەی قورەیش پەستانی زۆریان دەخستە سەر مسوڵمانەکان. بەڵام لە پاش بەهێزبوونی ئیسلامەوە، ئیدی جائیز نەما. وا دەردەکەوێت خاوەنی ئەم قسەیە پشتیوانێکی باشی دەوڵەتی ئیسلامییە، هەڵوێستی پشتیوان لە ئۆپۆزسیۆن و شۆڕشگێڕ جودایە. هەرکەسەو لە ڕوانگەی بەرژەوەندی خۆیەوە تەماشای بارودۆخەکە دەکات. هەرچۆنێک بێت توقیە سروشتە شۆڕشگێڕییەکەی لەدەست داوە لەم سەردەمەدا. شیعەی ئێستا شتێکی وا لە شۆڕش نازانن، تەنانەت جیاوازییەکی

ئەوتۆیشیان نییە لەگەڵ ئاراستە سیاسییەکانی دیکەی ناوچەکەدا. توقیەیش وەک هەموو شتەکانی دیکەیان بووەتە بەشێک لە کولتووریان.

٤- شیوەنی حوسەین. سەمەرەی چوارمی شیعە بریتییە لە تازیباری بۆ حوسەین. ئەم کارە لە سەرەتادا نیشانەی تووڕەیی و نارەزایی دەربڕین بوو دژی دەوڵەت. بەڵام هێدی هێدی ئەم کارە تەشەنەی سەند تا بووە هێندێک تقووسی بێمانا. شیعەی ئەوسا، لە ژێرخانەکاندا کۆدەبوونەوە و یادی ئەو تراژیدیا بەئێشەیان دەکردەوە کە بەسەری حوسێندا هاتبوو. لێرەیشەوە تیشکیان دەخستە سەر ستەمکارییەکانی دەوڵەت. ئەوان ئەوسا بەو جۆرەی پارتیزانەکانی ئێستا، چۆن لە شوێنی نهێنی و ژێرزەمینەکاندا کۆدەبنەوە، ئاوا کۆدەبوونەوە. بەڵام شیعەی هاوچەرخ ئەو بنەمایانەیان بیرنەماوە کە حوسێن لە پێناویدا شۆڕشی کرد، ئەوان گرنگی بە گریان و شیوەن دەدەن، وەک بڵێیت ئەوە ئامانجی حوسێن بووە لە شۆڕشەکانیدا.

*** *** ***

ساڵانە سەدان هەزار شیعە سەردانی مەزارگەی حوسەین دەکەن، لە کاتی گەڕانەوەیشدا هیچ گۆڕانێک تێیاندا ڕوونادات و وەها دێنەوە کە ڕۆیشتبوون، ئەوەی کە ئەنجامیان داوە، تەنها شینوڕۆڕۆیەک زیاتر نەبووە. ئەوان ئەمڕۆ شۆڕشگێڕی دامرکاون، سوڵتانەکان بێهۆشیان کردوون. ئەو شمشێرەی جاران پێی ڕادەپەڕین دژی ستەم، ئێستا کردوویانە بە زنجیر و لە خۆیانی پێ دەدەن. کێ دەزانێت، لەوانەیە سەرلەنوێ ڕۆژێک دابێتەوە و ئەو زنجیرانە بکەنەوە بە شمشێر.

ئەوان بۆ ئەم کارە تەنها کەسێکی ئاژاوەچی وەک ئیبن سەبەئیان پێویستە و تەواو. وەرزی حەج و کەربەلا لێکچوونیان لە نێواندا هەیە بەهۆی زۆری هاتوچۆی وەفدەکانەوە. بەڵام سەردانی کەربەلا لە چەند ڕوویەکەوە لە حەج جودایە، چونکە ئەم لە ناواخنی خۆیدا تۆوی شۆڕشێکی بێدەنگبووی تێدایە، ئەوەی سەردانی ئەوێی کردبێت، تێبینی ئەو جۆش و خرۆشە ترسناکە داپۆشراوە هەست پێ دەکات.

موتەوەکیل ویستی هەر لە بنەڕەتەوە ئەو ترسە لەبار بەرێت. بۆیە مەزارەکەی حوسەینی کاول کرد[٢٦٤]. دواتریش زەویەکەی کردە مەرەزە و کشتوکاڵ، بەڵام نەیتوانی ڕیشەی ئەم ترسە دەرکێشێتە دەرەوە. بەڵام زیارەتچییەکان بە نهێنی هەر سەردانی کەربەلایان دەکرد، لەم ڕێگایەیشدا سامان و گیانی خۆیانیان دەخستە مەترسییەوە. دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ڕۆژگارە، هێشتایش گڕی گۆڕی حوسێن هەر دانەمرکایەوە.

*** *** ***

تەشەیوعی ئەمڕۆژیمان چواند بە گڕکانێکی دامرکاو، ئەمە لە کاتێکدا ڕۆژگارێکی مێژوویی کلافەی کردووە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار هێدی هێدی کپ بووەتەوە و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ چیاکانی دەوروبەریدا نەبووە، مەگەر تەنها بە کەمە دووکەڵەکەی لێ بەرز بووەتەوە. گڕکانی داسەکناو، سەرباری بێدەنگییەکەی، بەڵام هێشتایش لە مەترسییەکەی ناکرێت دڵنیا بین. ئەو لە چیایەکی لاڵ دێتە دەرەوە، کە کەس نازانێت کاتی دەرپەڕینی ئەو ئاگرەی ناواخنی کەیە.

---

[٢٦٤]- آدم متز، المصدر السابق، ج١، ص١١٧ .

تەشـەیوع لەمـڕۆدا تەژیـیە لە خـورافە، ئەمەیـش جـێگەی مەترسـییە. خورافەکـانی شـیعە لەو چەشـنانەن کە زانایـانی کۆمەڵناسـی نـاوی "خورافەی کۆمەڵایەتی"یان لێناوە. ئەم جۆرە خورافەیانەیش ڕۆڵێکی کاریگەری ئاشوبەنگێزی و شۆڕشگێڕانەیان هەبوو لە سەردەمەکانی سەرەتای ئیسلامدا.

بیرکـردنەوەی لـۆژیکی جـێگەی مەترسـی نیـیە، نە ڕەگـی لامـل هەڵدەسـتێنێت و نە دڵـیش دادەخورپێنێت. مەترسـی لەوەدایە خەڵکی بڕوایەکـی قووڵیـان بە خـورافەیەک هەبێـت و هەمـوو هەوڵ و کۆششـێکیانی لەپێنـاودا سـەرف بـکەن تـا بیهێنـنە دی. لۆژیکی نـوێ تـوێژینەوە بـۆ بـڕوا ئاینییەکـان دەکـات لە دیـدگایەکی لـۆژیکی، یـان بیرێکی تەندرووستەوە. بە شێوەیەکی گشتیش، بڕوا ئاینییەکان زیاتر دیـاردەگەلێکی کـۆمەڵایەتین تـاوەکوو شـتانی کە عەقڵـین. مەسـەلەی ئیمـامەت ئەو مەسـەلەیە بـوو، شیعەی بـۆ چەنـدین دەیە لە بەرانـبەر دەسـەڵاتدارەکانەوە ڕاسـت کـردەوە، هەمـوو فەرمانڕەوایەکیـان بە ستەمکار و قۆرخکار دەزانی بێجگە ئەو کەسـەی کە لە نەوەی عەلییە و بێتاوانە -مەعسوومە.-

ئەوان نموونەیەکی زۆر باڵایان بۆ سیسـتەمی فەرمـانڕەوایی دانـابوو، کە ئەم نموونەیە هێندەی لە خەیاڵەوە نزیک بوو، ئەوەندە لە واقیعەوە نزیک نەبوو. هەر بۆیە بێوچان لە شۆڕشی بەردەوام و بێحەسانەوەدا بوون. ئەوان هەر فەرمانڕەوایەکیان دەخستە تای بەرانبەری ترازووی ئیمامەوە، هەر سەیری دەکرد و نوقسان خۆی دەردەخست، هەر بۆیە شۆڕش بێ پسانەوە لە برەودا بوو، سا ڕۆژێک یەکێک لەم ئیمـامە بـێخەوش و مەعسـوومانە بچـنە سـەر کورسـیی حـوکم و بە یەک چەقەنە دنیا بکەنە ماستی مەیوو. ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە بووبووە بەربەسـت و گرێکـوێرەی نێـوان شـیعەو هەر دەسـتەڵاتدارێک لە

مەزهەبەکانی دیکە. هەر لێرەوە شیعە بە کافر، زەندیق و مولحید ناوبرا. ئیدی "الترفض- ڕەفزکردن" بووە ئاماژەی ڕەفزکردنی ئاین و دەسەلاّت پێکەوە. بە تێپەڕبوونی کات، مسوڵمانان وایان لێهاتبوو پێیان خۆش بوو پێیان بڵێن کافر یان زەندیق، بەس نەڵێن شیعە یان ڕافیزە. جێکەوتی ئەم دیاردەیە تا ئێستایش بەدی دەکرێت.

شایەنی باسە، فەقیهەکانی شیعە هیچ جۆرە پارەیەکیان لە دەوڵەتەوە وەر نەدەگرت، سەرچاوەی ژیانیان بریتی بوو لە سەرچاوە میللییەکان -لاکۆلانییەکان-. لەوانەیە خوێنەر سەری سووڕبمێنێت کە دەبیستێت، فەقیهەکانی ئێران بۆ ڕاپەڕاندنی ژیانی خۆیان، تەنها پشت بە سەرچاوە میللییەکان -لاکۆلانییەکان- دەبەستن و هیچ داهاتێکی حکومەتییان نییە، سەرباری ئەوەی دەوڵەتەکەیش شیعەی عەیارە بیستوچوارە. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە، ئەگەر ئاخوندێک زۆر هاموشۆی دەزگاکانی دەوڵەت بکات، خەڵکی بە چاوێکی سووک تەماشای دەکەن و دەمهەڵبەستی زۆری لە بارەوە دەڵێن، کە گوایە سیخوڕە، نا دەستگایە، نا کلکی لەگەڵ فلانە مەسولدا گرێیە... هتد.

ئەو ڕقەی لە دڵی شیعەدا دژی دەوڵەت دروست بووە، نارەحەت دەردەهێنرێت. زۆر سەختە کەسێک لە دەوڵەتەوە نزیک بێت و بیشتوانێت کەسایەتی -شەخسیاتی- خۆی پاراستبێت. لە ناشیرینترین جنێو کە بدرێت بە ئاخوندێکی شیعە، ئەوەیە کە پێی بڵێیت: "ئەو لە دەوڵەت مووچە وەردەگرێت". لە بنەڕەتیشدا ئەم دیاردەیە، وەک هەموو دیاردەکانی دیکە، چاکیی و خراپیی خۆی هەیە. لە هەمان کاتدا کە لە کۆیلایەتی دەوڵەت قوتاری دەبێت، دەیشبهێتنێتە کۆیلەی ئاو و هەوا و خورافەی گەل و کۆمەڵگەکە. زانایانی شیعە شانازی بە دانەخرانی دەرگای ئیجتیهادەوە دەکەن، بەلاّم لە واقیعدا سوودێکی ئەوتۆیان لێ وەر نەگرتووە. ئەوان قوتی خۆیان لە خەڵک وەردەگرن،

ئەو خەڵكەیش بە شێوەیەكی گشتی حەزیان لە تازەگەریی نییە، دڵیان زیاتر بە كولتوور و پاشماوەی باووباپیرانیان دەكرێتەوە.

لە ڕووی نەزەرییەوە و لە بوارە شەرعییەكاندا موجتەهیدێكی شیعە دەستكراوەیە، بەڵام لە ڕووی كردارەكیی -عەمەلی-یەوە ناتوانێت هیچ بكات، نەبادا ڕەشەخەڵك پێیان ناخۆش بێت و ڕزقەكەی ببڕدرێت. ئیدی موجتەهیدی شیعی لە زۆر كاتدا خۆی شتێكی لە ئاین هەڵێنجاوە، شتێكی دیكە بە خەڵكی دەڵێت. شیعە میراتگری موعتەزیلەن لە مەسەلەی "فەلسەفاویبوون" و "ئازادی بیركردنەوە"دا. لە پاش ئەو زەبرە كوشندەیەی متەوەكیل، ئیدی موعتەزیلە لە ناو شیعەدا توانەوە، هەموو میراتەكان تێكەڵ بە شیعە كرد. ئەوەی كتێبە ئوسوڵییەكانی شیعە بخوێنێتەوە، زۆرێك لە دیدگای فەلسەفی موعتەزیلە بەدی دەكات[٢٦٥]. لە گرفتی زانایانی شیعە: ئەوان دەئاڵێن بە فەلسەفەوە، بەڵام وا خۆیان نیشان نادەن لە بەردەم ڕای گشتیدا، ئەوان لە دەروونندا موجتەهیدن و لە ڕواڵەتدا لاسایی كەرەوە –موقەلید-. كەمترین زانایەكی شیعە دەبینین دیدگاكانی خۆی لە بەردەم ڕای گشتیدا دەرببڕێت. خۆ ئەگەر كەسێكیش زاتی ئەم كارەی هەبێت، ئەوا خەڵك بە شایەنی لەداردان و فەلاقەی دەزانن لەسەر بەردی گەرمی بیابان.

خاڵێكی گرنگی دیكەیش ئەوەیە، ئەم كۆیلایەتییەی موجتەهید بۆ خەڵك، وای كردووە هەمیشە موجتەهیدەكان لایەنگری ڕای گشتی بن لە شۆڕشەكاندا دژی دەوڵەت و سولتان. فەقیهەكانی شیعە بەشداری هەموو شۆڕشە جیاوازەكانی عێراق و ئێران و سوریایان كردووە. ئەو "بزووتنەوەی دەستوور"ـەی كە لە كۆتایی سەدەی ڕابردوو، سەرەتای ئەم سەدەیەدا سەری هەڵدا لە ئێران، هەمووی لە ڕێگەی

[٢٦٥]- أحمد أمين، ضحى الاسلام، ج٣، ص٢٦٧ – ٢٦٨ .

فتوای موجتەهیدە شیعەکانەوە سەری هەڵدا و هەر پیاوە ئاینییەکان خۆیان پشتیوانیشیان لێ کرد. ئەمە لە کاتێکدا، هەر لەوبەرەوە -لای عوسمانییەکانەوە- فەتوا لە لایەن پیاوانی ئاینی ئەوانەوە دەچوو، کە ئەم بزووتنەوەی دەستوورە لە ئاین دەرچوون و کافرن.

ئەگەر بێین و لێکۆڵینەوە بۆ ئەو بزووتنەوە نوێگەرییە بکەین کە شێخ موحەمەد عەبدە پێی هەستا لە میسر، دەبینین باخەوان و تۆوپرژێنی شۆڕشەکە، فەقیهێکی شیعە مەزەب بوو، بە ناوی جمالەدینی ئەفغانی. سەید جەمالەدین سەیدێکی عەلەوی ئێرانییە، تا ئەمڕۆیش خزمانی لە شاری ئەسەداباد دەژین لە وڵاتی ئێران. ئەفغانی وانە ئاینیی و فەلسەفییەکانی لە حەوزەی زانستی نەجەف خوێندووە، لەو سەردەمەیشدا شاعیری ناودار "موحەمەد سەعید حبوبی" هاوڕێی بووە. ئەو کاتەی سەید جەمال ڕێگەی میسر دەگرێتەبەر، نازناوی ئەفغانی لە خۆی دەنێت وەک "تەوقیە". خۆ ئەگەر وای نەکردایە، هەرگیز نەیدەتوانی ئەو شۆڕشە مەزنە هەڵایسێنێت لە میسر.

لە ساڵی ١٨٩٠دا دەوڵەتی ئێران هەموو مافی قۆرخکردنی دایە دەست یەک کۆمپانیای ئینگلیزی. سەید جەمالیش ئەمەی وەک هەلێک تەماشا کرد و نامەیەکی ئاراستەی میرزا حەسەنی شیرازی کرد -کە موجتەهیدی هەرە گەورەی ئێران بوو-، کە تێیدا ڕەخنە لەو کارەی حکومەت گیرابوو، کە دەبێتە هۆی قایمبوونی جێپێی داگیرکەران لە وڵات. ئیدی کاریگەری ئەم نامەیەی ئەفغانی وای لە "حەسەنی شیرازی کرد" فەتوای حەرامێتی تووتن و جگەرەکێشان دەربکات. بەهۆی ئەم فەتوایەیشەوە دەوڵەت بەڵێننامەکەی لەگەڵ کۆمپانیاکە هەڵوەشاندەوە، ناچاریش بوو قەرەبوویەکی زۆری کۆمپانیاکەیش بکاتەوە. کەسێکی جێمتمانە پێی ڕاگەیاندم، ئەو دەمەی سەید جەمالەدین هاتە سەردانی میرزا حەسەنی شیرازی لە سامەڕا، پاش

پێكگەیشتنیان، بۆ چەند سەعاتێك چوونە گفتوگۆی نهێنییەوە و ماوەیەكی درێژ هەر چپووڕیان بوو. كەس نەیزانی ئەم دوو ئاژاوەگێڕە، چییان دەگوت و دەگوتەوە. لەوانەیە خەریكی گەرمكردنەوەی ئەو بووركانە خامۆشە بووبێتن.

*** *** ***

لە پاش داگیركرانی عێراق لە لایەن ئینگلیزەوە لە جەنگی یەكەمی جیهانی، فەقیهانی شیعە بەیداغی شۆڕشیان لە دژیان بەرز كردەوە. سەركردەیشیان لەم شۆڕشەدا میرزا محمد تەقی شیرازی بوو، كە وەك جێگرەوەی میرزا حەسەنی شیرازی، كاروباری شیعەی ئەو دەورانەی بەڕێوە دەبرد. موجتەهیدی ناوبراو فەتوای شۆڕشی دژی داگیركەران دەركرد، واجبیشە لەسەر مسوڵمانان بڕە زەكاتی سامانیان بدەنە شۆڕشگێڕان تا بیدەنە چەك و تفاقی جەنگ. فەقیهەكانی نەجەف و كەربەلا و كازمیە ڕۆڵێكی گەورەیان لە شۆڕشی ١٩٢٠دا گێڕا. ئەوان بەم شێوەیە بەردەوام بوون تا ڕەوانەی ئێران كران وەك ئاشكرایە. "ئالمیس بێل" دەڵێت: ((پیاوانی ئاینی لە ڕیزی پێشەوەی شۆڕشەكانی عێراق بوون لە دەورانی جەنگی جیهانی یەكەم و دواتریشدا. ئەمەیش وایكرد، پیاوانی دەوڵەت هەستن بە كردنەوەی قوتابخانەی هاوچەرخ تا ئاستی دینداری نەوەی نوێ لاواز بكەن و شۆڕش هەر لەبنەوە ڕیشەكەن بكەن[٢٦٦]. قسەی ئەم فەیلەسووفە جێگەی تێڕامان و بیركردنەوەیە بەڕاستی. ئێمە نازانین دەسەڵاتداران توانییان ئەو پلانە جێبەجێ بكەن یان نا؟

[٢٦٦]- مصطفى عبدالرزاق، محمد عبده، ص٥٧.

مەسەلەی دینداری لای گەنجانی عێراق ئێستا تا ئەوسا زۆر لاواز بووە. ئەم دیاردەیەیش لە لایەن زۆرێک لە سەردانیکەرانەوە تێبینی کراوە. لە بنەڕەتیشدا ئەم خوێندنگەیانە ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لە سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیەدا. داگیرکەران تەماشای فەقیهەکانی شیعەیان دەکرد کە بێوچان خەریکی گەرمکردنی خەڵکین لەسەر شۆڕش دژی دەسەڵات. لەوانەیە داگیرکەران ویستبێتیان بیری سیکۆلاریزم -عەلمانیەت- لەناو گەنجاندا برەو پێ بدەن، تا ئەوانیش دژی فەقیهەکان ڕاپەڕن و ئەمجارە ئەمان شۆڕشیان لە دژ بکرێت و نفوزی ئەم فەقیهانە کەم بکەنەوە. لەوانەیە فەقیهەکان هەستیان بەم شتە کردبێت، هەر بۆیە فەتوای حەرامێتی دەرسخوێندیان لەو شوێنانە داوە. بەڵام دیسانەوە ئەم حەرامکردنەیش بەسەریاندا شکایەوە و بوویەوە بەهۆی کەمبوونەوەی نفوزیان. خەڵکی سەرباری حەرامکردنی شتەکەیش، هێشتا ڕۆڵەکانیان دەنارده ئەوێ کاتێک دەیانبینی خوێندن لەوێ دەبێتەهۆی دەستکەوتنی کاری باش - وەزیفە- و پلەی بەرز.

فەقیهەکان وەزیفەکانیشیان حەرام کرد، بەمەیش قوڕەکەیان خەستتر کردەوە، چونکە خەڵکی واز لە خۆشی دنیای خۆیان ناهێنن لەبەر خاتری پیاوانی ئاینی. ئەوان ئاینیان وەک نەریتێک تەماشا کردووە، هیچ گرفتێکیشیان لەگەڵیدا نییە تا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا بەرکەوتن ڕوونەدات، بەڵام ئەگەر ئاین بووە ڕێگری بەرژەوەندی، زۆر بە ئاسانی دەیخەنە پشتی کەندووەوە. حوسەینی کوڕی عەلی دەڵێت: ((خەڵکی کۆیلەی دنیان، دینیش وەک ئامرازێکی مەعیشەت لەسەر زاران هەڵدەچەرخێنن، خۆ ئەگەر بووە هۆی بەلایان، ئەوا دینداریيان لاواز دەبێت)). خەڵکی هەڵەداوان دەچوونە ئەو خوێندنگەیانە بە هوتافەوە: ((خوێندەواری پێویستە لەسەر هەموو

مسولمانێک))، خۆی لە ڕاستیشدا ئەوان بۆ دەسخستنی پارە و سامان دەچوونە خوێندن، بەلام پاساویان بۆ دەهێنایەوە کە ئەم واجبە و مسولمان چۆن دەکرێت نەخوێندەوار بێت. ئەمانجی هەر یەکێکیان دەسخستنی بڕوانامە بوو، ئەگەر دنیایش بڕمێت بەسەر خەڵکەکەیدا، لای ئەم تەنها بڕوانامەکەی دەستکەوێت و هیچی تر.

لێرەوە تایەفەگەرایی بە شێوەیەکی دیکە سەری هەڵدایەوە. ئەمە لە کاتێکدا پێشتر تایەفەچێتی لەسەر مەزەب و شۆڕش بوو، ئێستا لەسەر وەزیفە و کارمەندییە. نەزعەی ئاینی لای خەڵکی عێراق سست بوو، لە جێگەیشیدا نەزعەی بێدینی و تایەفەگەرایی سەری هەڵدا. ئەمەیش جێگەی سەرسووڕمانە. دەتوانین بڵێین هەرچۆنێک بێت، بابەتی تایەفەگەری لە عێراق ڕوو لە خۆراوایە، چونکە ئەو لە پاش سستبوونی باوکی (کە ئاین بوو) ناتوانێت بۆ ماوەیەکی زۆر، لە مەیدان بمێنێتەوە و بەرگری بکات، ئەو ئێستا لە "گیانەلا"دایە، درەنگ یان زوو بە دیداری باوکی شاد دەبێت. ئەوەی کە تایەفەگەریی هێشتووەتەوە لە عێراقدا تەنها بریتیی بوو لە خۆشەویستی وەزیفە، ئەم وەزیفەیەیش هەر بەم چەشنە بەرچاو نابێت، کەم کەم پڕ دەبێتەوە و خەڵکی ناچار بۆ قوتی خۆیان ڕوو لە قاپی تر بکەن. وا خەریکە ژیان وای لێدێت کە خەڵکی تێبگەن کە دەتوانن لەسەر شێوەی دیکەیش بژێن و کاروانی کۆمەڵگەیش ڕۆژێک لە ڕۆژان دەگاتە وێستگەی کۆتایی.

**** **** ****

شایەنی باسە: سستبوونی ڕۆڵی ئاین لە عێراقدا بوویە هۆی

زۆربوونی شۆڕش، لە جێگای کەمبوونەوەی. ئەوان ویستیان نەزعەی علمانیەت بێنن تا کەفوکوڵی خەڵکی دامرکێنن، بەڵام کوپە ڕۆن بەسەر سەری خۆیانەوە شکا و لە جێگای سەری خەڵک چەورکردن، سەری خۆیان چەور بوو. کاتێک نەوەی نوێ وازی لە دەمارگیری ئاینی هێنا، خێرا شوێنگرەوەیەکی بۆ ئەو بۆشاییە دۆزییەوە، لە جاران زیاتر دڵگەرم بوونەوە، هێندە دڵگەرم بوون، هیچ ناوچەیەکی عەرەبی بەم چەشنەیان لێ نەهاتبوو.

لێرەوە تێدەگەین: سروشتی مرۆ مەیلی بەلای ئاینەوەیە، کاتێک یەکێک لە ئاینێکی ئاسمانی دادەڕندرێت، ئەوا ناچارە ئاینێکی زەمینی بۆ خۆی پەیدا بکات.

# بەشی دوانزیەم

# پەندوەرگرتن لە مێژوو

پێشینان وایان دەزانی، دادوەری کۆمەڵایەتی "بیرێکی ڕووتە- الفکر المجرد" دێت بە مێشکی دەسەڵاتدارەکاندا و پاڵیان پێوە دەنێت بۆ گرتنەبەری ڕێگای عەدالەت. بەڵام ئەم ئایدیایە لە لایەن لۆژیکی نوێوە پەسەند نەکراوە. بیری پەتی ناتەوانە لە بەرهەمهێنانی "سلوک-

ڕەفتار-کار'دا، چونکە مرۆ هیچ نییە بێجگە ئامێرێک بەدەست بارودۆخە دەروونی و کۆمەڵاتی و شارستانییەکەوە. هەر بۆیە 'بیر' بوارێکی زۆر کەمی هەیە لە مەیدانی گۆڕانکاریدا. دادوەری کۆمەڵایەتی تەنها لە ڕێگەی ترسان یان ترساندنی سوڵتان لە ئاگری جەحەندەمەوە بەرپا ناکرێت. فەرمانڕەوا وەک تۆ خۆفی خودای لە دڵدایە، ئەویش وەک تۆ لەبەر قاپی خودا دەپاڕێتەوە. بۆیە ئەگەر تۆ سەد جاریش ئامۆژگاریی بکەیت، هەر ئاوت بێژاوەتەوە، ئەو هەر ستەم دەکات و داوای یارمەتیش لە خودا دەکات.

عەدالەت دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و هەرگیز بەرپا ناکرێت مەگەر پاش ململانێی حاکم و مەحکوم (فەرمانڕەوا و گەل). فەرمانڕەوا هەرگیز لە خۆیەوە ناتوانێت دادپەروەر بێت، چونکە بەر لە هەموو شتێک، ئەو مرۆڤە، مرۆڤ. پڕە لە عەیبی مرۆیی و سروشتی، هەموو ئەو عەیبانەی کە لە بەشەکانی دیکەدا باسمان کردن. بۆیە ئەو هەرچەندەیش لە خواترس بێت، هەر لەو عەدالەتە تێناگات کە دانیشتوانەکەی لێی داوا دەکەن و چاوەڕێن لێی. مرۆڤ لە هەر سەردەم و شوێنێکدا هەر مرۆڤە. ئەو هاوڕێیەت کە دڵت پێی دەکرێتەوە، جارجارە دەکەویتە گومان 'تۆ بڵێیت ئەمە فریشتە نەبێت؟'، ئەم فریشتەیە بچێتە سەر دەور و عەبای ئاغایەتی لە شان بکات، دەبێتە ستەمکارێک، وێنەی نەبێتەوە لە دنیادا. ئەو ئێستا خاوێنە، چونکە دەستی بەر کورسیی دەسەڵات نەکەوتووە، تۆ چووزانیت ئەو دەمەی ڕۆیشتە سەر کورسی و شەقوەشێنەکانی لە بەردەرگا چاوەڕێی فەرمان و ماستاوچییەکان بە دەوروخولیدا و سەماکەری کەمەر باریکی هەر وەک کلۆی بەفریش لە دیوەخان سەمایان بۆ دەکرد. پەندێکی ئینگلیزی دەڵێت: 'ئەگەر ویستت کەسێکت بۆ دەرکەوێت، ئەوا یان ماڵ یان دەسەڵاتی بدەری.'

چاكسازی شتێكی ڕێژەییە، هێندێكی لێ ڕازی و هێندێكیشی لێ ناڕازی دەبن. پادشا هەرچەندەیش پیاوچاك و دادپەروەر بێت، بەڵام نازانێت دەستەودایرەی، خزم و كەسی چ خۆشڕابوێری و پاوانخوازییەك لە ڕێگەی ئەمەوە ئەنجام دەدەن. ئەمان خەڵكی لێ دەتارێنن بەبێ ئەوەی ئەم ئاگای لێبێت. ئەم تەنها بزەی سەر زاران و بەڵێ قوربان و دەست لەسەر سیەنەیان دەبینێت و نازانێت لە پشتەوە چ قوڕێكیان بۆ گرتووەتەوە. هەموو فەرمانڕەوایەك بە كۆمەڵێك خەڵك دەورە دراوە، كە خەڵكی لێ دوور دەخەنەوە، ناهێڵن خۆی ڕاستەوخۆ گوێبیستی خەڵكی ببێت. ئەو خۆی دەخەڵەتێنێت و دەچێتە لای خەڵكی تا گوێی لە گلەیی و گازەندەكانیان بێت، بەڵام سەرباری ئەمەیش ناتوانێت هیچێكی ئەوتۆیان لێ تێبگات، بێجگە لەوەی كە دەسەودایرەكەی پێشوەخت تێیان گەیاندووە. ئەو لە بنەڕەتدا چاكەی بۆ خەڵكی دەوێت، بەڵام بێخەبەر لەوەی چی لەملاولادا دەگوزەرێت. ئەوانەیش كە خەبەرداری گرفتەكانی كۆمەڵگەن، دەستەودایرەكەی ژێرچنگی خۆین، بەڵام ئەوانیش خۆیانیان لێ كردووەتە كەڕەی شەربەت.

پێوەندەكانی سوڵتان دەتوانن ڕەش لە بەرچاوی بكەنە سپی، ئەگەر خەڵكی بۆ تێكەنانێ ڕاچەنن، ئەمان دەڵێن: قووربان ئەمانە داوای پاقلاوەمان لێ دەكەن. هەژارێك هات و شەكوای حاڵی خۆی كرد، ئەمان وا لە سوڵتان تێدەگەیەنن، كە ئەمە زندیقە و كافرە، لە ژێرەوە خەریكی كەنەكردن و چاڵهەڵكەندنە لە ئیسلام. تا ئێرەیش هەر كار بە تەواوی لە كار نەترازاوە، بەڵام ئەوەندەی كە پیاوانی ئاینی كەوتنە ماستاو و بوونە واعیزی دەربار و چڵكاوخۆری سوڵتان، ئیدی كار لە كار ترازاوە. ئەمان سوڵتان دەچوێنن بە سێبەری بەرجەستەی پەروەردگار لەسەر زەوی، هەموو پێغەمبەران و مەلایك دەكەنە

تکاکار لای خودا، تا خودا دەستی بە باڵی سولّتانەوە بێت و هەر بەرقەراری بکات لەسەر ئەم فەرمانڕەواییە پیسەی. ئیدی سولّتان گورگێکە لە پێستی مەڕدا.

*** *** ***

بە دەرکەوتنی شار، دەوڵەتیش بۆ یەکەمجار لە مێژوودا سەری هەڵدا. وەک ئەوەی کە دەرکەوتووە، تەمەنی لە ٦ هەزار ساڵ تێپەڕ نابێت. ئیدی بەر درووستبوونی شار، سیستەمە مرۆییەکان هەمووی میرنشینیی بوون و دەوڵەتێک یان سولّتانێک نەبووە فەرمانڕەوایی بکات. بە دەرکەوتنی شار، فەرمانڕەوا پاوانخوازەکانیش دەرکەوتن، خەڵکی دەچەوسێنرانەوە بە دەستیانەوە بەو شێوەیەی کە دەچەوسانەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو، پێشتر کەسێک ڕابەرایەتی دەکردن، کە خۆیشی لە کاتی نارەحەتیدا لەناویاندا بوو، هەر بۆیە نەیدەتوانی دەست بەسەر کاروباریاندا بگرێت، مەگەر خۆیان بیانویستایە.

لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتدا، ستەمی کۆمەڵایەتیش لەدایک بوو. گومان لەوەدا نییە، بە دروستبوونی دەوڵەت، مرۆ زۆر پێکەوتنی بە خۆیەوە بینی، شارەکان بنیات نران، پەرستگاکان دامەزران، زانستەکان پێشخران، هونەرەکان بەرەوپێش بران، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خەڵکیش بە کۆیلە کران وماڵیان برا. بە دەربڕینێکی دیکە: دەوڵەت گەشەی بە شاردا و گەشەی بە داگیرکاریش دا پێکەوە. هێندێک کەسی سەخیف سەرسامن بە شوێنەوارە کۆنەکان و وەک شکۆی ڕابردوو تەماشای دەکەن. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە هیچ شتێکی

تیـدا ناخوێنـدرێتەوە جـگە لە سـتەمکارییەکی زۆر قێـزەون. ئەم شـوێنەوارە زەخـم و گەورە و سەرنجڕاکێشـانەی کە ئەو سـووکانە شانازی پێوە دەکەن، بناغەکەی لە تەرمی باوکە کرێکار و داماوەکان دروسـت کـراون و خشـت و بلـۆکە کەیشـی لە خـۆڵ و فرمێسـکی بێوەژن و منداڵی هەتیو پێکهێنراوە. هیچ تەلارێک بەرز نەکراوەتەوە تا بەندی سەدان قامچی نەقرتابن لە ئەنجامی دان لە پشتی کرێکاری بێدەرەتان.

ئەوەتا حافز ئیبراهیم سەنای ئەهرامەکانی میسر دەکات و دەڵێت و لە زاری فیرعەونەوە قسە دەکات:

**وقف الخلق ينظرون جميعا**

**كيف أبني قواعد المجد وحدي**

**خەڵکی هەموو تەماشاکارن کە چۆن**

**بە تەنها ئەم بناغەی شکۆیەم دامەزراند.**

شاعیرێکی دیکە بە ویژدانەوە دەڵێت:

**وقف الخلق ينظرون جميعا**

**كيف أبني قواعد الظلم وحدي**

**خەڵکی هەموو تەماشاکارن کە چۆن**

**بە تەنها ئەم بناغەی ستەمەم دامەزراند.**

ڕۆژێکیـان لەگەڵ هاوەڵێک پێکەوە تەماشـای دەسـکارێکی سـەردەمی زێڕینمـان دەکرد، ئەو هەڵیـدایە و گـوتی: "بـڕوانە شـکۆی باپیرانمـان". منـیش هەڵمـدایە و گـوتم: "باشـتر وایە بڵێیـت، بـڕوانە سـتەمکاریی باپیرانمان". بەهای دروستکردنی شارێکی کۆن، چەندین مرۆڤ بووە.

هەرچەنــدە پێشــکەوتنێکی مــاددی بــووە، بەڵام لە هەمــان کاتــدا پاشکەوتنێکی کۆمەڵایەتیش بووە. هەتا شکۆی سولتان زیاتر بووبێت، زەبروزەنگیشی بەسەر خەڵکییەوە زیاتر بووە. ئەو گێژانەی کە دڵ بە شـکۆی باپیرانیـان خـۆش دەکەن، نـازانن، لەوانەیە باپیرەیـان یەکێـک بووبێت لە کۆیلەکانی پادشا و نەنکیشیان کەنیزەکی دەربار و کۆشکە بڵندەکان. جێگەی سەرسوورمان نییە کورە ئاغا و شەقوەشێن دڵی بە دەســکاری باوبــاپیرانی خۆیــان خۆشــکەن، بەڵام کــورە هەژار و بێدەســتوپێ نابێــت دڵــی پێیــان خــۆش بێــت. یــان ئەوەتــا ئەمــڕۆش دەیانەوێت وەک باووباپیرانیان هەر کۆیلە و ژێردەستە بن.

مێــژووی کەونــارا دوو جــۆری لە تەرزی بیرکــردنەوە بە خــۆیەوە بینیــوە. یەکێکیــان بانگەشــەی شــکۆ و داگیرکــردن -فەتــح- و خۆشــڕابوێری کــردووە، ئەوی تریشــیان داوای بەرقەرارکردنــی عەدالەتی کۆمەڵایەتی کردووە. لێرەیشەوە خەڵکی بوونەتە دوو بەرە: بەرەی دەوڵەت، بەرەی شـۆڕش، ئیـدی مێـژووی کـۆنی شــارەکان بریتییە لە کارلێکی ئەم دوو بەرەیە. هەر لێرەیشـەوە مێژوو لێوانلێوە لە دوو جۆر جەنگ، یەکێک داگیرکردنی خاکی دەرەکی، ئەویتریشـیان شۆڕشـی نـاوەکی. تـا ڕووبەری جـوگرافی زیـاتر بێـت، دابەشـبوونی ناوەکیش زیاتر دەبێت. شایەنی باسە سەرانی شۆڕشی ئەوسا لەسەر ڕێتمی ئەو پێغەمبەرانە بوون کە ئاینی نوێیان دەهێنا، ئەو بیروباوەڕە ئاینییە کۆنەی کە لەناو خەڵکیدا باو بوو، دەسەڵاتیش بۆ برەودان پێی، چەنـدین پیـاوی ئـاینی دەهێنـایە مەیـدانەوە بـۆ خزمەتکردنـی، بەڵام پێغەمــبەران هەموویانیــان هەڵدەتەکانـد پـێکەوە و دینێکـی تــازەی شۆڕشگێڕانەیان دەهێنایە مەیدان.

قورئان دەڵێت:

قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم

بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ سبأ: ٣٤
ترسێنەری خۆمانمان بۆ هەر گەلێک ناردبێت، خۆشڕابوێرەکانی ناویان گوتوویانە: ئێمە بەم شتە تازەیەی ئێوە هێناوتانە کافرین].

قورئان خەڵکی بۆ دوو پۆل پۆلێن دەکات، یەکێکیان ترسێنەر و ئەوی دیشیان خۆشڕابوێر. بە گوزارشتی ئیمڕۆژی، ترسێنەر سەرکردە خۆماڵییە شەعبییەکانن و خۆشڕابوێریش ئەوانەی ناو کۆشک و تەلار. کە مێژووی پێغەمبەرانی کۆن دەخوێنینەوە، دەبینین هەژار و ستەمدیدە و لێقەوماوان شوێنی کەوتوون، بڕۆ تەماشاکە، نوح، ئیبراهیم، زارا، موسا، عیسا، سوقرات، ئەشعیا، عیسا و موحەمەد و بێجگە لەمانەیش، ئەمانە هەموویان بوونەتە مایەی چەنجاڵی و سەرقاڵی، لە پەناشدا ڕێبەری بزووتنەوە شەعبییەکان بوون.

قورئان لە بارەی خۆشگوزەرانەکانی دەورانی نوحەوە پێمان دەڵێت: ئەوان گاڵتەیان بە نوح دەکرد و پێیان دەگوت: ئەوانەی شوێنت کەوتوون هەموو سووک و ڕسواکانن، لە ڕاستیشدا ئەوانەی شوێن پێغەمبەران کەوتوون بە تووڵیی تاریخ هەر سووک و ڕسواکان بوون - العیاذ باللە. هێندێک کەس لەم سەردەمەدا وا دەزانن ئاین خەڵکی بۆ ملکەچی و سەرشۆڕی بەرانبەر بە فەرمانڕەوا پەلکێش دەکات، ئەم قسەیە ڕێک لەسەر ئەو ئاینە بەکرێگیراوە ڕاستە کە سوڵتانی ستەمکار بۆ خۆی داتاشیوە، بەڵام ئەو ئاینەی کە پێغەمبەران و ترسێنەران هێناویانە، بە هەموو شێوەیەک بانگەوازکاری شۆڕشە. ئێمە پێویستە جیاوازی لە نێوان ئاین و کەهەنووت بکەین وەک مامۆستا خالید دەڵێت.[٢٦٧] هەر ئاینێک پاش دەستبەسەرداگرتنی لە لایەن سوڵتانەوە و دروستکردنی واعیز بۆی، دەبێتە کەهەنووت.

---

[٢٦٧]- خالد محمد خالد، من هنا نبدأ، ص٤٦ و دواتریش



شۆڕش یەکێکە لە نەزعە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەی پێشکەوتوو. ئەم کۆمەڵگەیە ناتوانێت دەستبەرداری ئەم سیفەتە ببێت مەگەر ئەو کاتەی دەیەوێت خۆی لەناو بەرێت. لەوەتەی سیستەمی دەوڵەتداری دەرکەوتووە، شۆڕشگێڕیش دەرکەوتووە، ئیدی ئەم ململانێیە نەوە لە دوای نەوە هەر بەردەوام بووە و بەردەوامیش دەبێت. دیموکراتی لە ئەنجامی ئاکاری مندالانەوە سەری هەڵنەداوە وەک واعیزەکان دەیڵێن، بەڵکو ئەمە بەرئەنجامی ململانێ و بەریەککەوتنی گەل و دەسەلاتی ستەمکارەوە سەرچاوەی گرتووە. دیموکراسی و شۆڕش تا ئەمڕۆیش پێکەوەن. مێژووی ئێمەیش گوزارشتە لە زنجیرەیەک شۆڕشی بێکۆتایی.

سیستەمی دەنگدان، ئەوەی کە دیموکراسی لەسەر بنیات نراوە، هیچ مانایەکی نییە بێجگە لە شۆڕشێکی دەمامکدار. هەڵبژاردن خۆی لە بنەڕەتدا شۆڕشێکی بێدەنگە. ئەوەتا خەڵکی دەچنە سەر سندوقی دەنگدان وەک چۆن پێشینانیان دەچووە مەیدانی جەنگ. سوڵتانەکانیان ڕادەماڵن و جێگۆڕکێی پێ دەکەن. میستەر لیمان دەڵێت: شۆڕشگێڕانی ئێستا، وەرەقەی دەنگدان لە جێگای فیشەکی جاران بەکار دەهێنن. پێشینانی ئێمە ئاگا و خەبەریان لە هەڵبژاردن نەبوو، یان لەوانەیشە زانیبێتیان، بەڵام توانای جێبەجێکردنیان نەبوو، هەر بۆیە پەنایان بۆ شمشێر بردووە بەڵام لەمڕۆدا خەڵکی خوی بە کارتی دەنگدانەوە گرتووە، لێرەیشەوە ڕێوڕەسمی مێژوو شێوەیەکی هێمنی پارێزراوی وەرگرتووە. حکومەتی سەرکەوتوو ئەوەیە، خۆی ڕێگە بۆ شۆڕش خۆش بکات، نەک بەرهەڵستکار بێت، چونکە شۆڕش هەر ڕوو دەدات و ئەوە شتێکی حەتمییە. "کاروان دەڕوات و سەگیش دەوەڕێت" وەک

ئەوە پەندە عەرەبییەی کە وتراوە.

هیچ شۆڕشێکی چەکداری لە ولاتێکی دەستگرتوو بە چەمکەکانی دیموکراسی ڕاستەقینەوە ڕوو نادات. لەبەر ئەوەی حکومەتی دیموکراسی لە قووڵایی ناو خەڵکەوە هەڵبژێردراوە. ئەو گوزارشتە لە ویستی شاراوەی خەڵکەکە. وەک ئەبراهام لینکۆڵن دەڵێت: "ئەو لە گەلەوە، بە گەل و لەپێناو گەلدایە". زۆر بە نامۆ دەبیستین شۆڕشێک لە ولاتێکی دیموکراسی ڕاستەقینەدا هەڵایرسێت. مانای ئەوە نییە خەڵکی ئەم دەڤەرە مەڕن و هەستیان نییە، بەڵکوو ئەوان دەزانن ڕێگایەکی باشتر، مەترسی کەمتر هەیە کە بگەنە هەمان ئامانج، ئەویش دەنگدانە کە دوورە لە دەستی دەسەلاتدارە سووکەکان. ئەوان هەر ماوە و جارێک فەرمانڕەوای خۆیان دەگۆڕن، ئیدی نە خوێن دەڕژێت و نە جەنگیش بەرپا دەکرێت. ئەو دەوڵەتەیشی دانیشتوانەکەی خۆی لەسەر ڕێگای شۆڕشی بێخەتەر ڕانەهێنێت، ئەوا بێگومان دەرەنجامەکەی هەر ڕانی خوێن و بەرپابوونی هەراوهوریایەکی لێ دەکەوێتەوە کە سەرەتاکەی دیارە، بەلام بنەتاکەی دیار نییە.

*** *** ***

لەم کتێبەدا: لە ڕوانگەی لۆژیکی هاوچەرخەوە، خوێندنەوەمان بۆ مێژووی ئیسلامی کرد. لە ئەنجامدا دوو بەرەمان بینییەوە کە لەپێناو مانەوەدا تێدەکۆشن، یەکێیان سوڵتانەکان و ئەویتریشیان شۆڕشگێران. مەعاویە "پادشایەتی بە میرات"ی لە ئیسلامدا دامەزراند و لە کەناریشیدا چرای شۆڕش هەڵکرا، ئیدی ئەم دوو جەمسەرە

نەوە لە دوای نەوە بەردەوامییان پێ بەخشرا. لە ڕێگەی باوکی ڕەحمەتییەوە، کوڕ دەبووە سوڵتان، ئەو هیچ هونەرێکی سیاسەتوانی نازانێت بێجگە لە خۆشبیینین بە میراتەکەی باوکییەوە، پاشان شەقوەشێن و سیخوڕەکانیش پاس دەدات بۆ پارێزگاریکردن لەم میراتە. بەو شێوەیەی ئەگەر سوڵتان بە ڕەحمەتی خودا بچوایە، ئەوا خێرا ماستاوچییەکان بەیعەتی جێگرتنەوەیان دەدا میراتگرەکەی.

لە سەردەمی ڕاشیدیندا، بەیعەت بە هەڵبژاردن بوو، ئیدی پاش ئەمان کارەکە تەنها بووبە تەمسیل و شانۆگەری. ئەوەبوو چلکاوخۆرەکان ڕێوڕەسمێک، شتێکیان ڕێک دەخست، یەکێکیان بەیعەتی دەدایە جێگرەوەکە، دووەمیان قورئانی بەسەردا دەخوێندنەوە. سێیەمیان دەستی بەرز دەکردەوە و دەیگوت: خودایە دین و دەوڵەتمان بۆ بپارێزە، چوارەمیش فاتیحەی دەخوێند و پێنجەم "ئامین!"ی دەکرد. ئا بەم شێوەیە خەلیفایەتی لە پاش ڕاشیدین گوزەرا، بۆیە لە بەرەی بەرانبەرەوە شۆڕشگێڕان سەریان هەڵدا لە دژی ئەو دەوڵەت و دینەی کە خەڵکی لە سێبەردا دەچەوسایەوە. لێرەوە مسوڵمان بوونە دوو بەرە، یەکێکیان بانگەوازی بۆ شکۆ و فتوحات دەکرد، یەکێکی تریشیان بۆ شۆڕش و دادوەری کۆمەڵایەتی. هەردوو بەرەکەیش داوایان لە خودا دەکرد سەریان بخات بەسەر نەیارەکانیاندا. ئێمە نازانین خودا یارمەتی کام لایانی داوە.

دکتۆر ئەحمەد ئەمین دەڵێت: ((من دەڵێم ئەگەر موسوڵمان یەکدەس و یەک بیر بوونایە، ئەو وزەیەی لەپێناو ملکەچکردنی یەکتریدا خەرجیان کردووە، بۆ فتوحات بەکاریان بهێنایە، ئەوا زۆرینەی جیهانیان دەخستە ژێرڕکێفی خۆیانەوە -بۆ نموونە ئەو هەموو وزەیەی عەباسی و ئەمەوی بۆ ملکەچکردنی عەلەوییەکان بە خەرجیان دا، یان بە پێچەوانەوە، ئەوەی کە عەلەوییەکان سەرفیان کرد بۆ ملکەچکردنی

ئەوانی دیکە- ئەو کاتە ڕەنگە ڕێڕەوی مێژوو جۆرێکی دیکە بوایە و بە شـــێوەیەکی دیـــکە بنووســـــرابایەتەوە، بەڵام شــــەهوەتی دەســـەلاتدارەکان لە هەمـــوو ســـەردەمێکدا یەکڕیـــزی تێـــک دەدات و هێزیان لە ئەژنۆدا ناهێڵێت)).

لەوانەیە ئەم دکتۆرەمـان بە قاڵـب لە سـەدەی بیسـت و بە مێشـک لە سەدەی دەیەمدا بژێت. ئەو دەیەوێت مسوڵمانان سەربکەون و جیهان فەتـح بـکەن، ئیـدی گـوێی لەوە نیـیە ئەم شـێوازەی فەتـحە، لەوەی گەورەمان "تەیموری لەنگ"یش بێت. دکتۆر بیری چووە کە شۆڕش سروشتێکی بنجی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانە. ئیدی ئەگەر سیسـتەمی دەسەلات دیکتاتۆری بێت، ئەوا بێگومـان ستەم بەرقـەرار دەبێت، ئەو کـاتەیش درەنـگ یـان زوو خەڵـووزی شـۆڕش دەبێتە پشـکۆ. ئەگەر عەلەوییەکـانیش شۆڕشـیان بەرپـا نەکـردایە، هەر جێگـرەوەیەک بـۆ بەرپاکردنی شۆڕش پەیدا دەبوو. سروشتی مرۆ لەو ڕێچکەیە لانادات و جێگۆرکێیش قەبووڵ ناکات.

واعیزەکـــانی ســـوڵتان ناوبـــانگی عەلەوییەکانیـــان شـــێواندووە و تۆمەتباریـان کـردوون بە گەیشـتن بە کورسـیی دەسـەلات. خۆ ئەگەر بێیـنە ســەر واقیـع، ئەوا عەلەوییەکـانیش وەک ئەم عەشـاماتە هەر بنیادەم بوون و ئەوانیش حەز و ئارەزووی خۆیانیان هەبووە. زۆر دووری بـــۆ نـــاچین کە وەک ئەوە بـــووبێتن کە دوژمنەکانیـــان تۆمەتباریـان دەکەن. لـۆژیکی هـاوچەرخ جیـاوازی لە نێـوان حەز و ئارەزووی کەسەکاندا ناکات، بەڵکوو ئەوان زیاتر تەماشای ئەو لایەنە دەکەن کە کەســەکان مەیلـی سـالب یـان موجەبیـان بەرانـبەری هەیە. مێژووی شاریش هیچ نییە جگە لە مێژووی ململانێی ئۆپۆزسیۆن و پشــتیوانەکان. لایەک ڕیفۆرمخــواز و لایەکەی دیکەیــش پارێزکــار- موحافیزکـــار، وەک دێـــتە بەرچـــاو، ســـەرکەوتنی کۆتـــاییش بـــۆ

ڕیفۆرمخوازەكانە، چونكە لەسەر شانی ئەمان دیموكراتییەت بەرپا دەكرێت.

*** *** ***

زۆر جێگەی داخە عێراقی هاوچەرخ تەژی بووە لە بیرۆكەی سولّتانی. زۆرینەی خوێندەوارەكانی هیچ ئاگایان لە گوزەرانی هەژار و نەدارەكان نییە و هەموو كۆششێكیان بریتییە لە گەڕاندنەوەی شكۆی باوان. ئەوان تەنها بە گەڕاندنەوەی شكۆی هاروونە ڕەشید دلّیان ئاو ناخواتەوە، دەیانەوێت شكۆی حامورابی و ئاشوور پانیپالّیشمان بۆ بگەڕێننەوە، خۆ ئەگەر دانیشتووی سەمەرقەند بوونایە، ئەوا هەولّی گەڕاندنەوەی شكۆی تەیموی لەنگیشیان دەدا. ئەوان هەر خەریكی نۆژەنكردنەوەی قەسر و باڵەخانەكان و گوتنەوەی مارشەكانن، تا ئەو كاتەی بێگانەیەك دێتە ولّات سەری لە كاری خودا سووڕبمێنێت و بلّێت بەهـ بەهـ چ ولّاتێكیان هەیە... ئەمە گومانیانە. ئەو دەمەیشی گوێ لە سروود و مارشەكانیان دەگرین، هەر زوو زوو دەیلّێنەوە "نیشتیمان- نیشتیمان"، نازانم مەبەستیان لێی "نیشتیمانە"، ئەو نیشتیمانەیە كە پڕە لە سەگ و گورگ و شەقوەشێن و خۆشخۆر؟ هەرای ڕەجالّیش باری هەر چل مەنە و زەمین ڕاخەر و ئاسمان بالیفیەتی.

ئەگەر بكرایە ئەم هەموو كەلەپوورەیان بفرۆشتایە بە ولّاتانی دیكە و بە پارەكەی كەمێك خزمەتی ڕەشەخەڵكیان بكردایە زۆر باشتر بوو. گرفتەكە ئەوەیە ئەمانە دەیانەوێت ولّاتانی دنیا فەتح بكەن، بەلّام ناتوانن ئەوەی خۆیان فەتح بكەن و كەمێك لە دەغەز و نەخۆشیی

دووڕوویی و نەفـامی ڕزگـاری بـکەن. ڕۆژگاریـک بەسـەر عێراقـدا تێپەڕی، کە کاربەدەستەکانیان هیچ جیاوازییەک لەگەڵ ناڵە و نرکەی هەژار و دەنگی دەهۆڵ و زوڕنادا نەدەکرد و تەنها و تەنها هوتافی: "بۆ پێشەوە... بۆ پێشەوە"یان دەگوتەوە، بەبێ ئەوەی بیشـزانن کامە ئەو "پێشەوە"یەیە کە دەیانەوێت.

*** *** ***

نفوزی واعیزەکانی ئاین دای لە کەمی و هیی واعیزەکانی پێشکەوتن کەوتە بـرەو. ئەوەی کە سـەمەرەیە، واعیـزی فەرەنگـی لەبەر، هـیچ جیاوازییەکی لەگەڵ واعیزی جبەو مێزەرلەسەر نییە مەگەر بە سیپاڵی بەریـان و دەسـتەواژە دەسـکەلاییەکانی کە حازریـان کـردوون و لە هەمـوو کۆبـوونەوە و بۆنەیەکدا دووبـارەی دەکەنەوە. ئەمـان دەڵێن: "هـۆ گەلـۆ... ئـاین... ئـاین" و ئەوانیش دەڵێن: "هـۆ گەلـێ... پێشـکەوتن ...پێشکەوتن". ئەمان هاوار دەکەن "بەرەوپێش"، ئەوانیش هاوار دەکەن "بەرەوپـاش". لەوانەیە بەم قسـانە تەنهـا بیانەوێـت خەڵکـی سـەرقاڵی کۆمەڵێک شت بکەن و گرفتە سەرەکییەکانیان لە بیر بەرنەوە.

واعیـزی "فەرەنگـی لەبەر" دەبینیـت چـۆن لالـوت بـووە لە خەڵکـی و فـووی کـردووەتە خـۆی و ئەگەر بە گەڕەکی هەژارنشـینانـدا بـڕوات لەتاو بۆنی ئاوەڕۆی ناو کۆلانان، لووتی دەقوچێت و دەست دەکات بە پفەپـف وا خەریـکە لەهـۆش خـۆ دەچێـت. ئەو وا دەزانێـت ئەو هەژارانە سەگی گلاون، بۆیە هەر بێزیشی نایەت نزیکیان بکەوێتەوە و لە گرفتەکانیـان بکـۆڵێتەوە کە پێـوەی دەتلێـنەوە. ئەو بەس دەشـیرینێت: "بـۆ پێشـەوە...". هەژارێـک بە لای فەرەنگی لەبەرێکـدا

تێپەڕی و شەکوای گوزەرانی خۆیی کرد، کابرای فەرەنگی لەبەر پێی وت: 'بۆچی ئیش ناکەیت... هەر کەس ئیش بکات شتی دەست دەکەوێت- مالک لاتعمل... من جد وجد.! "

ئەمانە ڕێگەی ڕۆزی پەیداکردن بۆ خەڵکی ناکەنەوە و دواتریش پێی دەڵێن: بڕۆ بە دوای ڕۆزیدا. نموونەی ئەمانە وەک خاتوو ماری ئەنتوانێتی شاژنی لویسی شازدەیەمی فەرەنسان، کاتێک خەڵکەکە هاتن داوای نانیان لێکرد، ئەویش وتی "ئەگەر نانتان نییە بڕۆن کێک بخۆن کێک"... واعیزە فەرەنگی لەبەرەکان لە قسەی بێ ناوەڕۆککردندا، هیچیان کەمتر نییە لە واعیزە عەمامەبەسەرەکان، هیچ یەکێک لەمانە ناچێتە سەردانی ڕۆژاوا و کە هاتەوە دەست نەکات بە وەسف و سەناخوانیی ئاکار و ڕەوشتیان. ئینجا کە 'فەرەنگی لەبەر' گەڕایەوە بە چاوێکی سووکەوە تەماشای چواردەورەکەی دەکات و پێیان دەڵێت: 'باشە ئەوە ئێوە بۆ هیچتان لەوان ناکات؟'. لەملایشەوە عەمامەبەسەرەکان سەناخوانیی سەلەفی ساڵەح و خو و ڕەوشتی ئەوانمان بۆ دەکەن. هەردوو لا شتێکمان لەپێش دەهاوێن کە نەتوانین لە ئەستۆی بگرین.

ئەخلاق شتێک نییە تەنها بە وتە و گوفتار جوان بکرێت، ڕۆژئاوا بارودۆخیان بە قسە و وەعز چاک نەبووە، بەڵکوو چاکبوونی بارودۆخ جێکەوتی لەسەر باشبوونی ڕەفتاریش هەیە، واتە کە بارودۆخ باش بوو، ڕەفتاریش باش دەبێت. ئێمە زوڵممان کردووە ئەگەر بە کەسێکمان گوت: ڕاستگۆبە، دڵسۆز و دەستپاک و پاکوخاوێن بە، لە کاتێکدا ئەو خۆی و منداڵەکانی لە کەلاوەیەکدا لەبەر گەرمای ژەنگاوی هاوین و سەرمای دەم بە گوێزانی زستاندا هەڵدەلەرزن. ئەو هەزار جار دزی بە باشتر دەزانێت تا ئەو دەستپاکییەی کە لە برسا خەریکە دەیکوژێت. جلوبەرگی پاکوپاخوێن

بۆ فیتەرێک بێجگە لە مانای بێکاری و دەبەنگی، هیچ مانایەکی دیکەی لێ دەرناهێندرێت، بۆیە ئەگەر بە کەسی ناو کەلاوەیشمان وت، کاکە پاکوخاوێن بە، مانای ئەوەیە ئەم منداڵە نازێکی بێمانای دەکێشرێت.

واعیزەکان دەیانەوێت خەڵکانی ڕەجاڵ خاوەنی ئاکارێکی بڵند و بەرز بن. لەوانەیە بەم کارەیان بیانەوێت ڕەوایەتی بە خو و ڕەوشتی ناپەسەند و ستەمی ئاغا و قەڕاڵەکانی خۆیان بدەن. ئەمان دەیانەوێت شتێکی ئەستەم بخەنە بەردەستی خەڵک تا نەتوانن پێی بگەن – نەتوانن بگەن بەو ئەخلاقە بەرزانە– لێرەیشەوە پێیان بڵێن: "ئەها خوو و ڕەوشتتان بۆتە مایەی بەلا بەسەرتانەوە". ئەوان لە کاتی وتار و وەعزدا، هێندێک دەستەواژەی قەڵەو بەکار دەهێنن، کە خەڵکی هەر لێی تێناگات، بەم کارەیش هێندەی تر باری خەڵکی سەغڵەت دەکەن.

سوڵتانەکانی پێشین، دوو جۆر لە داردەستیان هەبوو، یەکێکیان داردەستی شمشێر بە دەست و ئەویشیان قەڵەم بە دەست. ئەوان ماڵیان دەبەخشی بۆ پارێزگاریکردن لە قەڵەم بەدەستان لە ڕێگەی کردنەوەی مەدرەسە و تەکیە و دەرخانە، هەروەک چۆن شیر و شمشێر و ئەسپی ڕەسەنیان بۆ شەقوەشێنەکانیش ئامادە دەکرد تا زیاتر خزمەتکار بن. لە ڕاستیشدا هێزی ستەم، تەنها بەسەر قاچی شمشێر بە دەستانەوە ڕانەوەستاوە، بەڵکوو وەک هەموو شتەکان، لەسەر دووقاچ ڕاوێستاوە، قاچی دووەمیشیان بریتییە لە فەتوا و بڕیاری فەقیە و قازییەکانە. ئەو سوڵتانەیشی کە بۆ کارەکانی تەنها پشت بە شمشێر دەبەستێت، کاری لەنگە و درەنگ و زوو میچی ماڵەکەی بەسەردا دەڕمێت.

ئێستا کات کاتی ئەوەیە شۆڕشێک لە بیروهۆشماندا ئەنجام بدەین، دەمی سوڵتان بەسەرچوو، لەبریدا زەمەن زەمەنی گەلانە. هیچ جوان نییە بۆ ئێمە کە لە سەدەی بیستدا دەژین، بێین و لەسەر ڕێڕەوی

واعیزەکانی سولتان بیر بکەینەوە. ئێستا کاتی ئەوەیە بە شێوەیەکی واقیعی لە سروشتی مرۆ بگەین وەک ئەوەی کە هەیە. پاشان دان بەو نوقسانییە سروشتییانەیشدا بنێین کە تێیدایە و لە پاش زانینی ئەمە، ئینجا ڕێگەی چاکسازی بگرینە بەر -واتە لە ڕوانگەی واقیعەوە-. بەلام ئەگەر مرۆمان بە فریشتە چواند و وامانزانی ناکرێت لە گول کالتری پێ بوترێت ئەو کاتە هیچ کارمان لەبەر ناڕوات و هیچ چاکسازییەکیش ناتوانین ئەنجام بدەین و ستەمکارانیش لە ستەمی خۆیاندا بەبێ ترس هەر بەردەوام دەبن.

# هەمبانەی وشە( فەرهەنگۆک )

**بارێر**: شار.
**لەچەریی**: حەسودی.
**سیپاڵ**: جل و بەرگ.
**هەربینا**: یەکسەر.
**پوش لەدەم**: هیچ بۆ نەماو.
**ماک**: بنچینە، سەرەکی.
**کەمایەسی**: نوقسانی.
**نەزیلە**: کورتە نموونە، یان چیرۆک.
**پەسن**: وەسف و ستایش.
**خولام**: مێردمنداڵ.
**دوو ڕازیی**: دوو ڕوویی.
**کتاتیب**: دەرسخانە، حوجرەی کۆنی جاران، وشەیەکی کۆنە، جێگرەوە هاوچەرخەکەی بریتییە لە خوێندنگە.
**تژە**: پڕ.
**دەستاوێز**: بەڵگە.
**نەست**: لاشعور.
**دۆت**: کیژ، کچ.
**قۆڕ کردن**: ئەوەیە هێلکەگونەکانی دەردێنن و ئیتر ئامێرەکەی ڕەق نابێت و سپێرمیش دروست ناکات.
**حەنا**: بەردەم
**کەوێکردن**: ڕامکرد، مسەخەر کردن.
**بولێڵ**: لیلیی. بولیلی بەیان، دەمی بەیان زوو.
**تۆبە گۆیی**: تۆبە گوتن و پەشیمانی دەربڕین.
**خوڕدەم**: خەڵکێکی زۆر.
**دڵ بە دەغەز**: دڵ نەخۆش.
**دوو ڕازیی**: دوو ڕوویی.
**دەوڵەتمەند**: دەوڵەمەند.
**دەروبان**: سەر و خوار، ئەرز و ئاسمان.
**لە پەسا**: یەک لەدوای یەک، بە بەردەوامی.
**پەسنکردن**: بەدڵبوون، دڵلێبوون.
**بێفەڕ**: بێخێر، خراپ.
**ڕەبەن**: هاومانا عەرەبییەکەی بریتییە لە "رهبان".
دوادنک: دوا دانە: هەموویان بە تێکرا.
**نهێم**: شەپۆل.
**خۆ بە زەلامزانین**: خۆ بە زلزانین.
**بەفەر**: بەپیت.
**هەلاوێرد**: بیجگە لە.
**دەعەز**: دەرد: نەخۆشی.
**حەوا**: ئاسمان.
**سیخورمە پێوەرکردن**: تێژەنینی لای

کەمەر، ئەها یەکێک دەیەوێت یەکێکی دیکە هەستێنێتەوە بۆ کارێک، هەر لەپەسا تێی دەژەنێت سا بەڵکو هەستێتە یەرپێ.

**پیتک پێوەنان**: ناوناتۆرە لێنان.

**هەڤدوو**: یەکتر.

**تنەتەبیعەت**: تورە و کەم جیقڵدانە.

**قەراڵ**: وەک پاشا.

**ئاپ**: مام، ئاپۆ: مامۆ،مامە

**پلک**: پوور.

**چەشەکردن**: شتێک دەدەیت بەکەسێک تا نمەک بیگرێت و نەتوانێت بەرامبەرت نامەردی بکات.

**نەپەرژان یان نەپەرژێنە سەر شتێک**: واتە مەجالی ئەو شتەت نەبێت.

**لەقەشێڵ**: نانەژێر پێ.

**میرازگرتن**: دارکاریی کردن.

**لەحەیبەت**: لەترس. لە هەیبەت.

**خۆشەبوون**: ڕاهاتن.

**تەفرەدان**: لەناوبردن.

**چەقلاوژوور**: دەمەوخوار، سەربەروخوار.

**ملنەدەر**: ملکەچ نەکەر.

**بەرتاو**: نفوز، ناوچەی جێ مفوز.

**مانقێز**: بێ نان و ئاو.

**خۆش-دوو**: قسە خۆش ، دەنگ خۆش.

**بدینیایە**: ببینیایە. دینین: بینین.

**دەحەجا**: دەچوو بۆ حەج.

**ئەوزار**: تاوان.

**تەیار**: ئامادە.

**خرەخەو**: قوڵ بوونەتەوە لە ناو خەودا. لەخەوێکی قوڵدابوون.

**قاپی**: دەرگا.

**متەقی نەکر**: فزەی نەکرد، هیچی نەگووت.

**سەرمەد**: نەمر، هەردەمێنێت.

**هەناسەچنین**: وەستاندنی هەناسەدان.

**جەعبە**: جبە، ئەو کەوا شۆڕەی کە لەبەری دەکەن.

**مکوڕبوون**: سوربوون.

**وزقە تف**: پڕ دەمێک تف.

**ڕاستاڵ**: ڕێک و هەماهەنگ.

**سایەبان**: سێبەر. سایە.

**برانە**: تێخوڕە، حوکم بکە.

**ساردی دەکەمەوە**: واتە دەیکوژم.

**پاتاڵ**: لە کوردی ڕەسەندا ، واتە ئاژەڵ.

**پلار**: تەعلیقلێدان، پیتک پێوەنان.

**ڕەخنەدان**: وەک خۆێدان. واتە شوێنی ڕەخنە.

**ئەزبەر**: دەرخ.

**دژوێن**: قسەی سوک و ڕەزیل.

**گۆپاڵ**: گۆچان.

**ئولگوو**: سەرمەشق یان پێشەنگ.

**ڕووتەڵ**: شوێنێک کە گیای تێدا

شین نابێت، بەکەمیی نەبێت.
**بەردی ئەلحەو:** ئەو بەردەیە کە مردوو لوتی لێی دەدات ئەو دەمەی دەیەوێت لەسەرقەبران لەگەڵ خەڵکەکە بگەڕێتەوە، نازانێت خۆی مردووە، بۆیە کە ئەوێت هەستێتەوە سەر پێ و هاوڕێیەتییان بکات بەرەو ماڵەوە، لە کاتی هەستانەوەکەدا لووتی بەر بەردەکانی سەری دەکەوێت و دەڵێت: ئەلحەق- ئەلحەو- واتە بەراستی مردن ڕاست بوو، بەڵام من چاوقایم بووم و بڕوان نەدەکرد.
**شەش لا، بریتین لە:** ڕاست، چەپ، سەر، خوار، پێش و دوا.
**سامدار:** خەڵکی لێی بترسن.
**سەر-نەوی:** سەر کز و گوێڕایەڵ..
**واتە:** دەیتەپێنن بۆی.
**گوندە:** کەسی زۆردار.
**بەدفەر:** خراپ.
**خواڕسک:** مەبەستمان فیتریە- الفکرە.
**ملۆزم:** کەسێکی گول، پیس. بێکەڵک.
**تارینەوە:** لێ دورکەوتنەوە بەهۆی بەخراپ زانینەوە.
**ئاتاجی:** پێویستی.
**چەوێڵ:** چەپ گەرد، لار و ناڕێک.
**ئاروان:** وشتر، حوشتر.
**خلۆربوونەوە:** بەرەوخوار بوونەوە.
**گلێرکردنەوە:** کۆ کردنەوە.
**ڕۆژی بەرێ:** ئەزەل، یەکەم ڕۆژی دنیا.
**ڕۆژی سەلا:** ڕۆژی قیامەت.
**قەف:** واتە تیرە، ئەستووریی.
**عەیالدار:** منداڵ کەوتوو بەسەردا
**ئارێشە:** گرفت.
**برەو:** زیادبوون.
**دڕدۆنگ:** دوودڵ.
**لەپەسا:** تۆز تا تۆزێک.
**تفاق:** پێویستی.
**بەرچاک:** زۆرێک. پڕ بە باوەشێک.
**گۆپاڵ:** گۆچان.
**ج باکێکتە:** کەی گرفتە.
**داڵغە:** خەیاڵ.
**ئاتاجان:** ئەوانەی کە پێویستیان بە یارمەتییە.
**ئەویان:** زیاتر.
**فرە:** زۆر.
**خودان:** خاوەن، ساحێب.
**جوقەوەر:** زیندەوەر.
**داپلۆساندن:** بێدەنگ کردن یان هەندێکجار لەناوبردن.
**تێسرەواندن:** لێدان.
**لێتاین بوون:** لێپەیدابوون. لەبەرانبەردا دروست بوون.
**گای ناو خۆمخۆرک:** ئەو گایەی

که دەچەقێت و توانای بزتنی
هەرشەش لای لەدەست دەدات،
بێدەنگ دەمێنێتەوە تا لەبرسان
دەمرێت.
**تەبەرک:** موقەددەس یان
موبارەک.
**بەهیچ کلۆجێک:** بەهیچ شێوەیەک.
**خۆتەرمکردن:** خۆ دوورەپەرێز
کردن.
**بەتەنگەدادان:** کێشان بەیەکدا.
**ڕاساڵ:** دروست و ساق.
**یەکەم دەردوو:** یەکەم فرسەت.
**بەهیچ کلۆجێک:** بە هیچ شێوەیەک.
**تەلکێشان:** کە گوڵێک بەدەستەوە
دەگرێت و دانە دانە پەڕەکانی
تەل دەکێشێت، ئەوەیە تەلکێشان.
**بنەڕۆژ:** سەرەتا.
**ماتەڵ:** چاوەڕوان
**دەسەوام:** واتە شتی دوو سەرە،
تۆشت دەدەی بە بەرانبەر، تا
ئەویش بیدا بەتۆ.
**هەڤدوو:** یەکتری.
**چەوتاو:** چەماوە، پشت کووڕ.
**زێن ڕۆشن:** عەقل کراوە و بەرچاو
ڕوون.
**هەتەران پەتەران:** قسەی پووچ.
**گرفتەوەر:** کێشاوی، گرفتاوی.
**بەموو:** بەحاڵ.
**تەرمکردن:** دوورخستنەوە.

**چاووگوێ درینەوە:** چاو کرانەوە.
بەرچاوڕوونی.
**حۆل:** گێژ
**کەنەکردن:** ژێرچاڵکردن، چاڵکردنی
ژێری شتێک تا وردەوردە
بتەپێتەوە و شتەکەیش
سەرنگووم ببێت.
**دەست لەخەنەدا بوون:** واتە دەست
بەستران.
**غەزوبەز:** نەرمایی، خۆشایی.
**فی فی لیهاتن:** گرنگی نەدان
بەشتێک. بەهەند وەرنەگرتن.
**بالۆرە:** بەزمو ڕەزم.
**لیتەکینەوە- لیتەکانەوە:** لێ
دوورکەوتنەوە.
**پەرێز:** دوور، لا.
**وێژە:** ئەدەب.
**گلۆڵە کەوتنە لێژی:** واتە بار
لاربوون، بێنرخ بوون.
**سارا:** سەحرا، بیابان.
**دەستبار:** هاریکاری.
**جیابەرە:** بەرەجیاواز، ئاڕاستە
جیاواز.
**نەوی:** نزم.
**سستۆک:** بێ هێز.
**نەسیحەتخوان:** ئامۆژگاریکەر.
**جوقەوەر:** زیندەوەر.
**پرپینک:** جوان پێکانی شتێک.
پڕاوپڕ پێکانی شتێک.

**خوڕدم**: قەڵەباڵغییەکی زۆر.
**گیانەڵا**: ئاخر و ئۆخری ژیان، سەرەمەرگ.
**حەقوان**: حەقویست.
**بەزیادکران**: تەواوبوون، داخران.
**پرینگانەوە**: سڵەمینەوە.
**ڕۆندک**: ئەسرین، فرمێسک.
**دردۆنگی**: گومان یان دوودڵی.
**کەلاک**: لاشەیەکی مردوو.
**بەیداغ**: ئالا، دروشم.
**مەنگاو**: ئاوی مەنگ.
**پێوار**: شاراوە.
**مۆڵەق بوون**: نە بۆ ئەملا، نە بۆ ئەولا، ئەوەی دەڵێت: مۆڵەقم لەبەین خەوف و ڕجادا.
**کنیشت**: کڵێسا، مەڵبەندی خوداپەرسی گاوران.
**دەم دڕینەوە**: قسەکردن.
**چەندۆکە ڕۆژ**: چەند ڕۆژێکی کەم.
**هەوا نەمان**: سام نەمان، ئەو دەستەواژەیە لە قورئاندا بەکارهاتووە: وتژهب ریحکم.
**تیلەوبەگو**: ماتانی، هەڵماتێن.
**پەلبڕ**: پەل بڕین.
**ساردکردنەوە**: کوشتن.
**ڕاسان**: پەنجەی هەڕەشە.
**ماڕزکار**: ستەمکار.
**ماڵەقۆلێ**: یاری منداڵان.
**کەونار**: کۆن، قەدیم.
**هۆمەرمزە**: گوزارشتە لە جەنگ و هەرا.
**ماڕز**: ستەم.
**پیران بردنەوە**: پێکەنینی زۆر زۆر، یان گریانی زۆر زۆر، لێرەدا مەبەست لەیەکمیانە.
**پاک**: هەموو.
**عەبابەشەر**: یەک تاکە کەس.
**ماڵمیرات**: تەمەنای مردنی کەسێکە.
**تێکومەکان**: تێکچوون. هەڵتەکین.
**ڕۆندک**: ئەسرین، فرمێسک.
**لینگویستیک**: زماننا‌س. جیاوازە لە زمانزان.
**مل خوس**: سەر شۆڕکردوو، سەرحیزکردوو.
**ماپۆسخانە**: بەندیخانە.
**سەرنماسین**: سەرزۆر سورمان. سەر ئاوسان.
**ودم**: پیرۆز، تەبەڕک.
**بنەڕۆ**: سەرەتا.
**کلافەکردن**: لەسەر ڕژان، بەهێزوبازووبوون.
**دەرهەست**: ئاوەز. بەرهەست: عەین.